# صحيح البخاري

## بە کوردی

وەرگێڕاوی هەموو فەرموودە صەحیحەکانی ئیمامی بوخارییە کە ژمارەیان ( ٧٥٦٣ ) فەرموودەیە

**بەرگی دەیەم**


نووسینی

**أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري**

وەرگێرانی

**محمد ملا صاڵح بامۆکی**




# صحيح البخاري

## به كوردى

**بەرگی دەیەم**

پەڕاوەکانی.. سزای تاوانەکان ، خوێنبایی ، داوای تەوبەکردن لە هەڵگەڕاوان ، زۆرلێکردن، فێڵەکان، لێکدانەوەی خەو، ئاشوب و ئاژاوەکان، بڕیارەکان، ئاوات خواستن ، فەرمووده ئاحادەکان ، پابەندی بە قورئان و سوننەت ، یەکتاپەرستی

نوسینی

**أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري**

وەرگێڕانی

**محمد ملا صالح بامۆكى**



# ( صحيح البخاري ) به كوردى


بەرگی دەیەم

نووسینی..أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخارى

وەرگێڕانی.. محمد ملا صالح بامۆكی

چاپی یەكەم ٢٠٢٣

تیراژ : ١٠٠٠ دانه

دیزاین .. ئەحمەد

له بڵاوكراوەكانی كتێبخانەی تیشك





07719899402
07501122110

## ٣٩- بابُ مَنْ أَدَّبَ أَهْلَهُ أَوْ غَيْرَهُ دُونَ السُّلْطَانِ

وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِذَا صَلَّى فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْهُ فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ». وَفَعَلَهُ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ.

## ٣٩- باسی کەسێک کەسو کاری یان کەسی تر تەمێ بکات بە بێ مۆڵەتی دەسەڵاتدار

**ئەبو سەعید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێك نوێژی کرد و کەسێك ویستی بەبەردەمیدا بڕوات با دووری خاتەوە، جا ئەگەر وازی نەهێنا با شەڕی لە دژ بکات))، ئەبو سەعیدیش بەو جۆرەی کردوە[1].**

٦٨٤٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَاءَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي - فَقَالَ: حَبَسْتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسَ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ. فَعَاتَبَنِي وَجَعَلَ يَطْعُنُ بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي، وَلاَ يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ إِلاَّ مَكَانُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ[2].

**٦٨٤٤- عائیشە ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ هات لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لەسەر ڕانی من بوو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ و خەڵکت وەستاندووە لە کاتێکدا ئاویان پێ نییە، بۆیە سەرزەنشتی کردم زوو زووش بەدەستی دەیکوتایە کەلەکەم، منیش لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لەسەر ڕانم بوو جووڵەم نەدەکرد، ئینجا خوای گەورە ئایەتی تەیەمومی دابەزاند.**

---

(١) واتە: نەیهێشتووە کەسێک بە بەردەمیدا بڕوات لە کاتی نوێژدا. بڕوانە: فەرموودەی (٥٠٩) لە صەحیحی بوخاریدا.
(٢) بڕوانە: ٣٣٤.

٦٨٤٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ القَاسِمِ حَدَّثَهُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَكَزَنِي لَكْزَةً شَدِيدَةً وَقَالَ: حَبَسْتِ النَّاسَ فِي قِلَادَةٍ. فَبِي المَوْتُ لِمَكَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ أَوْجَعَنِي. نَحْوَهُ[1].

**٦٨٤٥- عائیشه ﵂ دەڵێت: ئەبو بەکر ﵁ هات، ئینجا مستەکۆڵەیەکی توندی لێدام وتی: خەڵکەکەت ڕاگرتووە لەبەر ملوانکەیەك، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ (خەبەری نەبێتەوە)[2] خەریك بوو دەمردم، بەڕاستی زۆر ئازاری پێ گەیاندم، ئیتر ئەوی کەی وەك فەرموودەی پێشوو وایە.**

## ٤٠- بابُ مَنْ رَأَى مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً فَقَتَلَهُ

٦٨٤٦- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ، عَنْ وَرَّادٍ -كَاتِبِ الْمُغِيرَةِ- عَنِ الْمُغِيرَةِ قَالَ: قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: لَوْ رَأَيْتُ رَجُلاً مَعَ امْرَأَتِي لَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ غَيْرَ مُصْفَحٍ. فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «أَتَعْجَبُونَ مِنْ غَيْرَةِ سَعْدٍ، لَأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ، وَاللَّهُ أَغْيَرُ مِنِّي»[3].

## ٤٠- باسی (حوکمی) کەسێک لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێک ببینێت و پیاوەکە بکوژێت

**٦٨٤٦-موغیره دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە ﵁ وتی: ئەگەر پیاوێك ببینم لەگەڵ ژەکەمدا بەدڵنیاییەوە بەشمشێر بەباری تیژیدا لێی دەدەم، ئەم وتەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: ((ئایا سەرتان سوڕدەمێنێ لە غیرەی[4] سەعد؟ بێگومان من غیرەم لە سەعد زیاترە، خواش غیرەی[5] لە من زیاترە)).**

(١) بڕوانە: ٣٣٤.

(٢) چونکە سەری پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕانی بووە.

(٣) بڕوانە: ٧٤١٦.

(٤) غیره واته پێناخۆش بوونی گوناه و تاوان و ڕقبوونەوە لێی.

(٥) غیرەی خوا واته ڕێگری کردنی له تاوان ڕقبوونەوەی لێی.

## ٤١- بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّعْرِيضِ

٦٨٤٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَمًا أَسْوَدَ. فَقَالَ: «هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «مَا أَلْوَانُهَا؟». قَالَ: حُمْرٌ. قَالَ «فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «فَأَنَّى كَانَ ذَلِكَ؟». قَالَ: أُرَاهُ عِرْقٌ نَزَعَهُ. قَالَ: «فَلَعَلَّ ابْنَكَ هَذَا نَزَعَهُ عِرْقٌ»[1].

## ٤١- باسی ئەوەی دەربارەی (قەسەکردن بە) ناڕاستەوخۆ هاتووە

**٦٨٤٧- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ژنەکەم کوڕێکی ڕەشی بووە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا وشترت هەیە؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((ڕەنگیان چۆنە؟)) وتی: سوورن. فەرمووی: ((ئایا ڕەنگ خۆڵەمێشیان تیایە؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((دەی ئەوە لە کوێوە هاتووە؟)) وتی: لەوانەیە ڕەگێ لە ڕەگەزیان ڕەنگی وابێ، فەرمووی: ((دەی ئەو کوڕەی تۆش وەك ئەوە لەوانەیە ڕەگێ بێ لەڕەگەزی (ڕەنگی باوانیەوە هاتبێ) )).**

## ٤٢- بَابٌ: كَمِ التَّعْزِيرُ وَالأَدَبُ

٦٨٤٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يُجْلَدُ فَوْقَ عَشْرِ جَلَدَاتٍ إِلاَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٥٣٠٥.

(٢) بڕوانە: ٦٨٤٩، ٦٨٥٠.

## ٤٢- باسێک: سەرزەنشت و تەمێ کرد چەندە [1]

**٦٨٤٨-ئەبو بوردە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((لە دە جەڵد زیاتر لە کەس نادرێت، مەگەر لە سزایەك لە سزاکانی خوادا)).**

٦٨٤٩- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جَابِرٍ، عَمَّنْ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ عُقُوبَةَ فَوْقَ عَشْرِ ضَرَبَاتٍ إِلاَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ»[2].

**٦٨٤٩-عەبدوڕەحمانی کوڕِ جابیر لە کەسێکەوە دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری ﷺ ببیستووە کە فەرموویەتی: ((هیچ سزایەك لەسەروو دە جەڵدە و شەلاقەوە نییە، مەگەر لە سزایەك لە سزاکانی خوادا)) .**

٦٨٥٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، أَنَّ بُكَيْرًا، حَدَّثَهُ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا جَالِسٌ عِنْدَ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ إِذْ جَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جَابِرٍ فَحَدَّثَ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا سُلَيْمَانُ بْنُ يَسَارٍ فَقَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جَابِرٍ أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا بُرْدَةَ الأَنْصَارِيَّ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ تَجْلِدُوا فَوْقَ عَشْرَةِ أَسْوَاطٍ إِلاَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ»[3].

**٦٨٥٠-ئیبو وەهب دەڵێ: عەمر بۆی گێڕامەوە کە بوکەیر بۆی گێڕاوەتەوە وتوویەتی: لە کاتێکدا من لای سولەیمانی کوڕی یەسار دانیشتبووم، لەوکاتەدا عەبدوڕەحمانی کوڕی جابیر هات، پاشان سولەیمانی کوڕی یەسار ڕووی تێ**

(١) واتە: چەند دار یان قەمچی و شەلاق لێدان.
(٢) بڕوانە: ٦٨٤٨.
(٣) بڕوانە: ٦٨٤٨.

**كردين و وتی: عەبدوڕەحمانی كوڕی جابیر بۆی گێڕامەوە كە باوكی بۆی گێڕاوەتەوە كە لە ئەبی بوردەی ئەنصاری بیستووە وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لەسەروو دە قەمچییەوە لە كەس مەدەن، مەگەر لە سزایەك لە سزاكانی خوادا)).**

٦٨٥١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الوِصَالِ، فَقَالَ لَهُ رِجَالٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: فَإِنَّكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ تُوَاصِلُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّكُمْ مِثْلِي؟ إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ». فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلاَلَ، فَقَالَ: «لَوْ تَأَخَّرَ لَزِدْتُكُمْ». كَالْمُنَكِّلِ بِهِمْ حِينَ أَبَوْا. تَابَعَهُ شُعَيْبٌ وَيَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ وَيُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِد، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٦٨٥١-ئەبو سەلەمە دەگێڕێتەوە كە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری كرد لە شەو دانە دەم ڕۆژ لە ڕۆژووگرتندا، جا پیاوێك لە موسوڵمانان پێی وت: ئەی بۆ تۆ خۆت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شەو دەخەیتە سەر ڕۆژ؟! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((كامتان وەك منن؟ من شەوم بەسەردا دێت پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم دەداتێ))، جا كە هەر وازیان لێ نەهێنا لە شەو خستنە سەر ڕۆژ لە ڕۆژووگرتندا پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆژێ ویصالی پێكردن، ڕۆژێكی تریشی پێكردن، پاشان مانگیان بینی (و بوو بەجەژن)، ئەوسا فەرمووی: ((ئەگەر (بینینی مانگ) دواكەوتایە ڕۆژووی پەیوەستم زیاتر پێدەگرتن))، وەك سزا بۆیان كە هەر وازیان نەدەهێنا.**

---

(١) بروانە: ١٩٦٥.

**-شوعەیب و یەحیای کوڕی سەعید و یونس لەزوهرییەوە گێڕاویانەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عوقیلیان کردوە.**

**•عەبدوڕەحانی کوڕی خالید لە ئیبنو شیهابەوە دەگێڕێتەوە لە سەعیدەوە لە ئەبی ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایویەتیەوە.**

٦٨٥٢- حَدَّثَنِي عَيَّاشُ بْنُ الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُمْ كَانُوا يُضْرَبُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذَا اشْتَرَوْا طَعَامًا جِزَافًا أَنْ يَبِيعُوهُ فِي مَكَانِهِمْ حَتَّى يُئْوُوهُ إِلَى رِحَالِهِمْ[1].

**٦٨٥٢- سالیم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەوانەی کە خۆراکیان بە گۆترە دەکڕی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لێیان دەدرا، بۆئەوەی نەیفرۆشن تا وەرینەگرن و نەیبەنەوە بۆ ماڵی خۆیان.**

٦٨٥٣- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: مَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِنَفْسِهِ فِي شَيْءٍ يُؤْتَى إِلَيْهِ، حَتَّى تُنْتَهَكَ مِنْ حُرُمَاتِ اللَّهِ فَيَنْتَقِمَ لِلَّهِ[2].

**٦٨٥٣- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر خۆی تۆڵەی لە کەس نەسەندوە، لە هیچ شتێکدا بەرانبەر بەخۆی کرابێت، هەتا ڕێز و حورمەتی (ئاینی) خوا شکێنرابێت، ئەوسا لەبەر خوا تۆڵەی دەسەندەوە.**

(١) بڕوانە: ٢١٢٣.

(٢) بڕوانە: ٣٥٦٠.

## ٤٣- بابُ مَنْ أظْهَرَ الفَاحِشَةَ وَاللَّطْخَ وَالتُّهَمَةَ بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ

٦٨٥٤- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: شَهِدْتُ الْمُتَلاَعِنَيْنِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا، فَقَالَ زَوْجُهَا: كَذَبْتُ عَلَيْهَا إِنْ أَمْسَكْتُهَا. قَالَ: فَحَفِظْتُ ذَاكَ مِنَ الزُّهْرِيِّ: «إِنْ جَاءَتْ بِهِ كَذَا وَكَذَا فَهْوَ، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ كَذَا وَكَذَا - كَأَنَّهُ وَحَرَةٌ- فَهُوَ». وَسَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ يَقُولُ: جَاءَتْ بِهِ لِلَّذِي يُكْرَهُ[١].

## ٤٣- باسی کەسێک وا نیشان بدات داوێن پیسە و تێوەگلاوە و گومانی لەسەر بێت بە بێ شایەت بوون لەسەری (حوکمیان چیە؟)

**٦٨٥٤-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ وتی: ئامادەی دوو نەفرین کەرەکە[٢] بووم لەو کاتەدا تەمەنم پازدە ساڵ بوو، (پێغەمبەر ﷺ) لە یەکتری جیا کردنەوە، جا مێردی ژنەکە وتی: بوهتانم بۆ کردوە ئەگەر ڕایگرم[٣]، (سوفیان) وتی: ئەوەم لە زوهریەوە بیستووە: ئەگەر ژنەکە منداڵەکەی بوو ئاوەها و ئاوەها بوو ئەوە (پیاوەکە ڕاستی وتووە)، بەڵام ئەگەر منداڵەکەی بوو ئاوەها و ئاوەها بوو وەك شەوگەرد بوو ئەوە (پیاوە درۆی کردوە)، وە (سوفیان) وتی: لە زوهریم بیست دەیوت: ژنەکە منداڵەکەی بوو لەو کەسە دەچوو کە حەزی پێ نەدەکرا[٤].**

---

(١) بڕوانە: ٤٢٣.
(٢) ژن و مێرد.
(٣) وەک خێزانی خۆم لە ئێستا بەدواوە.
(٤) واتە: لەو کەسە دەچوو کە تاوانبار کرابوو زینا لەگەڵ ژنەکە کردوە.

٦٨٥٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: ذَكَرَ ابْنُ عَبَّاسٍ المُتَلاَعِنَيْنِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ شَدَّادٍ: هِيَ الَّتِي قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لَوْ كُنْتُ رَاجِمًا امْرَأَةً عَنْ غَيْرِ بَيِّنَةٍ؟». قَالَ: لاَ، تِلْكَ امْرَأَةٌ أَعْلَنَتْ[1].

**٦٨٥٥-قاسیمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ باسی ژن و پیاوە نەفرین کەرەکەی کرد، عەبدوڵلای کوڕی شەددادیش وتی: ئەو ئافرەتە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ژنێکم بەبێ شایەتی لەسەر دان بەردباران بکردایە؟)) ئیبنو عەبباس وتی: نەخێر ئەوە [2] ئافرەتێك بوو کاری خراپەی بەئاشکرا دەکرد [3]، (بەڵام شایەتی نەبوو لەسەری).**

٦٨٥٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: ذُكِرَ التَّلاَعُنُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ عَاصِمُ بْنُ عَدِيٍّ فِي ذَلِكَ قَوْلاً ثُمَّ انْصَرَفَ، وَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ يَشْكُو أَنَّهُ وَجَدَ مَعَ أَهْلِهِ، فَقَالَ عَاصِمٌ: مَا ابْتُلِيتُ بِهَذَا إِلاَّ لِقَوْلِي. فَذَهَبَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ بِالَّذِي وَجَدَ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ، وَكَانَ ذَلِكَ الرَّجُلُ مُصْفَرًّا قَلِيلَ اللَّحْمِ سَبِطَ الشَّعَرِ، وَكَانَ الَّذِي ادَّعَى عَلَيْهِ أَنَّهُ وَجَدَهُ عِنْدَ أَهْلِهِ آدَمَ خَدْلاً كَثِيرَ اللَّحْمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّهُمَّ بَيِّنْ». فَوَضَعَتْ شَبِيهًا بِالرَّجُلِ الَّذِي ذَكَرَ زَوْجُهَا أَنَّهُ وَجَدَهُ عِنْدَهَا، فَلاَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُمَا. فَقَالَ رَجُلٌ لاِبْنِ عَبَّاسٍ فِي الْمَجْلِسِ: هِيَ التِي قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ رَجَمْتُ أَحَدًا بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ رَجَمْتُ هَذِهِ؟». فَقَالَ: لاَ، تِلْكَ امْرَأَةٌ كَانَتْ تُظْهِرُ فِي الإِسْلاَمِ السُّوءَ[4].

(١) بڕوانە: ٥٣١٠.
(٢) کە پێغەمبەر ﷺ وای پێ فەرمووە.
(٣) نەخۆشی دانی دەنا بەخراپەکەیدا نەشایەتیش لەسەری هەبوو، بەڵام دەنگ و باسی خراپی هەبوو.
(٤) بڕوانە: ٥٣١٠.

**٦٨٥٦- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ باسی نەفرین کردن کرا، جا عاصیمی کوڕی عەدیی لەو بارەیەوە قسەیەکی کرد پاشان ڕۆشت، ئینجا پیاوێك لە هۆزەکەی هات بۆ لای سکاڵای ئەوەی لاکرد کە ئەو لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێکی بینیوە (زینای کردوە)، عاصیمیش وتی: من تەنها بە هۆی قسەکەمەوە تووشی ئەمە بووم، ئیتر عاصیم پیاوەکەی برد بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و جا ئەو هەواڵەی دا بە پێغەمبەر ﷺ کە بە ژنەکەیەوە بینویەتی، ئەو پیاوە (مێردی ژنەکە) ڕەنگ زەرد بوو کەم گۆشتی قژ خاو بوو، بەڵام ئەو پیاوەی تاوانباری دەکرد بەوەی لەگەڵ ژنەکەیدا بینویەتی ڕەنگ ئەسمەری لاق ئەستوری گۆشتن بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوایە ڕوونی کەرەوە))، ئینجا کەمنداڵەکەی بوو لەو پیاوە دەچوو کە مێردی ژنەکە وتی: لەگەڵ ژنەکەی دیویەتی، ئیتر پێغەمبەر ﷺ لە نێوانیاندا نەفرین کردنی ئەنجامدا.**

**ئینجا پیاوێ لە کۆڕەکەدا بەئیبنو عەبباس ﷺ وت: ئایا ئەو ژنە ئەوە بوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکم بە بێ شایەت بەرد باران بکردایە ئەم ژنەم بەرد باران دەکرد))، ئیبنو عەبباس وتی: نەخێر ئەوە ژنێك بوو لە ناوی مسوڵمانانددا بە ئاشکرا زینای دەکرد، (بەڵام شایەت نەبوو لەسەری).**

## ٤٤- بابُ رَمْيِ الْمُحْصَنَاتِ

وقول الله: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾ النور، ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ النور.

٦٨٥٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي الغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: «الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ المُحْصَنَاتِ المُؤْمِنَاتِ الغَافِلاَتِ»[1].

## ٤٤- باسی (حوکمی) بوختانی زینا کردن بۆ ئافرەتانی داوێن پاک

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە ئەوانەی کەبوختانی زینا دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك لە پاشان چوار شایەت ناهێنن[2]، ئەوە هەشتا داریان لێ بدەن و هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، وە ئەوانە لە سنوور دەرچوون، جگە لەوانەی کە دوای ئەوە تەوبە دەکەن و کردەوەی چاك دەکەن، ئەوسا بەڕاستی خوا لێخۆش بووی بەبەزەییە) (بێگومان ئەوانەی بوختانی زینا دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی بێ ئاگای ئیماندار، نەفرینیان لێ کراوە لە دونیاو دوا ڕۆژدا، وە سزای زۆر گەورەیان بۆ هەیە)**

**٦٨٥٧- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خۆتان بەدوور بگرن لە حەوت تاوانە لەناوبەرەکە)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو تاوانانە کامانەن؟ فەرمووی: ((هاوبەش دانان بۆ خوا و جادوو کردن و کوشتنی ئەو کەسەی کە خوا قەدەغەی کردوە مەگەر هەق بێ بکوژرێت و سووخۆری و خواردنی ماڵی هەتیوو هەڵهاتن لە ڕۆژی جەنگ و ڕوو بە ڕووبوونەوەدا و بوهتانکردن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی و باوەڕداری بێ ئاگا (کە زینای کردوە) )).**

---

(١) بڕوانە: ٢٧٦٦.

(٢) لەسەر ڕاستی بوختانەکەیان.

## ٤٥- بابُ قَذْفِ العَبِيدِ

٦٨٥٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّد، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ فُضَيْلِ بْنِ غَزْوَانَ، عَنِ ابْنِ أَبِي نُعْمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ قَذَفَ مَمْلُوكَهُ وَهْوَ بَرِيءٌ مِمَّا قَالَ جُلِدَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ كَمَا قَالَ».

## ٤٥- باسی (حوكمی) بوختانی زینا كردن بۆ كۆیلەیان

**٦٨٥٨- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: لە ئەبو لقاسیمم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەر كەس كۆیلەكەی تۆمەتبار بكات بەزینا لە كاتێكدا ئەوكۆیلەیە پاك بێت لەو تاوانەی ئەو وتوویەتی، لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو كەسە جەڵدی لێ دەدرێ مەگەر كۆیلەكە بەوجۆرە بێت كە ئەو وتوویەتی (دەربارەی) )).**

## ٤٦- بابٌ: هَلْ يَأْمُرُ الإِمَامُ رَجُلاً فَيَضْرِبُ الحَدَّ غَائِبًا عَنْهُ؟

وَقَدْ فَعَلَهُ عُمَرُ ﷺ.

٦٨٥٩- ٦٨٦٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ قَالاَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَنْشُدُكَ اللَّهَ إِلاَّ قَضَيْتَ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ. فَقَامَ خَصْمُهُ -وَكَانَ أَفْقَهَ مِنْهُ- فَقَالَ: صَدَقَ، اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ، وَأْذَنْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «قُلْ». فَقَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا فِي أَهْلِ هَذَا فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَخَادِمٍ، وَإِنِّي سَأَلْتُ رِجَالاً مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ فَأَخْبَرُونِي أَنَّ عَلَى ابْنِي جَلْدَ مِائَةٍ وَتَغْرِيبَ عَامٍ، وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ. فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ، المِائَةُ وَالْخَادِمُ رَدٌّ عَلَيْكَ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَيَا أُنَيْسُ اغْدُ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا فَسَلْهَا، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا». فَاعْتَرَفَتْ فَرَجَمَهَا[1].

---

(١) بروانه: ٢٣١٤، ٢٣١٥.

# ٤٦- باسێک: ئایا پێشەوا فەرمان بەپیاوێک دەکات سزای شەرعی بدات لە کەسێک کە لای پێشەوا نەبێت[1]

٦٨٥٩-٦٨٦٠- ئەبو هورەیرە و زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ هەردووكیان دەڵێن: پیاوێكی عەرەبی دەشتەكی هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: سوێندت دەدەم بە خوا تەنها بەكتێبەكەی خوا بڕیاربدە لە نێوانماندا، سكاڵاكەرەكەی بەرانبەر هەستا و- لەو تێگەشتوتر بوو- وتی: ڕاست دەكات بەكتێبەكەی خوا بڕیاربدە لە نێوانماندا، وە ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتی من بدە (قسە بكەم)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((قسە بكە)) وتی: بێگومان كوڕەكەی من ڕەنجبەر بووە لە ماڵی ئەم پیاوەدا و زینای كردوە لەگەڵ خێزانەكەیدا، منیش سەد سەر مەڕ و خزمەتكارێك (كەنیزەكێك) بریتیم داوە پێی (تا كوڕەكەم بەردباران نەكرێ)، وە من پرسیارم لە كەسانێكی زاناكردوە وتیان: كوڕەكەت سەد شەلاق و یەك ساڵ دوور خستنەوەی لەسەرە، وە بێگومان ژنی ئەم پیاوەش بەردباران كردنی لەسەرە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە بەكتێبەكەی خوا بڕیار دەدەم لە نێوانتاندا، سەد مەڕەكە و خزمەتكارەكە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ تۆ، كوڕەكەشت سەد شەلاق و یەك ساڵ دوور خستنەوەی لەسەرە، وە تۆش ئونەیس (بەپیاوێكی فەرموو) بەیانی بڕۆ بۆ لای ژنی ئەم پیاوە و پرسیاری لێ بكە، ئەگەر پێی نا لە زیناكەی ئەوە بەردبارانی بكە))، (ئونەیسیش بەیانیەكەی ڕۆشت بۆ لای ئافرەتەكە و) دانی نا بەزیناكەیدا، ئونەیسیش بەردبارانی كرد.

(١) واتە: لە شوێنێكی تر و شار و وڵاتێكی تر بێت غەیری شوێنی پێشەوا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٨٧- كِتَابُ الدِّيَاتِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٨٧- پەڕاوی خوێنبایی [١]

### ١- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴾ النساء.

٦٨٦١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَكْبَرُ عِنْدَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَنْ تَدْعُوَ لِلَّهِ نِدًّا وَهْوَ خَلَقَكَ». قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ». قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ». فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ تَصْدِيقَهَا: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ﴾ الآيَةَ، الفرقان[٢].

## ١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە هەر کەسێک باوەڕدارێک بەدەس ئەنقەست بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە)

**٦٨٦١- عەبدوڵڵا [٣] ﷺ دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ: کام تاوانە لای خوا گەورەترە؟ فەرمووی: ((ئەوە کە هاوار لە شتێك بکەیت وەك خوا، لە**

(١) خوێنبایی: ماڵ و سامانێکە دەدرێ لە بری تاوانی کوشتنی کەسێک یان لە دەستدانی ئەندامێکی لاشەی. بڕوانە: فەرهەنگی خاڵ: ل ١٦٨.
(٢) بڕوانە: ٤٤٧٧.
(٣) ئەم فەرموودە دوو ڕێگەی هەیە کە پێی گێردراوەتەوە.

**کاتێکدا ئەو (خوا) تۆی دروستکردوە))، وتی: لە پاشان چی تر (گەورەیە)؟ فەرمووی: ((پاشان ئەوە کە منداڵەکەت بکوژیت لە ترسی ئەوەی کە لەگەڵتدا خواردن بخوات))، وتی: لە پاشان چی تر (گەورەیە)؟ فەرمووی: ((ئەوە کە زینا بکەیت لەگەڵ هاوسەر و حەلاڵی دراوسێکەتدا)).**

**(عەبدوڵڵا وتی:) ئیتر خوای ﷻ ئەم ئایەتە دابەزاند وەك پشت ڕاست کردنەوە بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ: (وە (بەندە تایبەتەکانی خوای میهرەبان) کەسانێکن هیچ پەرستراوێك لەگەڵ خوادا ناپەرستن، وە هیچ کەسێ کە خوا کوشتنی ئەوی یاساغ (حەرام) کردوە بە هەق و ڕەوا نەبێ ناکوژن، وە زیناو داوێن پیسی ناکەن، وە هەر کەس ئەو تاوانانە بکات (کە باسکران) ) تا کۆتایی ئایەتەکە.**

٦٨٦٢- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ سَعِيدِ بْنِ العَاصِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَنْ يَزَالَ المُؤْمِنُ فِي فُسْحَةٍ مِنْ دِينِهِ، مَا لَمْ يُصِبْ دَمًا حَرَامًا»[1].

**٦٨٦٢- ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەردەوام باوەڕدار لە فراوانی ئاینەکەیایەتی، هەتا تووشی خوێنێکی حەرام نەبێت[2])).**

٦٨٦٣- حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ يَعْقُوب، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: إِنَّ مِنْ وَرْطَاتِ الأُمُورِ الَّتِي لاَ مَخْرَجَ لِمَنْ أَوْقَعَ نَفْسَهُ فِيهَا سَفْكَ الدَّمِ الْحَرَامِ بِغَيْرِ حِلِّهِ[3].

**٦٨٦٣- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: بێگومان لەو گرفتاریانەی کە هەر کەس خۆی بخاتە ناویەوە دەرچوونی نییە ڕشتنی خوێنی حەرامە بەناڕەوا.**

---

(١) بڕوانە: ٦٨٦٣.

(٢) واتە: هەتا بەناهەق کەسێک نەکوژێت حاڵی باشە، بەڵام کە خوێنی ناهەق کەوتە ملی ئیتر باوەڕەکەی لە مەترسی دایە.

(٣) بڕوانە: ٦٨٦٢.

٦٨٦٤- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ»[1].

**٦٨٦٤- ئەعمەش دەگێڕێتەوە لە ئەبو وائیلەوە ئەویش لە عەبدوڵلاوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: ((یەکەم شتێك لە نێوان خەڵكدا (لە قیامەتدا) دادگای تیادا دەکرێت، لەو خوێنانە دایە لە دونیادا ڕژێنراون).**

٦٨٦٥- حَدَّثَنَا عَبْدَان، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنَا عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ، أَنَّ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَدِيٍّ حَدَّثَهُ، أَنَّ الْمِقْدَادَ بْنَ عَمْرٍو الْكِنْدِيَّ حَلِيفَ بَنِي زُهْرَةَ حَدَّثَهُ -وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ لَقِيتُ كَافِرًا فَاقْتَتَلْنَا، فَضَرَبَ يَدِي بِالسَّيْفِ فَقَطَعَهَا، ثُمَّ لاَذَ بِشَجَرَةٍ وَقَالَ: أَسْلَمْتُ لِلَّهِ. آقْتُلُهُ بَعْدَ أَنْ قَالَهَا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَقْتُلْهُ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنَّهُ طَرَحَ إِحْدَى يَدَيَّ، ثُمَّ قَالَ بَعْدَ مَا قَطَعَهَا، آقْتُلُهُ؟ قَالَ: «لاَ تَقْتُلْهُ، فَإِنْ قَتَلْتَهُ فَإِنَّهُ بِمَنْزِلَتِكَ قَبْلَ أَنْ تَقْتُلَهُ، وَأَنْتَ بِمَنْزِلَتِهِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ كَلِمَتَهُ الَّتِي قَالَ»[2].

**٦٨٦٥-عەتای کوڕی یەزید گێڕایەوە کە عوبەیدوڵلای کوڕی عەدیی بۆی گێڕایەوە کە میقدادی کوڕی عەمری کیندیەوە-کە سوێند خۆر و هاوپەیمانی بەنی زوهرە بوو، وە لەو کەسانە بوو لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری غەزای بەدری کردوە - بۆی گێڕایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر گەشتم بە پیاوێ لە کافران لەگەڵ یەکتری بە جەنگ هاتین، ئینجا بە شمشێر دای لە باڵێکم و پەڕاندی، پاشان پەنای برد بۆ درەختێك (خۆی قوتار کرد لە من) وتی: مسوڵمان بووم و خۆم تەسلیمی خوا کرد، دوا ئەوەی کە وای ووت ئایا**

(١) بڕوانە: ٦٥٣٣.

(٢) بڕوانە: ٤٠١٩.

بیكوژم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((مەیكوژە))، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ئەو باڵێكمی پەڕاند دوای پەڕاندن، ئەوەی ووت (مسوڵمان بوو پاش ئەوەی باڵی پەڕاندنم )، ئایا بیكوژم؟ فەرمووی: ((مەیكوژە، چونكە ئەگەر بیكوژی ئەوە بەڕاستی وەك تۆ وایە پێش ئەوەی ئەو بكوژیت، وە تۆش وەك ئەو وایت پێش ئەوەی ئەو ووتەی وتی بیڵێ [1])).

٦٨٦٦ - وَقَالَ حَبِيبُ بْنُ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلْمِقْدَادِ: «إِذَا كَانَ رَجُلٌ مُؤْمِنٌ يُخْفِي إِيمَانَهُ مَعَ قَوْمٍ كُفَّارٍ فَأَظْهَرَ إِيمَانَهُ فَقَتَلْتَهُ، فَكَذَلِكَ كُنْتَ أَنْتَ تُخْفِي إِيمَانَكَ بِمَكَّةَ مِنْ قَبْلُ».

٦٨٦٦- حەبیبی كوڕی ئەبی عەمرە لە سەعیدەوە دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەمیقدادی فەرموو: ((ئەگەر پیاوێك باوەڕداربوو لەوانەی باوەڕەكەی شاردبوویەوە لەگەڵ كەسانێكی بێ باوەڕدابوو، ئیبجا باوەڕەكەی ئاشكرا كرد و تۆ كوشتت، جا تۆ خۆشت لە پێشدا لە مەككە باوەڕەكەت دەشاردەوە)).

## ٢- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَمَنْ أَحْيَاهَا ﴿٣٢﴾ ﴾ المائدة

قَالَ ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: حَرَّمَ قَتْلَهَا إِلَّا بِحَقٍّ ﴿ فَكَأَنَّمَا أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴿٣٢﴾ ﴾ المائدة[2] حَيِيَ النَّاسُ مِنهُ جَمِيعاً.

٦٨٦٧- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُقْتَلُ نَفْسٌ إِلاَّ كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْهَا»[3].

---

(١) پێش ئەوەی مسوڵمان ببێ.

(٢) لە ریوایەتی الأصيلي وأبي ذر دا ئەم زیادەیە هەیە: ﴿ فَكَأَنَّمَا أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴿٣٢﴾ ﴾ المائدة.

(٣) بڕوانە: ٣٣٣٥.

## ٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە هەر کەس کەسێک لە کوژران ڕزگار بکات)

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: واتە: کەسێك کوشتنی حەرام کرابێت مەگەر بەهەق[1] (ئەوە وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکی لە کوشتن ڕزگار کردبێت)، وە (ئەگەر کەسێك هیچ کەس نەکوژێت وەك ئەوە وایە)، هەموو خەڵکی لە لایەن ئەوەوە لە کوشتن ڕزگار کردبێت.**

**٦٨٦٧- عەبدوڵڵا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هیچ کەسێك بە ستەم ناکوژرێت، مەگەر بەشێك لە خوێن و تاوانەکەی لە گەردنی کوڕی یەکەمی[2] ئادەم دایە)).**

٦٨٦٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: وَاقِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَخْبَرَنِي، عَنْ أَبِيهِ، سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِب بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[3]

**.٦٨٦٨- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لە پاش من کافر مەبنەوە هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکتان)).**

٦٨٦٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ مُدْرِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا زُرْعَةَ بْنَ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ: «اسْتَنْصِتِ النَّاسَ، لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[4]. رَوَاهُ أَبُو بَكْرَةَ وَابْنُ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

---

(١) لە تۆڵەی کوشتندا بکوژرێتەوە.

(٢) قابیل کە هابیلی برای کوشت.

(٣) بڕوانە: ١٧٤٢.

(٤) بڕوانە: ١٢١.

**٦٨٦٩- عەلی کوڕی مودریك دەڵێ: لە ئەبو زورعەی کوڕی عەمری کوڕی جەریرم بیست گێڕایەوە لە جەریرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا فەرمووی: ((خەڵك بێ دەنگ بکە، دوای (مردنی) من کافر مەبنەوە هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکی ترتان)). ئەبو بەکرە و ئیبنو عەبباس ﷺ ئەم فەرموودەیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.**

٦٨٧٠- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ فِرَاسٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْكَبَائِرُ الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ». أَوْ قَالَ: «الْيَمِينُ الْغَمُوسُ». شَكَّ شُعْبَةُ. وَقَالَ مُعَاذٌ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: «الْكَبَائِرُ الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ». أَوْ قَالَ: «وَقَتْلُ النَّفْسِ»[1].

**٦٨٧٠-عەبدوڵڵای کوڕی عەمەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((گوناهە گەورەکان (ئەمانەن): هاوبەش دانان بۆ خوا و سەرپێچی و ئازار دانی دایك و باوك))، یان فەرمووی: ((سوێند خواردنی درۆ و هەڵبەستراو))، شوعبە گومانی بردووە (لە نێوان ئەو دوو ڕستەیەدا). وە موعاز وتی: شوعبە بۆی گێڕاینەوە فەرمووی: ((گوناهە گەورەکان (ئەمانەن): هاوبەش دانان بۆ خوا و سوێند خواردنی درۆ و هەڵبەستراو و سەرپێچی و ئازار دانی دایك و باوك))، یان فەرمووی: ((وە کوشتنی مرۆڤ[2])).**

٦٨٧١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، سَمِعَ أَنَسًا ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْكَبَائِرُ». وَحَدَّثَنَا عَمْرٌو،حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ

(١) بڕوانە: ٦٦٧٥.

(٢) بەناهەق و نارەوا.

ابْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَكْبَرُ الْكَبَائِرِ الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ، وَقَوْلُ الزُّورِ». أَوْ قَالَ: «وَشَهَادَةُ الزُّورِ»[1].

**٦٨٧١- شوعبە وتی: عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر بۆی گێڕاینەوە کە لە ئەنەسی کوڕی مالیکی ﷺ بیست ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((گوناهە گەورەکان))، وە عەمر بۆی گێڕاینەوە وتی: شوعبە بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو ئەبی بەکرەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((گەورەترینی تاوانە گەورەکان هاوبەش دانانە بۆ خوا و، کوشتنی مرۆڤ[2] و سەرپێچی کردنی دایك و باوك و وتەی درۆ)) یان فەرمووی: ((وە شایەتی دانی درۆ)).**

٦٨٧٢- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ، حَدَّثَنَا أَبُو ظَبْيَانَ قَالَ: سَمِعْتُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ ﷺ يُحَدِّثُ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الحُرَقَةِ مِنْ جُهَيْنَةَ. قَالَ: فَصَبَّحْنَا الْقَوْمَ فَهَزَمْنَاهُمْ. قَالَ: وَلَحِقْتُ أَنَا وَرَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ رَجُلاً مِنْهُمْ. قَالَ: فَلَمَّا غَشِينَاهُ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. قَالَ: فَكَفَّ عَنْهُ الأَنْصَارِيُّ، فَطَعَنْتُهُ بِرُمْحِي حَتَّى قَتَلْتُهُ. قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا بَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: فَقَالَ لِي: «يَا أُسَامَةُ، أَقَتَلْتَهُ بَعْدَ مَا قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ؟». قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا كَانَ مُتَعَوِّذًا. قَالَ: «أَقَتَلْتَهُ بَعْدَ أَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ؟». قَالَ: فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا عَلَيَّ حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ أَسْلَمْتُ قَبْلَ ذَلِكَ اليَوْمِ[3].

**٦٨٧٢- ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریسە ﷺ گێڕایەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردینی بۆسەر حورەقە (قەبیلەیەکە) لە جوهەینە، دەڵێ: بەیانی زوو دامان بەسەریاندا شکانمان و هەڵاتن، دەڵێ: من و پیاوێکی ئەنصاری گەشتین**

(١) بڕوانە: ٢٦٥٣.
(٢) بەناڕەوا و بێ ئەوە کەسێکی کوشتبێ بە ناهەق.
(٣) بڕوانە: ٤٢٦٩.

**بە پیاوێك لەوان[1] دەڵێ: كە پێی گەیشتین (و درەتانی نەما) وتی:** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) **دەڵێ: پیاوە ئەنصارییەكە وازی لێ هێنا، بەلام من بە ڕمەكەم لێمدا هەتا كوشتم، جا كە هاتینەوە (بۆ مەدینە) هەواڵەكە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتبوو، فەرمووی: ((ئەی ئوسامە ئایا دوای ئەوە وتی:** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) **تۆ كوشتت؟)) دەڵێ: وتم: بەڕاستی بۆ خۆ پاراستنی بوو (لە مردن)، فەرمووی: ((ئایا دوای ئەوە وتی:** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) **تۆكوشتت؟)) وتی: جا بەردەوام دووبارەی دەكردەوە بۆم، هەتا خۆزگەی ئەوەم خواست كە لە پێش ئەو ڕۆژەدا مسوڵمان نەبوومایە.**

٦٨٧٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنِ الصُّنَابِحِيِّ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه قَالَ: إِنِّي مِنَ النُّقَبَاءِ الَّذِينَ بَايَعُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَايَعْنَاهُ عَلَى أَنْ لاَ نُشْرِكَ بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ نَسْرِقَ وَلاَ نَزْنِيَ، وَلاَ نَقْتُلَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ، وَلاَ نَنْتَهِبَ، وَلاَ نَعْصِيَ، بِالْجَنَّةِ إِنْ فَعَلْنَا ذَلِكَ، فَإِنْ غَشِينَا مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا كَانَ قَضَاءُ ذَلِكَ إِلَى اللهِ[2].

**٦٨٧٣- صونابیحیی لە عوبادەی كوڕی صامیتەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە كە وتویەتی: بێگومان من لەو نەقیبانە بووم كە پەیمانیان بە پێغەمبەری خوادا ﷺ، پەیمانمان پێدا لەسەر ئەوەی كە هیچ هاوبەشێك بۆ خوا بڕیار نەدەین، وە دزی نەكەین و داوێن پیسی نەكەین، وە ئەو كەسەی خوا كوشتنی ئەوی حەرام كردوە نەیكوژین، وە تالانی نەكەین و سەرپێچی (خوا و پێغەمبەر ﷺ) نەكەین لە بەرامبەر (ی پێدانی) بەهەشتدا ئەگەر ئەو شتانەمان كرد، وە ئەگەر هەركام لەو شتانەمان كرد (كە قەدەغە كراوە لێمان) ئەو بڕیاری ئەوە لای خوایە.**

---

(١) كە ناوی میرداسی كوڕی عەمر فەدەكی بوو، یان میرداسی كوری نوهەیكی فوزاری بوو. بڕوانە: إرشاد الساري: ٢٨٢/١٤.

(٢) بڕوانە: ١٨.

٦٨٧٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا»[١]. رَوَاهُ أَبُو مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٦٨٧٤- عەبدوڵڵا ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاپەوە فەرمووی: ((هەر کەسێك چەك له دژمان هەڵگرێت ئەوە له ئێمه نییه)). ئەبو مووساش ﷺ ئەم فەرموودەی له پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.**

٦٨٧٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْمُبَارَكِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ وَيُونُسُ، عَنِ الحَسَنِ، عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: ذَهَبْتُ لأَنْصُرَ هَذَا الرَّجُلَ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قُلْتُ: أَنْصُرُ هَذَا الرَّجُلَ. قَالَ: ارْجِعْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: «إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ»[٢].

**٦٨٧٥- حەسەن گێڕاپەوە له ئەحنەف کوڕی قەیسەوە وتی: ڕۆشتم تا یارمەتی ئەو پیاوە بدەم (له جەنگی جەمەلدا)، جا ئەبو بەکرەم پێ گەیشت وتی: دەتەوێ بۆ کوێ بڕۆیت؟ وتم: یارمەتی ئەو پیاوە، (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) دەدەم، وتی: بگەڕێرەوە چونکه بێگومان له پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر دوو مسوڵمان به شمشێرەکانیان[٣] ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە (بۆ جەنگ لەگەڵ یەکتری)، ئەوە بکوژ و کوژراو له ئاگری دۆزەخدان)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بکوژەکه دەچێته دۆزەخەوە، ئەی کوژراوەکه لەبەر چی، تاوانی چییه؟ فەرمووی: ((بێگومان ئەویش سوور بووە لەسەر کوشتنی براکەی (بۆیه دەچێته دۆزەخەوە) )).**

---

(١) بڕوانه: ٧٠٧٠.

(٢) بڕوانه: ٣١.

(٣) یان هەر چەکێکی دیکه.

**٣- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ۖ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ ۚ فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَىْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ ۗ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ ۗ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٨﴾ ﴾ **البقرة**

## ٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە تۆڵە سەندن لە کوژراواندا (بەیەکسانی) پێویست کراوە لەسەرتان، ئازاد بە ئازاد و بەندە بە بەندە و ژن بە ژن (مێینە بە مێینە)، ئینجا هەر کەسێک لە لایەن برایەکی دینیەوە بە بەشێک (لە خوێنەکە) بەخشرا دەبێ (خزمەکانی) پەیڕەوی بکەن بەباشی، (بکوژیش) بەچاکی خوێنەکە بدات، ئەم سووک کردنە لە پەروەردگارتانەوەیە و میهرەبانییە، ئینجا هەر کەسێک دوای ئەمە دەست درێژی کرد، ئەوە سزای بەسۆی بۆ هەیە)

## ٤- بابُ سُؤَالِ القَاتِلِ حَتَّى يُقِرَّ، وَالإِقْرَارِ فِي الْحُدُودِ

٦٨٧٦- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ يَهُودِيًّا رَضَّ رَأْسَ جَارِيَةٍ بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَقِيلَ لَهَا: مَنْ فَعَلَ بِكِ هَذَا؟ أَفُلَانٌ أَوْ فُلَانٌ؟ حَتَّى سُمِّيَ اليَهُودِيُّ، فَأُتِيَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَلَمْ يَزَلْ بِهِ حَتَّى أَقَرَّ بِهِ، فَرُضَّ رَأْسُهُ بِالْحِجَارَةِ[1].

(١) بروانە: ٢٤١٣.

## ٤- باسی پرسیارکردن (ی پێشەوا) لە بکوژ [١] هەتا پێی لە تاوانەکەی بنێت، وە دانپیانانلە سزا شەرعیەکاندا

**٦٨٧٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کەپیاوێکی جوولەکە سەری کەنیزەکێك لەنیوان دوو بەردا تێك دەشکێنێ، بەکەنیزەکەکە ووترا: کێ وای لێکردوویت؟ ئایا فلان کەس بوو؟ ئایا فلان کەس بوو؟ هەتا ناوی پیاوە جوولەکەکە هێنرا (بەسەری ئاماژەی کرد بەڵێ ئەو بووە)، ئینجا هێنرا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ جا بەردەوام هەوڵی لەگەڵ درا هەتا دانی بە تاوانەکەیدا نا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد سەری لە نێوان دوو بەردا تێکشکێنرا.**

## ٥- بابٌ: إِذَا قَتَلَ بِحَجَرٍ أَوْ بِعَصًا

٦٨٧٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ جَدِّهِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: خَرَجَتْ جَارِيَةٌ عَلَيْهَا أَوْضَاحٌ بِالْمَدِينَةِ قَالَ: فَرَمَاهَا يَهُودِيٌّ بِحَجَرٍ. قَالَ: فَجِيءَ بِهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَبِهَا رَمَقٌ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: «فُلاَنٌ قَتَلَكِ». فَرَفَعَتْ رَأْسَهَا، فَأَعَادَ عَلَيْهَا قَالَ: «فُلاَنٌ قَتَلَكِ». فَرَفَعَتْ رَأْسَهَا، فَقَالَ لَهَا فِي الثَّالِثَةِ: «فُلاَنٌ قَتَلَكِ». فَخَفَضَتْ رَأْسَهَا، فَدَعَا بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَتَلَهُ بَيْنَ الحَجَرَيْنِ[٢].

## ٥- باسێک: ئەگەر (کەسێک کەسێکی) کوشت بەبەرد یان بەدار [٣]

**٦٨٧٧- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: کچێك [٤] لە مەدینە چووە دەرەوە هەندێ خشڵی زیوی پێوەبوو، دەڵێ: جوولەکەیەك بەردێکی بۆ هاویشت،**

(١) واتە: ئەوەی تاوانبارە بەکوشتن.
(٢) بڕوانە: ٢٤١٣.
(٣) ئایا هەر بە بەرد و دارەکە دەکوژرێتەوە یان بە شمشێر یان فیشەک و سێدارە.
(٤) کەنیزەکێک یا کچێکی ئازاد کە تەمەنی نەگەشتبوویە باڵغ بوون.

(ئەنەس) دەڵێ: ئینجا کچەکە هێنرا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ هێشتا گیانی تیامابوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێی: ((فڵان کەس کوشتیتی؟)) کچەکەش سەری بەرزکردەوە، جارێکی تر لێی دووبارە کردەوە فەرمووی: ((فڵان کەس کوشتیتی؟)) سەری بەرزکردەوە، پێغەمبەر ﷺ لە سێیەم جاردا فەرمووی: ((فڵان کەس کوشتیتی؟)) ئینجا سەری نزم کردەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەشوێنیدا و بانگی کرد و لە نێوان دوو بەردا کوشتی[1].

### ٦- بابُ قَوْلِ الله تَعَالَى: ﴿ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ المائدة

٦٨٧٨- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالْمَارِقُ مِنَ الدِّينِ التَّارِكُ الْجَمَاعَةَ»

## ٦- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: ((لە تەوراتدا نووسیمان پێویستمان کرد لەسەریان) کە بێگومان هەر کەسێک بەدەستی ئەنقەست کەسێک بکوژێ ئەکوژرێتەوە لەباتیدا، وە چاو لە باتی چاو وە لووت لەباتی لووت وە گوێچکە لەباتی گوێچکە وە ددان لەباتی ددان، وە زامەکانیش تۆڵەیان زامدارکردنی

(١) واتە: سەری خستە نێوان دوو بەردەوە و کوشتی، چونکە جوولەکەکە بەو جۆرە کچەکەی کوشتبوو وەک لە گێرانەوەکانی تری ئەم فەرموودەدا هاتووە.

دەست درێژکەرانە، جا هەر کەس لە تۆڵەسەندن خۆش بێت ئەوە ئەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهی، وە هەر کەسێ حوکم نەکات بەوەی کە خودا ناردوویەتیە خوارەوە ئەوا هەر ئەو کەسانە ستەمکاری تەواون)

**٦٨٧٨- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوێن ڕشتنی مرۆڤی مسوڵمان دروست نییە کەشایەتی بدات هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا، (وە شایەتی بدات) منیش پێغەمبەری خوام بەیەکێك لەم سێ تاوانە نەبێت: کەسێك لە بەرانبەر کەسێکدا (دەکوژرێتەوە)[1] و ژن و پیاوی زیناکەر و دەرچوو لە ئاینی ئیسلام و وازهێنەر لە مسوڵمانان)).**

## ٧- بابُ مَنْ أَقَادَ بِالْحَجَرِ

٦٨٧٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ يَهُودِيًّا قَتَلَ جَارِيَةً عَلَى أَوْضَاحٍ لَهَا، فَقَتَلَهَا بِحَجَرٍ، فَجِيءَ بِهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَبِهَا رَمَقٌ، فَقَالَ: «أَقَتَلَكِ فُلاَنٌ؟». فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَنْ لاَ، ثُمَّ قَالَ الثَّانِيَةَ، فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَنْ لاَ، ثُمَّ سَأَلَهَا الثَّالِثَةَ فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَنْ نَعَمْ، فَقَتَلَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِحَجَرَيْنِ[2].

## ٧- باسی کەسێک بەبەرد (بکوژ) بکوژێتەوە

**٦٨٧٩- هیشام لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کەجوولەکەیەك کچێکی [3] کوشت لە پێناو هەندێ خشڵی زیو کە پێوەبوو، بەردێکی (بۆ هاویشت) کوشتی، ئینجا کچەکە هێنرا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ هێشتا گیانی تیامابوو، پێغەمبەر ﷺ**

(١) واتە: کەسێکی بکوژ لە بەرانبەر کوشراوەکەدا دەکوژرێتەوە.
(٢) بڕوانە: ٢٤١٣.
(٣) کەنیزەکێک یا کچێکی ئازاد کە تەمەنی نەگەشتبوویە باڵغ بوون.

**فەرمووی پێی: ((فلان كەس كوشتیتی؟)) كچەكەش بەسەری ئاماژەی كرد نەخێر، بۆ جاری دووەم فەرمووی: كچەكەش بەسەری ئاماژەی كرد نەخێر، لە سێیەم جاردا پرسیاری لێ كرد (فەرمووی: فلان كەس كوشتیتی؟) كچەكەش بە سەری ئاماژەی كرد بەڵێ، ئەوسا پێغەمبەریش ﷺ بە دوو بەرد كوشتی [(١)].**

## ٨- بابٌ: مَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ

٦٨٨٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ خُزَاعَةَ قَتَلُوا رَجُلاً. وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَجَاءٍ: حَدَّثَنَا حَرْبٌ، عَنْ يَحْيَى، حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَّهُ عَامَ فَتْحِ مَكَّةَ قَتَلَتْ خُزَاعَةُ رَجُلاً مِنْ بَنِي لَيْثٍ بِقَتِيلٍ لَهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الفِيلَ وَسَلَّطَ عَلَيْهِمْ رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، أَلاَ وَإِنَّهَا لَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَلاَ تَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدِي، أَلاَ وَإِنَّمَا أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، أَلاَ وَإِنَّهَا سَاعَتِي هَذِهِ حَرَامٌ، لاَ يُخْتَلَى شَوْكُهَا، وَلاَ يُعْضَدُ شَجَرُهَا، وَلاَ يَلْتَقِطُ سَاقِطَتَهَا إِلاَّ مُنْشِدٌ، وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهْوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ: إِمَّا يُودَى، وَإِمَّا يُقَادُ». فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ يُقَالُ لَهُ أَبُو شَاهٍ فَقَالَ: اكْتُبْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اكْتُبُوا لأَبِي شَاهٍ». ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِلاَّ الإِذْخِرَ، فَإِنَّمَا نَجْعَلُهُ فِي بُيُوتِنَا وَقُبُورِنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِلاَّ الإِذْخِرَ». وَتَابَعَهُ عُبَيْدُ اللَّهِ عَنْ شَيْبَانَ فِي الفِيلِ، قَالَ بَعْضُهُمْ، عَنْ أَبِي نُعَيْمٍ: "الْقَتْلَ". وَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ إِمَّا أَنْ يُقَادَ أَهْلُ الْقَتِيلِ[(٢)].

---

(١) واتە: فەرمانی كرد لە نێوان دوو بەرددا كوژرا، وەک لە گێڕانەوەكەی پێشوودا هاتووە.

(٢) بڕوانە: ١١٢.

## ٨- باسێک: کەسێک کەسێکی کوژرا ئەوە (واریسی کوژراوەکە) لە نێوان دوو شتدا سەرپشکە

٦٨٨٠-ئەبو هورەیرە[١] ﷺ دەڵێ: ساڵی ئازادکردنی مەککە خوزاعە پیاوێکیان لە بەنی لەیس کوشت لە بەرانبەر کوژراوێکیاندا کە لە سەردەمی نەفامیدا کوژرا بوو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و فەرمووی: ((بێگومان خوای گەورە بەرگری فیلەکانی کرد لە مەککە، (کەبەنیاز بوون کەعبە بڕوخێنن)، وە پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئیماندارانی زاڵ کرد بەسەریاندا، ئەوسا بزانن بۆ هیچ کەس پێش من حەڵاڵ نەبووە (بجەنگێ تێیدا) لە دوای منیش بۆ کەس حەڵاڵ نابێ، بێداربن بێگومان لە ساتێکی ڕۆژدا جەنگان بۆمن (تێیدا) حەڵاڵ کرا، بێداریشبن بەدڵنیاییەوە لەم کاتەوەی منی تێیدام (جەنگ کردن) حەرامە، دڕکی هەڵناکەنرێ و درەختی هەڵناپاچرێ شتی کەوتوو (لە خەڵك) هەڵناگیرێتەوە مەگەر کەسێ جاڕی بۆ بدات (خاوەنەکە بدۆزێتەوە)، هەر کەس کەسێکی کوژرا، ئەوە (کەس و کارەکەی) سەرپشکە لە نێوان ئەم دوو بڕیارەدا: یان خوێنی دەدرێت، یان دەکوژرێتەوە (لە لایەن کەس و کاری کوژراوەکەوە) ))، جا پیاوێکی یەمەنی کە پێی دەوترا ئەبو شاه هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو فەرموودەی خۆتم بۆ بنووسەرەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەو فەرموودە بنووسنەوە بۆ ئەبو شاه))، پاشان پیاوێکی قوڕەیشیش (کە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب بوو) هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە ئیزخیر، چونکە ئێمە دەیخەینە خانوو و گۆڕەکانمان. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((جگە لە ئیزخیر[٢])).

---

(١) ئەم فەرموودە بە دوو ڕشتە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە.

(٢) ئیزخیر: گیایەکی بۆن خۆشە دەخرێتە سەر دارەڕای خانوو بۆ گۆڕیش بە کاریان هێناوە.

**وه عوبەیدوڵلا لە شەیبانەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی حەربی کوڕی شەددادی کردوە کە بە ((الفِيل))[1] گێڕاویەتیەوە. وە کەسێکی تریان لە ئەبی نوعەیمەوە گێڕاویەتیەوە بە((القَتْل))[2].**

**وە عوبەیدوڵلا لە گێڕانەوەکەیدا بەم جۆرە گێڕاویەتیەوە: ((یان کەس و کاری کوژراوەکە بکوژەکە بکوژنەوە)).**

٦٨٨١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَتْ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ قِصَاصٌ، وَلَمْ تَكُنْ فِيهِمُ الدِّيَةُ، فَقَالَ اللَّهُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنثَى بِالْأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ ﴿١٧٨﴾﴾ البقرة. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَالْعَفْوُ أَنْ يَقْبَلَ الدِّيَةَ فِي العَمْدِ، قَالَ: ﴿فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ ﴿١٧٨﴾﴾ البقرة. أَنْ يَطْلُبَ بِمَعْرُوفٍ، وَيُؤَدِّيَ بِإِحْسَانٍ[3].

**٦٨٨١- ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: لە ڕابردوودا لە ناو نەوەی ئیسرائیلدا تۆڵە سەندن هەبوو، وە خوێن دان لە ناویاندا نەبوو، خوای گەورە بەم گەلەی فەرمووی: (تۆڵە سەندنەوە لە کوژراواندا (بە یەکسانی) لەسەرتان پێویست کراوە، ئازاد بە ئازاد و بەندە بە بەندە و ژن بە ژن (مێینە بە مێینە)، ئینجا هەر کەسێك بەخشرا لە لایەن برایەکی دینیەوە بە بەشێك (لە خوێنەکە)، ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: عەفوکردن و لێخۆشبوون ئەوەیە لە کوشتنی بە ئەنقەستدا (خاوەنی کوژراوەکە) بەخوێن ڕازی بێت. وە دەڵێ: ﴿فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ ﴿١٧٨﴾﴾**

---

(١) وەک لە دەقی فەرموودەکەدا هاتووە بەگێڕانەوەی حەربی کوڕی شەدداد.
(٢) لە گێڕانەوەی موحەممەدی کوڕی یەحیای زوهەلیدا هاتووە بە (القتل) لە باتی (الفيل).
(٣) بڕوانە: ٤٤٩٨.

البقرة، ئەوەیە کە (خاوەنی کوژراوەکە) بە جوانی داوای خوێنەکە بکات، وە (بکوژەکەش) خوێنەکە بە چاکی بدات.

## ٩- بابُ مَنْ طَلَبَ دَمَ امْرِئٍ بِغَيْرِ حَقٍّ

٦٨٨٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ، حَدَّثَنَا نَافِعُ بْنُ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَبْغَضُ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ ثَلاَثَةٌ: مُلْحِدٌ فِي الْحَرَمِ، وَمُبْتَغٍ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَمُطَّلِبُ دَمِ امْرِئٍ بِغَيْرِ حَقٍّ لِيُهَرِيقَ دَمَهُ».

## ٩- باسی (حوکمی) کەسێک بیەوێ خوێنی مرۆڤێک بڕژێت[1] بە ناهەق

٦٨٨٢- ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێزراوترین کەس لای خوا سێ کەسن: کەسێ تاوانی گەورە بکات لە حەرەمدا[2] وە کەسێك لە ئیسلامدا بیەوێ نەریتیەکی سەردەمی نەفامی جێ بەجێ بکات[3]، وە کەسێك بەناڕەوا بەدوای خوێنی مرۆڤێکدا بگەڕێت تا خوێنی بڕێژێت)).

## ١٠- بابُ العَفْوِ فِي الخَطَإِ بَعْدَ المَوْتِ

٦٨٨٣- حَدَّثَنَا فَرْوَةُ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ: هُزِمَ الْمُشْرِكُونَ يَوْمَ أُحُدٍ.

---

(١) واتە: بیەوێ بیکوژێت.

(٢) دەگونجێ بە بێ باوەڕیش مانا بکرێ بەڵام ئەو مانای سەرەوە ڕاسترە و ئیبنو حەجەریش لای ڕاسترە وە مەبەست بە حەرەمیش کەعبەیە (فتح الباری ١٥/٢٦٠).

(٣) وەک کوشتنەوەی باوک و برای بکوژ لە جیاتی بکوژەکە.

وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا أَبُو مَرْوَانَ يَحْيَى بْنُ أَبِي زَكَرِيَّاءَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: صَرَخَ إِبْلِيسُ يَوْمَ أُحُدٍ فِي النَّاسِ: يَا عِبَاد الله، أُخْرَاكُمْ. فَرَجَعَتْ أُولاَهُمْ عَلَى أُخْرَاهُمْ حَتَّى قَتَلُوا الْيَمَانَ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: أَبِي أَبِي. فَقَتَلُوهُ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: غَفَرَ اللَّهُ لَكُمْ. قَالَ: وَقَدْ كَانَ انْهَزَمَ مِنْهُمْ قَوْمٌ حَتَّى لَحِقُوا بِالطَّائِفِ[1].

## ١٠- باسی لێخۆشبوون (لە بكوژەكە) لە كوشتنی هەڵەدا و دوای مردنی (كوژراوەكە)

**٦٨٨٣- هیشام لەعوروەی باوكیەوە دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: هاوبەش دانەران لە ڕۆژی (غەزای) ئوحوددا شكان. عائیشە دەڵێ: ئیبلیس لە ڕۆژی (غەزای) ئوحوددا لەناو خەڵكەكەدا هاواری كرد و وتی: ئەی بەندەكانی خودا ئاگاداری دواوەی خۆتان بن (لە دژیان بجەنگن)، ئیتر ئەوانە پێشەوەیان (لە مسوڵمانان) گەڕانەوە بۆ (جەنگ لە دژی) ئەوانەی دواوەیان، یەمانیان كوشت، حوزەیفەش وتی: ئەوە باوكمە ئەوە باوكمە (مەیكوژن بەڵام ئەوان) كوشتیان، حوزەیفەش وتی: خوا لێتان خۆش بێت [2]، دەڵێ: بێگومان هەندێ لەو هاوبەش دانەرانەی شكێنرابوون كەسانێكیان تیابوو هەڵهاتن هەتا گەشتنە تائیف.**

(١) بڕوانە: ٣٢٩٠.

(٢) دوعای بۆ كردن و لە خوێنەكەشی خۆش بوو كە بەهەڵە كوشتیان.

**١١- بابُ قَوْلِ اللّٰه تَعَالَي:** ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ ﴾ **النساء**

١١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بۆ هیچ باوەڕدارێک ڕەوا نییە باوەڕدارێک بکوژێک مەگەر بە هەڵە، وە هەر کەسێک باوەڕدارێک بەهەڵە بکوژێت ئەوە ئازادکردنی کۆیلەیەکی باوەڕدار و (نرخی) خوێنێکیشی (لەسەرە) کە بیدات بە کەس و کاری کوژراوەکە، مەگەر بیبەخشن (لە خوێنەکەی)، بەڵام ئەگەر کوژراوەکە لە گەلێک بوو کە دوژمنتان بوون (کافری شەڕکەر بوون)، وە کوژراوەکە باوەڕدار بوو ئەوە ئازادکردنی بەندەیەکی باوەڕداری (لەسەرە)، وە ئەگەر (کوژراوەکە) لە گەلێک بوو کە لە نێوان ئێوە و ئەواندا پەیمان هەبوو ئەوە (نرخی) خوێنێک بدەنە کەسی کوژراوەکە لەگەڵ ئازادکردنی کۆیلەیەکی باوەڕدار، جا ئەو (بکوژ)ـەی دەستی نەکەوت (یان نەیبوو) ئەوە ڕۆژووگرتنی دوو مانگ لەسەریەکی (لەسەرە) ئەم (بڕیارە) لێ بووردنە لەلایەن خواوە، وە خوا هەمیشە زانای کار دروستە).

## ١٢- بابٌ: إِذَا أَقَرَّ بِالْقَتْلِ مَرَّةً قُتِلَ

٦٨٨٤- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا حَبَّانُ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ. حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ يَهُودِيًّا رَضَّ رَأْسَ جَارِيَةٍ بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَقِيلَ: لَهَا مَنْ فَعَلَ بِكِ هَذَا؟ أَفُلاَنٌ أَفُلاَنٌ؟ حَتَّى سُمِّيَ الْيَهُودِيُّ فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا، فَجِيءَ بِالْيَهُودِيِّ فَاعْتَرَفَ، فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَرُضَّ رَأْسُهُ بِالْحِجَارَةِ. وَقَدْ قَالَ هَمَّامٌ: بِحَجَرَيْنِ[1].

## ١٢- باسێک: ئەگەر کەسێک یەک جار دانی نا بەکوشتنەکەیدا پێی دەکوژرێتەوە

**٦٨٨٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی جوولەکە سەری کەنیزەکێکی لەنێوان دوو بەردا تێك دەشکێنێ، بەکەنیزەکەکە ووترا: کێ وای لێکردیت؟ ئایا فلان کەس بوو؟ ئایا فلان کەس بوو؟ هەتا ناوی پیاوە جوولەکەکە هێنرا ئەویش بەسەری ئاماژەی کرد، ئەنجا پیاوە جوولەکەکە هێنرا و دانی بەتاوانەکەیدا هێنا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد سەری جوولەکەکە بە بەرد تێکشکێنرا.**

**وە بێگومان هەممام (لە گێڕانەوەکەیدا دەڵێ ئەنەس) وتی: بە دوو بەرد (سەری جوولەکەکە تێکشکێنرا).**

## ١٣- بابُ قَتْلِ الرَّجُلِ بِالْمَرْأَةِ

٦٨٨٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَتَلَ يَهُودِيًّا بِجَارِيَةٍ قَتَلَهَا عَلَى أَوْضَاحٍ لَهَا[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٤١٣.

(٢) بڕوانە: ٢٤١٣.

## ١٣- باسی کوشتنەوەی پیاو لە بەرانبەر ئافرەتدا [1]

٦٨٨٥- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی جوولەکەی کوشت لە بەرانبەر کچێکدا کە کچەکەی کوشتبوو، لەبەر هەندێ خشڵی زیوی کچەکە.

## ١٤- بابُ القِصَاصِ بَيْنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ فِي الْجِرَاحَاتِ

وَقَالَ أَهْلُ الْعِلْمِ: يُقْتَلُ الرَّجُلُ بِالْمَرْأَةِ. وَيُذْكَرُ عَنْ عُمَرَ: تُقَادُ الْمَرْأَةُ مِنَ الرَّجُلِ فِي كُلِّ عَمْدٍ يَبْلُغُ نَفْسَهُ فَمَا دُونَهَا مِنَ الْجِرَاحِ. وَبِهِ قَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ وَإِبْرَاهِيمُ وَأَبُو الزِّنَادِ، عَنْ أَصْحَابِهِ. وَجَرَحَتْ أُخْتُ الرُّبَيِّعِ إِنْسَانًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْقِصَاصُ».

## ١٤- باسی تۆڵە سەندنەوە لە نێوان پیاوان و ئافرەتاندا دەربارەی برین و زامەکان

زانایان دەڵێن: پیاو لە جیاتی ژن دەکوژرێتەوە.

وە لە عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: ئافرەت دەکوژرێتەوە لە بەرانبەر (کوشتنی) پیاودا، لە هەموو کوشتنێکی بەدەستی ئەنقەست بگاتە گیانی پیاوەکە[2]، یان کەمتر لەوە بە لە دەست دانی ئەندامێکی.

وە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و ئیبراهیم و ئەبوزیناد لە هاوەڵەکانیەوە قسەکەی عومەری کوڕی خەتتاب دەکەن.

وە خوشکی ڕوبەییع[1] کەسێکی بریندار کرد، پێغەمبەریش فەرمووی: (( (لە قورئانەکەی خوادا) تۆڵەسەندنەوەیە)).

---

(١) واتە: ئافرەتێک بکوژرێت پیاوەکە دەکوژرێتەوە وەک تۆڵەی ئافرەتە کوژراوەکە.

(٢) واتە: کوژرابێت.

٦٨٨٦- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ أَبِي عَائِشَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَدَدْنَا النَّبِيَّ ﷺ فِي مَرَضِهِ، فَقَالَ: «لاَ تَلُدُّونِي». فَقُلْنَا: كَرَاهِيَةُ المَرِيضِ لِلدَّوَاءِ. فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ: «لاَ يَبْقَى أَحَدٌ مِنْكُمْ إِلاَّ لُدَّ، غَيْرَ الْعَبَّاسِ فَإِنَّهُ لَمْ يَشْهَدْكُمْ»[٢].

**٦٨٨٦- عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵلا لە عائیشەوە ﵂ گێڕایەوە وتی: لە نەخۆشییەکەیدا دەرمانمان کردە دەمی پێغەمبەر ﷺ ، ئەویش بەئاماژە فەرمووی پێمان: ((دەرمان مەکەنە دەمم))، ئێمەش وتمان: لەبەر ئەوەیە نەخۆش حەزی بە دەرمان خواردن نییە، جا کە هۆشی هاتەوە فەرمووی: ((کەس لەمماڵەدا نەمێنێت ئیللا دەرمانی دەکرێتە دەمیەوە جگە لە عەبباس، چونکە بێگومان ئەو لەگەڵتان ئامادە نەبوو)).**

## ١٥- بابُ مَنْ أَخَذَ حَقَّهُ أَوِ اقْتَصَّ دُونَ السُّلْطَانِ

٦٨٨٧- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، أَنَّ الأَعْرَجَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: إِنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ "[٣].

## ١٥- باسی کەسێک مافەکەی خۆی (لە بەرانبەرەکەی) وەرگرێتەوە یان تۆڵەی خۆی لێی بسەنێتەوە بەبێ گەڕانەوە بۆ دەسەڵاتدار[٤]

**٦٨٨٧-ئەبو هورەیرە ﵁ دەیوت ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((ئێمەین کۆتاهەمینی (دونیا) پێشکەوتووانی ڕۆژی دوایین)).**

(١) ڕەوبەییعی کچی نەزرە کە پوری ئەنەسە ﵄.

(٢) بڕوانە: ٤٤٥٨.

(٣) بڕوانە: ٢٣٨.

(٤) دادوەر و قازی و ئەو کەسەی پەیوەندی بەدادگای نێوان خەڵکەوە هەیە.

٦٨٨٨- وَبِإِسْنَادِهِ: «لَوِ اطَّلَعَ فِي بَيْتِكَ أَحَدٌ، وَلَمْ تَأْذَنْ لَهُ خَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، مَا كَانَ عَلَيْكَ مِنْ جُنَاحٍ»[1].

**٦٨٨٨- بە هەمان ڕشتەی پێشوو (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر كەسێك بێ ئەوەی خۆت مۆڵەتی بدەیت سەیری ناو ماڵت بكات، بەپەلە پیتكە چەوێكی تێ بگری، چاوی دەربێنی[2] هیچ تاوانێكت لەسەر نییە)).**

٦٨٨٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ حُمَيْدٍ، أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ فِي بَيْتِ النَّبِيِّ ﷺ، فَسَدَّدَ إِلَيْهِ مِشْقَصًا. فَقُلْتُ: مَنْ حَدَّثَكَ؟ قَالَ: أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ[3].

**٦٨٨٩- یەحیای وتی: حومەید دەگێڕێتەوە كە پیاوێك تەماشای ناو ماڵی پێغەمبەری ﷺ كرد، پێغەمبەریش ﷺ سەرەڕمێكی ڕوو تێكرد، (یەحیا دەڵێ): منیش وتم (بەحومەید) كێ بۆی گێڕایەتەوە؟ وتی: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ .**

## ١٦- بابٌ: إِذَا مَاتَ فِي الزِّحَامِ أَوْ قُتِلَ

٦٨٩٠- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، أَخْبَرَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ: هِشَامٌ أَخْبَرَنَا، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَمَّا كَانَ يَوْمَ أُحُدٍ هُزِمَ الْمُشْرِكُونَ، فَصَاحَ إِبْلِيسُ: أَيْ عِبَادَ اللَّهِ، أُخْرَاكُمْ. فَرَجَعَتْ أُولاَهُمْ، فَاجْتَلَدَتْ هِيَ وَأُخْرَاهُمْ، فَنَظَرَ حُذَيْفَةُ فَإِذَا هُوَ بِأَبِيهِ الْيَمَانِ فَقَالَ: أَيْ عِبَادَ اللَّهِ، أَبِي أَبِي. قَالَتْ: فَوَاللَّهِ مَا احْتَجَزُوا حَتَّى قَتَلُوهُ. قَالَ حُذَيْفَةُ: غَفَرَ اللَّهُ لَكُمْ. قَالَ عُرْوَةُ: فَمَا زَالَتْ فِي حُذَيْفَةَ مِنْهُ بَقِيَّةٌ حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ[4].

---

(١) بڕوانە: ٦٩٠٢.

(٢) یا كوێری كەیت.

(٣) بڕوانە: ٦٢٤٢.

(٤) بڕوانە: ٣٢٩٠.

## ١٦- باسێک: ئەگەر کەسێک لە قەڵەباڵغییەکدا مرد یان کوژرا

**٦٨٩٠- عائیشە ﷺ دەڵێ: کاتێ لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا بتپەرستەکان شکێنران، ئیبلیس هاواری کرد: ئەی بەندەکانی خوا ئاگادار دواوەی خۆتان بن، ئەنجا ئەو (مسوڵمان)انەی لە پێشەوە بوون گەڕانەوە لەگەڵ ئەو (مسوڵمان)انەی لە دواوە بوون بە جەنگ هاتن[1]، حوزەیفەش سەرنجیدا جا یەمانی باوکی بینی (مسوڵمانان دەیکوژن)[2]، حوزەیفە وتی: ئەی بەندەکانی خوا ئەوە باوکمە ئەوە باوکمە، عائیشە وتی: جا سوێند بەخوا وازیان لێ نەهێنا هەتا کوشتیان، حوزەیفەش وتی: خوا لێتان خۆش بێ. عوروە وتی: جا بەردەوام حوزەیفە لەو کارەدا (داوای لێخۆشبوونی دەکرد بۆ بکوژانی باوکی)، بۆیە بەشێ چاکە و خێری هەبوو[3] تا مرد و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری.**

## ١٧- بابٌ: إِذَا قَتَلَ نَفْسَهُ خَطَأً فَلاَ دِيَةَ لَهُ

٦٨٩١- حَدَّثَنَا الْمَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى خَيْبَرَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: أَسْمِعْنَا يَا عَامِرُ مِنْ هُنَيْهَاتِكَ. فَحَدَا بِهِمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنِ السَّائِقُ؟» قَالُوا: عَامِرٌ. فَقَالَ: «رَحِمَهُ اللَّهُ». فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلاَّ أَمْتَعْتَنَا بِهِ. فَأُصِيبَ صَبِيحَةَ لَيْلَتِهِ، فَقَالَ الْقَوْمُ: حَبِطَ عَمَلُهُ، قَتَلَ نَفْسَهُ. فَلَمَّا رَجَعْتُ -وَهُمْ يَتَحَدَّثُونَ أَنَّ عَامِرًا حَبِطَ عَمَلُهُ- فَجِئْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، فَدَاكَ أَبِي وَأُمِّي، زَعَمُوا أَنَّ عَامِرًا حَبِطَ عَمَلُهُ. فَقَالَ: «كَذَبَ مَنْ قَالَهَا، إِنَّ لَهُ لأَجْرَيْنِ اثْنَيْنِ، إِنَّهُ لَجَاهِدٌ مُجَاهِدٌ، وَأَيُّ قَتْلٍ يَزِيدُهُ عَلَيْهِ؟!»[4].

---

(١) گومانیان وابوو ئەوانەی دواوە بتپەرەستەکانن.
(٢) بە بتپەرەستان زانی بوو.
(٣) یان دڵتەنگی و خەفەت خواردنی بۆ باوکی هەبوو.
(٤) بڕوانە: ٢٤٧٧.

## ١٧- باسێک: ئەگەر کەسێک بەهەڵە خۆی کوشت ئەوە خوێنی نییە

**٦٨٩١- سەلەمە ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشتین بۆ خەیبەر، جا پیاوێك لە خەڵكەكە بە عامیری وت: ئەی عامیر لە هۆنراوەكانت شتێكمان بۆ بڵێ گوێی لێ بگرین؟ عامیریش پیاوێكی شاعیر بوو، ئەویش دەستی كرد بە شیعر وتن بە دەنگەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەو ئاواز بێژە كێیە؟)) وتیان: عامیرە فەرمووی: ((ڕەحمەتی خوای لێ بێ)) ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی نەتهێشت دڵخۆش بین بەئاوازەكەی[1]؟ ئیتر ئەو شەوە بۆ بەیانیەكەی عامیر مرد[2]، خەڵكەكە وتیان: كردەوەكانی پوچەڵ بۆتەوە، خۆی كوشتووە، جا كە گەڕامەوە - خەڵكەكە لە نێوان خۆیاندا دەیانوت عامیر كردەوەكانی پوچەڵ بۆتەوە - بۆیە منیش ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتم ئەی پێغەمبەری خوا باوك و دایكم بە قوربانت بێ خەڵكانێ دەڵێن: عامیر كردەوەكانی پوچەڵ بۆتەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوەی وای ووتوە درۆی كردوە، بێگومان ئەو دوو پاداشتی هەیە، بەڕاستی ئەو زۆر هەوڵدەر بوو (لە چاكەو عیبادەتدا)، وە خەبات گێڕ بوو، چ كوشتنێك (پاداشتی) لەوەی عامیر زیاترە)).**

## ١٨- بَابٌ: إِذَا عَضَّ رَجُلاً فَوَقَعَتْ ثَنَايَاهُ

**٦٨٩٢-** حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ قَالَ: سَمِعْتُ زُرَارَةَ بْنَ أَوْفَى، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ أَنَّ رَجُلاً عَضَّ يَدَ رَجُلٍ فَنَزَعَ يَدَهُ مِنْ فَمِهِ، فَوَقَعَتْ ثَنِيَّتَاهُ، فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «يَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ الْفَحْلُ، لاَ دِيَةَ لَكَ».

---

(١) بە دوعاكەی پێغەمبەر شەهیدبونی دەستدەكەوێ، بۆچی نەتهێڵا بۆمان سرودو ئاوازی خۆشمان بۆ بڵێ؟.

(٢) شمشێرەكەی خۆی بەر ئەژنۆی كەوت و مرد.

# ١٨- باسێک: ئەگەر کەسێک گازی گرت لە پیاوێک دوو ددانەکەی پێشەوەی (گازگرەکە) کەوتن

**٦٨٩٢-عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك گازی گرت لە دەستی پیاوێك، پیاوەکەش بەتوندی دەستی لە دەمی (گازگرەکە) دەرهێنا، بەهۆیەوە دوو دانەکەی پێشەوەی (گازگرەکە) کەوتن، ئینجا کێشەکەیان بردە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((کەسێکتان گاز لە براکەی دەگرێت وەك چۆن وشتری نێر گاز دەگرێت؟ تۆ هیچ خوێنێکت ناکەوێ)).**

٦٨٩٣- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ، أَبِيهِ قَالَ: خَرَجْتُ فِي غَزْوَةٍ، فَعَضَّ رَجُلٌ فَانْتَزَعَ ثَنِيَّتَهُ، فَأَبْطَلَهَا النَّبِيُّ ﷺ[1].

**٦٨٩٣- صەفوانی کوڕی یەعلا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتی: ڕۆشتم بۆ غەزایەك پیاوێك گازی گرت (لە دەستی پیاوێکی تر بە توندی دەستی دەرهێنا لە دەمی)، بەهۆیەوە دانی پێشەوەی دەرهێنا، پێغەمبەریش ﷺ خوێنی بۆ دانەنا[2].**

## ١٩- ﴿وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ ﴿٤٥﴾﴾ المائدة

٦٨٩٤- حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ ، أَنَّ ابْنَةَ النَّضْرِ لَطَمَتْ جَارِيَةً، فَكَسَرَتْ ثَنِيَّتَهَا، فَأَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ فَأَمَرَ بِالْقِصَاصِ[3].

(١) بڕوانە: ١٨٤٨.

(٢) ئەم فەرموودە بە ڕوونتر بە ژمارە: (٢٩٧٣) رابورد لەم صەحیحی بوخاریەدا.

(٣) بڕوانە: ٢٧٠٣.

## ١٩- باسێک: (ددان لە باتی ددان)

**٦٨٩٤- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە کچی نەزر شەقازلەیەکی دا لە کچێك و ددانێکی پێشەوەی شکاند، ئینجا هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەتۆڵکردنەوە لێی.**

## ٢٠- بَابُ دِيَةِ الأَصَابِعِ

٦٨٩٥- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «هذِهِ وهذِهِ سَوَاءٌ»، يَعْنِي: الخِنْصَرَ وَالإِبْهَامَ.
حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ نَحْوَهُ.

## ٢٠- باسی خوێنبایی پەنجەکان [١]

**٦٨٩٥- ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەمە و ئەمە یەکسانن))، واتە: پەنجە توتە و پەنجە گەورە. (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) موحەممەدی کوڕی بەششار بۆی گێڕاینەوە وتی: ئیبنو ئەبی عەدیی بۆی گێڕاینەوە لە شوعبەوە لە قەتادەوە لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست، هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوە.**

(١) ئایا خوێنیان یەکسانە یان جیاوازن؟ .

## ٢١- بَابٌ: إِذَا أَصَابَ قَوْمٌ مِنْ رَجُلٍ هَلْ يُعَاقِبُ أَوْ يَقْتَصُّ مِنْهُمْ كُلِّهِمْ؟

وَقَالَ مُطَرِّفٌ عَنِ الشَّعْبِيِّ فِي رَجُلَيْنِ شَهِدَا عَلَى رَجُلٍ أَنَّهُ سَرَقَ فَقَطَعَهُ عَلِيٌّ، ثُمَّ جَاءَا بِآخَرَ وَقَالاَ: أَخْطَأْنَا. فَأَبْطَلَ شَهَادَتَهُمَا وَأُخِذَا بِدِيَةِ الأَوَّلِ، وَقَالَ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكُمَا تَعَمَّدْتُمَا لَقَطَعْتُكُمَا.

٦٨٩٦- وَقَالَ لِي ابْنُ بَشَّارٍ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ غُلاَمًا قُتِلَ غِيلَةً، فَقَالَ عُمَرُ: لَوِ اشْتَرَكَ فِيهَا أَهْلُ صَنْعَاءَ لَقَتَلْتُهُمْ.

وَقَالَ مُغِيرَةُ بْنُ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ: إِنَّ أَرْبَعَةً قَتَلُوا صَبِيًّا، فَقَالَ عُمَرُ مِثْلَهُ. وَأَقَادَ أَبُو بَكْرٍ وَابْنُ الزُّبَيْرِ وَعَلِيٌّ وَسُوَيْدُ بْنُ مُقَرِّنٍ مِنْ لَطْمَةٍ. وَأَقَادَ عُمَرُ مِنْ ضَرْبَةٍ بِالدِّرَّةِ. وَأَقَادَ عَلِيٌّ مِنْ ثَلاَثَةِ أَسْوَاطٍ. وَاقْتَصَّ شُرَيْحٌ مِنْ سَوْطٍ وَخُمُوشٍ.

## ٢١- باسێک: ئەگەر چەند کەسێک پیاوێکیان بریندارکرد یان کوشت، ئایا کەسەکان هەموویان تۆڵەیان لێ دەسەندرێ یان دەکوژرێنەوە؟

**موتەڕیف لە شەعبیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: دەربارەی دوو پیاو شایەتیان دا لەسەر پیاوێك کە دزی کردوە، عەلیش ﵁ دەستی پیاوەکەی بڕی، لە پاشان دوو پیاوەکە کەسێکی تریان هێناو هەردووکیان ووتیان (جاری پێشوو) هەڵەمان کرد[1]، عەلیش شایەتی دانەکەیانی پوچەڵکردەوە و هەڵوەشاندەوە، وە خوێنبایی (دەست بڕاوەکەی) یەکەمیان لێ سەنرا، وە عەلی وتی: ئەگەر بمزانیایە بەدەستی ئەنقەست ئەوەتان کردوە دەستی هەردووکتانم دەبڕی.**

**٦٨٩٦- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئیبنو بەششار پێی وتم: یەحیا بۆی گێڕاینەوەلە عوبەیدوڵڵاوە لە نافیعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ گێڕایەوە کە مێرد منداڵێك**

---

(١) ئەمەی تریان دزەکەیە.

**بەدزیەوە بەفێڵ کوژرا، ئینجا عومەر ﷺ وتی: ئەگەر خەڵکی صەنعا هەموویان لەو کوشتنەدا بەشداریان بکردایە بەدڵنیاییەوە هەموویانم دەکوشت. موغیرەی کوڕی حەکیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کە چوار کەس کوڕێکی منداڵیان کوشت، ئینجا عومەر ﷺ هاوشێوەی وتەکەی پێشووی وت. وە ئەبو بەکر و ئیبنو زوبەیر و عەلی ﷺ و سووەیدی کوڕی موقەڕین تۆڵەی زللە لێدانێکیان کردۆتەوە (لە بکەرەکەی).وە عەلی ﷺ تۆڵەی کردۆتەوە لە کەسێ سێ قەمچی (داوە لە کەسێك). وە شورەیح تۆڵەی کردۆتەوە لە قەمچی لێدانێك و ڕووشاندنێك.**

٦٨٩٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ أَبِي عَائِشَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: لَدَدْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ، وَجَعَلَ يُشِيرُ إِلَيْنَا: «لاَ تَلُدُّونِي». قَالَ: فَقُلْنَا: كَرَاهِيَةُ المَرِيضِ بِالدَّوَاءِ، فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ: «أَلَمْ أَنْهَكُمْ أَنْ تَلُدُّونِي؟!». قَالَ: قُلْنَا: كَرَاهِيَةٌ لِلدَّوَاءِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَبْقَى مِنْكُمْ أَحَدٌ إِلاَّ لُدَّ وَأَنَا أَنْظُر، إِلاَّ الْعَبَّاسَ فَإِنَّهُ لَمْ يَشْهَدْكُمْ»[1].

**٦٨٩٧-عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: عائیشە ﷺ وتی: لە نەخۆشییەکەیدا دەرمانمان کردە دەمی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بە ئاماژە فەرمووی پێمان: ((دەرمان مەکەنە دەمم))، ئێمەش وتمان: لەبەر ئەوەیە نەخۆش حەزی بە دەرمان خواردن نییە، جا کە هۆشی هاتەوە فەرمووی: ((ئایا من ڕێگریم نەکرد لەوەی کە دەرمانم بدەنێ؟)) دەڵێ: وتمان (لەوانەیە) لەبەر حەز نەکردنی نەخۆش بێت بۆ دەرمان خواردن، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کەس لەم ماڵە نەمێنێت ئیللا بە بەرچاومەوە دەرمانی پێ دەدرێت جگە لە عەبباس ﷺ ، چونکە بێگومان ئەو لەگەڵتان ئامادە نەبوو)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٤٥٨.

## ٢٢- بابُ القَسَامَةِ

وَقَالَ الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ»[1].

وَقَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: لَمْ يُقِدْ بِهَا مُعَاوِيَةُ، وَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ إِلَى عَدِيِّ بْنِ أَرْطَاةَ -وَكَانَ أَمَّرَهُ على الْبَصْرَةِ- فِي قَتِيلٍ وُجِدَ عِنْدَ بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ السَّمَّانِينَ إِنْ وَجَدَ أَصْحَابُهُ بَيِّنَةً، وَإِلاَّ فَلاَ تَظْلِمِ النَّاسَ، فَإِنَّ هَذَا لاَ يُقْضَى فِيهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ.

## ٢٢- باسی سوێندخۆریی بەکۆمەڵ لەسەر کوشتن

**ئەشعەسی کوڕی قەیس وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دوو شایەتت هەیە (قسەکەت بسەلمێنێ) یان سوێند خواردنی ئەو)).**

**ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: موعاویە ﷛ بەسوێند خۆریی بەکۆمەڵ لەسەر کوشتنەکە کوشتنەوەی ئەنجام نەداوە.**

**وە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نامەی نووسی بۆعەدیی کوڕی ئەرتات (کە لێپرسراوی بەصرە بوو)، دەربارەی کوژراوێك کە لای ماڵێك لەو ماڵانەی ڕۆن دەفرۆشن دۆزرایەوە: ئەگەر کەس و کاری کوژراوەکە شایەتیان هەیە ئەگەرنا ستەم لە خەڵکی مەکە، چونکە بەراستی ئەوە بڕیاری تیا نادرێ تا ڕۆژی قیامەت.**

٦٨٩٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، زَعَمَ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ سَهْلُ بْنُ أَبِي حَثْمَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّ نَفَرًا مِنْ قَوْمِهِ انْطَلَقُوا إِلَى خَيْبَرَ فَتَفَرَّقُوا فِيهَا، وَوَجَدُوا أَحَدَهُمْ قَتِيلاً، وَقَالُوا لِلَّذِي وُجِدَ فِيهِمْ: قَتَلْتُمْ صَاحِبَنَا. قَالُوا: مَا قَتَلْنَا وَلاَ عَلِمْنَا قَاتِلاً. فَانْطَلَقُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ انْطَلَقْنَا إِلَى خَيْبَرَ فَوَجَدْنَا أَحَدَنَا قَتِيلاً. فَقَالَ: «الْكُبْرَ الكُبْرَ». فَقَالَ لَهُمْ: «تَأْتُونَ بِالْبَيِّنَةِ عَلَى مَنْ قَتَلَهُ». قَالُوا: مَا لَنَا بَيِّنَةٌ.

(١) بڕوانە: ٢٥١٥، ٢٥١٦.

قَالَ: «فَيَحْلِفُونَ». قَالُوا: لاَ نَرْضَى بِأَيْمَانِ الْيَهُودِ. فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُبْطِلَ دَمَهُ، فَوَدَاهُ مِائَةً مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ[1].

**٦٨٩٨- بوشەیری کوڕی یەسار دەڵێ: پیاوێکی ئەنصاری کە پێی دەوترا: سەهلی کوڕی ئەبی حەسمە بۆی گێڕایەوە کە چەند کەسێك لە خزمەکانی ڕۆشتن بۆ خەیبەر، ئینجا لەوێ بڵاوبوونەتەوە، جا ئەو کەسانە پیاوێکیان لە خۆیان بەکوژراوی (لە خەیبەر) دۆزییەوە و ووتیان بەو کەسانەی کوژراوەکە لە ناویاندا دۆزرایەوە، ئێوە هاوڕێکەی ئێمەتان کوشتووە؟ ئەوانیش وتیان: ئێمە نەمان کوشتووە و ناشزانین بکوژەکەی کێی، ئینجا خەڵکەکە ڕۆشتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ڕۆشتین بۆ خەیبەر، یەکێکمان لە خۆمان بینی کوژرابوو، پێغەمبەریش فەرمووی: ((با گەورەکەتان قسە بکات، با گەورەکەتان قسە بکات))، وە فەرمووی پێیان: ((شایەت دێنن لەسەر ئەوەی کێ کوشتوویەتی؟)) وتیان: شایەتمان نییە، فەرمووی: ((دەی ئەوان سوێند ئەخۆن؟)) وتیان: ئێمە بەسوێند خواردنی جوولەکە بڕوا ناکەین، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی ناخۆش بوو خوێنبایەکەی هەروا بڕوا، بۆیە خۆی سەد وشتری زەکاتیدا لە خوێنەکەیدا.**

٦٨٩٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الأَسَدِيُّ، حَدَّثَنَا الْحَجَّاجُ بْنُ أَبِي عُثْمَانَ، حَدَّثَنِي أَبُو رَجَاءٍ مِنْ آلِ أَبِي قِلاَبَةَ، حَدَّثَنِي أَبُو قِلاَبَةَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ أَبْرَزَ سَرِيرَهُ يَوْمًا لِلنَّاسِ، ثُمَّ أَذِنَ لَهُمْ فَدَخَلُوا فَقَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي الْقَسَامَةِ؟ قَالَ: نَقُولُ: الْقَسَامَةُ الْقَوَدُ بِهَا حَقٌّ، وَقَدْ أَقَادَتْ بِهَا الْخُلَفَاءُ. قَالَ لِي مَا تَقُولُ يَا أَبَا قِلاَبَةَ؟ وَنَصَبَنِي لِلنَّاسِ. فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، عِنْدَكَ رُءُوسُ الأَجْنَادِ وَأَشْرَافُ الْعَرَبِ، أَرَأَيْتَ لَوْ

---

(١) بڕوانە: ٢٧٠٢.

أَنَّ خَمْسِينَ مِنْهُمْ شَهِدُوا عَلَى رَجُلٍ مُحْصَنٍ بِدِمَشْقَ أَنَّهُ قَدْ زَنَى لَمْ يَرَوْهُ أَكُنْتَ تَرْجُمُهُ؟ قَالَ: لاَ. قُلْتُ: أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ خَمْسِينَ مِنْهُمْ شَهِدُوا عَلَى رَجُلٍ بِحِمْصَ أَنَّهُ سَرَقَ أَكُنْتَ تَقْطَعُهُ وَلَمْ يَرَوْهُ؟ قَالَ: لاَ. قُلْتُ: فَوَاللَّهِ مَا قَتَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺأَحَدًا قَطُّ، إِلاَّ فِي إِحْدَى ثَلاَثِ خِصَالٍ: رَجُلٌ قَتَلَ بِجَرِيرَةِ نَفْسِهِ فَقُتِلَ، أَوْ رَجُلٌ زَنَى بَعْدَ إِحْصَانٍ، أَوْ رَجُلٌ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَارْتَدَّ عَنِ الإِسْلاَمِ. فَقَالَ الْقَوْمُ: أَوَلَيْسَ قَدْ حَدَّثَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَطَعَ فِي السَّرَقِ

وَسَمَرَ الأَعْيُنَ ثُمَّ نَبَذَهُمْ فِي الشَّمْسِ؟. فَقُلْتُ: أَنَا أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثَ أَنَسٍ، حَدَّثَنِي أَنَسٌ أَنَّ نَفَرًا مِنْ عُكْلٍ ثَمَانِيَةً قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَبَايَعُوهُ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَاسْتَوْخَمُوا الأَرْضَ فَسَقِمَتْ أَجْسَامُهُمْ، فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَفَلاَ تَخْرُجُونَ مَعَ رَاعِينَا فِي إِبِلِهِ فَتُصِيبُونَ مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا؟». قَالُوا: بَلَى. فَخَرَجُوا فَشَرِبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا فَصَحُّوا، فَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَطْرَدُوا النَّعَمَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَرْسَلَ فِي آثَارِهِمْ، فَأُدْرِكُوا فَجِيءَ بِهِمْ، فَأَمَرَ بِهِمْ فَقُطِّعَتْ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ وَسَمَرَ أَعْيُنَهُمْ، ثُمَّ نَبَذَهُمْ فِي الشَّمْسِ حَتَّى مَاتُوا. قُلْتُ: وَأَيُّ شَيْءٍ أَشَدُّ مِمَّا صَنَعَ هَؤُلاَءِ؟! ارْتَدُّوا عَنِ الإِسْلاَمِ وَقَتَلُوا وَسَرَقُوا. فَقَالَ عَنْبَسَةُ بْنُ سَعِيدٍ: وَاللَّهِ إِنْ سَمِعْتُ كَالْيَوْمِ قَطُّ. فَقُلْتُ: أَتَرُدُّ عَلَيَّ حَدِيثِي يَا عَنْبَسَةُ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ جِئْتَ بِالْحَدِيثِ عَلَى وَجْهِهِ، وَاللَّهِ لاَ يَزَالُ هَذَا الجُنْدُ بِخَيْرٍ مَا عَاشَ هَذَا الشَّيْخُ بَيْنَ أَظْهُرِهِمْ.قُلْتُ: وَقَدْ كَانَ فِي هَذَا سُنَّةٌ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ:دَخَلَ عَلَيْهِ نَفَرٌ مِنَ الأَنْصَارِفَتَحَدَّثُوا عِنْدَهُ، فَخَرَجَ رَجُلٌ مِنْهُمْ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ فَقُتِلَ، فَخَرَجُوا بَعْدَهُ، فَإِذَا هُمْ بِصَاحِبِهِمْ يَتَشَحَّطُ فِي الدَّمِ، فَرَجَعُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَاحِبُنَا كَانَ تَحَدَّثَ مَعَنَا، فَخَرَجَ بَيْنَ أَيْدِينَا، فَإِذَا نَحْنُ بِهِ يَتَشَحَّطُ فِي الدَّمِ. فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «بِمَنْ تَظُنُّونَ -أَوْ تَرَوْنَ- قَتَلَهُ؟». قَالُوا: نَرَى أَنَّ الْيَهُودَ قَتَلَتْهُ. فَأَرْسَلَ إِلَى الْيَهُودِ فَدَعَاهُمْ. فَقَالَ: «آنْتُمْ قَتَلْتُمْ هَذَا؟». قَالُوا: لاَ. قَالَ: «أَتَرْضَوْنَ نَفَلَ خَمْسِينَ مِنَ الْيَهُودِ مَا قَتَلُوهُ؟».

فَقَالُوا: مَا يُبَالُونَ أَنْ يَقْتُلُونَا أَجْمَعِينَ ثُمَّ يَنْتَفِلُونَ. قَالَ: «أَفَتَسْتَحِقُّونَ الدِّيَةَ بِأَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْكُمْ؟». قَالُوا: مَا كُنَّا لِنَحْلِفَ، فَوَدَاهُ مِنْ عِنْدِهِ.

قُلْتُ: وَقَدْ كَانَتْ هُذَيْلٌ خَلَعُوا خَلِيعًا لَهُمْ فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَطَرَقَ أَهْلَ بَيْتٍ مِنَ الْيَمَنِ بِالْبَطْحَاءِ، فَانْتَبَهَ لَهُ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَحَذَفَهُ بِالسَّيْفِ فَقَتَلَهُ، فَجَاءَتْ هُذَيْلٌ فَأَخَذُوا الْيَمَانِيَ فَرَفَعُوهُ إِلَى عُمَرَ بِالْمَوْسِمِ وَقَالُوا: قَتَلَ صَاحِبَنَا. فَقَالَ: إِنَّهُمْ قَدْ خَلَعُوهُ. فَقَالَ: يُقْسِمُ خَمْسُونَ مِنْ هُذَيْلٍ مَا خَلَعُوهُ.

قَالَ: فَأَقْسَمَ مِنْهُمْ تِسْعَةٌ وَأَرْبَعُونَ رَجُلاً، وَقَدِمَ رَجُلٌ مِنْهُمْ مِنَ الشَّأْمِ فَسَأَلُوهُ أَنْ يُقْسِمَ فَافْتَدَى يَمِينَهُ مِنْهُمْ بِأَلْفِ دِرْهَمٍ، فَأَدْخَلُوا مَكَانَهُ رَجُلاً آخَرَ، فَدَفَعَهُ إِلَى أَخِي الْمَقْتُولِ فَقُرِنَتْ يَدُهُ بِيَدِهِ، قَالُوا: فَانْطَلَقْنَا وَالْخَمْسُونَ الَّذِينَ أَقْسَمُوا حَتَّى إِذَا كَانُوا بِنَخْلَةَ، أَخَذَتْهُمُ السَّمَاءُ فَدَخَلُوا فِي غَارٍ فِي الْجَبَلِ، فَانْهَجَمَ الْغَارُ عَلَى الخَمْسِينَ الَّذِينَ أَقْسَمُوا فَمَاتُوا جَمِيعًا، وَأَفْلَتَ الْقَرِينَانِ وَاتَّبَعَهُمَا حَجَرٌ فَكَسَرَ رِجْلَ أَخِي المَقْتُولِ، فَعَاشَ حَوْلاً ثُمَّ مَاتَ.

قُلْتُ: وَقَدْ كَانَ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَرْوَانَ أَقَادَ رَجُلاً بِالْقَسَامَةِ ثُمَّ نَدِمَ بَعْدَ مَا صَنَعَ، فَأَمَرَ بِالْخَمْسِينَ الَّذِينَ أَقْسَمُوا فَمُحُوا مِنَ الدِّيوَانِ وَسَيَّرَهُمْ إِلَى الشَّأْمِ[1].

**٦٨٩٩- حەجاجی کوڕی ئەبی عوسمان دەڵێ: ئەبو ڕەجا کە لە خانەوادەی قیلابەیە بۆی گێڕامەوە وتی: ئەبو قیلابە بۆی گێڕامەوە کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ڕۆژێ کورسیەکەی بردە دەرەوە تا قسە بۆ خەڵك بکات، پاشان مۆڵەتیدا بە خەڵکەکە ئەوانیش چوونە خزمەتی، عومەر وتی: دەربارەی قەسامە [2] ئێوە چی دەڵێن؟ یەکێ وتی: دەڵێین: قەسامە کارپێکردنی هەق و ڕاستە، وە بێگومان جێنشینەکان بە قەسامە حوکمیان کردوە، (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) بە منی وت: ئەی ئەبو قیلابە تۆ ئەڵێی چی؟ لە (شوێنێکدا) لە**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٣.

(٢) سوێندخۆری بەکۆمەڵ لەسەر کوشتن.

خەڵکەکەوە دیاربم داینام، منیش وتم: ئەی پێشەوای باوەڕداران سەر لەشکر و پیاوە ناودار و گەورەکانی عەرەب لە خزمەتدان پێم بڵێ: ئەگەر پەنجا کەس لەمانە شایەتی بدەن لەسەر پیاوێك، کە ژنی هێنابێ لە دیمەشق زینای کردوە و نەیان بینیوە تۆ بەردبارانی دەکەیت؟ وتی: نەخێر، وتم: پێم بڵێ ئەگەر پەنجا کەس لەمانە شایەتی بدەن لەسەر پیاوێك لە حیمص بێ کە دزی کردوە و نەیان دیوە تۆ دەستی ئەبڕی؟ وتی: نەخێر، وتم: دەی سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا بەهۆی سێ شت نەبێ هەرگیز کەسی نەکوشتووە، کەسێك بەتاوانی خۆی کەسێکی کوشتووە بەهۆیەوە کوژراوەتەوە، یان پیاوێك پاش ئەوەی ژنی هێنابێ زینای کردبێ[1]، وە پیاوێك دژایەتی و جەنگ دژ بەخوا و پێغەمبەرەکەی بکات و پاشگەزبێتەوە لە ئیسلام، ئینجا خەڵکەکە وتیان: ئەی ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ نەیگێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دزەکانی بڕیوە و چاویانی هەڵکۆڵیوە و پاشان لەبەر هەتاو فڕێی داون؟ منیش وتم: من فەرموودەکەی ئەنەستان بۆ دەگێڕمەوە، ئەنەس ﷺ بۆی گێڕامەوە کە چەند کەسێك لە هۆزی عوکل کە ژمارەیان هەشت کەس بوو، هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و لەسەر ئیسلامەتی بەیعەتیان پێ کرد، ئاو و هەوای مەدینەیان پێ نەکەوت، لاشەیان نەخۆش کەوت، سکاڵایان بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بۆ لەگەڵ شوانەکەمان و وشترەکانی ناڕۆنە دەرەوە و (لە مەدینە) لە شیر و میزی وشترەکان بخۆنەوە))، وتیان: بەڵێ دەڕۆین، ئینجا ڕۆشتنە دەرەوە و لە شیر و میزی وشترەکانیان خواردەوە و چاك بوونەوە، ئینجا شوانەکەی پێغەمبەری خوایان ﷺ کوشت و وشترەکانیان دایە بەر و بردنیان، جا ئەو هەواڵە گەشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی نارد بەشوێنیاندا و پێیان

---

(١) یان ژنێک هەمان حوکمی هەیە.

گەیشتن و هێنانیانەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد دەست و پێیەکانیان بڕایەوە و چاویان بە بزماری سورۆکراو هەڵکۆڵرا، پاشان (فەرمانی کرد) فڕێی دانە بەر هەتاو تا مردن.

(ئەبو قیلابە دەڵێ) پێم وتن: چ خراپەیەك لەو خراپەی ئائەوانە کردیان خراپترە؟ پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام و پیاویان کوشت و دزییان کرد[1]، عەنبەسەی کوڕی سەعید[2] وتی: سوێند بەخوا هەرگیز وەك ئەمڕۆ وێنەی ئەمەم نەبیستووە. ئەبو قیلابە ئەڵێ: وتم: ئەی عەنبەسە بۆ تۆ بەرپەرچم دەدەیتەوە؟ وتی: نەخێر، بەڵکو تۆ فەرموودەکەت وەك خۆی گێڕایەوە، سوێند بەخوا ئەم لەشکری شامە تا ئەم پیاوە بەتەمەنە لە ناویاندا بژی لە خێرا ئەبن، ئەبو قیلابە دەڵێ: لەم فەرموودەدا سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەردەوامە، چەند کەسێك لە ئەنصارییەکان هاتنە خزمەتی (پێغەمبەر ﷺ) لە خزمەتیدا قسەیان کرد، پیاوێ لەوان[3] لە پێش ئەوانەوە هاتە دەرەوە [4] و کوژرا، ئینجا ئەوان هاتنە دەرەوە (و چوون بۆخەیبەر)، بینیان هاوڕێکەیان لە خوێندا ئەتلایەوە [5] ئینجا گەڕانەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو هاوڕێیەمان لەگەڵمان بوو قسەی دەکرد، لە پێش ئێمەوە ڕۆشت (بۆ خەیبەر)، جا ئێمە بینیمان لەخوێندا ئەتلایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ هاتەدەر (بۆ لایان) فەرمووی پێیان: ((گومانتان لە کێیە؟ یان وا دەزانن کێ کوشتویەتی؟)) وتیان: وا دەزانین جولەکە کوشتوویانە.

---

(١) پێغەمبەر ﷺ هەمان کاری لەگەڵیان کرد کە ئەوان بەشوانەکەیان کردبوو (موسلیم گێڕاویەتیەوە).

(٢) برای عەمری کوڕی ئەشدەقە واتە: دەم زل.

(٣) ناوی عەبدوڵڵای کوڕی سەهل بوو ﷺ.

(٤) ڕۆشت بۆ خەیبەر.

(٥) کوژرابوو.

(پێغەمبەر ﷺ) ناردی بەشوێن جولەکەکاندا و بانگی کردن و فەرمووی: ((ئایا ئێوە ئەو پیاوەتان کوشتووە؟)) وتیان: نەخێر، فەرمووی[1]: ((ڕازی دەبن بەوەی پەنجا کەس لە جولەکە سوێند بخۆن کە ئەوان نەیان کوشتووە؟)) وتیان: گوێی پێ نادەن کە هەموومان بکوژن سوێند بخۆن، فەرمووی پێیان: ((ئەی ڕازی دەبن بەوە پەنجا لە ئێوە سوێند بخۆن مافی خوێن وەرگرتنتان ببێ؟)) عەرزیان کرد: نەخێر نابێ ئێمە سوێند بخۆین، بۆیە پێغەمبەر ﷺ خۆی خوێنەکەی پێدان. (ئەبو قیلابە دەڵێ) وتم: هوزەیل لە سەردەمی نەفامیدا پەیمانێکی خۆیان سەبارەت بە کەسێك هەڵوەشاندەوە، ئەو کەسە (پەیمانەکەی هەڵوەشێنرابویەوە شەو هێرشی کردبوویە سەرماڵێکی یەمەنی لە بەتحا، جا یەکێك لە کەسانی ماڵەکە هەستی پێکردبوو شمشێرێکی بۆ هاویشت و کوشتی، هوزەیلیش هاتن لە کاتی حەجدا ئەو بکوژە یەمەنیان گرت و بردیانە لای عومەر (ی کوڕی خەتتاب) ﷺ ، وە وتیان: ئەمە پیاوێکی لە ئێمە کوشتووە، بکوژەکەش وتی: ئەوان پەیمانیان لەگەڵ هەڵوەشاندۆتەوە[2]، عومەر وتی: پەنجا کەس لە هوزەیل سوێند بخۆن کە پەیمانیان لەگەڵ هەڵنەوەشاندۆتەوە دەڵێ: چل و نۆ کەسیانی سوێندندا، پیاوێك لە هوزەیل لە شام هاتبۆوە، داوایان لێ کرد کە سوێند بخوا، ئەویش سوێندەکەی بە هەزار درهەم لێ کڕینەوە (و سوێندی نەخوارد).

پیاوێکی تریان لە شوێنی ئەو هێنا دایەن بەبرای کوژراوەکە کە دەستی درایە دەستی (ئەبو قیلابە)، دەڵێ: وتیان: جا (ئێمەو) ئەو پەنجا کەسەی کە سوێندیان خواردبوو (کە پەیمانیان لەگەڵ هەڵنەوەشاندۆتەوە) ڕۆشتن تا گەشتینە نەخلە[3]، بارانیان لێ باری و چوونە ئەشکەوتێکەوە لە ناو شاخێکدا

---

(١) بەکەس و کاری کوژراوەکە.

(٢) وە ئەوان خۆیان لێ بەری کردوە لە زامنی چوونەتە دەرەوە و هەقیان بەسەریەوە نییە هەر چی بەرانبەری بکرێت.

(٣) شوێنێکە ڕۆژە ڕێیەک لە مەککەوە دوورە.

بوو ئەشكەوتەكە ڕووخا بەسەر ئەو پەنجايەدا[١]، كەسوێنديان خواردبوو هەموويان مردن، بەڵام ئەو دووانەی پێكەوەبوون[٢] ڕزگاريان بوو، بەردێك شوێنی هەردووكيان كەوت، قاچی برای كوژراوەكەی شكاند ساڵێك ژيا و پاشان مرد، (ئەبو قيلابە) دەڵێ: عەبدولمەليكی كوڕی مەروان بەسوێند خۆريی بەكۆمەڵ لەسەر كوشتن پياوێكی كوشتەوە، لە پاشان لەو كارەی پەشيمان بوويەوە ناوی (پەنجا سوێند خۆرەكەی) لە ديوان سڕييەوە و ناردنی بۆ شام.

## ٢٣- بَابٌ: مَنِ اطَّلَعَ فِي بَيْتِ قَوْمٍ فَفَقَئُوا عَيْنَهُ فَلاَ دِيَةَ لَهُ

٦٩٠٠- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ فِي بَعْضِ حُجَرِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَامَ إِلَيْهِ بِمِشْقَصٍ -أَوْ بِمَشَاقِصَ- وَجَعَلَ يَخْتِلُهُ لِيَطْعُنَهُ[٣].

## ٢٣- باسێك: كەسێك سەيری ناو ماڵی كەسانێك بكات (بەبێ مۆڵەتيان)، ئەوانيش چاوی كوێر بكەن، ئەو خوێنبايی نييە

٦٩٠٠- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پياوێك لە يەكێ لە ماڵەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ (لە كونێكەوە) تەماشای دەكرد، پێغەمبەريش ﷺ هەستا و چوو بۆی بەتيرێكی پەيكانی پانەوە- يان بە چەند تيرێكی پەيكانی پانەوە- جا بۆ دەرفەتێك دەگەڕا لێی كە (تيرەكە) بكات بە چاويدا.

(١) واتە چل و نۆ كەسەياندا.
(٢) برای كوژراوەكە و ئەو پياوەی كە لە جياتی پياوەكە دانرابوو كە سوێندی نەخوارد.
(٣) بڕوانە: ٦٢٤٢.

٦٩٠١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ فِي جُحْرٍ فِي بَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺوَمَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِدْرًى يَحُكُّ بِهِ رَأْسَهُ- فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْ أَعْلَمُ أَنْ تَنْتَظِرَنِي لَطَعَنْتُ بِهِ فِي عَيْنَيْكَ». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِذْنُ مِنْ قِبَلِ الْبَصَرِ»[1].

**٦٩٠١-ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە کە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پیاوێك لە کونی دەرگای ماڵی پێغەمبەرەوە ﷺ سەیری کرد- پێغەمبەریش ﷺ ئاسنێکی وەك دانی شانەی[2] پێبوو سەری پێ دەخوراند- جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوەکەی بینی فەرمووی: ((ئەگەر بمزانیایە تۆ سەیرم دەکەیت ئەم (ئاسن)ـەم دەکرد بە چاوتدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان بۆیە مۆڵەت وەرگرتن دانراوە لەبەر بینین (ی ناشەرعی ڕوو نەدات) )).**

٦٩٠٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «لَوْ أَنَّ امْرَأً اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ، فَخَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ، فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ جُنَاحٌ»[3].

**٦٩٠٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبولقاسیم ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێك بێ ئەوەی خۆت مۆڵەتی بدەیت سەیری ناو ماڵت بکات، ئینجا بە پەلەپیتکە چەوێکت تێگرت چاویت کوێر کرد، هیچ تاوانێکت لەسەر نییە)).**

(١) بڕوانە: ٥٩٢٤.
(٢) یان تەختەیەک وەک دانی شانە.
(٣) بڕوانە: ٦٨٨٨.

## ٢٤- بابُ العَاقِلَة

٦٩٠٣- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، حَدَّثَنَا مُطَرِّفٌ قَالَ: سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا جُحَيْفَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَلِيًّا ﷺ : هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ مَا لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ؟ وَقَالَ مَرَّةً: مَا لَيْسَ عِنْدَ النَّاسِ. فَقَالَ: وَالَّذِي فَلَقَ الْحَبَّ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ، مَا عِنْدَنَا إِلاَّ مَا فِي الْقُرْآنِ، إِلاَّ فَهْمًا يُعْطَى رَجُلٌ فِي كِتَابِهِ، وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ. قُلْتُ: وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: العَقْلُ، وَفِكَاكُ الأَسِيرِ، وَأَنْ لاَ يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ[١].

## ٢٤- باسی خوێنبایی دەر[٢]

**٦٩٠٣- ئەبو جوحەیفە دەڵێ: پرسیارم لە عەلی ﷺ کرد: ئایا شتێکتان لایە کە لە قورئاندا نەبێت؟ وە (سوفیان) جارێك وتی: کە لای خەڵك نەبێت؟ (عەلیش) وتی: سوێند بەو زاتەی تۆمەکانی تەقاندووە و گیان لە بەرانی دروست کردوە، هیچمان لا نییە جگە لەوەی لە قورئان دایە، وە جگە لە تێگەشتنێك لە قورئانەکەی خوادا بەخشرابێ بەکەسێك، وە ئەوەش لەم تۆمارەدایە وتم: چی لەو تۆمارەدایە؟ وتی: خوێنی کوژراو و، ئازادکردنی دیل، وە کە مسوڵمان بەکافر ناکوژرێتەوە.**

## ٢٥- بابُ جَنِينِ الْمَرْأَة

٦٩٠٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، وَحَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ رَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى، فَطَرَحَتْ جَنِينَهَا، فَقَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ فِيهَا بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ[٣].

---

(١) بڕوانە: ١١١.

(٢) (العاقلة) بەخزمانی بکوژ دەوترێت لەسەری باوکیەوە، بۆیە پێیان دەوترێت (العاقلة) لەبەر ئەوەی ئەو وشترانەی کە لە خوێندا دەدرێن لە بەردەم ماڵی کوژراوەکەدا دەبەستنەوە. بڕوانە: إرشاد الساري:١٤/٣٢٠.

(٣) بڕوانە: ٥٧٥٨.

# ٢٥- باسی کۆرپەلەی ئافرەت

**٦٩٠٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ کە دوو ژن لە هۆزی هوزەیل یەکێکیان بەردی هاوێشت بۆ ئەوی کەیان و کۆرپەکەی فڕێدا و لە باری چوو، پێغەمبەری خواش ﷺ بڕیاری دا لە بارەیەوە کە خوێنەکەی[1] کۆیلەیەکە یان کەنیزەکێکە.**

٦٩٠٥- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيل، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنْ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ اسْتَشَارَهُمْ فِي إِمْلاَصِ المَرْأَةِ، فَقَالَ المُغِيرَةُ: قَضَى النَّبِيُّ ﷺ بِالْغُرَّةِ: عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ[2].

**٦٩٠٥- موغیرەی کوڕی شوعبە دەگێڕێتەوە لە عومەرەوە ﷺ کە ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵاندا کرد دەربارەی بەرپێ فڕێدانی ژن[3]، موغیرە وتی: پێغەمبەر ﷺ لەبەر بەژن فڕێداندا بڕیاری غورەی[4] دا: کە کۆیلە یان کەنیزەکێکە.**

٦٩٠٦ - فَقَالَ: ائْتِ مَنْ يَشْهَدُ مَعَكَ، فَشَهِدَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ أَنَّهُ شَهِدَ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى بِهِ[5].

**٦٩٠٦- جا (عومەر ﷺ ) وتی: کەسێك بێنە لەگەڵتدا شایەتی بدات لەسەر ئەمە، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە شایەتیدا، کە ئەو پێغەمبەر ﷺ بینی بڕیاری غورەیدا.**

٦٩٠٧- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنْ عُمَرَ نَشَدَ النَّاسَ: مَنْ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى فِي السِّقْطِ؟ وَقَالَ الْمُغِيرَةُ: أَنَا سَمِعْتُهُ قَضَى فِيهِ بِغُرَّةٍ: عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ[1].

---

(١) خوێنی کۆرپەکە کە ژنەکە لە باری چوو، یەکەم جار ئەو برگەی بەمورسەلی گێڕاوەتەوە و ناوی عائیشەی ﷺ نەهێناوە، بەڵام دواتر بەنەپچڕاوی هێناویەتی و ناوی عائیشەی هێناوە ﷺ .

(٢) بڕوانە: (٦٩٠٧، ٦٩٠٨، ٧٣١٧).

(٣) بەهۆی لێدانیەوە.

(٤) بەکۆیلە یان کەنیزەک دەڵێن غوررە.

(٥) بڕوانە: ٦٩٠٨، ٧٣١٨.

**٦٩٠٧- هیشام له باوکیەوه دەگێڕێتەوه که عومەر ﷺ سوێندی خەڵکیدا[٢] وتی: کێ له پێغەمبەری ﷺ بیستوویەتی بڕیاری دابێ دەربارەی منداڵی له بارچوو؟ موغیره وتی: من لێم بیستووه بڕیاریدا دەربارەی به غوڕڕەیەك: که کۆیلەیەك یان کەنیزەکێکه.**

٦٩٠٨- قَالَ: ائْتِ مَنْ يَشْهَدُ مَعَكَ عَلَى هَذَا. فَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ: أَنَا أَشْهَدُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِ هَذَا[٣].

**٦٩٠٨- (( (عومەر ﷺ ) وتی: کەسێك بێنه لەگەڵتدا شایەتی بدات لەسەر ئەوه، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش وتی: من شایەتی ئەدەم لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەوێنەی شایەتی ئەو موغیره)).**

٦٩٠٨ م- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَابِقٍ، حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ سَمِعَ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ يُحَدِّثُ عَنْ عُمَرَ أَنَّهُ اسْتَشَارَهُمْ فِي إِمْلَاصِ الْمَرْأَةِ مِثْلَهُ[٤].

**٦٩٠٨- هیشامی کوڕی عوروه له باوکیەوه دەگێڕێتەوه که له موغیرەی کوڕی شوعبەی ﷺ بیست له عومەرەوه ﷺ گێڕایەوه که ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵاندا کرد دەربارەی بەرپێ فڕێدانی ژن. بەوێنەی گێڕانەوەکەی وەهەیبی گێڕایەوه.**

---

(١) بڕوانه: ٦٩٠٥.

(٢) که ئیمامی بوخاری هێناویەتی به ژماره: ٦٩٠٥.

(٣) بڕوانه: ٦٩٠٦.

(٤) بڕوانه: ٦٩٠٥.

## ٢٦- بابُ جَنِينِ الْمَرْأَةِ، وَأَنَّ العَقْلَ عَلَى الْوَالِدِ وَعَصَبَةِ الوَالِدِ لاَ عَلَى الوَلَدِ

٦٩٠٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَضَى فِي جَنِينِ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي لِحْيَانَ بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ، ثُمَّ إِنَّ الْمَرْأَةَ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا بِالْغُرَّةِ تُوُفِّيَتْ، فَقَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنَّ مِيرَاثَهَا لِبَنِيهَا وَزَوْجِهَا، وَأَنَّ الْعَقْلَ عَلَى عَصَبَتِهَا[١].

## ٢٦- باسی (ڕوونکردنەوەی حوکمی) کۆرپەلەی ئافرەت و (ڕوونکردنەوە) خوێنی (ئافرەتی کوژراو) لەسەر باوک (ی ئافرەتە بکوژەکەیە)، وە لەسەر کەس و کاری باوکیەتی نەک کوڕانی

**٦٩٠٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی کۆرپەلەی ژنێکی بەنی لەحیان (کەپێی فڕێدرابوو)، بڕیاریدا بەدانی خوێنێك: کۆیلەیەك یان کەنیزەکێك بێت، پاشان ئەو ژنەی کە پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا لەسەری کە خوێنێك بدات مرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا کە میراتەکەی بۆ منداڵەکانی و مێردەکەیەتی و خوێنەکەش لەسەر باوانی ژنەکەیە[٢].**

٦٩١٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: اقْتَتَلَتِ امْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ، فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى بِحَجَرٍ قَتَلَتْهَا وَمَا فِي بَطْنِهَا، فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَضَى أَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ وَلِيدَةٌ، وَقَضَى دِيَةَ الْمَرْأَةِ عَلَى عَاقِلَتِهَا[٣].

---

(١) بڕوانە: ٥٧٥٨.

(٢) (عَصَبة): بەکەس و کاری نێرینەی مرۆڤ دەوترێت لەسەری باوکیەوە وەک مام و باپیر و ئامۆزا...هتد.

(٣) بڕوانە: ٥٧٥٨.

**٦٩١٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: دوو ژن لە هۆزی هوزەیل بوو بەشەڕیان، ژنێکیان بەردێکی هاوێشت بۆ ژنێکی تریان ژنەکە و کۆرپەکەی ناو سکیشی کوشت، ئینجا کێشەکەیان برد بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەویش بڕیاریدا کە خوێنی کۆرپەکەی غورەیەکە: کە کۆیلەیەك یان کەنیزەکێکە، وە بڕیاریدا کە خوێنی ژنەکەش لەسەر کەس و کاری باوکی ژنە بکوژەکەیە.**

## ٢٧- بابُ مَنِ اسْتَعَانَ عَبْدًا أَوْ صَبِيًّا

وَيُذْكَرُ أَنَّ أُمَّ سُلَمةﷺ بَعَثَتْ إِلَى مُعَلِّمِ الكُتَّابِ: أن ابْعَثْ لَي غِلْمَانًا يَنْفُشُونَ صُوفًا، وَلاَ تَبْعَثْ إِلَيَّ حُرًّا.

٦٩١١- حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمَّاقَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، أَخَذَ أَبُو طَلْحَةَ بِيَدِي فَانْطَلَقَ بِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَنَسًا غُلاَمٌ كَيِّسٌ فَلْيَخْدُمْكَ. قَالَ: فَخَدَمْتُهُ فِي الحَضَرِ وَالسَّفَرِ، فَوَاللَّهِ مَا قَالَ لِي لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ: لِمَ صَنَعْتَ هَذَا هَكَذَا؟ وَلاَ لِشَيْءٍ لَمْ أَصْنَعْهُ: لِمَ لَمْ تَصْنَعْ هَذَا هَكَذَا؟[1]

## ٢٧- باسی کەسێک داوای یارمەتی[2] لە کۆیلەیەک یان کوڕێکی منداڵ بکات (و بمرێت)

**لە ئوممو سەلەمەوە دەگێڕدرێتەوە کە ناردویەتی بۆ لای مامۆستای حوجرەی منداڵان، چەند میرد منداڵێکم بۆ بنێری خوری شیکەنەوە بەڵام کەسی ئازادم بۆ مەنێرە.**

(١) بڕوانە: ٢٧٦٨.

(٢) لە جیاتی (إستعان) داوای یارمەتی بکات، لە هەندێ گێڕانەوەی صەحیحی بوخاریدا بە (إستعار) هاتووە، واتە: شتێک بخوازێت.

**٦٩١١- عەبدولعەزیز دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە، ئەبو تەڵحە دەستی گرتم و بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی ئەنەس لاوێکی ژیرکەلەیە با خزمەتت بکات، ئەنەس دەڵێ: منیش خزمەتم کرد لە شار و لە سەفەردا، جا سوێند بە خوا هەر شتێکم کردبێ پێی نەووتووم بۆ ئەو شتەت ئاوەها کرد؟ هەر شتێکیشم نەکردبێت پێی نەووتووم بۆ ئەو شتەت ئاوەها نەکرد؟.**

## ٢٨- بَابٌ: الْمَعْدِنُ جُبَارٌ وَالْبِئْرُ جُبَارٌ

٦٩١٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ وَأَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْعَجْمَاءُ جُرْحُهَا جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ»[1].

## ٢٨- باسێک: کانی کانزا (هەر شتێکی تێ بکەوێ) بژاردنی نییە، بیریش (هەر شتێکی تێ بکەوێ) بژاردنی نییە

**٩٦١٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئاژەڵ (هەر زیانێك بدات) بژاردنی نییە، بیریش (هەر شتێك بکەوێتە ناوی) بژاردنی نییە، کانیش (هەر شتێکی تێکەوێت) بژاردنی نییە، گەنجینەش پێنج یەکی زەکاتە)).**

## ٢٩- بَابٌ: الْعَجْمَاءُ جُبَارٌ

وَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ: كَانُوا لاَ يُضَمِّنُونَ مِنَ النَّفْحَةِ، وَيُضَمِّنُونَ مِنْ رَدِّ الْعِنَانِ. وَقَالَ حَمَّادٌ: لاَ تُضْمَنُ النَّفْحَةُ إِلاَّ أَنْ يَنْخُسَ إِنْسَانٌ الدَّابَّةَ. وَقَالَ شُرَيْحٌ: لاَ تُضْمَنُ مَا عَاقَبَتْ أَنْ يَضْرِبَهَا

(١) بڕوانە: ١٤١٩.

فَتَضْرِبَ بِرِجْلِهَا. وَقَالَ الْحَكَمُ وَحَمَّادٌ: إِذَا سَاقَ الْمُكَارِي حِمَارًا عَلَيْهِ امْرَأَةٌ فَتَخِرُّ، لاَ شَيْءَ عَلَيْهِ. وَقَالَ الشَّعْبِيُّ: إِذَا سَاقَ دَابَّةً فَأَتْعَبَهَا فَهْوَ ضَامِنٌ لِمَا أَصَابَتْ، وَإِنْ كَانَ خَلْفَهَا مُتَرَسِّلاً لَمْ يَضْمَنْ.

## ٢٩- باسێک: ئاژەڵ و بێ زمان (هەر زیانێک بدەن) بژاردنی نییە

**ئیبنو سیرین دەڵێ: پێشینان [١] بە لەقەدانی وڵاخ زیانیان بەخاوەنی وڵاخەکە نەئەبژارد، بەڵام بە دەست شل کردنی لەغاو بۆ وڵاخەکە (زیانیدا لەو کاتەدا) زیانیان پێ دەبژارد. حەمماد دەڵێ: لە قەدانی وڵاخ نابژێردرێت مەگەر کەسێك بە وڵاخەکەوە بژەنێت. شورەیح دەڵێ: لە قەدانی وڵاخ بە خاوەنەکەی نابژێردرێت، ئەگەر وڵاخەکە بە بەرانبەر لەقەیدا، کەسێك لە وڵاخەکە بدات و وڵاخەکەش لەقەی لێدات. حەکەم وحەمماد دەڵێ: ئەگەر کەسێکی بەکرێگیراو گوێدرێژێك لێیخوڕێ ئافرەتێك بەسواریەوە بێت و بکەوێتەخوارەوە، بەکرێ گیراوەکە هیچی لەسەر نییە. شەعبی دەڵێ: ئەگەر کەسێك وڵاخێکی لێیخوڕی و ماندووی کرد، ئەوە وڵاخەکە لە هەرچی بدات زامنی دەبێت، بەڵام ئەگەر دوا ئەوە بەهێواشی و لەسەرخۆیی لێیخوڕی، (ئەگەر لە هەرچی بدات) لێخوڕەکە زامن نابێت.**

٦٩١٣- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْعَجْمَاءُ عَقْلُهَا جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ»[٢].

**٦٩١٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ئاژەڵ (هەر زیانێك بدات) بژاردنی نییە، بیریش (هەر شتێك**

(١) لە زانایانی هاوەڵان یا تابیعین.

(٢) بڕوانە: ١٤٩٩.

بکەوێتە ناوی) بژاردنی نییە، وە کان[1] (هەر شتێکی تێکەوێت) بژاردنی نییە، گەنجینەش پێنج یەکی زەکاتە)).

## ٣٠- بابُ إِثْمِ مَنْ قَتَلَ ذِمِيًّا بِغَيْرِ جُرْمٍ

٦٩١٤- حَدَّثَنَا قَيْسُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الحَسَنُ، حَدَّثَنَا مُجَاهِدٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَتَلَ نَفْسًا مُعَاهَدًا لَمْ يَرَحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا يُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًا»[2].

## ٣٠- باسی تاوانی کەسێک (گاور یان جوویەکی) پەیمان لەگەڵ کراو بکوژرێت بەبێ تاوان

**٦٩١٤- عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەوەی خاوەن پەیمانێك بکوژێت ئەو بۆنی بەهەشت ناکات، وە بێگومان بۆنەکەی لە دووری چل ساڵ ڕێگاوە هەیە و هەستی پێ دەکرێ)).**

## ٣١- بابٌ: لاَ يُقْتَلُ المُسْلِمُ بِالْكَافِرِ

٦٩١٥- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُس، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا مُطَرِّفٌ، أَنَّ عَامِرًا حَدَّثَهُمْ، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ. وَحَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الفَضْلِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، حَدَّثَنَا مُطَرِّفٌ، سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ يُحَدِّثُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا جُحَيْفَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَلِيًّا ﷺ هَلْ: عِنْدَكُمْ شَيْءٌ مِمَّا لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ؟ -وَقَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ مَرَّةً: مَا لَيْسَ عِنْدَ النَّاسِ- فَقَالَ: وَالَّذِي فَلَقَ الحَبَّةَ

---

(١) کان: جێگایەکە لە زەویدا کە خوای گەورە شتێکی تێدا دروست کردبێ، وەک زێڕ زیو بەرد و نەوت. فەرهەنگی خاڵ: ٤٤٠.

(٢) بڕوانە: ٣١٦٦.

وَبَرَأَ النَّسَمَةَ، مَا عِنْدَنَا إِلاَّ مَا فِي الْقُرْآنِ- إِلاَّ فَهْمًا يُعْطَى رَجُلٌ فِي كِتَابِهِ- وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ. قُلْتُ: وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: الْعَقْلُ، وَفِكَاكُ الأَسِيرِ، وَأَنْ لاَ يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ»[1].

## ٣١- باسێک: مسوڵمان له بری کافر ناکوژرێتەوه

**٦٩١٥- (ئیمام بوخاری دەڵێ) ئەحمەدی کوڕی یونس بۆی گێڕاینەوه وتی: زوهەیر بۆی گێڕاینەوه وتی: موتەڕیف بۆی گێڕاینەوه کە عامیر بۆی گێڕانەوه لە ئەبی جوحەیفەوه وتی: وتم بە عەلی.**

**(ئیمام بوخاری دەڵێ) صەدەقەی کوڕی فەزل بۆی گێڕاینەوه وتی: ئیبنو عویینه بۆی گێڕاینەوه وتی: موتەڕیف بۆی گێڕاینەوه وتی: لە شەعبیم بیست دەیگێڕایەوه دەیوت: لە ئەبی جوحەیفەم بیست وتی: پرسیارم لە عەلی ﷺ کرد: ئایا شتێکتان لایە کە لە قورئاندا نەبێت؟ وە سوفیانی کوڕی عویەینە جارێك وتی: کە لای خەڵك نەبێت؟ (عەلیش) وتی: سوێند بەو زاتەی تۆمەکانی تەقاندووه و گیان لە بەرانی دروست کردوه، هیچمان لانیە جگە لەوەی لە قورئان دایە -مەگەر تێگەشتنێك لە قورئانەکەی خوادا بەخشرابێ بەکەسێك- وە ئەوەش لەم تۆمارە دایە. وتم: چی لەو تۆمارە دایە؟ وتی: خوێنی کوژراو و، ئازادکردنی دیل و، وە کە مسوڵمان لە بەرانبەری کافردا ناکوژرێتەوه.**

## ٣٢- بابٌ: إِذَا لَطَمَ الْمُسْلِمُ يَهُودِيًّا عِنْدَ الْغَضَبِ

رَوَاهُ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٦٩١٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُخَيِّرُوا بَيْنَ الأَنْبِيَاءِ»[1].

---

(١) بڕوانه: ١١١.

## ٣٢- باسێک: ئەگەر مسوڵمان لەکاتی تووڕەییدا زللەیەکی دابێت لە جولەکەیەک

**ئەبو هورەیرە ﷺ ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە[٢].**

**٦٩١٦- ئەبو سەعید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((لە نێوان پێغەمبەراندا کەسیان هەڵمەبژێرن بەسەر ئەوانی تردا)).**

٦٩١٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى المَازِنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ اليَهُودِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَدْ لُطِمَ وَجْهُهُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِكَ مِنَ الأَنْصَارِ لَطَمَ فِي وَجْهِي. قَالَ: «ادْعُوهُ». فَدَعَوْهُ. قَالَ: «لِمَ لَطَمْتَ وَجْهَهُ؟». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي مَرَرْتُ بِالْيَهُودِ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى عَلَى البَشَرِ. قَالَ: قُلْتُ: وَعَلَى مُحَمَّدٍ ﷺ؟: قَالَ: فَأَخَذَتْنِي غَضْبَةٌ فَلَطَمْتُهُ. قَالَ: «لاَ تُخَيِّرُونِي مِنْ بَيْنِ الأَنْبِيَاءِ، فَإِنَّ النَّاسَ يَصْعَقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يُفِيقُ، فَإِذَا أَنَا بِمُوسَى آخِذٌ بِقَائِمَةٍ مِنْ قَوَائِمِ العَرْشِ، فَلاَ أَدْرِي أَفَاقَ قَبْلِي أَمْ جُزِيَ بِصَعْقَةِ الطُّورِ»[٣].

**٦٩١٧- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پیاوێکی جوولەکە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کە زلەیەك درابوو لە دەم و چاوی وتی: ئەی موحەممەد، بێگومان پیاوێکی ئەنصاری لە هاوەڵانت زللەیەکی دا لە دەم و چاوم، فەرمووی: ((بانگی بکەن))، جا بانگیان کرد. فەرمووی: ((بۆچی زللەت داوە لە دەم و چاوی؟)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ڕۆشتم بەلای ئەو جولەکەدا و گوێم لێی بوو دەیوت: سوێند بەو زاتەی موسای ﷺ هەڵبژاردووە بەسەر هەموو بەشەرەکاندا،**

---

(١) بڕوانە: ٢٤١٢.

(٢) لە بوخاریدا بەژمارە: ٢٤١١.

(٣) بڕوانە: ٢٤١٢.

**دەڵێ وتم: بەسەر موحەممەدیشدا ﷺ؟ وتی: بۆیە توڕەیی گرتمی زللەیەکم لەدەم و چاویدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لە نێوان پێغەمبەراندا من هەڵمەبژێرن بەسەر ئەوانی تریاندا، چونکە بەڕاستی خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا لە هۆش خۆیان دەچن،، جا من یەکەم کەسم هۆش دەکەمەوە یەکسەر موسا ﷺ دەبینم دەستی گرتووە بەیەکێك لە قاچەکانی عەرشەوە، جا نازانم ئایا پێش من هۆشی هاتۆتەوە یان بە هۆی بێهۆشیەکەی توورەوە چاوپۆشی کراوە[1])).**

(١) سەرنج: کە موسا ﷺ داوای بینینی خوای کرد لەسەر کێوی توور، ئەوە بووخوای گەورە خۆی نیشانی کێوەکەدا و ورد و هاش بوو، بە هۆیەوە موسا لە هۆش خۆی چوو، جا لێرەدا پێغەمبەر دەفەرمووی نازانم بە هۆی ئەو لە هۆش چوونەی دنیا چاوپۆشی لێکراوە لە هۆشخۆی نەچووە، یان لە پێش من هۆشی هاتۆتەوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٨٨- كِتَابُ اسْتِتَابَةِ المُرْتَدِّينَ وَالمُعَانِدِينَ وَقِتَالِهِمْ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٨٨- پەڕاوی داوای تەوبەکردن لە هەڵگەڕاوان و سەرکەشان و جەنگ کردن لە دژیان

## ١- بَابُ إِثْمِ مَنْ أَشْرَكَ بِاللَّهِ وَعُقُوبَتِهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ لقمان. وقال: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾﴾ الزمر.

٦٩١٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾﴾ الأنعام. شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَقَالُوا: أَيُّنَا لَمْ يَلْبِسْ إِيمَانَهُ بِظُلْمٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهُ لَيْسَ بِذَاكَ، أَلاَ تَسْمَعُونَ إِلَى قَوْلِ لُقْمَانَ: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ لقمان»[1].

## ١- باسی تاوانی ئەو کەسەی هاوبەش دانێت بۆ خوا، وە سزاکە لە دنیا و دوارۆژدا

**خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: (بەڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە)، (ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی بێگومان کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە، وە بەڕاستی لە زەرەرمەندان دەبیت).**

---

(١) بڕوانە: ٣٢.

**٦٩١٨- عەبدوڵلا ﷺ وتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾ ﴾ الأنعام. واتە: (ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، وە بڕواکەیان تێکەڵ بە ستەم (هاوەڵ دانان) نەکردوە)، ئەمە بەلای هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ قورس بوو، وە وتیان: کێ لە ئێمە باوەڕەکەی ستەمی تێکەڵ نەبووە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەو ستەمە نییە، ئایا گوێبیستی فەرموودەکەی لوقمان نابن: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾ لقمان. واتە: (بەڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە).**

٦٩١٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّد، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، حَدَّثَنَا الجُرَيْرِيُّ. وَحَدَّثَنِي قَيْسُ ابْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا سَعِيدٌ الجُرَيْرِيُّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِابْنُ أَبِي بَكْرَة، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَكْبَرُ الكَبَائِرِ الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ وَشَهَادَةُ الزُّورِ" ثَلَاثًا أَوْ "قَوْلُ الزُّورِ". فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ[1].

**٦٩١٩-عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((گوناهە هەرە گەورەکان ئەمانەن: هاوبەش دانان بۆ خوا و سەرپێچی کردنی دایك و باوك و شایەتیدانی درۆ و شایەتیدانی درۆ))، سێ جار فەرمووی، یان ((وتەی درۆ)) جا بە بەردەوامی ئەم وتەی دووبارە دەکردەوە هەتا دەمان وت خۆزگە بێدەنگ بوایە.**

٦٩٢٠- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْحُسَيْنِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا شَيْبَانُ، عَنْ فِرَاسٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ

(١) بڕوانە: ٢٦٥٤.

اللَّهِ، مَا الكَبَائِرُ؟ قَالَ: «الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ». قَالَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: «ثُمَّ عُقُوقُ الوَالِدَيْنِ». قَالَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: «اليَمِينُ الغَمُوسُ». قُلْتُ: وَمَا اليَمِينُ الغَمُوسُ؟ قَالَ: «الَّذِي يَقْتَطِعُ مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ هُوَ فِيهَا كَاذِبٌ»[1].

**٦٩٢٠- عەبدوڵڵای كوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: عەرەبێكی دەشتەكی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گوناهە گەورەكان كامانەن؟ فەرمووی: ((هاوبەش دانان بۆ خوا))، وتی: پاشان چی ترە؟ فەرمووی: ((پاشان سەرپێچی و ئازاردانی دایك و باوك))، وتی: پاشان چی ترە؟ فەرمووی: ((سوێند خواردنی درۆ و هەڵبەستراو))، (عەبدوڵڵا دەڵێ:) وتم: سوێند خواردنی درۆ و هەڵبەستراو چییە؟ فەرمووی: ((ئەو سوێندەیە بە هۆیەوە ماڵ و سامانی مسوڵمانێك بپچڕێت بۆ خۆی كە ئەو كەسە لەو سوێندەدا درۆزن بووە)).**

٦٩٢١- حَدَّثَنَا خَلَّادُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ وَالأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا فِي الجَاهِلِيَّةِ؟ قَالَ: «مَنْ أَحْسَنَ فِي الإِسْلاَمِ لَمْ يُؤَاخَذْ بِمَا عَمِلَ فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَمَنْ أَسَاءَ فِي الإِسْلاَمِ أُخِذَ بِالأَوَّلِ وَالآخِرِ».

**٦٩٢١- ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر ئەو كردەوانەی لە سەردەمی نەفامیدا كردوومانە سزا دەدرێین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێ لە كاتی مسوڵمان بوونیدا كار و كردەوەی چاك و جوانی بێ، سزا نادرێ لەسەر ئەو كردەوانەی لە سەردەمی نەفامیدا كردوویەتی، بەڵام هەر كەس لە كاتی مسوڵمان بوونیدا كار و كردەوەی خراپ و ناشیرین بێ، تۆڵەی سەرەتا و كۆتایی لێ دەسەندرێ)).**

---

(١) بڕوانە: ٦٦٧٥.

## ٢- بابُ حُكْمِ الْمُرْتَدِّ وَالْمُرْتَدَّةِ واستتابتهما

وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ وَالزُّهْرِيُّ وَإِبْرَاهِيمُ: تُقْتَلُ الْمُرْتَدَّةُ. وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ آل عمران. وَقَالَ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ آل عمران. وَقَالَ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا ﴿١٣٧﴾ ﴾ النساء. وَقَالَ: ﴿ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ المائدة

وَقَالَ: ﴿ وَلَـٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ وَأَبْصَـٰرِهِمْ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَـٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ ﴾ يقول: حقاً ﴿ أَنَّهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ﴾ إلى قوله ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ ﴾ ﴿ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾ ﴾ النحل: ﴿ وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَـٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ ﴾ البقرة

## ٢- باسی حوکمی پیاو و ئافرەتی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام و داوای تەوبەکردن لێیان

ئیبنو عومەر ﷺ و زوهری و ئیبراهیم دەڵێن: ئافرەتی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام دەکوژرێت.

وە خوای بەرز و بڵند دەفەرمووی: (چۆن خوا ڕێنموونی گەلێك دەكات بێ بڕوابوون دوای بڕواهێنانیان، وە شایەتیان دابێ كە ئەو پێغەمبەرە ڕاستە، وە بەڵگەو نیشانەی زۆریان بۆ هاتبێ، وە خوا ڕێنموونی گەلی ستەمكاران ناكات، ئەوانە سزایان ئەوەیە كە نەفرینی خوا و فریشتە و هەموو خەڵكیان لەسەرە لەو (نەفرینە)دا دەمێننەوە بەئێجگاری، سزایان لێ سووك ناكرێت وە مۆڵەت نادرێن مەگەر ئەوانەی تۆبەیان كردبێ دوای ئەوە، وە كردەوەی چاكیان كردبێت، ئەوە بێگومان خوا لێخۆشبووی میهرەبانە، بەڕاستی ئەوانەی كە بێ بڕوا بوون دوای بڕواهێنانیان پاشان زیاتر بێ بڕوابوون، هەرگیز تەوبەیان لێ گیرا ناكرێت وە ئەوانەن گومڕایان).

وە خوا دەفەرمووی: (ئەی ئەو كەسانەی كەبڕواتان هێناوە، ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی دەستەیەك لەوانە بن كە نامەیان پێ دراوە، دەتانكەنەوە بە كافر دوای بڕواهێنانەكەتان).

وە خوا دەفەرمووی: (بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە پاشان بێ باوەڕ بوونەتەوە دواتر بڕوایان هێناوە پاشان بێ باوەڕ بوونەتەوە، پاشان لە بێ بڕواییدا زیاتر ڕۆچوون، خوا هەرگیز لێیان خۆش نابێت، وە ڕێنموویان ناكات بۆ ڕێگای ڕاست)، وە خوا دەفەرمووی: (هەر كەس لە ئێوە هەڵگەڕێتەوە لە ئایینەكەی ئەوە بەزوویی خوا لە باتی ئەوان گەل و كۆمەڵێكی تر ئەهێنێ، خوا ئەوانی خۆش بوێ و ئەوانیش خوایان خۆش بوێ، بەسۆز و بەزەیین بەرانبەر

**بڕواداران بەهێز و توندن بەرانبەر بێ بڕوایان)، وە دەفەرموێ:(بەڵام هەر کەسێ دڵخۆش و شادمان بێت بە بێ باوەڕی ئەوە بەر خەشم و قینی خوا کەوتوون و سزای گەورەیان دەبێت، ئەم (هەڕەشەیە) لەبەر ئەوەیە بەڕاستی ئەوانە ژیانی دونیایان لا خۆشەویستر بوو لە ژیانی دوارۆژ، وە بەڕاستی خوا ڕێنموونیی کەسانی بێ باوەڕ ناکات، ئەوانە کەسانێکن خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و گوێ و چاویاندا، وە هەر ئەوانەن بێ ئاگایان، ڕاستە و گومانی تێدا نییە) ﴿ لَا جَرَمَ ﴾ دەڵێ: واتە: ڕاستە (ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا هەر ئەوانەن زەرەرمەندن)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوا: (بێگومان پەروەردگارت لە دوا ئەوە لێبوردەی میهرەبانە)، (بەردەوام دەست هەڵناگرن و جەنگتان لەگەڵدا دەکەن تا پەشیمانتان بکەنەوە لە ئایینەکەتان ئەگەر بتوانن، وە هەر کەسێك لە ئێوە لە ئایینی خۆی هەڵبگەڕێتەوە و بەبێ بڕوایی بمرێ، ئا ئەوانە هەموو کردەوەکانیان پووچ دەبێتەوە لە هەردوو دونیادا، وە ئەوانە هاوڕێ و هاودەمی ئاگرن، تێیدا دەمێننەوە بەئێجگاری).**

٦٩٢٢- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ مُحَمَّدُ بْنُ الْفَضْلِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: أُتِيَ عَلِيٌّ ﷺ بِزَنَادِقَةٍ فَأَحْرَقَهُمْ، فَبَلَغَ ذَلِكَ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ: لَوْ كُنْتُ أَنَا لَمْ أُحْرِقْهُمْ لِنَهْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلَقَتَلْتُهُمْ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»[١].

**٦٩٢٢- عیکریمە دەگێڕێتەوە کە چەند زندیقێك[٢] هێنران بۆ (بەردەستی) عەلی ﷺ ، عەلیش بەئاگر سوتاندنی جا ئەم هەواڵە گەیشت بە ئیبنو عەبباس ﷺ و وتی: ئەگەر من (لە جیاتی عەلی) بوومایە نەمدەسوتاندن، چونکە پێغەمبەر**

(١) بڕوانە: ٣٠١٧.

(٢) زندیق: کەسێکە باوەڕی بەهیچ ئایینێک نەبێت یان مولحید بێت. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٤١/١٤.

ﷺ سوتاندنی قەدەغە كردوە، وە دەمكوشتن لەبەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ: ((هەركەس پاشگەزبۆوە لە ئایینەكەی ئەوە بیكوژن)).

٦٩٢٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ قُرَّةَ بْنِ خَالِدٍ، حَدَّثَنِي حُمَيْدُ بْنُ هِلاَلٍ، حَدَّثَنَا أَبُو بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: أَقْبَلْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَمَعِي رَجُلاَنِ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ أَحَدُهُمَا عَنْ يَمِينِي وَالآخَرُ عَنْ يَسَارِي، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْتَاكُ، فَكِلاَهُمَا سَأَلَ. فَقَالَ: «يَا أَبَا مُوسَى». أَوْ «يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ». قَالَ: قُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَطْلَعَانِي عَلَى مَا فِي أَنْفُسِهِمَا، وَمَا شَعَرْتُ أَنَّهُمَا يَطْلُبَانِ الْعَمَلَ. فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى سِوَاكِهِ تَحْتِ شَفَتِهِ قَلَصَتْ، فَقَالَ: «لَنْ -أَوْ لاَ- نَسْتَعْمِلُ عَلَى عَمَلِنَا مَنْ أَرَادَهُ، وَلَكِنِ اذْهَبْ أَنْتَ يَا أَبَا مُوسَى -أَوْ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ- إِلَى الْيَمَنِ». ثُمَّ اتْبَعَهُ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، فَلَمَّا قَدِمَ عَلَيْهِ أَلْقَى لَهُ وِسَادَةً قَالَ: انْزِلْ، وَإِذَا رَجُلٌ عِنْدَهُ مُوثَقٌ. قَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ: كَانَ يَهُودِيًّا فَأَسْلَمَ ثُمَّ تَهَوَّدَ. قَالَ: اجْلِسْ. قَالَ: لاَ أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ، قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَأَمَرَ بِهِ فَقُتِلَ[1].

٦٩٢٣- ئەبو بوردە لە ئەبو مووساوە رضي الله عنه گێڕایەوە وتی: هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دوو پیاوی ئەشعەرییەكانم لەگەڵدا بوو، یەكێكیان لای ڕاستمەوە بوو ئەوی كەیان لای چەپمەوە بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ سیواكی دەكرد، هەردووكیان داوایان كرد (كاریان پێ بسپێرێت)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەبو موسا))، یان فەرمووی: ((ئەی عەبدوڵلای كوڕی قەیس)) دەڵێ: وتم: سوێند بەو زاتەی تۆی بەهەق ناردووە ئاگاداریان نەكردووم بەوەی كە لە دڵیاندایە، وە هەستم نەكردوە كە داوای كار پێ سپاردن دەكەن، جا دەڵێی بە پێش چاومەوەیە كە سیواكەكەی لەژێر لێویدا بوو لێوی هاتوەتەیەك، جا فەرمووی: ((هەرگیز یان نەخێر كەسێ ناخەینە سەر كار و فەرمانمان كە خۆی بیەوێ، بەڵام ئەی ئەبو موسا تۆ بڕۆ- یان ئەی عەبدوڵلای كوڕی قەیس- بۆ یەمەن)) پاشان موعازی

(١) بڕوانە: ٢٢٦١.

کوڕی جەبەلیشی بەشوێنیدا نارد، کاتێ کە موعاز گەشتە لای (ئەبو موسا) ڕاخەرێکی بۆ دانا و وتی: دابەزە، وە بینی پیاوێك لایدا کۆت و زنجیر کراوە، (موعاز) وتی: ئەوە چییە؟ (ئەبو موسا) وتی: ئەمە جولەکە بووە پاشان مسوڵمان بووە لە پاشان بووەتەوە بەجولەکە، وتی: دانیشە، وتی: دانانیشم هەتا نەکوژرێت، بڕیاری خوا و پێغەمبەرەکەیەتی-سێ جار ئەم وتەی دووبارە کردەوە- ئینجا ئەبو موسا فەرمانی کرد و کوژرا، پاشان باس و خواسی شەونوێژمان کرد، یەکێکیان وتی (کە موعاز بوو) بەڵام من شەو هەڵدەستم و دەشخەوم، چەند بەهیوای پاداشتی شەونوێژەکەمم ئەوەندەش بەهیوای پاداشتی خەوتنەکەمم.

## ٣- بابُ قتْلِ مَنْ أبَى قبُولَ الفَرَائضِ وَمَا نُسِبُوا إلَى الرِّدَّة

٦٩٢٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ العَرَبِ قَالَ عُمَرُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَمَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ، إِلاَّ بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ؟!»[1].

## ٣- باسی کوشتنی ئەو کەسەی مل نەدا و ڕازی نەبێ بەجێبەجێکردنی فەرزەکان و باسی ئەوەی پاڵدراون بەلای پاشگەزبوونەوە لە ئیسلامدا

٦٩٢٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد ئەبو بەکر ﷺ بوویە جێنشین، ئەوەی ویستی پاشگەزبێتەوە لە عەرەبەکان پاشگەز

(١) بڕوانە: ١٣٩٩.

**بوویەوە، ئەنجا عومەر ﷺ وتی بە ئەبو بەکر: چۆن لەگەڵ خەڵکدا دەجەنگی لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فەرمانم پێ کراوە لە دژی خەڵك بجەنگم هەتا دەڵێن: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. جا هەرکەس بیڵێ ئەوە بێگومان بە هەق و مافی خۆی نەبێت ماڵ و خوێنیان لە لایەن منەوە پارێزراوە، لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە)).**

٦٩٢٥ - قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللَّهِ لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقًا كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا. قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ رَأَيْتُ أَنْ قَدْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ[1].

**٦٩٢٥- ئەبو بەکر ﷺ وتی: سوێند بەخوا دەجەنگم لە دژی ئەو کەسەی جیاوازی بکات لە نێوان نوێژ و زەکاتدا، چونکە بێگومان زەکات مافی ماڵ و سامانە، وە سوێند بەخوا ئەگەر گیسکێکم نەدەنێ کە کاتی خۆی دەیاندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر نەدانی لە دژیان دەجەنگم، عومەر ﷺ وتی: ئەم کارە تەنها ئەوەبوو بەڕاستی خوا دڵی ئەبو بەکری گوشادکرد بۆ جەنگ کردن (لە دژیان)، ئیتر منیش زانیم کە ئەو بڕیارە هەق و ڕاستە.**

## ٤- بابٌ: إِذَا عَرَّضَ الذِّمِّيُّ وَغَيْرُهُ بِسَبِّ النَّبِيِّ ﷺ وَلَمْ يُصَرِّحْ، نَحْوَ قَوْلِهِ: السَّامُ عَلَيْكَ

٦٩٢٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدِ بْنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: مَرَّ يَهُودِيٌّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ

(١) بڕوانە: ١٤٠٠.

فَقَالَ: السَّامُ عَلَيْكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَعَلَيْكَ». فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَدْرُونَ مَا يَقُولُ؟ قَالَ: السَّامُ عَلَيْكَ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلاَ نَقْتُلُهُ؟ قَالَ: «لاَ، إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ فَقُولُوا: وَعَلَيْكُمْ»[1].

## ٤- باسێک: ئەگەر پەیمان لەگەڵ کراو (گاور و جوو) و خەڵکی تر بەناڕاستەوخۆ جنێوی بە پێغەمبەر ﷺ دا بەڕاشکاوانە نەبوو، وەک ئەوەی بڵێ: (السام علیک)[2]

**٦٩٢٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: جولەکەیەك بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕی وتی: مردن بۆ تۆ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (( (مردن) بۆ تۆبێ))، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا دەزانن چی دەڵێ؟ وتی: مردن بۆ تۆ))، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ئەی نەیکوژین؟ فەرمووی: ((نەخێر، ئەگەر نامەدارەکان سڵاویان لێ کردن پێیان بڵێن: لەسەر خۆتان بێت)).**

٦٩٢٧- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتِ: اسْتَأْذَنَ رَهْطٌ مِنَ الْيَهُودِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ. فَقُلْتُ: بَلْ عَلَيْكُمُ السَّامُ وَاللَّعْنَةُ. فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ». قُلْتُ: أَوَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: «قُلْتُ: وَعَلَيْكُمْ»[3].

**٦٩٢٧- عوروە لە عائیشەوە ﵂ گێڕایەوە و وتی: کۆمەڵێ جولەکە مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەیان لە پێغەمبەر ﷺ خواست وتیان: مردن بۆ تۆ بێت، (عائیشە دەڵێ): وتم: بەڵکو مردن و نەفرین بۆ خۆتان بێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی ((ئەی**

---

(١) بڕوانە: ٦٢٥٨.

(٢) ئەوە ڕستەیە لە جیاتی (السَّلَامُ عَلَيْكَ) بەکاری هێناوە، بەڵام مەبەستی بە (السَّامُ عَلَيْكَ) واتە: مردن بۆ تۆ.

(٣) بڕوانە: ٢٩٣٥.

**عائیشە بێگومان خوا نەرم ونیان و لەسەر خۆیە، لە هەموو کارەکاندا نەرم و نیانی پێ خۆشە))، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا گوێت لێ بوو چیان وت؟ فەرمووی: ((منیش وتم: لەسەر خۆتان بێ)).**

٦٩٢٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْيَهُودَ إِذَا سَلَّمُوا عَلَى أَحَدِكُمْ إِنَّمَا يَقُولُونَ: سَامٌ عَلَيْكَ. فَقُلْ: عَلَيْكَ»[1].

**٦٩٢٨- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان جولەکەکان کاتێ سەلام دەکەن لە کەسێکتان بەدڵنیاییەوە دەڵێن: مردن بۆ تۆ تۆش پێی بڵێ: (مردن) بۆ خۆت)).**

## ٥- بابٌ

٦٩٢٩- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي شَقِيقٌ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَحْكِي نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ ضَرَبَهُ قَوْمُهُ فَأَدْمَوْهُ، فَهْوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ وَيَقُولُ: رَبِّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ[2].

## ٥- باسێک[3]

**٦٩٢٩- عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: دەڵێی پێغەمبەر ﷺ بە پێش چاومەوەیە سەیری دەکەم باسی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی دەکرد کە**

(١) بڕوانە: ٦٢٥٧.

(٢) بڕوانە: ٣٤٧٧.

(٣) هیچ ناونیشانی بۆ دیاری نەکراوە.

**گەلەکەی لێیان دابوو خوێناویان کردبوو، ئینجا ئەویش خوێنەکەی ڕووخساری دەسڕی و دەیفەرموو: ((پەروەردگارم لە گەلەکەم خۆشبە چونکە بێگومان نازانن))** [١].

## ٦- بابُ قَتْلِ الخَوَارِجِ وَالْمُلْحِدِينَ بَعْدَ إِقَامَةِ الحُجَّةِ عَلَيْهِمْ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾ التوبة. وَكَانَ عَبْدِ اللَّهِ ابْنُ عُمَرَ ﷺ يَرَاهُمْ شِرَارَ خَلْقِ اللَّهِ، وَقَالَ: إِنَّهُمُ انْطَلَقُوا إِلَى آيَاتٍ نَزَلَتْ فِي الكُفَّارِ فَجَعَلُوهَا عَلَى المُؤْمِنِينَ.

## ٦- باسی کوشتنی خەواریجەکان[٢] و بێبڕوایان بەخوا، دوای بەرپەرچدانەوەی بەڵگەکانیان

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە باوی خودا وانەبووە هیچ کۆمەڵێ گومڕا بکات، دوای ئەوەی ڕێنموونیی کردوون هەتا بۆیان ڕوون نەکاتەوە ئەوەی پێویستە خۆیانی لێ بپارێزن).**

**وە ئیبنو عومەر ﷺ ڕای وابوو خەواریجەکان خراپترین دروستکراوی خودان، وە دەڵێ: بێگومان ئەوان (خەواریجەکان) ڕۆشتوون ئەو ئایەتانەی دەربارەی کافر دابەزیوە، وا مانایان کردوە کە دەربارەی باوەڕدارانە (و بڕیویانە بەسەر مسوڵماندا).**

---

(١) ئەوەی بانگیان دەکەم بۆ لای ئەوەی سەرفرازی هەردوو دنیای تێدایە.

(٢) ئەوانەبوون لە ئیسلام دەرچوون، لە فەرمانی عەلی ﷺ دەرچوون لێی جیابوونەوە، چونکە نارازی بوون بە قبوڵ کردنی نێوان گێری عەلی و موعاویە بەسەرپەرشتی ئەبو موسا و عەمری کوڕی عاص ﷺ، هەردوو لایان عەلی و موعاویە و هەرچی لەگەڵیاندا بوو بە دەرچوو لە ئیسلامیان دادەنان. بڕوانە: إرشاد الساري:١٤/١٤٨.

٦٩٣٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا خَيْثَمَةُ، حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ غَفَلَةَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ : إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا فَوَاللَّهِ، لأَنْ أَخِرَّ مِنَ السَّمَاءِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَكْذِبَ عَلَيْهِ، وَإِذَا حَدَّثْتُكُمْ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ فَإِنَّ الحَرْبَ خَدْعَةٌ، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «سَيَخْرُجُ قَوْمٌ فِي آخِرِ الزَّمَانِ، حُدَّاثُ الأَسْنَانِ، سُفَهَاءُ الأَحْلاَمِ، يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ البَرِيَّةِ، لاَ يُجَاوِزُ إِيمَانُهُمْ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، فَأَيْنَمَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ، فَإِنَّ فِي قَتْلِهِمْ أَجْرًا لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

**٦٩٣٠- سوەیدی کوڕی غەفلە وتی: عەلی ﷺ وتی: ئەگەر فەرموودەیەکم لە پێغەمبەری خواوە گێڕایەوە بۆتان، سا سوێند بەخوا ئەگەر لە ئاسمانەوە بکەومە خوارەوە لام خۆشترە لەوەی کە درۆ بکەم بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ، وە ئەگەر قسەیەکتان بۆ بکەم کە لە نێوان من و ئێوەدا بێت، چونکە بەڕاستی جەنگ بریتییە لە فڕ و فێڵ، وە بێگومان لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە ئاخر زەماندا کەسانێك دێن و پەیدا دەبن هەرزەکار و نەفامن و کەم عەقڵن بە وتەی چاکترینی مرۆڤەکان (کە پێغەمبەرە ﷺ) قسە دەکەن و دەیڵێن[٢]، باوەڕیان لە گەروویان تێپەڕ ناکات، لە ئیسلام دەردەچن هەرچۆنێك تیر لە نێچیر دەردەچێت، جا لە هەر کوێدا پێیان گەشتن بیانکوژن، چونکە بێگومان لە کوشتنیاندا لە ڕۆژی دواییدا پاداشتی گەورە هەیە بۆ ئەو کەسەی دەیانکوژێت)).**

٦٩٣١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ قَالَ: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَعَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّهُمَا أَتَيَا أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ فَسَأَلاَهُ عَنِ الحَرُورِيَّةِ: أَسَمِعْتَ النَّبِيَّ ﷺ؟. قَالَ: لاَ أَدْرِي مَا الحَرُورِيَّةُ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ

---

(١) بڕوانە: ٣٦١١.

(٢) کە قورئانە دەڵێن: (لا حكم إلاّ لله).

يَقُولُ: «يَخْرُجُ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ -وَلَمْ يَقُلْ مِنْهَا- قَوْمٌ تَحْقِرُونَ صَلاَتَكُمْ مَعَ صَلاَتِهِمْ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حُلُوقَهُمْ -أَوْ حَنَاجِرَهُمْ- يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ، فَيَنْظُرُ الرَّامِي إِلَى سَهْمِهِ إِلَى نَصْلِهِ إِلَى رِصَافِهِ، فَيَتَمَارَى فِي الْفُوقَةِ، هَلْ عَلِقَ بِهَا مِنَ الدَّمِ شَيْءٌ»[1].

**٦٩٣١- موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم لە ئەبو سەلەمە و عەتائی کوڕی یەسارەوە دەگێڕێتەوە کە هەردووکیان چوون بۆ لای ئەبو سەعیدی خودری ﷺ ، جا هەردووکیان دەربارەی حەرورییە[2] پرسیاریان لێ کرد وتیان: ئایا (دەربارەی هیچت) لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە؟ وتی: نازانم حەرورییە چییە، لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە ئەم ئوممەتەدا[3] (نەیفەرموو لە ئوممەتی ئیسلام) کەسانێك هەڵدەتۆقن و پەیدا دەبن، نوێژی ئێوە بە کەم و هیچ دەزانن لە بەرانبەر نوێژی خۆیاندا، قورئان دەخوێنن لە گەروویان تێناپەڕێت، لە ئایین (ی ئیسلام) دەردەچن وەك دەرچوونی تیر لە نێچیر، ئینجا تیر ئەندازەکە سەیری تیرەکەی دەکات سەیری پیکانەکەی دەکات، سەیری تیلمەی سیرمەکەی دەکات، ئینجا گومان دەکات لە ژێیەی کەوانەکەش ئایا هیچ خوێنی پێوە دراوە[4])).**

٦٩٣٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانُ، حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ -وَذَكَرَ الْحَرُورِيَّةَ- فَقَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ».

---

(١) بڕوانە: ٣٣٤٤.

(٢) حەرورییە: واتە: خەواریج بۆیە پێیان وتراوە حەرورییە چونکە لە شوێنێکدا کۆبوونەوە پێی دەوترا حەرورا: نزیک کوفە بوو.

(٣) واتە: ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ کە کافریش دەگێڕێتەوە.

(٤) واتە: تیر هاوێژەکە گومانیشی هەیە ئایا ئەو جێگایەش هیچ ئاسەوارێکی نێچیرەکەی پێوەبە.

٦٩٣٢- ئیبنووەهب دەڵێ: عومەر بۆی گێڕامەوە کە باوکی بۆی گێڕایەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ باسی حەرورییەی کرد وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( (خەواریج) لە ئیسلام دەردەچن، وەك دەرچوونی تیر لە نێچیرەکەی کوناو دەری دەکات)).

## ٧- بابُ مَنْ تَرَكَ قِتَالَ الْخَوَارِجِ لِلتَّأَلُّفِ، وَأَنْ لاَ يَنْفِرَ النَّاسُ عَنْهُ

٦٩٣٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: بَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَقْسِمُ جَاءَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ ذِي الْخُوَيْصِرَةِ التَّمِيمِيُّ فَقَالَ: اعْدِلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: «وَيْلَكَ مَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ؟». قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَهُ. قَالَ: «دَعْهُ، فَإِنَّ لَهُ أَصْحَابًا يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلاَتَهُ مَعَ صَلاَتِهِ، وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، يُنْظَرُ فِي قُذَذِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، يُنْظَرُ فِي نَصْلِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ فِي رِصَافِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ فِي نَضِيِّهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، قَدْ سَبَقَ الفَرْثَ وَالدَّمَ، آيَتُهُمْ رَجُلٌ إِحْدَى يَدَيْهِ -أَوْ قَالَ: ثَدْيَيْهِ- مِثْلُ ثَدْيِ المَرْأَةِ -أَوْ قَالَ: مِثْلُ البَضْعَةِ- تَدَرْدَرُ، يَخْرُجُونَ عَلَى حِينِ فُرْقَةٍ مِنَ النَّاسِ».قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَشْهَدُ سَمِعْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ وَأَشْهَدُ أَنَّ عَلِيًّا قَتَلَهُمْ وَأَنَا مَعَهُ، جِيءَ بِالرَّجُلِ عَلَى النَّعْتِ الَّذِي نَعَتَهُ النَّبِيُّ ﷺ. قَالَ: فَنَزَلَتْ فِيهِ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ ﴿٥٨﴾ ﴾ التوبة[1].

## ٧- باسی کەسێک لەبەر دڵ ڕاگرتن جەنگی خەواریج نەکات، وە بۆ ئەوە خەڵکە (مسوڵمانە) کە لێی دوورنەکەونەوە

٦٩٣٣- ئەبو سەلەمە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ (ئاڵتوونێکی) دابەش دەکرد عەبدوڵڵای کوڕی

(١) بڕوانە: ٣٣٤٤.

زولخوەیصیرەی تەمیمی هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دادگەربە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هاوار بۆ تۆ ئەگەر من دادگەر نەبم كێ دادگەر دەبێت؟)) ئەنجا عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا) مۆڵەتم بدەبا بدەم لە گەردنی، ئەویش فەرمووی: ((وازی لێ بێنە چونكە بێگومان چەند هاوڕێیەكی هەیە هەر كامتان نوێژی خۆی لە بەرانبەر نوێژی ئەودا و ڕۆژووی خۆی لە بەرانبەری ڕۆژووی ئەودا بەكەم دەزانێت، لە ئاینی (ی ئیسلام) دەردەچن، وەك چۆن تیر لە نێچیرەكە دەردەچێت، سەیری سەرە ڕمەكە دەكرێ هیچی پێوە نییە، پاشان سەیری سیرمە (ی قایم كردنی سیرمە) كە دەكرێ هیچ شتێكی پێوە نییە، پاشان سەیری كلكی ڕەمەكە دەكرێ هیچ شتێكی پێوە نییە، پاشان سەیری پەڕی ڕمكە دەكرێ هیچی پێوە نییە، بێگومان (تیرەكە) لە ڕیخ و خوێنەكە تێپەڕی[1]، نیشانەی ئەو كەسانە پیاوێكە قۆڵێكی - یان وتی: هەردوو مەمكی- وەك دوو مەمكی ژن وایە-یان وتی: وەك پارچە گۆشتێك وایە- بلەرێتەوە (بێت و بڕوا)، وە لە كاتی جیاوازی دووبەرەكی خەڵكدا پەیدا دەبن[2])).

ئەبو سەعید ﷺ وتی: شایەتی دەدەم كە (ئەم فەرموودەیەم) لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە، وە شایەتی دەدەم بێگومان كە عەلی ﷺ جەنگی لە دژیان كرد و منیش لەگەڵیدا بووم، وە پیاوەكەیان هێنا بینیم بەو شێوەیە بوو كە پێغەمبەر ﷺ باسیكرد بوو، دەڵێ: ئیتر دەربارەی ئەم ئایەتە دابەزی: (وە هەندێ كەس لەوانە ڕەخنە و توانجت لێ دەگرن لە دابەشكردنی خێرەكاندا (زەكاتدا) ).

---

(١) واتە چۆن تیرێک بدات لە نێچیرێک ئەوەندە خێرا لێی دەردەچێت هیچ لەگەڵ خۆی نەبات، ئەوانیش ئاوا لە ئیسلام دەردەچن و هیچ لەگەڵ خۆیان نابەن.

(٢) یان: لە چاكترین دەستە دەردەچن و دژیان دەوەستنەوە، وەک لەگێڕانەوەیەكی تردا هاتووە (إرشاد الساري ١٠٣/٨).

٦٩٣٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الشَّيْبَانِيُّ، حَدَّثَنَا يُسَيْرُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: قُلْتُ لِسَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ: هَلْ سَمِعْتَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ فِي الْخَوَارِجِ شَيْئًا؟ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ -وَأَهْوَى بِيَدِهِ قِبَلَ العِرَاقِ-: «يَخْرُجُ مِنْهُ قَوْمٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ».

**٦٩٣٤- یوسەیری كوڕی عەمر دەڵێ: بە سەهلی كوڕی حونەیفم وت ﷺ ئایا لە پێغەمبەرت ﷺ بیستووە هیچ شتێك دەربارەی خەواریج بفەرمووی؟ وتی: لێم بیست دەیفەرموو (دەستیشی ڕوو بە عێراق درێژ كرد): ((لەوێوە گەلێك پەیدا دەبێ قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان [1] تێناپەڕێ، لە ئیسلام دەردەچن وەك دەرچوونی تیر لە نێچیر كە دیوە و دەری دەكات)).**

## ٨- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَقْتَتِلَ فِئَتَانِ دَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ»

٦٩٣٥- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ دَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ»[2].

## ٨- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((قیامەت بەرپا نابێت هەتا دوو كۆمەڵی[3] (گەورە) جەنگ لەگەڵ یەكتری نەكەن بانگەواز و قسەی هەردووكیان یەك شتە[4]))

**٦٩٣٥- ئەعرەج دەگێڕێتەوە كە ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕۆژی دوایی بەرپانابێت هەتا دوو كۆمەڵ لە دژی یەكتری بەجەنگ نەیەن، داوای هەردووكیان یەك شتە)).**

(١) (تراقهم): تراقي: بەو ئێسكی چەڵەمەیە دەڵێن كە لە سەرووی سنگەوەیە و دوو دانەن لەم بەروبەرەوەن.
(٢) بڕوانە: ٨٥.
(٣) لە مسوڵمانان یان كۆمەڵی عەلی و موعاویە ﷺ.
(٤) هەریەكەیان دەڵێ ئەو لەسەر هەق و ڕاستییە.

## ٩- بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُتَأَوِّلِينَ

٦٩٣٦ - قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ المِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدٍ القَارِيَّ أَخْبَرَاه، أَنَّهُمَا سَمِعَا عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَقُولُ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمٍ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَاسْتَمَعْتُ لِقِرَاءَتِهِ، فَإِذَا هُوَ يَقْرَؤُهَا عَلَى حُرُوفٍ كَثِيرَةٍ لَمْ يُقْرِئْنِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَذَلِكَ، فَكِدْتُ أُسَاوِرُهُ فِي الصَّلاَةِ، فَانْتَظَرْتُهُ حَتَّى سَلَّمَ ثُمَّ لَبَّبْتُهُ بِرِدَائِهِ -أَوْ بِرِدَائِي- فَقُلْتُ: مَنْ أَقْرَأَكَ هَذِهِ السُّورَةَ؟ قَالَ: أَقْرَأَنِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. قُلْتُ لَهُ: كَذَبْتَ، فَوَاللَّهِ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقْرَأَنِي هَذِهِ السُّورَةَ الَّتِي سَمِعْتُكَ تَقْرَؤُهَا. فَانْطَلَقْتُ أَقُودُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ بِسُورَةِ الْفُرْقَانِ عَلَى حُرُوفٍ لَمْ تُقْرِئْنِيهَا، وَأَنْتَ أَقْرَأْتَنِي سُورَةَ الْفُرْقَانِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَرْسِلْهُ يَا عُمَرُ، اقْرَأْ يَا هِشَامُ». فَقَرَأَ عَلَيْهِ الْقِرَاءَةَ الَّتِي سَمِعْتُهُ يَقْرَؤُهَا. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«هَكَذَا أُنْزِلَتْ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَأْ يَا عُمَرُ». فَقَرَأْتُ، فَقَالَ: «هَكَذَا أُنْزِلَتْ». ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ»(١).

## ٩- باسی ئەوەی دەربارەی لێکدەرەوان هاتووە

**٦٩٣٦- عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە میسوەری کوڕی مەخرەمە و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدولقاری بۆیان گێڕایەوە کە هەردووکیان لە عومەری کوڕی خەتتابیان ﷺ بیست دەیوت: لە هیشامی کوڕی حەکیمم بیست ﷺ لە ژیانی پێغەمبەری خوادا سوڕەتی فورقانی دەخوێند، منیش گوێم گرت بۆ قورئان خوێندنەکەی، جا دەبینم ئەو بە چەند شێوەیەکی زۆر دەیخوێنێ کە**

(١) بڕوانە: ٢٤١٩.

**پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوانە بەمنی نەخوێندبوو، بۆیە خەریك بوو لە نوێژەکەدا پەلاماری بدەم [1]، بەڵام ئارامم گرت تا سەلامی دایەوە (لە نوێژەکە)، ئینجا یەخەیم گرت بە جلەکانی - یان بە جلەکانی خۆم- وتم: کێ ئەم سوڕەتەی پێ خوێندووی؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خوێندووم، پێم وت: درۆ دەکەیت، دەی سوێند بەخوا بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم سوڕەتەی بەمن خوێندووە کە گوێم لێبوو تۆ دەتخوێند، ئینجا دامەبەر و بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) من گوێم لەم پیاوە بوو سوڕەتی فورقانی دەخوێند، بەشێوازێك کە جەنابت ئەوشێوازەت بەمن نەخوێندووە، وە جەنابیشت سوڕەتی فورقانت بەمن وتووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەی عومەر بەرەڵایکە، هیشام بخوێنە))، هیشامیش بەو شێوەی کە من گوێ بیستی بووم دەیخوێند بۆی خوێند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:((ئا بەمجۆرە دابەزێندراوە))پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی عومەر بیخوێنە)) منیش خوێندم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئا بەو جۆرە دابەزێنراوە))، پاشان فەرمووی: ((بێگومان ئەم قورئانە لەسەر حەوت شێوە (خوێندەوە) دابەزێنراوە، بۆیە بەکام لەو حەوتە ئاسانە (بۆتان) بیخوێنن)).**

**٦٩٣٧-** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ ح. حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾ ﴾ الأنعام، شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَقَالُوا: أَيُّنَا لَمْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ كَمَا تَظُنُّونَ، إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لاِبْنِهِ ﴿ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾ لقمان [2]».

---

(١) سەری بگرم.

(٢) بڕوانە: ٣٢.

**٦٩٣٧- عەبدوڵڵا ﷺ وتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی:** ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾ ﴾ الأنعام. **واتە: (ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و بڕواکەیان تێکەڵ بە ستەم (هاوەڵدانان) نەکردوە)، ئەمە بەلای هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ قورس بوو، وە وتیان: کێ لە ئێمە هەیە ستەمی لە خۆی نەکردبێت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( بەو شێوە نییە ئێوە گومان دەبەن، بێگومان مەبەست پێی وەك ئەوەیە لوقمان بە کوڕەکەی فەرموو:** ﴿ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾ لقمان. **واتە: ئەی کوڕی شیرینم هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، بێگومان هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی گەورەیە)).**

٦٩٣٨- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ ابْنُ الرَّبِيعِ قَالَ: سَمِعْتُ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: غَدَا عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ رَجُلٌ: أَيْنَ مَالِكُ بْنُ الدُّخْشُنِ؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَّا: ذَلِكَ مُنَافِقٌ لاَ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَلاَ تَقُولُوهُ يَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ؟». قَالَ: بَلَى. قَالَ: «فَإِنَّهُ لاَ يُوَافَى عَبْدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِهِ إِلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ النَّارَ»[1].

**٦٩٣٨- مەحمودی کوڕی ڕەبیع دەڵێ: لە عیتبانی کوڕی مالیکم بیست دەڵێ: ئەو ڕۆشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، پیاوێك وتی: مالیکی کوڕی دوخشون لەکوێیە؟ پیاوێك لە ئێمە وتی: ئەو دووڕووە و خوا و پێغەمبەرەکەی خۆش ناوێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((گومان وای پێ مەبەن دەڵێ:** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) **و مەبەستی ڕەزامەنی خوایە؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((دەی بێگومان هەر کەسێك لە ڕۆژی دواییدا** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)**ی بەجێ هێنابێ، خوا چوونە ئاگری دۆزەخی لەسەر حەرام دەکات)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٢٤.

٦٩٣٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ فُلاَنٍ قَالَ: تَنَازَعَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَحِبَّانُ بْنُ عَطِيَّةَ، فَقَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ لِحِبَّانَ: لَقَدْ عَلِمْتُ الذِي جَرَّأَ صَاحِبَكَ عَلَى الدِّمَاءِ -يَعْنِي: عَلِيًّا- قَالَ: مَا هُوَ لاَ أَبَا لَكَ؟ قَالَ شَيْءٌ سَمِعْتُهُ يَقُولُهُ. قَالَ: مَا هُوَ؟ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالزُّبَيْرَ وَأَبَا مَرْثَدٍ -وَكُلُّنَا فَارِسٌ- قَالَ: «انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ حَاجٍ -قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: هَكَذَا قَالَ أَبُو عَوَانَةَ: حَاجٍ- فَإِنَّ فِيهَا امْرَأَةً مَعَهَا صَحِيفَةٌ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى الْمُشْرِكِينَ، فَأْتُونِي بِهَا». فَانْطَلَقْنَا عَلَى أَفْرَاسِنَا حَتَّى أَدْرَكْنَاهَا حَيْثُ قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَسِيرُ عَلَى بَعِيرٍ لَهَا، وَكَانَ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ مَكَّةَ بِمَسِيرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَيْهِمْ، فَقُلْنَا: أَيْنَ الْكِتَابُ الَّذِي مَعَكِ؟ قَالَتْ: مَا مَعِي كِتَابٌ. فَأَنَخْنَا بِهَا بَعِيرَهَا، فَابْتَغَيْنَا فِي رَحْلِهَا فَمَا وَجَدْنَا شَيْئًا، فَقَالَ صَاحِبِي: مَا نَرَى مَعَهَا كِتَابًا. قَالَ: فَقُلْتُ: لَقَدْ عَلِمْنَا مَا كَذَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ حَلَفَ عَلِيٌّ: وَالَّذِي يُحْلَفُ بِهِ لَتُخْرِجِنَّ الكِتَابَ أَوْ لأُجَرِّدَنَّكِ. فَأَهْوَتْ إِلَى حُجْزَتِهَا -وَهْيَ مُحْتَجِزَةٌ بِكِسَاءٍ- فَأَخْرَجَتِ الصَّحِيفَةَ، فَأَتَوْا بِهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ الله، قَدْ خَانَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، دَعْنِي فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا حَاطِبُ مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ؟». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَالِي أَنْ لاَ أَكُونَ مُؤْمِنًا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَلَكِنِّي أَرَدْتُ أَنْ يَكُونَ لِي عِنْدَ الْقَوْمِ يَدٌ يُدْفَعُ بِهَا عَنْ أَهْلِي وَمَالِي، وَلَيْسَ مِنْ أَصْحَابِكَ أَحَدٌ إِلاَّ لَهُ هُنَالِكَ مِنْ قَوْمِهِ مَنْ يَدْفَعُ اللَّهُ بِهِ عَنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ. قَالَ: «صَدَقَ، لاَ تَقُولُوا لَهُ إِلاَّ خَيْرًا». قَالَ فَعَادَ عُمَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولُ اللَّهِ، قَدْ خَانَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، دَعْنِي فَلأَضْرِبَ عُنُقَهُ. قَالَ: «أَوَلَيْسَ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ؟ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ عَلَيْهِمْ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَاشِئْتُمْ فَقَدْ أَوْجَبْتُ لَكُمُ الجَنَّةَ». فَاغْرَوْرَقَتْ عَيْنَاهُ فَقَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ[١].

---

(١) بڕوانە: ٣٠٠٧ .

٦٩٣٩- حوصەین لە کەسێکەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەبو عەبدوڕەحمان و حیببانی کوڕی عەتییە بوویە مشتومڕیان، ئەبو عەبدوڕەحمان وتی: بە حیببان سوێند بەخوا دەزانم ئەوەی هاوڕێکەتی -مەبەستی عەلی بوو- وا لێکردوە بوێر بێت لەسەر خوێن ڕشتن چییە، وتی: چیە کوڕی باوکی خۆت نەبی (ئەگەر ڕاست بێت)، وتی: شتێك بوو لێم بیست دەیوت، وتی چی بوو؟ وتی: (عەلی ﷺ دەڵێ:) پێغەمبەری خوا ﷺ من و زوبەیر و ئەبو مەرسەدی نارد -هەمووان سوار چاك بووین- فەرمووی: ((بڕۆن هەتا دەگەنە (روضةحاج) [1] -ئەبو سەلەمە دەڵێ: ئەبو عەوانە ئاوەهای وت: حاج- جا بێگومان لەوێدا ئافرەتێکی تیایە نامەیەکی پێیە لە حاتیبی کوڕی بەلتەعەوە (نووسراوە) بۆ بتپەرستان (ی مەککە)، ئەو نامەیەم بۆ بێنن)) ئێمەش بە سواری وڵاغەکانمان ڕۆشتین لەو جێگەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموو بووی پێمان پێی گەیشتین بەسواری وشترەکەیەوە دەڕۆشت و (ڕامانگرت)، حاتیب نامەی نووسیبوو بۆ خەڵکی مەککە دەربارەی ڕۆشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ (و لەشکرەکە) بۆ سەریان، ئینجا وتمان: کوا ئەو نامەکەی پێتە؟ ئافرەتەکە وتی: هیچ نامەیەکم پێ نییە، ئێمەش وشترەکەیمان پێ یەخدا و بارەکەی گەڕاین و هیچمان نەدۆزییەوە، هەردوو هاوڕێکەم وتیان وا نازانین نامەی پێ بێت، عەلی دەڵێ: وتم: سوێند بەخوا دەزانین پێغەمبەری خوا ﷺ درۆ ناکات، پاشان عەلی سوێندی خوارد و وتی: سوێند بەو زاتەی سوێندی پێ دەخورێت، ئەو نامەیە دەردێنیت یان جل و بەرگت لەبەردا ناهێڵین و دایدەکەنین- کەواکەی بەستبویە پشتی- دەستی برد بۆ کەواکەی کە بەستبویە پشتی نامەکەی دەری هێنا [2] ئینجا ئەوانیش نامەکەمان هێنایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، (جا کە خوێنرایەوە) عومەر ﷺ

(١)شوێنێکە نزیک مەدینە.

(٢) کەواکەی لە ناو قەدیدا گرێی دابوو.

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ناپاکی کردوە لە خوا و پێغەمبەرکەی و باوەڕداران، بۆیە لێم گەڕێ بابدەم لە گەردنی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەی حاتیب چی پاڵی پێوە نای ئەم کارە بکەیت؟)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هیچ شتێك لە ناخمدا نییە کە باوەڕدار نەمابم بە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، بەڵام ویستوومە لای ئەو کۆمەڵە (قورەیشەکان) چاکەیەکم هەبێ بەسەریانەوە بەو هۆیەوە زیان لە ماڵ وخێزانم پێ لادرێت، هیچ کام لە هاوەڵانت نییە مەگەر لەوێ (مەککە) خزم و کەسی هەیە، کە خوا بە هۆیانەوە ماڵ و خێزانی بپارێزێ، فەرمووی: ((ڕاست دەکات، وتەی چاك نەبێ هیچی پێ مەڵێن))، عومەر ﷺ گەڕایەوە (بۆ وتەکەی پێشووی) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی خیانەتی لە خوا و پێغەمبەرەکەی و باوەڕداران کردوە، وازم لێ بێنە بابدەم لە گەردنی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا لە بەشدار بووانی بەدر نییە؟ تۆ چوزانیت لەوانەیە خوا ئاگاداریان بێت (چی دەکەن)، وە فەرموویێتی: ئەوەی ویستتان بیکەن بەڕاستی من بەهەشتم بۆتان مسۆگەر کردوە))، جا چاوەکانی عومەر ﷺ فرمێسکیان پیا هاتە خوارەوە وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٨٩- كِتَابُ الإِكْرَاهِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨٩- پەڕاوی زۆرلێکردن (١)

وَقَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ النحل. وَقَالَ: ﴿ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ﴿٢٨﴾ ﴾ آل عمران. وَهْيَ: تَقِيَّةٌ.

وَقَالَ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴿٩٧﴾ ﴾ إلى قوله: ﴿ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ﴾ النساء:

وَقَالَ: ﴿ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ﴾ النساء.

فَعَذَرَ اللَّهُ الْمُسْتَضْعَفِينَ الذِينَ لَا يَمْتَنِعُونَ مِنْ تَرْكِ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ، وَالْمُكْرَهُ لَا يَكُونُ إِلَّا مُسْتَضْعَفًا غَيْرَ مُمْتَنِعٍ مِنْ فِعْلِ مَا أُمِرَ بِهِ. وَقَالَ الحَسَنُ: التَّقِيَّةُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ فِيمَنْ يُكْرِهُهُ اللُّصوصُ فَيُطَلِّقُ: لَيْسَ بِشَيْءٍ. وَبِهِ قَالَ ابن عُمَرَ وَابْنُ الزُّبَيْرِ وَالشَّعْبِيُّ وَالْحَسَنُ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "الأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ"(٢).

---

(١) واتە: زۆرلێکردنی کەسێک بەشتێک کە کەسەکە پێی ناخۆشە.

(٢) بڕوانە: ١.

**وە ئەم فەرمايشتەی خوای بەرز و بڵند: (مەگەر كەسێك زۆری لێ كرابێت، دڵیشی دامەزراو بێت بەباوەڕ، بەڵام كەسێك دڵی خۆش و شادمان بێت بەبێ باوەڕی، ئەوە بەر خەشم و قینی خوا كەوتوون و سزای گەورەیان دەبێت)، وە دەفەرمووێ: (مەگەر بۆ خۆپاراستنیان بێت لێیان)، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ﴿ تُقَىٰةً ﴾: هەر بەمانای (تَقِيَّةٌ) هاتووە[1].**

**وە خوا دەفەرمووی: (بەڕاستی ئەوانەی كە فریشتەكان گیانیان دەكێشن لە كاتێكدا كە ستەمیان لە خۆیان دەكرد[2] پێیان دەڵێن: (بەتەشەرەوە دەربارەی ئایینەكەتان) لە چیدا بوون؟! دەڵێن: ئێمە چەوساوە بووین لە زەویدا) تا دەگاتە ئەم فەرمايشتە: ( (خوا) چاوپۆشیكەر و لێخۆشبووە).**

**وە خوا دەفەرمووی: ( (بۆ جەنگ ناكەن) لە پێناو چەوساوەكان لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان ئەوانەی كە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ڕزگارمان بكەی لەم شارە كە خەڵكەكەی ستەمكارن، وە لە لایەن خۆتەوە دڵسۆزێكمان بۆ بەدی بهێنە، وە لە لایەن خۆتەوە بەدی بهێنە بۆمان یارمەتی دەرێك).**

**جاخوا عوزر و بەهانەی ئەو چەوساوانەی قەبوڵ كرد ڕێگرن نابن لە وازهێنان لەوەی خوا فەرمانی پێ كردوە، زۆر لێ كراویش هەر چەوساوەیە و ڕێگر نییە لە كردنی ئەوەی خوا فەرمانی پێ كردوە.**

**حەسەن دەڵێ: خۆپاراستن تا ڕۆژی دوایی بەردەوامە و هەیە.**

**وە ئیبنو عەبباس ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی كۆمەڵی دزێك ناچاری بكەن ژنەكەی تەڵاق بدات، هیچ نییە (و تەڵاقەكەی ناكەوێ).**

---

(١) واتە: نابێ مسوڵمان كافر بكاتە دۆست و پشتیوانی خۆی نە بەئاشكرا نە بەنهێنی، مەگەر بۆ خۆپاراستن بێت بەئاشكرا شتێ بڵێ نەک لە دڵەوە.

(٢) بەكۆچ نەكردنیان.

**ئیبنو عومەر و ئیبنو زوبەیر ﷺ و شەعبی و حەسەنیش هەمان ڕای ئیبنو عەبباسیان هەیە.**

**وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەموو کردەوەکان پەیوەستن بە نیەت و نیازەوە)).**

٦٩٤٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ خَالِدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ أُسَامَةَ، أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَدْعُو فِي الصَّلاَةِ: «اللَّهُمَّ أَنْجِ عَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، وَالْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، اللَّهُمَّ أَنْجِ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ وَابْعَثْ عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ»[1].

**٦٩٤٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکانیدا دوعا و نزای دەکرد دەیفەرموو: ((خوایە عەیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە و سەلەمەی کوڕی هیشام و وەلیدی کوڕی وەلید ڕزگار بکەیت، خوایە باوەڕدارە لاوازەکان ڕزگار بکەیت، خوایە تۆڵەی توندی خۆت بنێری بۆ هۆزی موزەڕ، گرانی و قات و قڕی بخەیتە ناویان وەك گرانی و قات و قڕی سەردەمی یوسف پێغەمبەر ﷺ)).**

## ١- بابُ مَنِ اخْتَارَ الضَّرْبَ وَالْقَتْلَ وَالْهَوَانَ عَلَى الْكُفْرِ

٦٩٤١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَوْشَبٍ الطَّائِفِيُّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ

---

(١) بڕوانە: ٨٠٤.

الإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِكَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ»[1].

## ١- باسی ئەو کەسەی لێدان و کوشتن و سووکی و زەبوونی هەڵبژاردووە بەسەر بێ باوەڕیدا

**٦٩٤١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سێ خەسڵەت هەن هەر کەس تێیدا بێت شیرینی ئیمان هەست پێ دەکات: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە هەموو کەس خۆشەویستتربن لە لای، ئەگەر کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت، پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ بێ باوەڕی، هەرچۆنێك پێی ناخۆشە کە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە)).**

٦٩٤٢- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا عَبَّادٌ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، سَمِعْتُ قَيْسًا، سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ زَيْدٍ يَقُولُ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَإِنَّ عُمَرَ مُوثِقِي عَلَى الإِسْلاَمِ، وَلَوِ انْقَضَّ أُحُدٌ مِمَّا فَعَلْتُمْ بِعُثْمَانَ كَانَ مَحْقُوقًا أَنْ يَنْقَضَّ[2].

**٦٩٤٢- قەیس دەڵێ: لە سەعیدی کوڕی زەیدم ﷺ بیست دەیوت: سوێند بە خوا بەڕاستی خۆم دیوە عومەر کۆت و زنجیری کردبووم لەبەر ئەوەی مسوڵمان بووم[3]، وە ئەگەر کێوی ئوحود لە جێگای خۆیدا نەمایە بەهۆی ئەوەی بەعوسمانتان کرد، شیاوی بوو کە نەمێنێ.**

---

(١) بڕوانە: ١٦.

(٢) بڕوانە: ٣٨٦٢.

(٣) مەبەستی ئەوەیە کە سەعید و خێزانەکەی- کە خوشکی ئیمامی عومەر بوو-زۆرلێکراو بوون لە لایەن ئیمامی عومەرەوە پێش ئەوەی مسوڵمان بێت، بەڵام ئەوان ئیسلامیان هەڵبژارد و بەرگەی ئەشکەنجەی عومەریان گرت، هەروەها ئیمامی عوسمانیش کوشتنی خۆی پێ باشتر بوو لە لادان لە فەرمانی خوای گەورە.

**٦٩٤٣-** حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا قَيْسٌ، عَنْ خَبَّابِ بْنِ الأَرَتِّ قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ مُتَوَسِّدٌ بُرْدَةً لَهُ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ فَقُلْنَا: أَلاَ تَسْتَنْصِرُ لَنَا؟ أَلاَ تَدْعُو لَنَا؟. فَقَالَ: «قَدْ كَانَ مَنْ قَبْلَكُمْ يُؤْخَذُ الرَّجُلُ فَيُحْفَرُ لَهُ فِي الأَرْضِ فَيُجْعَلُ فِيهَا، فَيُجَاءُ بِالْمِنْشَارِ فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ فَيُجْعَلُ نِصْفَيْنِ، وَيُمَشَّطُ بِأَمْشَاطِ الْحَدِيدِ مَا دُونَ لَحْمِهِ وَعَظْمِهِ، فَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ، وَاللَّهِ لَيَتِمَّنَّ هَذَا الأَمْرُ، حَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ مِنْ صَنْعَاءَ إِلَى حَضْرَمَوْتَ لاَ يَخَافُ إِلاَّ اللَّهَ وَالذِّئْبَ عَلَى غَنَمِهِ، وَلَكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ»[1].

**٩٦٤٣- قەیس لە خەبباى كوڕى ئەرەتتەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە كاتێكدا پێغەمبەر ﷺ لە سێبەرى كەعبەدا لەسەر عاباكەى خۆى شانى دادا بوو، عەرزمان كرد بۆ داواى سەركەوتنمان بۆ ناكەیت؟ بۆ لە خودا ناپاڕێیتەوە بۆمان؟ ئەویش فەرمووى: ((دڵنیابن لە گەلانى پێش ئێوەدا پیاوى (خواناس) دەهێنرا لە زەویدا چاڵى بۆ هەڵدەكەنرا و دەخرایە ناویەوە، ئەنجا مشار دەهێنرا و لەسەر سەرى دادەنرا و دەكرا بەدوو لەتەوە، وە (خواناسى وا هەبوو) بەشانەى ئاسن داهێنراوە و گۆشت و ئێسكى لە یەك جیا كراوەتەوە، بەڵام ئەوە لە ئایینەكەى وەرى نەگێڕاوە، سوێند بەخوا ئەم ئایینى ئیسلامە تەواو و كامڵ دەبێت، هەتا سوار لە صەنعاوە دەڕوات بۆ حەزرەمەوت لە خوا نەبێت لە كەس ناترسێت، یان گورگ بنێتە ڕانەكەى بەڵام ئێوە پەلە دەكەن)).**

## ٢- بابٌ: فِي بَيْعِ الْمُكْرَهِ وَنَحْوِهِ فِي الْحَقِّ وَغَيْرِهِ

**٦٩٤٤-** حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ إِذْ خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «انْطَلِقُوا إِلَى يَهُودَ». فَخَرَجْنَا مَعَهُ حَتَّى جِئْنَا بَيْتَ الْمِدْرَاسِ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَنَادَاهُمْ: «يَا مَعْشَرَ

---

(١) بڕوانە: ٣٦١٢.

يَهُودَ، أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا». فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ. فَقَالَ: «ذَلِكَ أُرِيدُ»، ثُمَّ قَالَهَا الثَّانِيَةَ. فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ. ثُمَّ قَالَ الثَّالِثَةَ فَقَالَ: «اعْلَمُوا أَنَّ الأَرْضَ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ، وَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُجْلِيَكُمْ، فَمَنْ وَجَدَ مِنْكُمْ بِمَالِهِ شَيْئًا فَلْيَبِعْهُ، وَإِلاَّ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا الأَرْضُ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ»[١].

## ٢- باسێک: دەربارەی فرۆشتنی زۆرلێکراو و ناچارکراو هەقێکی دارایی یان غەیری دارایی [٢]

**٦٩٤٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە مزگەوت دا بووین لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ ناومان و فەرمووی: ((دەرچن بڕۆن بۆ سەر جووەکان))، ئێمەش (لەگەڵیدا دەرچووین هەتا ڕۆشتینە ئەوماڵەی تەوراتی تیا دەخوێنرا، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هەستاو بانگی کردن و فەرمووی: ((ئەی پێڕی جووەکان مسوڵمان بن بێوەی و سەلامەت دەبن)). ئەوانیش وتیان: بێگومان ئەبو لقاسیم پەیامەکەت گەیاند، ئەویش فەرمووی: ((منیش ئەوەم مەبەست بوو))، پاشان وتەکەی دووبارە کردەوە، ئەوانیش وتیان: بێگومان ئەبو لقاسیم پەیامەکەت گەیاند، پاشان لە جاری سێیەمدا فەرمووی: ((چاك بزانن کە بێگومان ئەم زەویە موڵکی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، وە بەڕاستی من دەمەوێ (لەم خاك و زەویە) دەرتان بکەم، جا هەر کەسێکتان موڵك و ماڵێکی هەیە با بیفرۆشێت، ئەگەر نا چاك بزانن زەوی هی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی)).**

(١) بڕوانە: ٣١٦٧.

(٢) یان مەبەست بە هەق قەرزە و غەیرە هەقیش جگە لە قەرز.

## ٣- بابٌ: لاَ يَجُوزُ نِكَاحُ الْمُكْرَهِ

﴿ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ ﴾ النور

## ٣- باسێک: مارەکردنی زۆرلێکراو دروست نییە

**(وە کەنیزەکەکانتان زۆر لێ مەکەن[١]، لەسەر زیناکردن کە خوازیاری داوێن پاکین، تا ماڵ و سامانی ژیانی دونیاتان دەسکەوێ، جا هەر کەس ناچاریان بکات، بێگومان خوا دوای زۆرلێکردنەکەیان لێبوردەی دلۆڤانە)[٢].**

٦٩٤٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَمُجَمِّعٍ ابْنَىْ يَزِيدَ بْنِ جَارِيَةَ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ الأَنْصَارِيَّةِ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهْيَ ثَيِّبٌ، فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَرَدَّ نِكَاحَهَا[٣].

**٦٩٤٥- عەبدوڕەحمان و موجەممیعی کوڕانی یەزیدی کوڕی جارییەی ئەنصاری دەگێڕنەوە لە خەنسای کچی خیزامی ئەنصاریەوە ﵂، کە ئەو بێوەژن بوو باوکی دای بە شوو، بەڵام ئەو (خەنسا) ڕازی نەبوو بەو بەشوودانە و ڕۆشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش مارە کردنەکەی هەڵوەشاندەوە[٤].**

٦٩٤٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ أَبِي عَمْرٍو -هُوَ ذَكْوَانُ- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يُسْتَأْمَرُ النِّسَاءُ فِي

---

(١) ناچاریان مەکەن.

(٢) بەو کەنیزەکانە کە بەزۆر زینایان پێ کراوە.

(٣) بڕوانە: ٥١٣٨.

(٤) بە دانەمەزراوی لە قەڵەمدا.

أَبْضَاعِهِنَّ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قُلْتُ: فَإِنَّ الْبِكْرَ تُسْتَأْمَرُ فَتَسْتَحِي فَتَسْكُتُ. قَالَ: «سُكَاتُهَا إِذْنُهَا»[١].

**٦٩٤٦- ئەبو عەمر - کە زەکوانە - لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئافرەتان لە مارەکردنیاندا[٢] پرسیان پێ دەکرێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) وتم: دەی بەڕاستی کچ پرسی پێ بکرێ شەرم دەکات و بێ دەنگ دەبێ؟ فەرمووی: ((بێدەنگی کچ مۆڵەت دانێتی)).**

## ٤- بابٌ: إِذَا أُكْرِهَ حَتَّى وَهَبَ عَبْدًا أَوْ بَاعَهُ لَمْ يَجُزْ

وَبِه قَالَ بَعْضُ النَّاسِ: فَإِنْ نَذَرَ الْمُشْتَرِي فِيهِ نَذْرًا، فَهْوَ جَائِزٌ بِزَعْمِهِ، وَكَذَلِكَ إِنْ دَبَّرَهُ.

**٦٩٤٧-** حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ دَبَّرَ مَمْلُوكًا وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي؟». فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ النَّحَّامِ بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ. قَالَ: فَسَمِعْتُ جَابِرًا يَقُولُ: عَبْدًا قِبْطِيًّا مَاتَ عَامَ أَوَّلَ[٣].

## ٤- باسێک: ئەگەر کەسێک زۆری لێ بکرێ هەتا کۆیلەیەک ببەخشێت یان بیفرۆشێت دروست نییە

**هەندێ کەس[٤] دەڵێ: جا ئەگەر کڕیار لەو شتەی دەیکڕی[١] نەزرێکی کرد بەلای ئەو کەسانەوە دروستە، هەروەها ئەگەر کۆیلەیەك بکڕێ[٢] بڕیار بدات پاش مردنی کڕیارەکە ئازاد ببێ دروستە.**

---

(١) بڕوانە: ٥١٣٧.

(٢) بەمانا سەرجێی کردنیاندا بەڵام لە فەرموودەکەدا بە مارەکردن ڕاسترە مانا بکرێت.

(٣) بڕوانە: ٢١٤١.

(٤) ئەمە ڕایانە لە زانایانی حەنەفی مەزهەب.

**٦٩٤٧- جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی ئەنصاری کۆیلەیەکی خۆیی ئازاد کرد پاش مردنی خۆی، جگە لەو کۆیلەیەش هیچ ماڵ و سامانیکی نەبوو، جا ئەو هەواڵە گەشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کێ ئەم (کۆیلەیەم) لێ دەکڕێت؟)). ئینجا نوعەیمی کوڕی نەححام بە هەشت سەد درهەم لێی کڕی، (عەمر دەڵێ) جا لە جابیری کوڕی عەبدوڵلام بیست دەیوت: (کۆیلە چاوەڕوان کراوەکە) کۆیلەیەکی قیبتی بوو، هەر لە ساڵی یەکەمدا مرد.**

## ٥- بابٌ: مِنَ الإِكْرَاهِ

كَرهٌ وكُرهٌ -يعني: بالفتح في الكاف والضم- وَاحِدٌ.

٦٩٤٨- حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ مَنْصُورٍ، حَدَّثَنَا أَسْبَاطُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا الشَّيْبَانِيُّ سُلَيْمَانُ بْنُ فَيْرُوزَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. قَالَ الشَّيْبَانِيُّ: وَحَدَّثَنِي عَطَاءٌ أَبُو الْحَسَنِ السُّوَائِيُّ، وَلاَ أَظُنُّهُ إِلاَّ ذَكَرَهُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ﴿١٩﴾﴾ الآيَةَ، النساء.: قَالَ كَانُوا إِذَا مَاتَ الرَّجُلُ كَانَ أَوْلِيَاؤُهُ أَحَقَّ بِامْرَأَتِهِ، إِنْ شَاءَ بَعْضُهُمْ تَزَوَّجَهَا، وَإِنْ شَاءُوا زَوَّجَهَا، وَإِن شَاءُوا لَمْ يُزَوِّجْهَا، فَهُمْ أَحَقُّ بِهَا مِنْ أَهْلِهَا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ بِذَلِكَ[٣].

## ٥- باسێک: لەسەر زۆر لێکردن

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) (كَرْهٌ) و (كُرْهٌ)[٤] -مەبەستی ئەوەیە پیتی کافەکە سەر یان بۆری هەبێت- یەك مانان.**

---

(١) لە کەسە زۆرلێکراوەکە.

(٢) لە کەسە زۆرلێکراوەکە.

(٣) بڕوانە: ٤٥٧٩.

(٤) یان (كَرْهٌ) بۆ زۆر لێ کردنە و (كُرْهٌ) بۆ نارەحەتی یە.

٦٩٤٨- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس[(١)] ﷺ (دەربارەی ئەم ئایەتە): (ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە، حەڵاڵ نییە بۆتان کە ئافرەتان بەزۆر (ناچاری) بەمیرات بەرن (بۆ خۆتان) )، تا کۆتایی ئایەتەکە. دەڵێ: نەریتیان وابوو ئەگەر پیاوێك بمردایە کەس و کارەکەی لە هەموو کەس لە پێشتر بوون بەژنەکەی، ئەگەر کەسێکیان بیویستایە مارەی دەکرد بۆ خۆی، وە ئەگەر بیانویستایە بەشوی دەدا، ئەگەریش بیانویستایە بەشوویان نەدەدا، چونکە ئەوان لە کەس وکاری ژنەکە لە پێشتر بوون بە ژنەکە، ئیتر ئەم ئایەتە لەوەدا دابەزی.

## ٦- بابٌ: إِذَا اسْتُكْرِهَتِ المَرْأَةُ عَلَى الزِّنَا، فَلاَ حَدَّ عَلَيْهَا

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعۡدِ إِكۡرَٰهِهِنَّ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣٣﴾ ﴾ النور

٦٩٤٩- وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ أَنَّ صَفِيَّةَ ابْنَةَ أَبِي عُبَيْدٍ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ عَبْدًا مِنْ رَقِيقِ الإِمَارَةِ وَقَعَ عَلَى وَلِيدَةٍ مِنَ الْخُمُسِ، فَاسْتَكْرَهَهَا حَتَّى افْتَضَّهَا، فَجَلَدَهُ عُمَرُ الْحَدَّ وَنَفَاهُ، وَلَمْ يَجْلِدِ الْوَلِيدَةَ مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ اسْتَكْرَهَهَا. قَالَ الزُّهْرِيُّ فِي الأَمَةِ البِكْرِ يَفْتَرِعُهَا الْحُرُّ: يُقِيمُ ذَلِكَ الحَكَمُ مِنَ الأَمَةِ العَذْرَاءِ بِقَدْرِ قِيمَتِهَا، وَيُجْلَدُ، وَلَيْسَ فِي الأَمَةِ الثَّيِّبِ فِي قَضَاءِ الأَئِمَّةِ غُرْمٌ، وَلَكِنْ عَلَيْهِ الْحَدُّ.

## ٦- باسێک: ئەگەر ئافرەت زۆری لێ بکرێت لەسەر زیناکردن، ئەو سزا (ی زیناکردن) لەسەر ئەو ئافرەتە نییە، بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (جا هەر کەس ئەو (کەنیزەک)انە ناچار بکات ئینجا بەڕاستی خوا دوای ئەو زۆر لێکردنەیان لێبوردەی میهرەبانە)

(١) ئەم فەرموودەیە بە دوو ڕشتە هاتووە و گێردراوەتەوە.

**٦٩٤٩- لەیس دەڵێ: نافیع بۆی گێڕامەوە کە صەفییەی کچی ئەبی عوبەیدە بۆی گێڕایەوە کە کۆیلەیەك لە کۆیلەکانی خەلیفە (عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ) سواری کەنیزەکێك بوو کە هی پێنج یەك بوو[١]، زۆری لە کەنیزەکەکە کرد هەتا کچێنیەکەی دڕی، ئینجا عومەر ﷺ سزای زینای (کە سەد جەڵدە) لێدا و دووری خستەوە[٢]، بەڵام جەڵدی نەدا لە کەنیزەکەکە لەبەر ئەوەی کۆیلەکە زۆری لێ کردبوو[٣].**

**زوهری دەڵێ: دەربارەی کەنیزەکێکی کچ پیاوێکی ئازاد کچێنیەکەی نەهێڵێ، قازی ئەو لابردنی کچێنیە بەپارە دادەنێت بەبەراورد لەگەڵ کەنیزەکێکی کچدا، جا بەئەندازەکەی (پارە لە پیاوە زیناکەرەکە دەسەنرێ) و جەڵدی لێ دەدرێ[٤]، بەڵام کەنیزەکی بێوەژن (زینای بەزۆر لەگەڵ بکرێ) هیچ بژاردنێك نییە لە بڕیاری زانایاندا، بەڵام پیاوەکە (زیناکەرە) سزای زینای لەسەرە[٥].**

٦٩٥٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، حَدَّثَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَاجَرَ إِبْرَاهِيمُ بِسَارَةَ، دَخَلَ بِهَا قَرْيَةً فِيهَا مَلِكٌ مِنَ الْمُلُوكِ -أَوْ جَبَّارٌ مِنَ الجَبَابِرَةِ- فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ أَنْ أَرْسِلْ إِلَيَّ بِهَا. فَأَرْسَلَ بِهَا، فَقَامَ إِلَيْهَا، فَقَامَتْ تَوَضَّأُ وَتُصَلِّي فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ آمَنْتُ بِكَ وَبِرَسُولِكَ فَلاَ تُسَلِّطْ عَلَيَّ الْكَافِرَ فَغُطَّ حَتَّى رَكَضَ بِرِجْلِهِ»[٦].

**٦٩٥٠-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ سارە (ی خێزانی) سەفەری کرد بۆ وڵاتێك، جا بردیە نێو شارێ کە**

(١) پێنج یەک بەشێکە لە غەنیمەت دەدرێت بە پێغەمبەر ﷺ و جێنشینەکانی تا بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان خەرجی کەن.
(٢) لە مەدینە شەش مانگ.
(٣) بەزۆر زینای لەگەڵ کردبوو.
(٤) لە پیاوەکە کە زینای لەگەڵ کەنیزەکەدا کردوە.
(٥) جەڵد ئەگەر ژنی نەهێنابوو، بەردباران ئەگەر ژنی هێنابوو.
(٦) بڕوانە: ٢٢١٧.

**پادشایەك لە پادشاكانی- یا زۆردارێك لە زۆردارەكانی- تێدا بوو، ئەنجا ئەو پادشایە ناردی بۆ لای كە ئەو ئافرەتەم بۆ بنێرە، ئیبراهیمیش سارەی نارد، ئینجا پادشاكە هەستا دەستی بۆ برد، سارەش هەستا دەستنوێژی گرت و نوێژی كرد و وتی: خوایە گیان ئەگەر من باوەڕم بەتۆ و پێغەمبەرەكەت هێناوە دەی ئەم كافرە زاڵ نەكەیت بەسەرمدا، جا پادشاكە (وای لێهات) بە ئەستەم هەناسەی بۆ دەدرا و لرخە لرخی دەهات، هەتا دەستی كرد بە لەقەفرتە)).**

## ٧- بابُ يَمِينِ الرَّجُلِ لِصَاحِبِهِ: إِنَّهُ أَخُوهُ إِذَا خَافَ عَلَيْهِ القَتْلَ أَوْ نَحْوَهُ

وَكَذَلِكَ كُلُّ مُكْرَهٍ يَخَافُ، فَإِنَّهُ يَذُبُّ عَنْهُ الظَّالِمَ وَيُقَاتِلُ دُونَهُ وَلاَ يَخْذُلُهُ، فَإِنْ قَاتَلَ دُونَ المَظْلُومِ فَلاَ قَوَدَ عَلَيْهِ وَلاَ قِصَاصَ. وَإِنْ قِيلَ لَهُ: لَتَشْرَبَنَّ الخَمْرَ، أَوْ لَتَأْكُلَنَّ المَيْتَةَ، أَوْ لَتَبِيعَنَّ عَبْدَكَ، أَوْ تُقِرُّ بِدَيْنٍ، أَوْ تَهَبُ هِبَةً وَتَحُلُّ عُقْدَةً، أَوْ لَنَقْتُلَنَّ أَبَاكَ أَوْ أَخَاكَ فِي الإِسْلاَمِ. وَسِعَهُ ذَلِكَ؛ لِقَوْلِ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ». وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: لَوْ قِيلَ لَهُ: لَتَشْرَبَنَّ الْخَمْرَ، أَوْ لَتَأْكُلَنَّ المَيْتَةَ، أَوْ لَنَقْتُلَنَّ ابْنَكَ أَوْ أَبَاكَ أَوْ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ، لَمْ يَسَعْهُ، لأَنَّ هَذَا لَيْسَ بِمُضْطَرٍّ. ثُمَّ نَاقَضَ فَقَالَ: إِنْ قِيلَ لَهُ: لَنَقْتُلَنَّ أَبَاكَ أَوِ ابْنَكَ، أَوْ لَتَبِيعَنَّ هَذَا الْعَبْدَ، أَوْ تُقِرُّ بِدَيْنٍ أَوْ تَهَبُ، يَلْزَمُهُ فِي القِيَاسِ، وَلَكِنَّا نَسْتَحْسِنُ وَنَقُولُ: الْبَيْعُ وَالْهِبَةُ وَكُلُّ عُقْدَةٍ فِي ذَلِكَ بَاطِلٌ. فَرَّقُوا بَيْنَ كُلِّ ذِي رَحِمٍ مُحَرَّمٍ وَغَيْرِهِ بِغَيْرِ كِتَابٍ وَلاَ سُنَّةٍ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «قَالَ إِبْرَاهِيمُ لاِمْرَأَتِهِ: هَذِهِ أُخْتِي". وَذَلِكَ فِي اللَّهِ». وَقَالَ النَّخَعِيُّ: إِذَا كَانَ المُسْتَحْلِفُ ظَالِمًا فَنِيَّةُ الحَالِفِ، وَإِنْ كَانَ مَظْلُومًا فَنِيَّةُ المُسْتَحْلِفِ.

## ٧- باسی سوێند خواردنی کەسێک بۆ هاوڕێکەی کە ئەو برایەتی، ئەگەر ترسی لێی هەبوو بکوژرێت یا هاوشێوەی کوشتن[١]

**هەروەها هەموو زۆرلێکراوێك کە بترسێت، چونکە بێگومان (بەو سوێندە) ستەمکارەکەی لێ دوور دەخاتەوە، وە لە پێناو مسوڵمانەکەدا دەجەنگێت و پشتی بەرنادات، جا ئەگەر جەنگی کرد لە پێناو ستەملێکراوێکدا ئەوە تۆڵە و کوشتنەوەی لەسەر نییە، وە ئەگەر بەکەسێك وترا بەدڵنیاییەوە یان عارەق دەخۆیتەوە یان مردارەوەبوو دەخۆیت، یان کۆیلەکەت دەفرۆشیت یان دان دەنێیت بە قەرزێکدا کە لەسەرتە، یان شتێك دەبەخشیت یان مامەڵەیەك[٢] هەڵدەوەشێنیتەوە کە گرێت داوە، یان باوکت یان برای ئایینیت لە ئیسلامەدا دەکوژین، دروستە ئەوانەی پێشوو بکات (بۆ ڕزگارکردنی باوك و برا دینیەکەی). بەبەڵگەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((مسوڵمان برای مسوڵمانە)).**

**وە هەندێ کەس وتوویەتی[٣]: ئەگەر کەسێك (بەزۆر لێکردن) پێی بووترێت دەبێ عارەق بخۆیتەوە یان مردارەوەبوو بخۆیت یان کوڕەکەت یان باوکت یان خزمێکت لەسەری دایکتەوە کە مەحرەمە دەکوژین، ڕێگەی نییە ئەو کارانە بکات، چونکە ئەو کەسە زۆرلێکراو نییە[٤]، پاشان پێچەوانەی ووتەکەی خۆی کردوە و دەڵێ: ئەگەر پێی وترا: باوکت یان کوڕەکەت دەکوژین یا ئەو کۆیلەیە**

---

(١) وەک بڕینی دەستی یا قاچی، ئەگەر ئەو کەسە ئەو سوێندە نەخوات کە زۆری لێدەکرێت لە لایەن ستەمکارێکەوە.

(٢) وەک تەڵاقدانی ژنەکەی یان ئازادکردنی کۆیلەکەی.

(٣) ئەبو حەنیفەیە رحمه الله.

(٤) چونکە بەلای ئەبو حەنیفەوە زۆرلێکراو کەسێک هەڕەشەی کوشتنەکە بەرانبەر بەخۆی بێت نەک خەڵکی تر.

**دەفرۆشێت، یان دان دەنێیت بە قەرزێکدا کە لەسەرتە، یان شتێك دەبەخشێت بەپێی بەراوردکاری دەبێ یەکێ لەو شتانە بکات[1]، بەڵام ئێمە پێچەوانەی بەرانبەرکاریمان هەڵبژاردووە و دەڵێین: فرۆشتن و بەخشین و هەموو مامەڵەیەك دروست نییە، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئەوانە جیاوازیان کردوە هەموو خزمێکی سەری دایك کە مەحرەم بێت لەگەڵ خزمی تردا، بەبێ بونی بەلگەی قورئان و سوننەت.**

**وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووی: ((ئیبراهیم ﷺ بە هاوسەری [2] فەرموو: ئەمە خوشکمە)) (ئیمامی بوخاری دەڵێ: ) ئەوە لە ئاینی خوادا خوشکێتی.**

**نەخەعی دەڵێ: ئەگەر سوێند دەرەکە ستەمکاربوو، ئەوە سوێند خواردنەکە لەسەر نیەتی سوێند خۆرەکەیە، بەڵام ئەگەر سوێند دەرەکە ستەم لێکراو بوو ئەوە سوێندەکە لەسەر نیەتی سوێند دەرەکەیە.**

٦٩٥١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ سَالِمًا أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ، كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ»[3].

**٦٩٥١- ئیبنو شیهاب دەڵێ: سالیم بۆی گێڕاوەتەوە کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر رضي الله عنهما بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مسوڵمان برای مسوڵمانە ستەمی لێ ناکات پشتی بەرنادات (لە بەرانبەر ناحەزیدا)، وە هەرکەس پێویستی برایەکی جێبەجێ بکات، خواش پێویستی ئەو جێبەجێ دەکات)).**

---

(١) بۆ ئەوەی باوکی و کوڕەکەی نەکوژرێت.

(٢) کەناوی سارەیە.

(٣) بڕوانە: ٢٤٤٢.

٦٩٥٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ،أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا». فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنْصُرُهُ إِذَا كَانَ مَظْلُومًا، أَفَرَأَيْتَ إِذَا كَانَ ظَالِمًا كَيْفَ أَنْصُرُهُ؟ قَالَ: «تَحْجُزُهُ -أَوْ تَمْنَعُهُ- مِنَ الظُّلْمِ، فَإِنَّ ذَلِكَ نَصْرُهُ»[1].

**٦٩٥٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((یارمەتی براکەت بدە ستەمکار بوو یان ستەم لێکراو))، جا پیاوێك عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ستەم لێکراوبوو یارمەتی دەدەم، دەی پێم بڵێ ئەگەر ستەمکار بوو چۆن یارمەتی بدەم؟ فەرمووی: ((ڕێگری لێ بکە، یان دەستی بگرە لە ستەمکردن، بێگومان ئەوە یارمەتی دانیەتی)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٤٣.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٩٠- كِتَابُ الحِيَلِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٩٠- پەڕاوی فێڵەکان

## ١- بابٌ: فِي تَرْكِ الحِيَلِ، وَأَنَّ لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى فِي الأَيْمَانِ وَغَيْرِهَا

٦٩٥٣- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷺ يَخْطُبُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ هَاجَرَ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»[1].

## ١- باسێک: لە فێڵ نەکردن، وە بێگومان هەر کەس نیاز و نیەتی چی بێت ئەوەی بۆ هەیە لە سوێندەکان و غەیر سوێندەکان

**٦٩٥٣- عەلقەمەی کوڕی وققاص دەڵێ: لە عومەری کوڕی خەتتابم ﷺ بیست وتاری دەدا وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەی خەڵکینە بێگومان هەموو کردەوەکان پەیوەستن بەنییەتەوە، بەڕاستی هەر کەسێکیش چ نییەت و مەبەستێکی (لە کردەوەکەیدا) هەبێ ئەوەی بۆ هەیە (و دەنوسرێ لای خوا)،**

(١) بڕوانە: ١.

**كەواتە هەر كەس كۆچكردنەكەی لە پێناو ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەرەكەیدا ﷺ بێت، ئەوە بەكۆچ و هیجرەت لەبەر خوا و پێغەمبەر ﷺ دادەنرێ (پاداشتی ئەوەی دەدرێتەوە)، بەڵام ئەو كەسەی كۆچكردنەكەی بۆ ئەوە بێت دونیای دەستكەوێت، یان لەبەر ئافرەتێك بێت (بۆ ئەوەی) مارەی بكات، ئەوە كۆچكردنەكەی بەپێی ئەو شتەیە كۆچی بۆ كردوە (لە لای خوا هیچ پاداشتێكی نییە) )).**

## ٢- بَابٌ: فِي الصَّلاَةِ

٦٩٥٤- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَلاَةَ أَحَدِكُمْ إِذَا أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ»[١].

## ٢- باسێک: دەربارەی نوێژ

**٦٩٥٤- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمووی: ((خوا نوێژی كەسێكتان وەرناگرێ ئەگەر دەستنوێژی شكا هەتا دەستنوێژ نەگرێت).**

## ٣- بَابٌ: فِي الزَّكَاةِ وَأَنْ لاَ يُفَرَّقَ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ وَلاَ يُجْمَعَ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ

٦٩٥٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا ثُمَامَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ أَنَسٍ، أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَتَبَ لَهُ فَرِيضَةَ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ»[٢].

---

(١) بڕوانە: ١٣٥.

(٢) بڕوانە: ١٤٤٨.

## ٣- باسێک: دەربارەی زەکات[1]، نابێ ماڵێکی (زەکاتی) پێکەوەبوو جیاکرێتەوە، هەروەها نابێ ماڵێکی جیا کۆبکرێتەوە لە ترسی زەکاتدان

**٦٩٥٥- سومامە دەڵێ: ئەنەس ﷺ بۆی گێڕایەوە کە ئەبو بەکر ﷺ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایناوبوو (لە زەکاتدا بدرێ) بۆی نووسی: ((ماڵی جیا کۆناکرێتەوە، وە ماڵی کۆ جیاناکرێتەوە لە ترسی زەکات دان)).**

٦٩٥٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي سُهَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَائِرَ الرَّأْسِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخْبِرْنِي مَاذَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: «الصَّلَوَاتِ الخَمْسَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا». فَقَالَ أَخْبِرْنِي بِمَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصِّيَامِ؟ قَالَ: «شَهْرَ رَمَضَانَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا». قَالَ أَخْبِرْنِي بِمَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الزَّكَاةِ؟ قَالَ: فَأَخبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَرَائِعَ الإِسْلاَمِ. قَالَ: وَالَّذِي أَكْرَمَكَ لاَ أَتَطَوَّعُ شَيْئًا وَلاَ أَنْقُصُ مِمَّا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ شَيْئًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ». أَوْ «دَخَلَ الْجَنَّةَ إِنْ صَدَقَ». وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ فِي عِشْرِينَ وَمِائَةِ بَعِيرٍ: حِقَّتَانِ. فَإِنْ أَهْلَكَهَا مُتَعَمِّدًا أَوْ وَهَبَهَا أَوِ احْتَالَ فِيهَا فِرَارًا مِنَ الزَّكَاةِ، فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ[2].

**٦٩٥٦- تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە: کە عەرەبیەکی دەشتەکی قژ ئاڵسکاو هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بدەرێ خوا چ نوێژێکی فەرز کردوە لەسەرم؟ ئەویش فەرمووی: ((پێنج نوێژە (فەرزە) کە مەگەر خۆت نوێژی سوننەت بکەی))، ئینجا وتی: هەواڵم بدەرێ خوا بەوەی فەرزی کردوە لەسەرم لە ڕۆژوو؟ فەرمووی: ((مانگی ڕەمەزان مەگەر خۆت**

(١) فێڵ نەکردن دەربارەی نەدانی زەکات.

(٢) بڕوانە: ٤٦.

**ڕۆژووی سوننەت بگری))، ئینجا وتی: هەواڵم بدەرێ بەوەی خوا فەرزی کردوە لەسەرم لە زەکات؟ تەڵحە دەڵێ: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێدا دەربارەی یاساکانی ئیسلام[1]، پیاوەکە وتی: سوێند بەو زاتەی ڕێزداری کردووی، بەڕاستی هیچ سووننەت و زیادەیەك ناکەم، وە لەوەش خوا فەرزی کردوە لەسەرم هیچی لێ کەم ناکەم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((سەرفراز دەبێ ئەگەر ڕاست بکات))، یان((دەڕواتە بەهەشتەوە ئەگەر ڕاست بکات)). (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) هەندێ کەس دەڵێ[2]: لە سەد و بیست وشتردا دوو وشتری مێینەی سێ ساڵان دەدرێت، جا ئەگەر وشترەکانی فەوتاند بە دەست ئەنقەست (سەربڕین)، یا بەخشینی یا فێڵێکی تیا کردن، وەك ڕاکردن لە زەکاتدان، ئەوە هیچی لەسەر نییە[3].**

٦٩٥٧- حَدَّثَنِي إِسْحَاق، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَكُونُ كَنْزُ أَحَدِكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ، يَفِرُّ مِنْهُ صَاحِبُهُ فَيَطْلُبُهُ وَيَقُولُ: أَنَا كَنْزُكَ. قَالَ: وَ اللَّهِ لَنْ يَزَالَ يَطْلُبُهُ حَتَّى يَبْسُطَ يَدَهُ فَيُلْقِمَهَا فَاهُ»[4].

**٦٩٥٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو سامانەی کەسێکتان کۆی کردۆتەوە و زەکاتی لێ نەداوە دەبێتە نێرەمارێکی سەر کەچەڵ[5]، هاوڕێکەی لە دەستی (ئەو مارە) ڕادەکات مارەکەش شوێنی دەکەوێت و دەڵێ: من سامانەکەی تۆم (کۆتدەکردەوە و زەکاتت نەدەدا)، فەرمووی: سوێند بەخوا بەردەوام شوێنی دەکەوێ هەتا کابرا دەستی درێژ دەکات مارەکەش دەیبات بە دەمیدا)).**

---

(١) دەربارەی زەکات و حەج و ئەوەی پەیوەندی پێیانەوە هەیە.

(٢) مەبەستی زانایەکی حەنەفییە.

(٣) ئەوە بەلای حەنەفییەکانەوە وایە نەهیچی لەسەرە نەسەرزەنشت دەکرێت، بەلای شافیعییەکانەوە هیچی لەسەرە نییە بەڵام سەرزەنشت دەکرێت.

(٤) بڕوانە: ٢٣٧١.

(٥) لەبەر زۆر ژەهری سەری کەچەڵ بووە.

٦٩٥٨ - وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:«إِذَا مَا رَبُّ النَّعَمِ لَمْ يُعْطِ حَقَّهَا تُسَلَّطُ عَلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، تَخْبِطُ وَجْهَهُ بِأَخْفَافِهَا». وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ فِي رَجُلٍ لَهُ إِبِلٌ فَخَافَ أَنْ تَجِبَ عَلَيْهِ الصَّدَقَةُ فَبَاعَهَا بِإِبِلٍ مِثْلِهَا، أَوْ بِغَنَمٍ، أَوْ بِبَقَرٍ، أَوْ بِدَرَاهِمَ، فِرَارًا مِنَ الصَّدَقَةِ بِيَوْمٍ احْتِيَالاً: فَلاَ بَأْسَ عَلَيْهِ، وَهْوَ يَقُولُ: إِنْ زَكَّى إِبِلَهُ قَبْلَ أَنْ يَحُولَ الحَوْلُ بِيَوْمٍ أَوْ بِسَنَةٍ، جَازَتْ عَنْهُ[1].

**٦٩٥٨- وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی[2]: ((ئەگەر خاوەن ماڵات و ئاژەڵێك زەكاتەكەی نەدابێت (لە دونیادا)، لە ڕۆژی قیامەت دا ئەو ئاژەڵە زاڵ دەكرێت بەسەر خاوەنەكەیدا سمەكانی توند دەنێت بەرووخساریدا و دەیجلیقێنێ)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) هەندێ كەس دەڵێ[3]: دەربارەی پیاوێ وشتری هەبێت و بترسێ زەكاتی لەسەر واجب بێت، ئینجا وشترەكان بفرۆشێ بە وشتری هاوشێوەی وشترەكانی خۆی، یان بەمانگا و ڕەشە وڵاخ یا بە درهەم و پارە بەرۆژێ (پێش تەواوبوونی ساڵی زەكاتەكە)، وەك ڕاكردن لە زەكاتدان بەفێڵ، ئەوە زیانی نییە بۆی، وە هەر ئەو كەسە دەڵێ: ئەگەر ئەو كەسە زەكاتی وشترەكانی بدات بەڕۆژێك پێش ئەوەی ساڵی بەسەردا بسوڕێتەوە یان ساڵێك پێش ئەوەی ساڵی بەسەردا بسوڕێتەوە ئەوە بۆی دروستە.**

٦٩٥٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ اسْتَفْتَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ الأَنْصَارِيُّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، تُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْضِهِ عَنْهَا».

وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: إِذَا بَلَغَتِ الإِبِلُ عِشْرِينَ، فَفِيهَا أَرْبَعُ شِيَاهٍ، فَإِنْ وَهَبَهَا قَبْلَ الحَوْلِ أَوْ بَاعَهَا، فِرَارًا وَاحْتِيَالاً لِإِسْقَاطِ الزَّكَاةِ، فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ، وَكَذَلِكَ إِنْ أَتْلَفَهَا فَمَاتَ فَلاَ شَيْءَ فِي مَالِهِ[4].

---

(١) بڕوانە: ٢٣٧١.

(٢) بەهەمان ڕستەی فەرموودەی پێش خۆی.

(٣) مەبەستی ئەبو حەنیفەیە ﷺ، ئیمامی بوخاری ئەوە وەک ڕەخنەگرتن دەهێنێت.

(٤) بڕوانە: ٢٧٦١.

**٦٩٥٩- عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبە لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو وتی: سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنصاری ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی نەزرێك کە لەسەر دایکی بووە، دایکی مردووە. پێش ئەوەی نەزرەکەی بەجێ بێنێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێی: ((لە جیاتی دایکت قەزای بکەرەوە و بیگێڕەرەوە))[١].**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) کەسێك دەڵێ[٢]: ئەگەر وشتر گەشتە بیست دانە، ئەوە چوار مەڕ زەکاتی یەتی، جا ئەگەر وشترەکانی بەخشی پێش تەواوبوونیساڵ یان فرۆشتی، وەك ڕاکردن یان فێڵ بۆ نەدانی زەکاتەکەی، ئەوە هیچی لەسەر نییە، هەروەها ئەگەر وشترەکانی فەوتان و خۆی مرد، ئەوە هیچ (زەکاتێ) لەماڵەکەیدا پێویست نابێ[٣].**

## ٤- بابُ الحِيلَةِ فِي النِّكَاحِ

٦٩٦٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ. قُلْتُ لِنَافِعٍ: مَا الشِّغَارُ؟ قَالَ: يَنْكِحُ ابْنَةَ الرَّجُلِ وَيُنْكِحُهُ ابْنَتَهُ بِغَيْرِ صَدَاقٍ، وَيَنْكِحُ أُخْتَ الرَّجُلِ وَيُنْكِحُهُ أُخْتَهُ بِغَيْرِ صَدَاقٍ. وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: إِنِ احْتَالَ حَتَّى تَزَوَّجَ عَلَى الشِّغَارِ، فَهْوَ جَائِزٌ، وَالشَّرْطُ بَاطِلٌ. وَقَالَ فِي الْمُتْعَةِ: النِّكَاحُ فَاسِدٌ، وَالشَّرْطُ بَاطِلٌ. وَقَالَ بَعْضُهُمُ الْمُتْعَةُ وَالشِّغَارُ جَائِزٌ، وَالشَّرْطُ بَاطِلٌ[٤].

---

(١) هەر کەس مرد و نەزر قەرزار بوو کەس و کارەکەی بۆی بکەن و قەزای کەنەوە بۆی.

(٢) مەبەستی ئەبو حەنیفەیە ﷺ.

(٣) کە بووەتە ماڵی واریسەکانی.

(٤) بڕوانە: ٥١١٢.

## ٤- باسی فێڵ (نەكردن) لە مارەكردندا

**٦٩٦٠- نافیع لە عەبدوڵڵاوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ مارەكردنی شیغاری قەدەغە كرد، (عوبەیدوڵڵا دەڵێ) وتم: بەنافیع شیغار چیە؟ وتی: پیاوێك كچی پیاوێك مارە دەكات (بۆ خۆی) و كچەكەی خۆشی بۆ پیاوەكە مارە دەكات بە بێ مارەیی[١]، وە پیاوێك خوشكی پیاوێك مارە دەكات و خوشكی خۆی بۆ پیاوەكە مارە دەكات بەبێ مارەیی.**

**هەندێكیان[٢] دەڵێن: ئەگەر فێڵی كرد هەتا بەژن بەژن مارەی كرد ئەوە دروستە و مەرجەكە (نەبوونی مارەیی) دروست نییە.**

**وە دەربارەی مارەكردنی كاتی[٣] دەڵێ: مارەكردنەكە دروست نییە و مەرجەكەش[٤] دروست نییە، بەڵام هەندێكیان[٥] دەڵێ: مارەكردنی شیغار و مارەكردنی كاتی هەردووكیان دروستن و مەرجەكەیان دروست نییە.**

٦٩٦١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنِ الحَسَنِ وَعَبْدِ اللَّهِ ابْنَيْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ عَنْ أَبِيهِمَا، أَنَّ عَلِيًّا ﷺ قِيلَ لَهُ: إِنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ لاَ يَرَى بِمُتْعَةِ النِّسَاءِ بَأْسًا. فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْهَا يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ. وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: إِنِ احْتَالَ حَتَّى تَمَتَّعَ، فَالنِّكَاحُ فَاسِدٌ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: النِّكَاحُ جَائِزٌ وَالشَّرْطُ بَاطِلٌ[٦].

---

(١) هەردوو كچەكە مارەییان بۆ دانانێن.
(٢) لە زانایانی حەنەفییە.
(٣) كە پێشی دەڵێن موتعە و سیغە.
(٤) بۆ ماوەیەكی دیاریكراو بێت.
(٥) لە زانایانی حەنەفی كە زوفەرە.
(٦) بڕوانە: ٤٢١٦.

٦٩٦١- حەسەن و عەبدوڵڵای کوڕانی موحەممەدی کوڕی عەلی لە باوکیانەوە دەیگێڕنەوە کە بە عەلی ﷺ وترا: بێگومان ئیبنو عەبباس ﷺ مارەکردنی کاتی ژنانی [1] بەلایەوە ئاساییە (و حەرام نییە)، عەلیش وتی: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا ئەو (مارەکردنی کاتی ژنان) و خواردنی گۆشتی کەری ماڵی قەدەغە کرد.

وە هەندێ کەس [2] دەڵێ: ئەگەر پیاوێك فێڵی کرد بۆ ئەوەی مارەکردنی کاتی بکات، ئەوە مارەکردنەکە دروست نییە، وە کەسێکیان دەڵێ: مارەکردنەکە دروستە و مەرجەکە بەتاڵە.

## ٥- باب مَا يُكْرَهُ مِنَ الاحْتِيَالِ فِي الْبُيُوعِ، وَلاَ يُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ لِيُمْنَعَ بِهِ فَضْلُ الْكَلإِ

٦٩٦٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ لِيُمْنَعَ بِهِ فَضْلُ الْكَلأِ»[3].

## ٥- باسی ئەوەی کە ناپەسەندە لە فێڵ کردن لە مامەڵەدا، وە باسی ئاوی زیادە قەدەغە ناکرێت تا بەهۆیەوە لەوەڕگا قەدەغە بکرێت

٦٩٦٢- ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئاوی زیادە قەدەغە ناکرێت تا بەهۆیەوە لەوەڕگا قەدەغە بکرێت)).

---

(١) (متعة النساء) واتە: مارە کردنی ئافرەتان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە بەرانبەر بڕێک پارەدا.

(٢) مەبەستی ئەبو حەنیفەیە ﷬.

(٣) بڕوانە: ٢٣٥٣.

## ٦- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ التَّنَاجُشِ

٦٩٦٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ مَالِكٍ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ النَّجْشِ[1].

## ٦- باسی ئەوەی ناپەسەندە لە زەمکاری بەنیازی فێڵ

**٦٩٦٣- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە زەمکاری بەنیازی فێڵ[2].**

## ٧- بابُ مَا يُنْهَى مِنَ الْخِدَاعِ فِي الْبُيُوعِ

وَقَالَ أَيُّوبُ: يُخَادِعُونَ اللَّهَ كَمَا يُخَادِعُونَ آدَمِيًّا، لَوْ أَتَوُا الأَمْرَ عِيَانًا كَانَ أَهْوَنَ عَلَيَّ

.٦٩٦٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَجُلاً ذَكَرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي البُيُوعِ، فَقَالَ: «إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ: لاَ خِلاَبَةَ»[3].

## ٧- باسی ئەوەی ڕێگری لێکراوە لە فێڵ کردن لە کڕین و فرۆشتنەکاندا

**ئەیوب دەڵێ: (کەسانێك) فێڵ لە خوا دەکەن[4]، وەك چۆن فێڵ لە ئادەمیزادێك دەکەن، ئەگەر ئەو کارە بەئاشکرا بکەن، بەلای منەوە ئاسانترە (لە فێڵەکەیان).**

---

(١) بڕوانە: ٢١٤٢.

(٢) واتە: ئەو کەسەی نرخی کاڵایەک بەرز دەکاتەوە، زەم دەکات بەسەر کەسێکی تردا، مەبەستی کڕینی ئەو کاڵایە نییە، بەڵکو مەبەستی خەڵەتاندنی کەسێکی ترە تا کاڵاکە بە نرخێکی بەرزتر بفرۆشێت بەو کەسە.

(٣) بڕوانە: ٢١١٧.

(٤) بەلای خۆیانەوە چونکە کەس ناتوانێ فێڵ لە خودا بکات.

**٦٩٦٤- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد کە ئەو لە مامەڵەدا دەخەڵەتێنرێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەر کات مامەڵەت کرد بڵێ: خەڵەتاندن (لە ئیسلامدا) نییە)).**

## ٨- بابُ مَا يُنْهَى مِنَ الاحْتِيَالِ لِلْوَلِيِّ فِي الْيَتِيمَةِ الْمَرْغُوبَةِ، وَأَنْ لاَ يُكَمِّلَ صَدَاقَهَا

٦٩٦٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، حَدَّثَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: كَانَ عُرْوَةُ يُحَدِّثُ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ ﴿٣﴾ ﴾ النساء. قَالَتْ: هِيَ الْيَتِيمَةُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا، فَيَرْغَبُ فِي مَالِهَا وَجَمَالِهَا، فَيُرِيدُ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِأَدْنَى مِنْ سُنَّةِ نِسَائِهَا، فَنُهُوا عَنْ نِكَاحِهِنَّ، إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ فِي إِكْمَالِ الصَّدَاقِ، ثُمَّ اسْتَفْتَى النَّاسُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعْدُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ ﴿١٢٧﴾ ﴾ النساء. فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[١].

## ٨- باسی ئەوەی ڕێگری کراوە لە فێڵ کردنی سەرپەرشتیاری کچی هەتیو کە خۆی لێی دەکات[٢] بەڵام مارەیی تەواوی خۆی[٣] پێ نادات

**٦٩٦٥- زوهری دەڵێ: عوروە دەگێڕێتەوە کە ئەو پرسیاری لە عائیشە ﵂ کرد دەربارەی ئەم ئایەتە: (وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن لە (مارەیی) ئەو ئافرەتە بێ باوکانەدا (مارەیان مەکەن)، ئەوە مارە بکەن لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان)، عائیشەش وتی: ئەو کچە هەتیومیە لای سەرپەرشتیارەکەیەتی، وە**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٩٤.

(٢) مارەی کات.

(٣) واتە: مارەیی هاوشێوەی خۆی پێ نادات بەڵکو کەمتری دەداتێ فێڵی لێ دەکات.

سەرپەرشتیارەكە حەزی لە سامان وجوانی كچە هەتیوەكەیە، دەیەوێ مارەی كات لەخۆی بە كەمتر لە مارەیی ئافرەتی هاوشێوەی خۆی، لەبەر ئەوە ڕێگریان لێكرا ئەو كچە هەتیوانە مارە بكەن، مەگەر دادگەر بن بەرانبەریان و بە تەواوی مافی مارەییان پێ بدەن، پاشان خەڵكی دوای دابەزینی ئەو ئایەتە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وە (ئەی موحەممەد) پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی ئافرەتان) ئینجا فەرموودەكەی باسكرد.

## ٩- بابٌ: إِذَا غَصَبَ جَارِيَةً فَزَعَمَ أَنَّهَا مَاتَتْ فَقُضِيَ بِقِيمَةِ الجَارِيَةِ الْمَيِّتَةِ، ثُمَّ وَجَدَهَا صَاحِبُهَا، فَهْيَ لَهُ وَيَرُدُّ الْقِيمَةَ، وَلاَ تَكُونُ القِيمَةُ ثَمَنًا.

وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: الجَارِيَةُ لِلْغَاصِبِ لأَخْذِهِ الْقِيمَةَ، وَفِي هَذَا احْتِيَالٌ لِمَنِ اشْتَهَى، جَارِيَةَ رَجُلٍ لاَ يَبِيعُهَا، فَغَصَبَهَا وَاعْتَلَّ بِأَنَّهَا مَاتَتْ حَتَّى يَأْخُذَ رَبُّهَا قِيمَتَهَا، فَيَطِيبُ لِلْغَاصِبِ جَارِيَةَ غَيْرِهِ. قَالَ: «أَمْوَالُكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ»، «وَلِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

## ٩- باسێک: ئەگەر پیاوێک کەنیزەکێکی داگیرکرد، ئینجا بەدرۆ وتی کەنیزەکەکە مردووە و بڕیار درا لە دژی بە (بژاردنی) نرخی کەنیزەکەکە مردووەکە، لە پاشان خاوەنی کەنیزەکەکە کەنیزەکەکەی بەزیندوویی دۆزییەوە، ئەوە هی خۆیەتی، و نرخەکەی دەگێڕێتەوە (بۆ داگیرکەرەکە)، ئەو پارەیەی لەسەر دانرابوو (بە زیندوویی) نابێتە نرخی کەنیزەکەکە

وە كەسێك دەڵێ[1]: كەنیزەكەكە بۆ داگیركەرەكەیە، لەبەر وەرگرتنی نرخەكەی (لە لایەن خاوەنەكەیەوە)، وە لە ئەمەدا فێڵ كردنێك هەیە بۆكەسێك حەز لە كەنیزەكی پیاوێكە نایفرۆشێت و داگیری دەكات و بیانو دێنێتەوە كە مردووە، هەتا خاوەنی كەنیزەكەكە

---

(١) كە ئەبو حەنیفەیە ؒ.

**نرخەکەی وەرگرێ، ئینجا کەنیزەکی کەسێك بۆ داگیرکەرەکە حەڵاڵ دەبێت.**

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ماڵ و سامانتان بۆ یەکتری حەرامە لەسەرتان[١]))، وە فەرموویەتی: ((هەموو ناپاك و پەیمان شکێنێك لە ڕۆژی قیامەتدا بەیداخێکی هەیە)).**

٦٩٦٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قال: «لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُعْرَفُ بِهِ»[٢].

**٦٩٦٦- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((هەموو غەدرکارێك لە ڕۆژی دواییدا بەیداغێکی هەیە پێی دەناسرێت)).**

## ١٠- بابٌ

٦٩٦٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، وَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا، فَلاَ يَأْخُذْ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ»[٣].

## ١٠- باسێک

**٦٩٦٧- ئوممو سەلەمە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان منیش هەر مرۆڤێکم، ئێوەش ناکۆکی و کێشەتان دێننە لام، وە لەوانەیە هەندێکتان چاکتر بتوانن بەڵگەکەی بخاتەڕوو[٤]، منیش بڕیاری بۆ بدەم لەسەر ئەوەی دەیبیستم، جا هەر کەس بڕیاری شتێکم بۆدا لە مافی براکەی ئەوە وەری نەگرێت، چونکە بەدڵنیاییەوە پارچەیەك لە ئاگری (دۆزەخی) بۆ دەبڕم و بڕیاری دەدەم)).**

---

(١) واتە: نابێ ماڵی یەکتری بخۆن چونکە حەڕامە لەسەرتان.

(٢) بڕوانە: ٣١٨٨.

(٣) بڕوانە: ٢٤٥٨.

(٤) زمان پاراوترین و قسەزانترین بەخستنە ڕووی بەڵگەکەتان.

## ١١- بابٌ: فِي النِّكَاحِ

٦٩٦٨- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، وَلاَ الثَّيِّبُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ». فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: «إِذَا سَكَتَتْ». وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: إِنْ لَمْ تُسْتَأْذَنِ البِكْرُ وَلَمْ تَزَوَّجْ. فَاحْتَالَ رَجُلٌ فَأَقَامَ شَاهِدَيْ زُورٍ أَنَّهُ تَزَوَّجَهَا بِرِضَاهَا، فَأَثْبَتَ القَاضِي نِكَاحَهَا، وَالزَّوْجُ يَعْلَمُ أَنَّ الشَّهَادَةَ بَاطِلَةٌ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَطَأَهَا، وَهْوَ تَزْوِيجٌ صَحِيحٌ[1].

## ١١- باسێک: (لە شایەتی درۆدان) لەمارەکردندا

**٦٩٦٨-ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((کچ نادرێ بە شوو تا مۆڵەتی (ڕازی بوونی) لێ وەر نەگیرێت، وە بێوەژن مارە ناکرێ و نادرێ بە شوو تا ڕای وەرنەگیرێت))، جا عەرزی کرا ئەی پێغەمبەری خودا مۆڵەتی کچ چۆنە؟ فەرمووی: ((کە (وتت ڕازیت) بێدەنگ بێت)).**

**وە هەندێ کەس[2] دەڵێ: ئەگەر مۆڵەت لە کچ وەرنەگیرێت و شوو نەکات، پیاوێك فێڵێکی کرد دوو شایەتی درۆی هێنا شایەتییان دا کە ئەو (پیاوە) ئەو ئافرەتەی مارە کردوە بەڕەزامەندی ئافرەتەکە خۆی، قازیش مارەکردنەکەی جێگیر کرد و دایمەزراند، مێردەکەش دەزانێ کە شایەتیدانەکە درۆیە، ئەوە قەینا سەرجێی لەگەڵدا بکات، وە ئەوە مارەکردنێکی ڕاست و دروستە.**

(١) بڕوانە: ٥١٣٦.

(٢) مەبەستی ئیمام ئەبو حەنیفەیە ﷺ.

٦٩٦٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ القَاسِمِ، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ وَلَدِ جَعْفَرٍ تَخَوَّفَتْ أَنْ يُزَوِّجَهَا وَلِيُّهَا وَهْيَ كَارِهَةٌ فَأَرْسَلَتْ إِلَى شَيْخَيْنِ مِنَ الأَنْصَارِ: عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَمُجَمِّعٍ ابْنَيْ جَارِيَةَ، قَالاَ: فَلاَ تَخْشَيْنَ، فَإِنَّ خَنْسَاءَ بِنْتَ خِذَامٍ أَنْكَحَهَا أَبُوهَا وَهْيَ كَارِهَةٌ، فَرَدَّ النَّبِيُّ ﷺ ذَلِكَ. قَالَ سُفْيَانُ: وَأَمَّا عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ، عَنْ أَبِيهِ: إِنَّ خَنْسَاءَ[١].

**٦٩٦٩- یەحیای کوڕی سەعید لە قاسیمەوە دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێك کە کچی کوڕێکی جەعفەر[٢] بوو، ترسا لەوەی سەرپەرشتیارەکەی بیدات بەشوو لە کاتێکدا ئەو ئافرەتە پێی خۆش نییە، بۆیە ناردی بۆ لای دوو پیاوی بەتەمەنی ئەنصاری (کە عەبدوڕەحمان و موجەممەعی کوڕانی جاریە[٣] بوون)، هەردووکیان وتیان: هیچ مەترسە، چونکە بەڕاستی خەنسای کچی خیزام باوکی مارەی کرد (بۆ کەسێك) لە کاتێکدا خەنسا ناڕازی بوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئەو مارەکردنەی هەڵوەشاندەوە و ڕەددی کردەوە.**

**سوفیان دەڵێ: بەڵام عەبدوڕەحمان من لێم بیست دەیووت و لە باوکیەوە دەیگێڕایەوە: کە بێگومان خەنسا... هتد.**

٦٩٧٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلاَ تُنْكَحُ البِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ». قَالُوا كَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: «أَنْ تَسْكُتَ». وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: إِنِ احْتَالَ إِنْسَانٌ بِشَاهِدَيْ زُورٍ عَلَى تَزْوِيجِ امْرَأَةٍ ثَيِّبٍ بِأَمْرِهَا، فَأَثْبَتَ القَاضِي نِكَاحَهَا إِيَّاهُ، وَالزَّوْجُ يَعْلَمُ أَنَّهُ لَمْ يَتَزَوَّجْهَا قَطُّ، فَإِنَّهُ يَسَعُهُ هَذَا النِّكَاحُ، وَلاَ بَأْسَ بِالْمُقَامِ لَهُ مَعَهَا[٤].

---

(١) بڕوانە: ٥١٣٨.

(٢) لەوانەیە جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب بێت.

(٣) ڕاستر وایە جاریە باپیرەیانە و باوکیان ناوی یەزیدە.

(٤) بڕوانە: ٥١٣٦.

**٦٩٧٠- ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێوەژن مارە ناكرێ و نادرێ بە شوو تا ڕای وەرنەگیرێت، وە كچ نادرێ بە شوو تامۆڵەتی (ڕازی بوونی) لێ وەرنەگیرێت))، عەرزیان كرد مۆڵەتی كچ چۆنە؟ فەرمووی: ((كە (وتت ڕازیت) بێدەنگ بێت)).**

**وە هەندێ كەس[1] دەڵێ: ئەگەر پیاوێ بەدوو شایەتی درۆ فێڵ بكات لەسەر مارەكردنی بێوەژنێك بەفەرمانی خودی بێوەژنەكە، ئینجا قازی مارەكردنەكەی دامەزراند لەگەڵ ئەو پیاوەدا، مێردەكەش چاك دەزانێ كە هەرگیز ئەو ژنەی مارە نەكردوە، ئەوە بەڕاستی ئەو مارەكرنەی (قازی) بەسە، وە زیانی نییە پیاوەكە لەگەڵیدا بێت (ژن و مێردبن).**

**٦٩٧١-** حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ ذَكْوَانَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «البِكْرُ تُسْتَأْذَنُ». قُلْتُ: إِنَّ البِكْرَ تَسْتَحْيِي. قَالَ: «إِذْنُهَا صُمَاتُهَا». وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: إِنْ هَوِيَ رَجُلٌ جَارِيَةً يَتِيمَةً أَوْ بِكْرًا، فَأَبَتْ فَاحْتَالَ فَجَاءَ بِشَاهِدَيْ زُورٍ عَلَى أَنَّهُ تَزَوَّجَهَا، فَأَدْرَكَتْ فَرَضِيَتِ اليَتِيمَةُ،فَقَبِلَ القَاضِي شَهَادَةَ الزُّورِ، وَالزَّوْجُ يَعْلَمُ بِبُطْلاَنِ ذَلِكَ، حَلَّ لَهُ الوَطْءُ[2].

**٦٩٧١- زەكوان لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((كچ مۆڵەتی لێ دەخوازرێت))، وتم: بێگومان كچ شەرم دەكات، فەرمووی: ((بێدەنگی كچ مۆڵەت دانێتی)).**

---

(١) مەبەستی ئیمام ئەبو حەنیفەیە ﵀.

(٢) بڕوانە: ٥١٣٧.

وە هەندێ کەس [1] دەڵێ: ئەگەر پیاوێ حەز لە کچێکی هەتیو بکات یان حەز لە کچێك بکات کچەکە ڕازی نەبێت (شووی پێ بکات)، ئینجا پیاوەکە فێڵی کرد و دوو شایەتی درۆی هێنا و لەسەر ئەوەی کە مارەی کردوە، ئینجا کچە (هەتیوە)کە باڵغ بوو، وە کچە (ناڕازییەکە) ڕازی بوو (شووی پێ بکات)، قازیش شایەتی دوو شایەتە درۆکەی قەبوڵ کرد، مێردەکەش بەبەتاڵی ئەو شایەتەی دەزانی، دروستە بۆی سەرجێی لەگەڵ بکات.

## ١٢- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنِ احْتِيَالِ المَرْأَةِ مَعَ الزَّوْجِ وَالضَّرَائِرِ، وَمَا نَزَلَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي ذَلِكَ

٦٩٧٢- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ الحَلْوَاءَ، وَيُحِبُّ العَسَلَ، وَكَانَ إِذَا صَلَّى العَصْرَ أَجَازَ عَلَى نِسَائِهِ فَيَدْنُو مِنْهُنَّ، فَدَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ فَاحْتَبَسَ عِنْدَهَا أَكْثَرَ مِمَّا كَانَ يَحْتَبِسُ، فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ (فَقالَ) لِي: أَهْدَتِ امْرَأَةٌ مِنْ قَوْمِهَا عُكَّةَ عَسَلٍ، فَسَقَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنْهُ شَرْبَةً. فَقُلْتُ: أَمَا وَاللَّهِ لَنَحْتَالَنَّ لَهُ. فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِسَوْدَةَ، قُلْتُ: إِذَا دَخَلَ عَلَيْكِ فَإِنَّهُ سَيَدْنُو مِنْكِ، فَقُولِي لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ فَإِنَّهُ سَيَقُولُ: لاَ. فَقُولِي لَهُ: مَا هَذِهِ الرِّيحُ؟ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَشْتَدُّ عَلَيْهِ أَنْ تُوجَدُ مِنْهُ الرِّيحُ، فَإِنَّهُ سَيَقُولُ: سَقَتْنِي حَفْصَةُ شَرْبَةَ عَسَلٍ. فَقُولِي لَهُ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ العُرْفُطَ. وَسَأَقُولُ ذَلِكَ، وَقُولِيهِ أَنْتِ يَا صَفِيَّةُ. فَلَمَّا دَخَلَ عَلَى سَوْدَةَ، قُلْتُ: تَقُولُ سَوْدَةُ: وَالَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَقَدْ كِدْتُ أَنْ أُبَادِرَهُ بِالَّذِى قُلْتِ لِي وَإِنَّهُ لَعَلَى البَابِ، فَرَقًا مِنْكِ، فَلَمَّا دَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ قَالَ: «لاَ». قُلْتُ: فَمَا هَذِهِ الرِّيحُ؟ قَالَ: «سَقَتْنِي حَفْصَةُ شَرْبَةَ عَسَلٍ». قُلْتُ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ العُرْفُطَ. فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيَّ قُلْتُ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ. وَدَخَلَ عَلَى صَفِيَّةَ فَقَالَتْ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ.

---

(١) مەبەستی ئیمام ئەبو حەنیفەیە رحمه الله.

فَلَمَّا دَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ قَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلاَ أَسْقِيكَ مِنْهُ؟ قَالَ: «لاَ حَاجَةَ لِي بِهِ». قَالَتْ: تَقُولُ سَوْدَةُ سُبْحَانَ اللَّهِ لَقَدْ حَرَمْنَاهُ. قَالَتْ: قُلْتُ لَهَا: اسْكُتِي[1].

## ١٢- باسی ئەوەی کە ناپەسەندە ژن فێڵ بکات لە مێرد و هەوێکانی، وە باسی ئەوەی لەو بارەیەوە دابەزی بۆ پێغەمبەر ﷺ

**٦٩٧٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لە حەڵوا دەکرد، وە حەزی لە هەنگوین دەکرد، وە کە لە نوێژی عەسر دەگەڕایەوە دەڕۆشت بۆ لای ژنەکانی، جا لێیان نیزك دەبوویەوە[2]، وە ڕۆشتە لای حەفصە ﵂ و زیاتر لەوەی کە لای دەمایەوە لای مایەوە، منیش لەو بارەیەوە پرسیارم کرد، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی پێم: ژنێکی خزمی خۆی هیزەیەك هەنگوینی بەدیاری بۆ هێنابوو، حەفصەش شەربەتی هەنگوینی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش وتم: وەڵڵاهی دەبێ فێڵێکی لێ بکەین، ئینجا ئەوەم بۆ سەودەی کچی زەمعە باسکرد و وتم: کە پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆلات بە دڵنیاییەوە لێت نزیك دەبێتەوە[3]، ئەوە پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا مەغافیرت خواردووە؟ جا بێگومان ئەویش بە تۆ دەڵێ: نەخێر (نەم خواردووە) ئینجا پێی بڵێ: ئەی ئەم بۆنە چییە (هەستی پێدەکەم لێت)؟ پێغەمبەر ﷺ هەمیشە زۆر پێی ناخۆشە بۆنی ناخۆشی لێ بێت، بۆیە بەدڵنیاییەوە ئەویش دەفەرمووێ: حەفصە هەندێ شەربەتی هەنگوینی دامێ خواردمەوە، ئەوسا پێی بڵێ: هەنگەکەی بەداری عورفوتەوە نیشتۆتەوە[4]، منیش ئەو وتەیە ئەڵێم پێی، ئەی**

---

(١) بڕوانە: ٤٩١٢.

(٢) ماچی دەکرد یا یاری لەگەڵ دەکرد.

(٣)یاری و دەستبازیت لەگەڵ بکات.

(٤) گەڵاو گوڵی ئەو دارەی مژیوە کە مەغافیر دەر دەدات، وە کەتیرە دەر دەکات.

صەفیە تۆش وا بڵێ، عائیشە وتی: جا كاتێ پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ژوورەوە بۆ لای سەودە، وتم: سەودە دەیوت: جا سوێند بە خوا كە هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لە ئەو، بەڕاستی كە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە دەرگاكەم لە ترسی تۆ ویستم هەر لەوێدا ئەوی كە تۆ پێت وتم عەرزی بكەم، جا كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لێم نزیك بوویەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەغافیرت خواردووە؟ فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: ئەی ئەم بۆنە ناخۆشە چییە؟ فەرمووی: ((حەفصە شەربەتی هەنگوینی پێداوم (خواردوومەتەوە) ))، وتم: هەنگەكەی بەداری عورفوتەوە نیشتۆتەوە، ئینجا كە هاتە ژوورەوە بۆ لای منیش وەك قسەكەی ئەوم پێ وت، وە كە ڕۆشتە ژوورەوە بۆ لای صەفیەش هەمان قسەی پێی وتبوو، ئنجا كە ڕۆشتبویە ژوورەوە بۆلای حەفصە پێی وتبوو: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو هەنگوینەت بدەمێ؟ فەرمووی: ((نەخێر پێویستم پێی نییە))، عائیشە دەڵێ: سەودە وتی: پاك و بێگەردی بۆ خوا بێگومان هەنگوین خواردنمان لێ قەدەغە كرد، (عائیشە) دەڵێ: وتم كچێ بێ دەنگبە.

## ١٣- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ الاِحْتِيَالِ فِي الفِرَارِ مِنَ الطَّاعُونِ

٦٩٧٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الشَّأْمِ، فَلَمَّا جَاءَ بِسَرْغَ بَلَغَهُ أَنَّ الْوَبَاءَ وَقَعَ بِالشَّأْمِ، فَأَخْبَرَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَمِعْتُمْ بِأَرْضٍ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ». فَرَجَعَ عُمَرُ مِنْ سَرْغَ[1]. وَعَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ عُمَرَ إِنَّمَا انْصَرَفَ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ.

---

(١) بڕوانە: ٥٧٢٩.

## ١٣- باسی ئەوەی كە ناپەسەندە لە فێڵكردن لە ڕاكردن لە چاوە قووڵە[1]

**٦٩٧٣- عەبدوڵڵای كوڕی عامیری كوڕی ڕەبیعە دەگێڕێتەوە كە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ ڕۆشت بۆ شام، جا كاتێ چووە سەرغ[2]، هەواڵی پێ گەیشت كە دەردێكی گشتی لە شام كەوتۆتەوە، ئینجا عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف ﷺ بۆی گێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر بیستان چاوە قووڵە لە وڵاتێكدا كەوتۆتەوە[3] ئەوا مەچن بۆ ئەو وڵاتە، وە ئەگەر چاوە قووڵە لە وڵاتێكدا بڵاوبوو بوویەوە و ئێوە تێیدابوون، ئەوە دەرمەچن و ڕامەكەن لێی)) ئینجا عومەر ﷺ لەسەرغ گەڕایەوە.**

**وە ئیبنو شیهاب لە سالیمی كوڕی عەبدوڵڵاوە دەگێڕێتەوە كە بێگومان عومەر ﷺ بە (بەڵگەی) فەرموودەكەی عەبدوڕەحمان گەڕایەوە.**

٦٩٧٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، حَدَّثَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنَا عَامِرُ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ يُحَدِّثُ سَعْدًا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَكَرَ الوَجَعَ فَقَالَ: «رِجْزٌ - أَوْ: عَذَابٌ- عُذِّبَ بِهِ بَعْضُ الأُمَمِ، ثُمَّ بَقِيَ مِنْهُ بَقِيَّةٌ، فَيَذْهَبُ الْمَرَّةَ وَيَأْتِي الأُخْرَى، فَمَنْ سَمِعَ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ يَقْدَمَنَّ عَلَيْهِ، وَمَنْ كَانَ بِأَرْضٍ وَقَعَ بِهَا فَلاَ يَخْرُجْ فِرَارًا مِنْهُ»[4].

**٦٩٧٤- زوهری دەڵێ: عامیری كوڕی سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص گێڕایەوە كە لە ئوسامەی كوڕی زەیدی ﷺ بیست دەیگێڕایەوە بۆ سەعد كە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی چاوە قووڵەی كرد و فەرمووی: ((ئازارێكە (یان سزایەكە) سزای**

---

(١) چاوە قووڵە پێشی دەڵێن: ژقنە.
(٢) گوندێكە یا شارێكە ١٣ قۆناغ لە مەدینەوە دوورە.
(٣) پەیدابووە و بڵاوبۆتەوە.
(٤) بڕوانە: ٣٤٧٣.

**هەندێ گەلی پێ دراوە، لە پاشان پاشماوەیەکی لێ ماوەتەوە جارێ دەڕوا و جارێ دێتەوە، ئینجا هەر کەس بیستی چاوە قووڵە لە زەوی وڵاتێك دایە ئەوە با نەڕوات بۆئەو وڵات و جێگایە، وە هەر کەسیش لە وڵاتێکدابوو چاوە قووڵە تێیدا پەیدابوو، ئەوە با دەرنەچێت وەك ڕاکردن لێی)).**

## ١٤- بَابٌ: فِي الهِبَةِ وَالشُّفْعَةِ

وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: إِنْ وَهَبَ هِبَةً أَلْفَ دِرْهَمٍ أَوْ أَكْثَرَ، حَتَّى مَكَثَ عِنْدَهُ سِنِينَ، وَاحْتَالَ فِي ذَلِكَ، ثُمَّ رَجَعَ الوَاهِبُ فِيهَا، فَلاَ زَكَاةَ عَلَى وَاحِدٍ مِنْهُمَا، فَخَالَفَ الرَّسُولَ ﷺ فِي الهِبَةِ وَأَسْقَطَ الزَّكَاةَ.

٦٩٧٥- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَيُّوبَ السَّخْتِيَانِيِّ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ، لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ»[1].

## ١٤- باسێک: (باسی ئەوەی ناپەسەندە لە فێڵ کردن) لە بەخشین و هەڵگرتنەوەدا

**وە هەندێ کەس دەڵێ[2]: ئەگەر کەسێك بەخشینێك ببەخشێت، هەزار درهەم بێت یا زیاتر هەتا چەن ساڵ ماڵەکە بمێنێتەوە (لای ئەو کەسەی پێی بەخشراوە) لەو کارەدا فێڵ بکات[3]، لە پاشان بەخشەرەکە پەشیمان بێتەوە [4]، ئەوە لەو کاتەدا هیچ کامیان زەکاتیان لەسەر نییە، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئەو**

---

(١) بڕوانە: ٢٥٨٩.

(٢) مەبەستی ئیمام ئەبو حەنیفەیە ﵀.

(٣) لەگەڵ ئەو کەسەی پێی بەخشیوە ڕێک کەوتووە ژێربەژێر.

(٤) ماڵەکەی لێ وەرگرێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ خۆی.

**کەسە (ئەبو حەنیفە) لە بەخشینەکەدا پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری ﷺ کردوە[1]، هەروەها لە زەکات لێ نەکەوتنەکەشدا (بەهەڵەدا چووە)[2].**

**٦٩٧٥- ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پاشگەز دەبێتەوە وەك سەگ وایە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی خۆی (و بیخوات)، ئێمە نموونەی ناشیرینمان نییە (وەك ئەم نموونە) )).**

٦٩٧٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: إِنَّمَا جَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ الشُّفْعَةَ فِي كُلِّ مَا لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ فَلاَ شُفْعَةَ.
وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: الشُّفْعَةُ لِلْجِوَارِ. ثُمَّ عَمَدَ إِلَى مَا شَدَّدَهُ فَأَبْطَلَهُ، وَقَالَ: إِنِ اشْتَرَى دَارًا فَخَافَ أَنْ يَأْخُذَ الْجَارُ بِالشُّفْعَةِ، فَاشْتَرَى سَهْمًا مِنْ مِائَةِ سَهْمٍ، ثُمَّ اشْتَرَى الْبَاقِيَ، وَكَانَ لِلْجَارِ الشُّفْعَةُ فِي السَّهْمِ الأَوَّلِ، وَلاَ شُفْعَةَ لَهُ فِي بَاقِي الدَّارِ، وَلَهُ أَنْ يَحْتَالَ فِي ذَلِكَ[3].

**٦٩٧٦- جابیری کوڕی عەبدوڵلا رضي الله عنهما دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ شوفعەی[4] داناوە لە هەموو ماڵێکدا هاوبەش بێت و بەش نەکرابێت، جا ئەگەر سنوورەکان دانران و ڕێگا و بانەکان دیاری کران ئیتر شوفعە نییە.**
**وە هەندێ کەس[5] دەڵێ: هەڵگرتنەوە بۆ دراوسێیەتیە، لە پاشان چووە ئەومەندە توندی کردوە هەڵیوەشاندووەتەوە، وە دەڵێ: ئەگەر خانوویەکی کڕی و ترسا دراوسێکەی بەهەڵگرتنەوە بیبات، ئینجا یەك پشکی کڕی لە سەد پشك لە پاشان**

---

(١) ماڵ بەخشرا پەشیمان بوونەوەی تێدا نییە جگەلە بەخشینی بەکوڕی خۆی کە دەتوانێ لێی سەنێتەوە.
(٢) چونکە کە ساڵی بەسەردابوو لا پێی بەخشراوەکە دەبێ زەکاتی بدات.
(٣) بڕوانە: ٢٢٣١.
(٤) شوفعە: واتە یەکێک لە هاوبەشەکان بەشەکەی خۆی بفرۆشێ، ئەنجا هاوبەشەکەی تری بڕوات شتەکە لە کڕیارەکە بسەنێتەوە بەو پارەی پێی کڕیوە، هەرچەند پێشی خۆش نەبێت.
(٥) ئەبوحەنیفە.

**ئەوی مابوو كڕی، وە دراوسێكەی مافی هەڵگرتنەوەی هەیە لە پشكی یەكەمیاندا، بەڵام ئەو پیاوە مافی هەڵگرتنەوەی نییە لە ماوەی خانووەكە، وە بۆ ئەو كەسەی (خانووەكەی كڕی) بۆی هەیە كە فێڵ بكات لەوەدا [1].**

٦٩٧٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مَيْسَرَةَ، سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ الشَّرِيدِ قَالَ: جَاءَ الْمِسْوَرُ بْنُ مَخْرَمَةَ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى مَنْكِبِي، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ إِلَى سَعْدٍ فَقَالَ أَبُو رَافِعٍ لِلْمِسْوَرِ: أَلاَ تَأْمُرُ هَذَا أَنْ يَشْتَرِيَ مِنِّي بَيْتِي الَّذِي فِي دَارِي؟ فَقَالَ: لاَ أَزِيدُهُ عَلَى أَرْبَعِمِائَةٍ، إِمَّا مُقَطَّعَةٍ وَإِمَّا مُنَجَّمَةٍ. قَالَ: أُعْطِيتُ خَمْسَمِائَةٍ نَقْدًا فَمَنَعْتُهُ، وَلَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «الْجَارُ أَحَقُّ بِصَقَبِهِ». مَا بِعْتُكَهُ -أَوْ قَالَ مَا أَعْطَيْتُكَهُ- قُلْتُ لِسُفْيَانَ: إِنَّ مَعْمَرًا لَمْ يَقُلْ هَكَذَا. قَالَ: لَكِنَّهُ قَالَ لِي هَكَذَا. وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: إِذَا أَرَادَ أَنْ يَبِيعَ الشُّفْعَةَ فَلَهُ أَنْ يَحْتَالَ حَتَّى يُبْطِلَ الشُّفْعَةَ، فَيَهَبُ الْبَائِعُ لِلْمُشْتَرِي الدَّارَ، وَيَحُدُّهَا وَيَدْفَعُهَا إِلَيْهِ، وَيُعَوِّضُهُ الْمُشْتَرِى أَلْفَ دِرْهَمٍ، فَلاَ يَكُونُ لِلشَّفِيعِ فِيهَا شُفْعَةٌ[2].

**٦٩٧٧- عەمری كوڕی شەرید دەڵێ: میسوەری كوڕی مەخرەمە هات و دەستی خستە سەر شانم، جا لەگەڵیدا ڕۆشتم بۆ لای سەعد، ئینجا ئەبو ڕافیع بەمیسوەری وت: بۆ فەرمان بە ئەمە (سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص) ناكەیت كە ئەو هۆدەی[3] لە خانووەكەم دایە[4] لێم بكڕێت؟ (سەعد) وتی: چوار سەد زیاتر نادەم بەبەش بەش یان بەچەند كاتێكی دیاری كراو، (ئەبو ڕافیع) وتی: پێنج سەدی حازریم پێ دراوە نەمداوە، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((دراوسێ لە پێشترە بەهەڵگرتنەوەی ئەوەی[5] لە تەنیشتیایەتی))، پێم نەدەفرۆشت (یان وتی: پێم نەدەدایت).**

---

(١) ئیمامی بوخاری دەڵێ ئەم قسەی دواوەی پێچەوانەیە لەگەڵ قسەی پێشوویدا، دەڵێ: دراوسێ بۆی هەیە ماڵ و موڵكی دراوسێكەی بەشوفعە هەڵگرتنەوە، كە چی لێرەدا دەڵێ بۆی نییە..

(٢) بڕوانە: ٢٢٥٨.

(٣) لەگێڕانەوەی ئەبی زەڕ و كوشمیهەنیی دا بەم جۆرەیە: ( ئەو دوو هۆدەی).

(٤) لەگێڕانەوەیەكدا ئەبی زەڕدا بەم جۆرەیە: ( لە خانووەكەی دایە).

(٥) زەوی یا خانوو یا هەر شتێكی تر.

**(عەلی کوڕی مەدینی دەڵێ) وتم بەسوفیان: بێگومان مەعمەر ئاوەها ناڵێت، سوفیان وتی: بەلاّم ئاوەها بەمنی وتووە و هەندێ کەس دەڵێ: ئەگەر کەسێك بیەوێ ماڵێ کە هەڵگرتنەوەی تیایە بیفرۆشێت، ئەوە بۆی هەیە فێڵ بکات تا هەڵگرتنەوەکە بەتاڵ بکاتەوە، فرۆشیار خانووەکە بەبەخشین و دیاری بدات بەکڕیارەکە و سنوورەکەی دیاری کات و بیدات پێی، کڕیارەکە لە بری ئەوە هەزار درهەمی پێ بدات، ئیتر ئەو کاتە ئەوەی مافی هەڵگرتنەوەی بوو مافی هەڵگرتنەوەی نامێنێ.**

٦٩٧٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مَيْسَرَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ أَنَّ سَعْدًا سَاوَمَهُ بَيْتًا بِأَرْبَعِمِائَةِ مِثْقَالٍ فَقَالَ: لَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْجَارُ أَحَقُّ بِصَقَبِهِ». لَمَا أَعْطَيْتُكَ. وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: إِنِ اشْتَرَى نَصِيبَ دَارٍ، فَأَرَادَ أَنْ يُبْطِلَ الشُّفْعَةَ، وَهَبَ لاِبْنِهِ الصَّغِيرِ، وَلاَ يَكُونُ عَلَيْهِ يَمِينٌ[1].

**٦٩٧٨- عەمری کوڕی شەرید لە ئەبی ڕافیعەوە دەگێڕێتەوە کە سەعد سەوای ماڵێکی لەگەڵدا کرد بەچوار سەد مسقاڵ، ئەبو ڕافیع وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((دراوسێ لە پێشترە بە هەڵگرتنەوەی ئەوەی لە تەنیشتیایەتی)) پێم نەدەدایت (بەوپارەیە)، وە هەندێ کەس دەڵێ [2]: ئەگەر کەسێك بەشێکی لە خانوویەك کڕی، ویستی مافی هەڵگرتنەوە بەتاڵ کاتەوە بیبەخشێت بەکوڕە بچوکەکەی، لەو کاتەدا لەسەری نییە سوێند بخوات (دەربارەی بەخشینەکە و مەرجەکانی).**

(١) بڕوانە: ٢٢٥٨.

(٢) مەبەستی ئیمام ئەبو حەنیفەیە ﷺ.

## ١٥- بابُ احْتِيَالِ الْعَامِلِ لِيُهْدَى لَهُ

٦٩٧٩- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: اسْتَعْمَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلاً عَلَى صَدَقَاتِ بَنِي سُلَيْمٍ يُدْعَى: ابْنَ اللُّتَبِيَّةِ، فَلَمَّا جَاءَ حَاسَبَهُ قَالَ: هَذَا مَالُكُمْ وَهَذَا هَدِيَّةٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَهَلاَّ جَلَسْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وَأُمِّكَ، حَتَّى تَأْتِيَكَ هَدِيَّتُكَ إِنْ كُنْتَ صَادِقًا؟!». ثُمَّ خَطَبَنَا فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَسْتَعْمِلُ الرَّجُلَ مِنْكُمْ عَلَى الْعَمَلِ مِمَّا وَلاَّنِي اللَّهُ، فَيَأْتِي فَيَقُولُ هَذَا مَالُكُمْ، وَهَذَا هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي. أَفَلاَ جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ حَتَّى تَأْتِيَهُ هَدِيَّتُهُ؟!، وَاللَّهِ لاَ يَأْخُذُ أَحَدٌ مِنْكُمْ شَيْئًا بِغَيْرِ حَقِّهِ، إِلاَّ لَقِيَ اللَّهَ يَحْمِلُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَلأَعْرِفَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ لَقِيَ اللَّهَ يَحْمِلُ بَعِيرًا لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةً تَيْعَرُ». ثُمَّ رَفَعَ يَدَهُ حَتَّى رُئِيَ بَيَاضُ إِبْطِهِ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟». بَصُرَ عَيْنِي وَسَمِعَ أُذُنِي[1].

## ١٥- باسی فێڵ كردنی كار بەدەست بۆ ئەوەی دیاری پێ بدرێت

**٦٩٧٩- ئەبو حومەیدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێكی كردە كارمەندی كۆكەرەوەی زەكاتی بەنی سولەیم پێی دەوترا ئیبنو لوتەبییە، جا كاتێ هاتەوە لێپرسینەوەی لەگەڵدا كرد، كابرا وتی: ئەم ماڵ و سامانە هی ئێوەیە، ئەمەش دیاریە (بەخۆمیان داوە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ڕاستگۆیت دەی بۆ لە ماڵی باوك و دایكتدا دانەنیشتیت هەتا دیارییەكەت بۆ بێت؟)) لە پاشان وتارێكی بۆ داین جا سوپاس و ستایشی خوای كرد پاشان فەرمووی: ((لە پاشان من پیاوێك لە ئێوە لە كارێكدا بەكاری دێنم لەو كارانەی خوا داویەتیە دەستم، ئینجا دێتەوە و دەڵێ: ئەوەماڵ و سامانەكەی ئێوەیە، ئەوەش دیاریە و بەدیاری هێنراوە بۆ خۆم. ئەی بۆ لە ماڵی باوك و**

(١) بڕوانە: ١٢٥.

**دایکیدا دانەنیشت هەتا دیارییەکەیی بۆ بێت؟!، سوێند بەخوا هەر کەسێ لە ئێوە شتێك وەربگرێ کە بەهەقی خۆی نەبێ، کە لە ڕۆژی قیامەتدا گەشتە خزمەتی خوای گەورە ئەو شتە بەکۆڵیەوە هەڵیگرتووە، جا بێگومان کەسێکتان دەناسمەوە کە بەخزمەتی خوا دەگات و حوشترێکی بەکۆڵەوەیە و هەڵیگرتووە بارەبارێتی، یان مانگایەکە قۆڕەی دێ، یان مەڕێکە باعەباعیەتی))، پاشان دەستی بەرز کردەوە هەتا سپیایی هەردوو بن باڵی بینرا و دەیفەرموو: ((خودایە ئایا گەیاندم؟)). (ئەبو حومەید وتی) بەچاوم بینیم، بەگوێم بیستم.**

٦٩٨٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مَيْسَرَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْجَارُ أَحَقُّ بِصَقَبِهِ».

وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: إِنِ اشْتَرَى دَارًا بِعِشْرِينَ أَلْفَ دِرْهَمٍ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَحْتَالَ حَتَّى يَشْتَرِيَ الدَّارَ بِعِشْرِينَ أَلْفَ دِرْهَمٍ، وَيَنْقُدَهُ تِسْعَةَ آلاَفِ دِرْهَمٍ وَتِسْعَمِائَةَ دِرْهَمٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، وَيَنْقُدَهُ دِينَارًا بِمَا بَقِيَ مِنَ العِشْرِينَ الأَلْفَ، فَإِنْ طَلَبَ الشَّفِيعُ أَخَذَهَا بِعِشْرِينَ أَلْفَ دِرْهَمٍ، وَإِلاَّ فَلاَ سَبِيلَ لَهُ عَلَى الدَّارِ، فَإِنِ اسْتُحِقَّتِ الدَّارُ، رَجَعَ الْمُشْتَرِي عَلَى البَائِعِ بِمَا دَفَعَ إِلَيْهِ، وَهْوَ تِسْعَةُ آلاَفِ دِرْهَمٍ وَتِسْعُمِائَةٍ وَتِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ دِرْهَمًا وَدِينَارٌ، لأَنَّ الْبَيْعَ حِينَ اسْتُحِقَّ انْتَقَضَ الصَّرْفُ فِي الدِّينَارِ، فَإِنْ وَجَدَ بِهَذِهِ الدَّارِ عَيْبًا وَلَمْ تُسْتَحَقَّ، فَإِنَّهُ يَرُدُّهَا عَلَيْهِ بِعِشْرِينَ أَلْفَ دِرْهَمٍ. قَالَ: فَأَجَازَ هَذَا الْخِدَاعَ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ دَاءَ وَلاَ خِبْثَةَ وَلاَ غَائِلَةَ»[1].

**٦٩٨٠- عەمری کوڕی شەرید لە ئەبی ڕافیعەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دراوسێ لە پێشترە بەهەڵگرتنەوەی ئەوە لە تەنیشتیایەتی)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٢٥٨.

وه هەندێ كەس دەڵێ[1]: ئەگەر كەسێك بیەوێ خانوویەك بكڕێ بە بیست هەزار درهەم، زیانی نییە كە فێڵێك بكات[2]، هەتا خانووەكە بە بیست هەزار درهەم بكڕێت و نۆ هەزار و نۆ سەد و نەوەد و نۆ درهەمی بەحازری پێ بدات، كڕیارەكە یەك دیناری حازری پێ بدات لە بەرانبەری ئەوەی لای كڕیار ماوە لە بیست هەزار درهەمەكە، جا ئەگەر شەفیعەكە[3] داوای كرد ئەوە ماڵە فرۆشراوەكە بەبیست هەزار درهەم هەڵدەگرێتەوە، ئەگەرنا ڕێگەی نییە بۆ وەرگرتنەوەی خانووەكە، ئینجا ئەگەر خانووەكە بەماڵی خەڵك دەرچوو، كڕیار ئەو پارەی داویەتی بەفرۆشیار لێی وەردەگرێتەوە، كە نۆ هەزار و نۆسەد و نەوەد و نۆ درهەم و دینارێكە، چونكە لەو كاتەدا خانووەكە بەهی خەڵك دەرچوو گۆڕینی دینارەكە هەڵوەشایەوە، جا ئەگەر لەو خانووەدا ناتەواویەكی تیابوو بەموڵكی خەڵكیش دەرنەچوو، دەبێ خاوەنی خانووەكە بیست هەزار درهەم بگێڕێتەوە بۆ كڕیار، (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: (ئەبو حەنیفە) ئەم فێڵە لە ناو موسڵماناندا ڕێگە پێ دەدات. (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( (لە مامەڵەی موسڵماندا) عەیب و ناتەواوی تێدا نییە، حەرامی تێدا نییە، فێڵ وخراپەی[4] تێدا نییە)).

٦٩٨١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ مَيْسَرَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، أَنَّ أَبَا رَافِعٍ سَاوَمَ سَعْدَ بْنَ مَالِكٍ بَيْتًا بِأَرْبَعِمِائَةِ مِثْقَالٍ، وَقَالَ: لَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْجَارُ أَحَقُّ بِصَقَبِهِ». مَا أَعْطَيْتُكَ[5].

---

(١) مەبەستی ئەبو حەنیفەیە ﷺ.
(٢) بۆ ئەوەی شوفعەكە نەمێنێت و بەتاڵ بێتەوە. إرشاد الساري: ٤٠٦/١٤.
(٣) ئەو كەسەی ماف هەڵگرتنەوەی ماڵی شەریكەكەی هەیە.
(٤) وە دزی و بەندەی هەڵهاتوو.
(٥) بڕوانە: ٢٢٥٨.

٦٩٨١- ئیبراهیمی کوڕی مەیسەرە لە عەمری کوڕی شەریدەوە دەگێڕێتەوە کە ئەبو ڕافیع سەوای ماڵێکی لە سەعد کرد بەچوار سەد مسقاڵ، ئەبو ڕافیع وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((دراوسێ لە پێشترە بەهەڵگرتنەوەی ئەوەی لە تەنیشتیایەتی )) پێم نەدەدایت (بەو پارەیە).

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٩١- كِتابُ التَعبير

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٩١- پەڕاوی لێكدانەوەی خەو

## ١- باب أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ

٦٩٨٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ. وَحَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَأَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّادِقَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، فَكَانَ يَأْتِي حِرَاءً فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ -وَهْوَ التَّعَبُّدُ- اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ فَتُزَوِّدُهُ لِمِثْلِهَا، حَتَّى فَجِئَهُ الْحَقُّ وَهْوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فِيهِ فَقَالَ: اقْرَأْ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي. فَقَالَ: اقْرَأْ. فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ. فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدُ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۝٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۝٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ۝٥﴾ العلق. فَرَجَعَ بِهَا تَرْجُفُ بَوَادِرُهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ فَقَالَ:

«زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي». فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، فَقَالَ: «يَا خَدِيجَةُ، مَا لِي؟». وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ وَقَالَ: «قَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي». فَقَالَتْ لَهُ: كَلاَّ، أَبْشِرْ، فَوَاللَّهِ لاَ يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا؛ إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَصْدُقُ الْحَدِيثَ، وَتَحْمِلُ الكَلَّ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الحَقِّ.

ثُمَّ انْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى بْنِ قُصَيٍّ - وَهْوَ ابْنُ عَمِّ خَدِيجَةَ أَخُو أَبِيهَا- وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الكِتَابَ الْعَرَبِيَّ فَيَكْتُبُ بِالْعَرَبِيَّةِ مِنَ الإِنْجِيلِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخًا كَبِيراً قَدْ عَمِيَ - فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: أَيِ ابْنَ عَمِّ، اسْمَعْ مِنِ ابْنِ أَخِيكَ. فَقَالَ وَرَقَةُ: ابْنَ أَخِي، مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ مَا رَأَى، فَقَالَ وَرَقَةُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَى مُوسَى، يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا أَكُونُ حَيًّا حِينَ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَمُخْرِجِيَّ هُمْ؟». فَقَالَ وَرَقَةُ: نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمَا جِئْتَ بِهِ إِلاَّ عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا.

ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ، وَفَتَرَ الوَحْيُ فَتْرَةً حَتَّى حَزِنَ النَّبِيُّ ﷺ فِيمَا بَلَغَنَا حُزْنًا غَدَا مِنْهُ مِرَارًا كَيْ يَتَرَدَّى مِنْ رُءُوسِ شَوَاهِقِ الجِبَالِ، فَكُلَّمَا أَوْفَى بِذِرْوَةِ جَبَلٍ لِكَيْ يُلْقِيَ مِنْهُ نَفْسَهُ، تَبَدَّى لَهُ جِبْرِيلُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ حَقًّا. فَيَسْكُنُ لِذَلِكَ جَأْشُهُ وَتَقِرُّ نَفْسُهُ فَيَرْجِعُ، فَإِذَا طَالَتْ عَلَيْهِ فَتْرَةُ الوَحْيِ غَدَا لِمِثْلِ ذَلِكَ، فَإِذَا أَوْفَى بِذِرْوَةِ جَبَلٍ تَبَدَّى لَهُ جِبْرِيلُ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ[1].

-قال إبنُ عباس ﴿ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ ﴿٩٦﴾ ﴾ الأنعام. ضَوْءُ الشَّمْسِ بِالنَّهَارِ، وَضَوْءُ القَمَرِ بِاللَّيْلِ.

---

(١) بروانه: ٣.

## ١- باسێک: سەرەتای دەست پێکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بەنیگا بۆ هاتن بەخەو بینینی ڕاست و چاک دەستی پێکرا

٦٩٨٢-عوروە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: سەرەتای نیگا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە خەو بینینی ڕاست لە خوداوە دەستی پێکرد، بەجۆرێ هەر خەوێکی دەبینی وەك هەڵهاتنی ڕۆژ دەهاتە دی، ئیتر (مانگی ڕەمەزان) دەچوو بۆ ئەشکەوتی حیڕا بەندایەتی تێدا دەکرد، - (التَحَنُّثُ) واتە: بەندایەتی - چەند شەو دەمایەوە، خواردنی ئەو ماوەیەی لەگەڵ خۆی دەبرد و پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای خەدیجەی خێزانی و بەشی ئەوەندەی تر خواردنی لەگەڵ خۆی دەبرد، (بەم شێوەیە بەردەوام بوو ) هەتا لە ناکاودا ڕاستیی بۆ هات لە کاتێکدا لە ئەشکەوتی حیڕا بوو، لەوێدا فریشتەی نیگا هاتە لای فەرمووی: بخوێنە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((منیش وتم: من خوێندەوار نیم، ئینجا گرتمی و زۆر بەتوندی باوەشی پیاکردم، هەتا باوەشپێدا کردنەکەی ئەوپەڕی توند بوو بۆم، پاشان بەرەڵای کردم، وە فەرمووی: بخوێنە! منیش وتم: خوێندەوار نیم، جا بۆ جاری دووەم گرتمی و زۆر بە توندی باوەشی پیاکردم، هەتا باوەشپێدا کردنەکەی ئەوپەڕی توند بوو بۆم، پاشان بەرەڵای کردم و فەرمووی: بخوێنە، منیش وتم: خوێندەوار نیم، جا بۆ جاری سێیەم گرتمی و زۆر بە توندی باوەشی پێدا کردم، هەتا باوەشپێدا کردنەکەی ئەوپەڕی توند بوو بۆم، پاشان بەرەڵای کردم و فەرمووی: (بخوێنە! بەناوی پەروەردگارێکتەوە کە هەموو شتێکی درووست کردوە مرۆڤی دروست کردوە لە خوێنێکی بەستوو، بخوێنە! پەروەردگاری تۆ (لە هەموو کەس) بەخشندە ترە ئەوەی کە (مرۆڤی) فێری (نووسین) کردوە بە قەڵەم، مرۆڤی شارەزا کردوە بەو شتانەی کە نەیدەزانی)، پێغەمبەر ﷺ بە دڵە لەرزە و ترسەوە گەڕایەوە

(بەهۆی ئەو ڕووداوەوە)، ڕۆشتەوە بۆ لای خەدیجەی خێزانی ﷺ و فەرمووی: ((دامپۆشن، دامپۆشن))، جا دایانپۆشی تا ترسەکەی نەما، ئینجا فەرمووی: ((ئەی خەدیجە من چیمە؟)) ئیتر هەواڵی ڕووداوەکەی بۆ خەدیجە گێڕایەوە، وە فەرمووی: ((بەڕاستی لە خۆم ترسام (بمرم لە ترسا، یان نەخۆش بکەوم) ))، خەدیجەش عەرزی کرد: نا، موژدەت لێ بێ سوێند بەخوا هەرگیز خوا خەمبار یان سەرشۆڕت ناکات، چونکە تۆ ماف خزمایەتی بەجێ دێنی و لە قسە کردنتدا ڕاست گۆی، یارمەتی و دەستگیرۆیی لاواز و هەتیو و هەژار دەکەی، وە خواردن بە میوان دەدەیت و ڕێزی لێ دەگری، وە یارمەتی هەر لێقەوماو و ڕووداوێك دەدەیت بەسەر خەڵکدا بێت (ئەگەر ناحەق نەبێت).

ئینجا خەدیجە ﷺ لەگەڵ خۆی بردی تا گەشتە لای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی قوصەیی- کە ئامۆزای خەدیجە بوو، کە باوکی خەدیجە برای باوکی دەکات- وەرەقە پیاوێك بوو لە سەردەمی نەفامیدا بووبوو بە گاوور (وازی لە بت پەرستی هێنابوو)، وەرەقە نامەی عەرەبی دەنووسی[١٥٧٤]، ئینجا لە ئینجیل بە عەرەبی ئەوەندەی خوا حەز بکات بنوسێت بەعەرەبی لە ئینجیلی دەنووسی، پیاوێکی پیری بەساڵاچوو بوو، کوێر بووبوو، خەدیجە ﷺ بە وەرەقەی وت: ئەی ئامۆزای خۆم! گوێ بگرە بۆ برازای خۆت (کە پێغەمبەرە ﷺ)، وەرەقەش (بە پێغەمبەری ﷺ) وت: برازای خۆم چیت دیوە؟ جا پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی دیبووی بۆی گێڕایەوە و پێی وت، وەرەقەش وتی: ئەمە ئەو فریشتەیە کە نێردرا بۆ لای موسا (کە جیبریلە ﷺ)، ئای خۆزگە لە کاتی بانگەوازەکەتدا گەنج بوومایە، خۆزگە زیندوو بوومایە کاتێك گەلەکەت دەرت دەکەن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بۆ گەلەکەم دەرم دەکەن؟!)) وەرەقە وتی: بەڵێ دەرت دەکەن، چونکە هەر کەسێك وێنەی ئەم پەیامەی تۆی هێنابێ دژایەتی کراوە، جا ئەگەر گەیشتمە ئەو ڕۆژگارە (کە

دەرت دەكەن) پشتیوانێكی بەهێزت لێ دەكەم، پاشان زۆری پێ نەچوو وەرەقە وەفاتی كرد و دابەزینی نیگاش بۆ ماوەیەك بچڕا و دوا كەوت، (زوهری دەڵێ:) وەك پێمان گەشتووە پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە خەمبار و دڵتەنگ بوو پێی چەند جار ویستوویەتی لەسەر شاخە بەرزەكانەوە خۆی بخاتە خوارەوە، جا هەر كاتێ بگەشتایەتە سەر لوتكەی شاخەكە بۆ ئەوەی خۆی لێوەی فڕێ بداتە خوارەوە، جیبریل ﵇ خۆی نیشان دەدا و دەیفەرموو: ئەی موحەممەد بێگومان تۆ پێغەمبەری خوایت بە ڕاستی، ئیتر بەوە بێتاقەتی و ناڕەحەتیەكەی نەدەما و دڵنیا دەبوو دەگەڕایەوە، ئینجا ئەگەر بچڕانی نیگا بۆی درێژەی بكێشایە دەگەڕایەوە بۆ وێنەی ئەو كارەی باسكرا، جا كە دەگەشتە لوتكەی شاخەكە جیبریل ﵇ خۆی نیشان دەدا و وێنەی وتەكەی پێشووی پێ دەوتەوە.

ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: ﴿ فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ ﴿٩٦﴾ ﴾ الأنعام: ڕووناكی خۆرە بەرۆژدا و ڕووناكی مانگە بەشەودا.

## ٢- بابُ رُؤْيا الصَّالحِينَ

وَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ لَّقَدۡ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءۡيَا بِٱلۡحَقِّۖ لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمۡ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَۖ فَعَلِمَ مَا لَمۡ تَعۡلَمُواْ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتۡحٗا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ ﴾ الفتح.

٦٩٨٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنَ الرَّجُلِ الصَّالِحِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ»[1].

(١) بڕوانە: ٦٩٩٤.

## ٢- باسی خەو بینینی پیاو چاكان

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (سوێند بەخوا بێگومان خوا ئەو خەوەی پێغەمبەرەكەی دیبوی بەڕاستی گێڕا و هێنایەدی كە (فەرموو بووی): دڵنیابن دەچنە ناو كەعبەی پیرۆزەوە بەویستی خوا بەئارامی و بێ ترس، سەرتان تاشیوە یان كورتتان كردۆتەوە، (لە دوژمن) ناترسن، جا ئەوەی (خوا) دەیزانی ئێوە نەتاندەزانی (كە خێر لە ڕێك كەوتن دایە)، وە جگە لەوەی (چوونە مەككە) بڕیاری داوە كە سەركەوتنێكی نزیكە (بۆ ئێوەیە كە ڕێك كەوتنی حودەیبیەیە) ).

٦٩٨٣- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خەو بینینی باش لە لایەن پیاو چاكێكەوە بەشێكە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی)).

## ٣- بابُ الرُّؤْيَا مِنَ اللهِ

٦٩٨٤- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُس، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى -هُوَ ابْنُ سَعِيدٍ- قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الرُّؤْيَا مِنَ اللهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ»[١].

## ٣- باسی خەو بینینی [٢] چاک لە خواوەیە

٦٩٨٤- ئەبو قەتادە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((خەو بینینی چاك لە خواوەیە، خەو بینینی خراپیش لە شەیتانەوەیە)).

---

(١) بڕوانە: ٣٢٩٢.

(٢) الرؤیا: بۆ خەو بینینی چاک بەزۆر بەكاردێت، (الحُلم) بۆ خەو بینینی خراپ بەكاردێت. بڕوانە: إرشاد الساري: ٤٢٠/١٤.

٦٩٨٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي ابْنُ الهَادِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ رُؤْيَا يُحِبُّهَا فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ اللَّهِ، فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ عَلَيْهَا وَلْيُحَدِّثْ بِهَا، وَإِذَا رَأَى غَيْرَ ذَلِكَ مِمَّا يَكْرَهُ فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَلْيَسْتَعِذْ مِنْ شَرِّهَا، وَلاَ يَذْكُرْهَا لأَحَدٍ، فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ»

**٦٩٨٥- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو لە پێغەمبەری ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر کەسێکتان خەوێکی بینی پێی خۆش بوو، ئەوە بێگومان لە خواوەیە، وە با سوپاسی خوای لەسەر بکات و بیگێڕێتەوە [1]، وە ئەگەر خەوێکی بینی جگە لەمە کە پێی خۆش نەبوو، ئەوە بێگومان لە شەیتانەوەیە، با پەنا بگرێت بەخوا لە خراپەی ئەو خەوە، وە نەیگێڕێتەوە بۆ کەس، ئیتر بەدڵنیاییەوە زیانی پێ ناگەیەنێت)).**

## ٤- بابٌ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ

٦٩٨٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ -وَأَثْنَى عَلَيْهِ خَيْرًا: لَقِيتُهُ بِالْيَمَامَةِ - عَنْ أَبِيهِ، حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا حَلَمَ فَلْيَتَعَوَّذْ مِنْهُ وَلْيَبْصُقْ عَنْ شِمَالِهِ، فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ»[2].

وَعَنْ أَبِيهِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْن أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ.

## ٤- باسێک: خەو بینینی باش بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی

**٦٩٨٦- ئەبو سەلەمە لە ئەبو قەتادەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خەو بینینی چاک لە خواوەیە، خەوی**

---

(١) بۆ کەسێک کە خۆشی دەوێ و کەسی ژیر و دانا.

(٢) بڕوانە: ٣٢٩٢.

**خراپیش له شەیتانەوەیه، جا ئەگەر کەسێك خەوێکی ناخۆش و خراپی بینی، با پەنا بگرێت بە خوا لە زیانی ئەو خەوە، وە تف بکاتە لای چەپی، چونکە بەدڵنیاییەوە زەرەری پێ ناگەیەنێت)).**

**وە (بەهەمان ڕشتەی پێشوو)، عەبدوڵلای کوڕی یەحیا لە باوکیەوە دەیگێڕێتەوە دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی ئەبی قەتادە بۆی گێڕاینەوە لە باوکیەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ، وەك فەرموودەکەی پێشوو گێڕایەوە.**

٦٩٨٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ».

**٦٩٨٧- ئەنەسی کوڕی مالیك لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خەو بینینی باوەڕدار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی)).**

٦٩٨٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ»[1]. رَوَاهُ ثَابِتٌ وَحُمَيْدٌ وَإِسْحَاقُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ وَشُعَيْبٌ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٦٩٨٨- ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خەو بینینی باوەڕدار بەشێکە لە چل وشەش بەشی پێغەمبەرایەتی)).**

**هەروەها هەر یەکە لە سابیت و حومەید و ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵلا و شوعەیب لە ئەنەسەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەکەی پێشوویان گێڕاوەتەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٧٠١٧.

٦٩٨٩- حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي حَازِمٍ وَالدَّرَاوَرْدِيُّ، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ»

**٦٩٨٩ ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە كە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە كە فەرموویەتی: ((خەو بینینی چاك و باش بەشێكە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی)).**

## ٥- بابُ المُبَشِّرَاتِ

٦٩٩٠- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ المُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ: قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الْمُبَشِّرَاتُ». قَالُوا: وَمَا المُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: «الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ».

## ٥- باسی مژدە خۆشەكان

**٦٩٩٠- سەعیدی كوڕی موسەییەب دەگێڕێتەوە كە ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هیچ شتێك لە پێغەمبەرایەتی نەماوە جگە لە مژدە خۆشەكان))، عەرزیان كرد مژدە خۆشەكان چین؟ فەرمووی: ((خەو بینینی باش و چاكە)).**

## ٦- بابُ رُؤْيَا يُوسُفَ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾ قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيْدًاۖ إِنَّ

ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٦﴾ ﴾ يوسف. وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ۞ رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾ يوسف. فَاطِرٌ وَالْبَدِيعُ وَالْمُبْتَدِعُ وَالْبَارِئُ وَالْخَالِقُ وَاحِدٌ، ﴿ مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ ﴾: بَادِيَةٍ.

## ٦- باسی خەو بینینی یوسف ﷺ

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بیریان خەرەوە کاتێ یوسف بەباوکی وت: ئەی بابەگیان من لە خەوما بینیم یازدە ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ بینیمن سوژدەیان بۆ دەبردم، (باوکی) وتی: ئەی کوڕی شیرینم خەوەکەت مەگێڕەوە بۆ براکانت، نەوەك بەهۆیەوە فێڵ و پیلانێکت لێ بکەن، بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئادەمی، ئا بەو شێوەیە پەروەردگارت هەڵت دەبژێرێ (بۆ پێغەمبەرایەتی)، وە فێری بەشێك لە خەو پەرژینت دەکات، وە بەهرەی خۆی تەواو دەکات بۆ خۆت و بۆ بنەماڵەی یەعقوب هەرچۆنێ تەواوی کرد بۆ هەردوو باپیرەت لە پێشدا کە ئیبراهیم و ئیسحاقن، ﷺ بەڕاستی پەروەردگارت زانای کار دروستە).**

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (یوسف ﷺ وتی: ئەی باوکی خۆشەویستم ئەمە لێکدانەوەی خەوەکەم بوو کە لەمەو پێش (بینیم)، بێگومان**

پەروەردگارم بەڕاستی گێڕا، وە بێگومان خوا چاکەی لەگەڵ کردم کاتێ لە زیندان دەری هێنام و ئێوەشی لە لادێ و بیابانەوە هێنا (بۆ ناو شار) دوای ئەوەی شەیتان ناخۆشی و ناکۆکی خستە نێوان من و براکانم، بەڕاستی پەروەردگارم بەسۆزە بەرانبەر ئەوەی بیەوێ، بەڕاستی هەر ئەو زانای کار دروستە، ئەی پەروەردگارم بەڕاستی هەندێك لە دەسەڵات و پاشایەتیت پێ بەخشیووم و هەندێکیش لە لێکدانەوەی خەوت فێر کردووم، ئەی دروست کاری ئاسمانەکان و زەوی، تۆ پشتیوان و یارمەتی دەری منی لە دونیا و لە ڕۆژی دواییدا، بە مسوڵمانێتی بم مرێنە و بمخەرە ڕیزی پیاو چاکانەوە (لە دوا ڕۆژدا)

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:)** (فَاطِرٌ) و (الْبَدِيعُ) و (الْمُبْتَدِعُ) و (الْمُبْدِعُ) و (الْبَارِئُ) و (الْخَالِقُ) **هەموویان یەك مانایان هەیە (کە دروست کار و بەدی هێنەرە).** ﴿ مِّنَ ٱلْبَدْوِ ﴾[1]: **بیابان نشین.**

## ٧- بابُ رُؤْيَا إِبْرَاهِيمَ عليه السلام

وَقَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَـٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَـٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَـٰدَيْنَـٰهُ أَن يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ الصافات. قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ أَسْلَمَا ﴿١٠٣﴾ ﴾ الصافات. سَلَّمَا مَا أُمِرَا بِهِ. ﴿ وَتَلَّهُۥ ﴿١٠٣﴾ ﴾ الصافات. وَضَعَ وَجْهَهُ بِالأَرْضِ.

---

(١) لە گێڕانەوەیەکدا (من البدیء) واتە: دەست پێکردن و سەرەتای دروست بوون کە بەمانای (فاطر) دێت.

## ٧- باسی خەو بینینی ئیبراهیم ﷺ

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (جا كاتێ ئەو (كوڕە گەورەبوو تا) گەشتە ئەوەی ئیش و كار بكات لەگەڵ (ئیبراهیم)دا، (ئیبراهیم) وتی: ئەی كوڕی شیرینم بەڕاستی من لە خەومدا دیم كە سەرت دەبڕم، جا سەرنج بدە دەڵێی چی و ڕات چییە؟ (كوڕەكە) وتی: بابە گیان ئەوەی فەرمانت پێدراوە بیكە، دڵنیابە دەمبینی بەویستی خوا لە خۆڕاگران دەبم، ئینجا كاتێ هەردووكیان ملكەچ بوون (بۆ فەرمانی خوا)، ئیبراهیم ئیسماعیلی ﷺ بە ڕوودا خستە سەر زەوی، ئێمەش بانگمان كرد ئەی ئیبراهیم ﷺ بێگومان خەوەكەت بەجێ هێنا، بەڕاستی ئێمە ئا بەو شێوە پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە).

موجاهید دەڵێ: ﴿أَسْلَمَا ﴿١٠٣﴾﴾ الصافات: هەردووكیان ملكەچ بوون بۆ ئەوەی فەرمانیان پێكرابوو ﴿وَتَلَّهُۥ ﴿١٠٣﴾﴾ الصافات: بەڕوودا خستیە سەر زەوی.

## ٨- بابُ التَّوَاطُؤُ عَلَى الرُّؤْيَا

٦٩٩١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ أُنَاسًا أُرُوا لَيْلَةَ القَدْرِ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ، وَأَنَّ أُنَاسًا أُرُوا أَنَّهَا فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْتَمِسُوهَا فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ»[1].

## ٨- باسی ڕێك كەوتن لەسەر خەوێك[2]

٦٩٩١- ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە كە كەسانێك لە خەودا شەوی قەدریان پیشان درا لە حەوتەمی كۆتاییدا، وە كەسانێكیش لە خەودا شەوی قەدریان

---

(١) بڕوانە: ١١٥٨.

(٢) واتە: چەند كەسێك خەو ببینن و خەوی هەموویان وەك یەك وابێت با دەربڕینەكانیان جیاوازبێت.

پیشان درا له دەیەمی کۆتاییدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەدواییدا بگەڕێن له حەوتەمی کۆتاییدا)).

## ٩- بابُ رُؤْيَا أَهْلِ السُّجُونِ وَالْفَسَادِ وَالشِّرْكِ

لِقَوْلِهِ ﷻ: ﴿وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعْصِرُ خَمْرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ[1] مُّتَفَرِّقُونَ ﴿٣٩﴾﴾ يوسف. وَقَالَ الفُضَيلُ لِبَعْضِ الأَتْبَاعِ: يَا عَبْدَ اللَّهِ: ﴿ءَأَرۡبَابٞ[2] مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي

(١) له ڕیوایەتی (أبي ذر)دا به: ﴿ءَأَربابٌ﴾ گێڕاویەتیەوە كه حەفصە بەو جۆرە خوێندویەتیەوە.

(٢) له ڕیوایەتی (الأصيلي)دا به: ﴿أَربابٌ﴾ گێڕاویەتیەوە كه نافیع و ئیبنو كەسیر و ئەبی عەمرە بەو شێوە خوێندویانەتەوە.

ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾ قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ فَأَرۡسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴿٥٠﴾ ﴾ يوسف. ﴿ وَٱدَّكَرَ ﴿٤٥﴾ ﴾ يوسف. افْتَعَلَ مِنْ ذَكَرَ. أُمَّة: قرن وتقرأ: أَمَهٍ: نِسْيَانٍ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿ يَعۡصِرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ يوسف: الأَعْنَابَ وَالدُّهْنَ. ﴿ تُحۡصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ يوسف: تَحْرُسُونَ.

## ٩- باسی خەو بینینی خەڵکی زیندانەکان و خراپەکار و هاوبەش دانەر

**بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (وە دوو کوڕی لاو (خزمەتکار) لەگەڵی چوونە بەندیخانە، کە یەکێکیان وتی: (بە یوسف) من لە خەومدا خۆم بینی ترێم دەگوشی کە دەبێ بەعارەق، وە ئەوی تریان وتی: من لەخەومدا خۆمم بینی نانم هەڵدەگرت بەسەر سەرمەوە باڵندە لێی دەخوارد، لێکدانەوەی ئەو (خەو)ەمان پێ بڵێ، بەڕاستی ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین، (یوسف) وتی: هیچ خۆراکێکتان بۆ نایەت کە دەرخواردتان دەدرێت مەگەر من بە هەردووکتان دەڵێم چییە پێش ئەوەی بێت بۆتان، ئەمەش لەو بەهرانەیە کە پەروەردگارم**

فێری کردووم، بەڕاستی من وازم لە ئایینی گەلێك هێناوە کە بڕوایان بەخوا نەهێناوە، هەروەها ئەوان بێ بڕواش بوون بەرۆژی دوایی، وە شوێنی ئایینی با و باپیرانم کەوتووم، کە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبن ﷺ ڕەوا و شیاو نییە بۆمان کە هیچ شتێ بکەین بە هاوبەش بۆ خوا، ئەمەش چاکە و بەهرەی خوایە بەسەر ئێمەوە و بەسەر خەڵکیشەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسی خوا ناکەن، ئەی دوو هاوڕێکەی بەندیخانەم ئایا چەند خوایەکی جیاجیا)

وە فوزەیل بەهەندێ شوێنکەوتەی وت: ئەی بەندەی خوا چەند خوایەکی (جیا جیا باشترن یان خوایەکی تاکی بەدەسەڵات، ئێوە بێجگەلە خوا هیچ شتێك ناپەرستن، جگە لە چەند ناوێك نەبێت کە ئێوە و با و باپیرانتان ناوتان ناون، خوا هیچ بەڵگەیەکی دەربارەیان نەناردۆتە خوارەوە، بێگومان بڕیار تەنها بۆ خوایە، فەرمانی داوە جگە لەو (خوا) هیچ شتێ نەپەرستن، ئەوەیە ئایینی ڕاستی دامەزراوی نەگۆڕاوە بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، ئەی دوو هاوڕێکەی بەندیخانەم یەکێکتان عارەق دەرخواردی گەورەکەی (پادشا) دەدات، بەڵام ئەوی ترتان (دەکوژرێ و) هەڵدەواسرێ، ئەوسا باڵندە لەسەر (و دەم و چاو)ی دەخوات، ئەو کارەی کە ئێوە دەربارەی پرسیار دەکەن بڕیار دراوە، وە (یوسف) وتی: بەوەی دەیزانی ڕزگاری دەبێ، لە دوو بەندکراوەکە باسم بکە لای گەورە و پادشاکەت (کە بەناهەق گیراوم)، بەڵام شەیتان باسکردنی (یوسفی) لە بیری بردەوە لای پادشا (باسی بکات)، بۆیە ماوەی چەند ساڵێك (یوسف) لە بەندیخانەدا مایەوە، وە پادشا وتی: بێگومان من لە خەومدا حەوت مانگای قەڵەوم بینی کە حەوت (مانگا)ی لەڕ دەیخواردن، وە حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوز و حەوتی تری وشکیشم بینی، ئەی پیاو ماقوڵان ئەم خەوەم بۆ لێکدەنەوە ئەگەر ئێوە مانای خەو دەکەن و دەزانن خەو پەرژین بکەن، وتیان خەوی تێکەڵ و پێکەڵە (پڕ و پوچە) و ئێمەش لێکدانەوەی خەوی تێکەڵ و

پێکەڵ نازانین، ئینجا ئەوەیان کە ڕزگار بوو لە دوو (بەندکراو)ـەکە لەپاش چەند ساڵێك بیری کەوتەوە و وتی: من مانای ئەو خەوەتان بۆ لێکدەدەمەوە، جا (وتی) بمنێرن (بەدوای یوسفدا کە لە بەندیخانەیە)، وتی: یوسف ئەی هاوڕێی ڕاستگۆ مانای ئەو خەوەمان پێ بڵێ چییە حەوت مانگای قەڵەو کە حەوت مانگای لەڕ و لاواز بیان خوات، هەروەها حەوت گوڵی دانەوێڵەی سەوز و حەوت گوڵی وشك تا من بگەڕێمەوە بۆ لای خەڵکی بۆ ئەوەی ئەوان ئەوە بزانن، (یوسف) وتی: حەوت ساڵ کوشتوکاڵ دەکەن بەدوای یەکدا و بەبەردەوامی جا ئەوەی کە دروێنەتان کرد بیهێڵنەوە لە گوڵەکەیدا، کەمێك نەبێت لەوەی کە دەیخۆن، ئینجا لە پاش ئەو (حەوت ساڵە) حەوت ساڵی تر دێت کە سەخت و قات و قڕییە هەرچیتان پاشەکەوت کردوە بۆ ئەم (حەوت ساڵە سەختە) دەیخۆن، مەگەر کەمێك لەوەی قایم هەڵی دەگرن[1]، پاشان دوای ئەو (حەوت ساڵە سەختە) ساڵێك دێت خەڵکی تێیدا (ڕزگار دەکرێن)، بارانیان بۆ دەبارێنرێ و تێیدا شەربەتی (ی میوەهات) دەگرن، پادشا وتی: ئەو (پیاوەم) بۆ بێنن، جا کاتێ نێردراوەکە (ی پادشا) هاتە لای یوسف ﷺ، (یوسف) وتی: بگەڕێرەوە بۆ لای گەورەکەت).

(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ﴿ وَٱدَّكَرَ ﴿٤٥﴾ ﴾ لەسەر کێشی (افتعَل) یە لە (ذَكَرَ)ـەوە وەرگیراوە (کە بەمانای بیری کەوتەوە دێت) (أُمَّة) چەرخ و سەدە، وە بە (أَمَهٍ) دەخوێنرێتەوە واتە: لە بیر چوون.

ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: ﴿ يَعۡصِرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾: ترێ و ڕۆن (ی کونجی دەگوشن) ﴿ تُحۡصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾: (قایم هەڵی دەگرن و) دەیچێنن.

---

(١) بۆ تۆو کردن.

٦٩٩٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ وَأَبَا عُبَيْدٍ أَخْبَرَاهُ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ لَبِثْتُ فِي السِّجْنِ مَا لَبِثَ يُوسُفُ ثُمَّ أَتَانِي الدَّاعِي لأَجَبْتُهُ»[1].

**٦٩٩٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وە ئەگەر من ئەو ماوە درێژ و زۆرەی یوسف ﷺ لە بەندیخانەدا مایەوە بمایامەوە پاشان بانگکەرەکە بهاتایە بە دوامدا، بێگومان دەڕۆشتم بە دەمیەوە[2])).**

## ١٠- بابُ مَنْ رَآى النَّبِيَّ ﷺ فِي الْمَنَامِ

٦٩٩٣- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: "مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ، وَلاَ يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي"[3]، قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ ابن سِيرِينَ: إِذَا رَآهُ فِي صُورَتِهِ.

## ١٠- باسی ئەو کەسەی لە خەودا پێغەمبەر ﷺ ببینێت

**٦٩٩٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((هەر کەسێك لە خەویدا من ببینێ ئەوە بەڕاستی لە کاتی بەخەبەر بووندا من دەبینێت، شەیتان ناتوانێ لە شێوەی مندا خۆی پیشان (ی خەڵك) بدات)).**

**ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئیبنو سیرین دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەری ﷺ بینی لەسەر شێوەی خۆی[4].**

---

(١) بڕوانە: ٣٣٧٢.

(٢) کە هات بۆ لای یوسف ﷺ وتی: پاشا بانگت دەکات خەوێکی بینیوە بۆی مانا بکەیت، بەڵام یوسف نەڕۆشت.

(٣) بڕوانە: ١١٠.

(٤) ئەوسا پێغەمبەر ﷺ دەبینێ لە دوا ڕۆژدا.

٦٩٩٤- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُخْتَارٍ، حَدَّثَنَا ثَابِتٌ البُنَانِيُّ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي؛ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَخَيَّلُ بِي، وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ»[1].

**٦٩٩٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك لە خەویدا من ببینێت، ئەوە بێگومان منی بینیوە، چونکە بەڕاستی شەیتان ناتوانێ لە شێوەی مندا خۆی پیشان بدات، وە خەو بینینی باوەڕدار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی)).**

٦٩٩٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي جَعْفَرٍ، أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَمَنْ رَأَى شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفِثْ عَنْ شِمَالِهِ ثَلاَثًا وَلْيَتَعَوَّذْ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ، وَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَزَايَا بِي»[2].

**٦٩٩٥- ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خەو بینینی چاك لە خواوەیە، وە خەوبینینی خراپ لە شەیتانەوەیە، جا هەر کەسێك لە خەویدا شتێکی بینی بەلایەوە ناخۆش بوو (کە لە خەو هەستا) باسێ جار تف بکاتە لای چەپی، وە پەنا بگرێ بەخوا لە شەیتان، چونکە بەدڵنیاییەوە زیانی پێ ناگەیەنێت، وە بێگومان شەیتان ناتوانێت خۆی لە شێوەی مندا نیشان بدات (لە خەو بینیندا) )).**

٦٩٩٦- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ خَلِيٍّ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنِي الزُّبَيْدِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: قَالَ أَبُو قَتَادَةَ ﷺ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ رَآنِي فَقَدْ رَأَى الحَقَّ». تَابَعَهُ يُونُسُ وَابْنُ أَخِي الزُّهْرِيِّ[3].

---

(١) بڕوانە: ٦٩٨٣.

(٢) بڕوانە: ٣٢٩٢.

(٣) بڕوانە: ٣٢٩٢.

**٦٩٩٦- ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێ لە خەویدا من ببینێ، ئەوە بێگومان بەڕاستی منی بینیوە [1])).**
**یونس و كوڕی برای زوهری ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی زوبەیدی دەكەن.**

٦٩٩٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي ابْنُ الْهَادِ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ رَآنِي فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَكَوَّنُنِي»

**٦٩٩٧- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە كە دەیفەرموو: ((هەر كەسێك لە خەویدا من ببینێ، ئەوە بێگومان هەر بەڕاستی منی بینیوە، چونكە بێگومان شەیتان ناتوانێ خۆی وەكو من لێ بكات و بڕواتە سەر شێوەی من)).**

## ١١- بابُ رُؤْيَا اللَّيْلِ

رَوَاهُ سَمُرَةُ[2].

٦٩٩٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ المِقْدَامِ العِجْلِيُّ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الطُّفَاوِيُّ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ الكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَبَيْنَمَا أَنَا نَائِمٌ البَارِحَةَ إِذْ أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الأَرْضِ حَتَّى وُضِعَتْ فِي يَدِي». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنْتُمْ تَنْتَقِلُونَهَا[3].

---

(١) ئەگەر لەسەر شێوەی خۆی ببینێت ئەوە خۆی بینیوە، چونكە شەیتان ناتوانێ بڕواتە سەر شێوەی پێغەمبەر ﷺ.
(٢) بڕوانە: ٧٠٤٧.
(٣) بڕوانە: ٢٩٧٧.

# ١١- باسی خەو بینین لە شەودا

ئەو فەرموودەی لەم باسەدا هاتووە سەمورە ﷺ گێڕاویەتیەوە[1].

٦٩٩٨- موحەممەد لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کلیلی وتە کورتە پڕ ماناکانم پێدراوە، وە بەترس و بیمی بەتین سەرخراوم، جا لە کاتێکدا شەوی ڕابوردوو لە خەودا بووم کە کلیلی گەنجینەکانی زەویم پێدرا و خرایە ناودەستم)). ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت و وەفاتی کرد، ئێوەش ئەو گەنجینانە دەردەهێنن.

٦٩٩٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أُرَانِي اللَّيْلَةَ عِنْدَ الكَعْبَةِ، فَرَأَيْتُ رَجُلاً آدَمَ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنْ أُدْمِ الرِّجَالِ، لَهُ لِمَّةٌ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنَ اللِّمَمِ، قَدْ رَجَّلَهَا تَقْطُرُ مَاءً، مُتَّكِئًا عَلَى رَجُلَيْنِ -أَوْ عَلَى عَوَاتِقِ رَجُلَيْنِ- يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَسَأَلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقِيلَ: المَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ. ثُمَّ إِذَا أَنَا بِرَجُلٍ جَعْدٍ قَطَطٍ أَعْوَرِ الْعَيْنِ الْيُمْنَى، كَأَنَّهَا عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ، فَسَأَلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقِيلَ: المَسِيحُ الدَّجَّالُ»[2].

٦٩٩٩- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەم شەو لە خەودا خۆم بینی لای کەعبەدا بووم، ئینجا پیاوێکی ئەسمەرم بینی وەك جوانترین پیاو بوو لە پیاوە ئەسمەرەکاندا مرۆڤ بینیبێتی، قژێکی هەبوو دەیدا لە شانەکانی، جوانترین قژ بوو بەو شێوە قژە مرۆڤ بینی بێتی، بێگومان جوان قژی داهێنابوو، سەری ئاوی لێ دەتکا، خۆی دابوو بەسەر دوو پیاودا - یان خۆی دابوو بەسەر شانی دوو پیاودا- تەواڧ دەکرد بەدەوری بەیتدا، منیش پرسیارم کرد ئەمە کێیە؟ وترا: مەسیحی کوڕی مەریەمە، پاشان لەو کاتەدا پیاوێکم دی قژی زۆر لوول

(١) لە صەحیحی بوخاریدا بەژمارە: ٧٠٤٧.

(٢) بڕوانە: ٣٤٤٠.

**بوو، چاوی ڕاستی كوێر بوو، وەك دەنكە ترێیەك وابوو دەرپۆقی بێت [١]، ئینجا پرسیارم كرد ئەمە كێیە؟ وترا: ئەمە مەسیحی دەججالە)).**

٧٠٠٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أُرِيتُ اللَّيْلَةَ فِي الْمَنَامِ، وَسَاقَ الحَدِيثَ. وَتَابَعَهُ سُلَيْمَانُ بْنُ كَثِيرٍ وَابْنُ أَخِي الزُّهْرِيِّ وَسُفْيَانُ بْنُ حُسَيْنٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَالَ الزُّبَيْدِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ -أَوْ أَبَا هُرَيْرَةَ- عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَالَ شُعَيْبٌ وَإِسْحَاقُ بْنُ يَحْيَى، عَنِ الزُّهْرِيِّ: كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَكَانَ مَعْمَرٌ لاَ يُسْنِدُهُ حَتَّى كَانَ بَعْدُ [٢].

**٧٠٠٠- عوبەیدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە كە ئیبنو عەبباس ﵄ دەیگێڕایەوە كە پیاوێك هاتبوویە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من ئەمشەو لە خەومدا نیشانم درا... ئیتر فەرموودەكەی باس كرد.**

**سولەیمانی كوڕی كەسیر و كوڕی برای زوهری و سوفیانی كوڕی حوسەین لە زوهرییەوە گێڕایانەوە لە عوبەیدوڵڵاوە لە ئیبنو عەبباسەوە ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودەیان گێڕایەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی زوهریان كردوە.**

**وە زوبەیدی لە زوهرییەوە دەگێڕێتەوە لە عوبەیدوڵڵاوە دەگێڕێتەوە كە ئیبنو عەبباس یان ئەبو هوڕەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە.**

**وە شوعەیب و ئیسحاقی كوڕی یەحیا لە زوهرییەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: ئەبو هوڕەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە دەیگێڕایەوە.**

**وە مەعمەر ڕشتەی ئەم فەرموودەی نەدەهێنا تا دواتر ڕشتەكەی باس دەكرد.**

---

(١) واتە: چاوی ئاسای نەبوو لە قوڵای دابێت بەڵكو بەدەرەوە بوو.

(٢) بڕوانە: ٧٠٤٦.

## ١٢- بَابُ الرُّؤْيَا بِالنَّهَارِ

وَقَالَ ابن عَوْنٍ: عَنِ ابن سِيرِينَ: رُويَا النَّهَارِ مِثْلُ رُويَا اللَّيْلِ.

٧٠٠١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ، وَكَانَتْ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمًا فَأَطْعَمَتْهُ، وَجَعَلَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهْوَ يَضْحَكُ[1].

## ١٢- باسی خەو بینین بەڕۆژدا

**ئیبنو عەون لە ئیبنو سیرینەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: خەوبینینی ڕۆژ وەك خەو بینینی شەو وایە.**

**٧٠٠١- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو تەڵحە دەڵێ: کە ئەو لە ئەنەسی کوڕی مالیکی ﷺ بیست کە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆشت بۆ ماڵی ئوممو حەرامی کچی میلحان، وە ئوممو حەرام خێزانی عوبادەی کوڕی صامیت بوو، جا جارێکیان پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ماڵیان ئوممو حەرامیش چێشت و خواردنی دابە پێغەمبەر ﷺ و دەستی کرد بەبژنینی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری خواش ﷺ خەوی لێ کەوت، پاشان لە خەو هەستا و پێدەکەنی.**

٧٠٠٢ - قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ مُلُوكًا عَلَى الأَسِرَّةِ -أَوْ مِثْلَ الْمُلُوكِ على الأَسِرَّةِ». شَكَّ إِسْحَاقُ. قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ فَدَعَا لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهْوَ يَضْحَكُ. فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «نَاسٌ مِنْ

---

(١) بڕوانە: ٢٧٨٨.

أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ». كَمَا قَالَ فِي الأُولَى. قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ: «أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ». فَرَكِبَتِ الْبَحْرَ فِي زَمَانِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ فَهَلَكَتْ[1].

**٧٠٠٢- (ئومموحەرام) وتی: منیش، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەبەر چی پێدەكەنیت؟ فەرمووی: ((كەسانێك لە ئوممەتەكەم نیشاندرا كە جەنگاوەر بوون لە ڕێی خوادا سواری (كەشتی دەبن) لە ناوەڕاست دەریادا، پاشان لەسەر تەختەكەیان دانیشتوون))، یان((وەكو پادشا وان لەسەر تەختەكەیان دانیشتوون))، ئیسحاق گومانی بردووە لە (نێوان ئەو دوو ڕستەیەدا) ئوممو حەرام وتی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا نزام بۆ بكە لای خوا كە من لەو جەنگاوەرانەبم، پێغەمبەریش ﷺ نزای بۆ كرد، پاشان سەری خستەوە سەر پشتیەكە و (خەوت) پاشان خەبەری بوویەوە و پێدەكەنی (ئوممو حەرام وتی) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هۆی چییە پێدەكەنیت؟ فەرمووی: ((كەسانێك لە ئوممەتەكەمم نیشان درا جەنگاوەربوون لە ڕێی خوادا))، وەكو جاری یەكەمی فەرموو، (ئوممو حەرام) وتی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا نزام بۆ بكە لای خوا كە لەو جەنگاوەرانەبم، فەرمووی: ((تۆ لە یەكەمینەكانیت)) (ئەنەس دەڵێ:) لە سەردەمی موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیاندا ئوممو حەرام سواری كەشتی بوو لە دەریادا (بۆ خەبات لە ڕێی خوادا)، جا كاتێ لە دەریا هاتەدەر (بۆ وشكانی) لە وڵاخەكەی كەوتە خوارەوە و مرد.**

## ١٣- بابُ رُؤْيَا النِّسَاءِ

٧٠٠٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي خَارِجَةُ بْنُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ أَنَّ أُمَّ الْعَلاَءِ -امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ بَايَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرَتْهُ

(١) بڕوانە: ٢٧٨٩.

أَنَّهُمُ اقْتَسَمُوا الْمُهَاجِرِينَ قُرْعَةً. قَالَتْ: فَطَارَ لَنَا عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ، وَأَنْزَلْنَاهُ فِي أَبْيَاتِنَا، فَوَجِعَ وَجَعَهُ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، فَلَمَّا تُوُفِّيَ غُسِّلَ وَكُفِّنَ فِي أَثْوَابِهِ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ أَبَا السَّائِبِ، فَشَهَادَتِي عَلَيْكَ لَقَدْ أَكْرَمَكَ اللَّهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَمَا يُدْرِيكِ أَنَّ اللَّهَ أَكْرَمَهُ؟». فَقُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَنْ يُكْرِمُهُ اللَّهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَّا هُوَ فَوَاللَّهِ لَقَدْ جَاءَهُ الْيَقِينُ، وَاللَّهِ إِنِّي لأَرْجُو لَهُ الْخَيْرَ، وَوَاللَّهِ مَا أَدْرِي -وَأَنَا رَسُولُ اللَّهِ- مَاذَا يُفْعَلُ بِي». فَقَالَتْ: وَاللَّهِ لاَ أُزَكِّي بَعْدَهُ أَحَدًا أَبَدًا[1].

## ١٣- باسی خەو بینینی ئافرەتان

**٧٠٠٣- خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیت دەگێڕێتەوە: ئوممو عەلا -کە ئافرەتێکی ئەنصاری بوو پەیمانی بە پێغەمبەر ﷺ دابوو- بۆی گێڕایەوە: کە کۆچەرییەکان بەتیر و پشك دابەشکران، عوسمانی کوڕی مزعون بەری ئێمە کەوت ئێمە لە خانوو و ماڵی خۆماندا نیشتەجێمان کرد، ئەنجا نەخۆش کەوت بەو نەخۆشیەی کە پێی مرد، جا کەمرد و شۆرا و کفن کرا لە پارچە قوماشەکاندا، پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ سەرتەرمەکەی منیش وتم: ئەبو سائیب ڕەحمەتی خوات لێ بێ شایەتیت بۆ دەدەم بێگومان لای خوا ڕێزلێگیراویت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((تۆ چووزانیت خوا ڕێزی لێ گرتووە؟)) وتم: باوکم بەقوربانت بێ ئەی پێغەمبەری خوا خوا ڕێز لە کێ دەگرێ؟ فەرمووی: ((بەڵام عوسمان مردنی بەسەردا هاتووە، وەڵڵاهی من ئومێدی خێری بۆ دەکەم وە سوێند بەخوا -من بۆخۆشم کە پێغەمبەری خوام- نازانم چیم لێ دەکرێ و چیم بەسەردا دێت!)) ئوممو عەلا وتی: سوێند بەخوا لە دوای عوسمانی کوڕی مەزعون کەس بەچاك و بەهەشتی دانانێم.**

---

(١) بڕوانە: ١٢٤٣.

٧٠٠٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ بِهَذَا، وَقَالَ: «مَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِهِ». قَالَتْ: وَأَحْزَنَنِي، فَنِمْتُ فَرَأَيْتُ لِعُثْمَانَ عَيْنًا تَجْرِي، فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «ذَلِكَ عَمَلُهُ»[1].

**٧٠٠٤-ئەبولیەمان بۆی گێڕاینەوە وتی: شوعەیب بۆی گێڕاینەوە لە زوهریەوە ئەو فەرموودەی گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من نازانم (کە پێغەمبەری خواشم) چیم لێ دەکرێت))، (ئوممو لعەلا) وتی: ئەم باسە خەفەتباری کردم، ئینجا خەوتم و لەخەومدا کانیاوێکم بینی کە (ئاوەکەی) دەڕۆشت هی عوسمان بوو، ئینجا خەوەکەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((ئەوە کردەوەی عوسمانە)).**

## ١٤- بابٌ: الحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ فَإِذَا حَلَمَ فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ وَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ ﷻ

٧٠٠٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ الأَنْصَارِيَّ -وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَفُرْسَانِهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا حَلَمَ أَحَدُكُمُ الحُلُمَ يَكْرَهُهُ فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ وَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْهُ، فَلَنْ يَضُرَّهُ»[2].

## ١٤- باسێک: خەو بینینی خراپ لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر کەسێک خەوێکی خراپی بینی با تف بکات بەلای چەپیدا و پەنا بگرێت بەخوا ﷻ

**٧٠٠٥- ئەبو سەلەمە دەگێڕێتەوە کە ئەبو قەتادە ﷺ کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وە لە سوار چاکەکانی بوو، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((خەو بینینی**

(١) بڕوانە: ١٢٤٣.

(٢) بڕوانە: ٣٢٩٢.

چاك لە خواوەیە و خەو بینینی خراپ لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر کەسێکتان خەویکی ناخۆشی بینی بەلایەوە ناخۆش بوو، (کە لە خەو هەستا) با سێ جار تف بکاتە لای چەپی، وە پەنا بگرێ بەخوا لەو خەوە، چونکە بەدڵنیاییەوە زیانی پێ ناگەیەنێت)).

## ١٥- بابُ اللَّبَنِ

٧٠٠٦- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ، فَشَرِبْتُ مِنْهُ، حَتَّى إِنِّي لأَرَى الرِّيَّ يَخْرُجُ مِنْ أَظْفَارِي، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِي». يَعْنِي عُمَرَ. قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الْعِلْمَ»[1].

## ١٥- باسی (خەو بینین بە) شیرەوە

٧٠٠٦- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەوەکەمدا پەرداخێك شیریان بۆ هێنام منیش لێم خواردەوە (بەجۆرێ پاراو بوومەوە)، هەتا وامدەزانی پاراوی لە نینۆکەکانمەوە دەردەچێ، پاشان پاشماوەکەممدا بەو)) مەبەستی عومەر بوو، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خەوە بەچی لێك دەدەیتەوە؟ فەرمووی: ((بە عیلم و زانست)).

## ١٦- بابٌ: إِذَا جَرَى اللَّبَنُ فِي أَطْرَافِهِ أَوْ أَظَافِيرِهِ

٧٠٠٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنِي حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما يَقُولُ:

(١) بروانە: ٨٢.

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ مِنْهُ، حَتَّى إِنِّي لأَرَى الرِّيَّ يَخْرُجُ مِنْ أَطْرَافِي، فَأَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ». فَقَالَ مَنْ حَوْلَهُ: فَمَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الْعِلْمَ»[1].

## ١٦- باسێک: ئەگەر کەسێک لە خەویدا بینی شیر لە دەستەکانیەوە دەردەچوو یان لە نینۆکەکانیەوە

**٧٠٠٧- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەوەکەمدا پەرداخێك شیریان بۆ هێنام و لێم خواردەوە (بەجۆرێ پاراو بوومەوە)، هەتا وامدەزانی پاراوی لە نینۆکەکانمەوە دەردەچێ، پاشان پاشماوەکەممدا بە عومەری کوڕی خەتتاب))، جا ئەو کەسانەی لە دەوری بوون عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خەوەت بەچی لێك دایەوە؟ فەرمووی: ((بە عیلم و زانست)).**

## ١٧- بابُ القَمِيصِ فِي المَنَامِ

٧٠٠٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو أُمَامَةَ بْنُ سَهْلٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَمَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثَّدْيَ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ دُونَ ذَلِكَ، وَمَرَّ عَلَيَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ». قَالُوا مَا أَوَّلْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الدِّينَ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٨٢.

(٢) بڕوانە: ٢٣.

## ١٧- باسی بینینی کراس (پۆشاک) لە خەودا

٧٠٠٨- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا خەوتبووم لە خەومدا خەڵکانێکم بینی کە کراسیان لەبەردابوو پیشانم دەدران، هەندێکیان کراسەکانیان دەگەشتە مەمکیان، هەندێکی تریان لەوەش کورتتر بوو، وە عومەری کوڕی خەتتاب بەلامدا تێپەڕی کراسێکی لەبەردا بوو بە دوای خۆیدا ڕایدەکێشا))، وتیان: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە خەومت بەچی لێك دایەوە؟ فەرمووی: ((بە ئایین)).

## ١٨- بابُ جَرِّ القَمِيصِ فِي المَنَامِ

٧٠٠٩- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي أَبُو أُمَامَةَ بْنُ سَهْلٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ عُرِضُوا عَلَيَّ، وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ، فَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدْيَ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ دُونَ ذَلِكَ، وَعُرِضَ عَلَيَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجْتَرُّهُ». قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الدِّينَ»[1].

## ١٨- باسی بینینی ڕاکێشانی پۆشاک (کراس) بەشوێن خۆیدا لە خەودا

٧٠٠٩- ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە کاتێکدا خەوتبووم لە خەومدا خەڵکانێکم دی پیشانم دران کە کراسیان لەبەردا بوو، هەندێك لە

---

(١) بڕوانە: ٢٣.

**کراسەکان دەگەشتنە مەمکیان، هەندێکی تریان لەوەش کورتتر بوون، بەڵام عومەری کوڕی خەتتابم نیشاندرا کراسێکی لەبەردا بوو بە دوای خۆیدا ڕایدەکێشا))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە خەومت بەچی لێك دایەوە؟ فەرمووی: ((بەئایین)).**

## ١٩- بَابُ الْخُضَرِ فِي الْمَنَامِ وَالرَّوْضَةِ الْخَضْرَاءِ

٧٠١٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الْجُعْفِيُّ، حَدَّثَنَا حَرَمِيُّ بْنُ عُمَارَةَ، حَدَّثَنَا قُرَّةُ بْنُ خَالِدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: قَالَ قَيْسُ بْنُ عُبَادٍ: كُنْتُ فِي حَلْقَةٍ فِيهَا سَعْدُ بْنُ مَالِكٍ وَابْنُ عُمَرَ، فَمَرَّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ فَقَالُوا: هَذَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ. فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّهُمْ قَالُوا كَذَا وَكَذَا. قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ! مَا كَانَ يَنْبَغِي لَهُمْ أَنْ يَقُولُوا مَا لَيْسَ لَهُمْ بِهِ عِلْمٌ، إِنَّمَا رَأَيْتُ كَأَنَّمَا عَمُودٌ وُضِعَ فِي رَوْضَةٍ خَضْرَاءَ، فَنُصِبَ فِيهَا، وَفِي رَأْسِهَا عُرْوَةٌ وَفِي أَسْفَلِهَا مِنْصَفٌ - وَالْمِنْصَفُ: الوَصِيفُ- فَقِيلَ: ارْقَهْ. فَرَقِيتُ حَتَّى أَخَذْتُ بِالْعُرْوَةِ. فَقَصَصْتُهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَمُوتُ عَبْدُ اللَّهِ وَهُوَ آخِذٌ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى»[1].

## ١٩- باسی بینینی سەوزی لە خەودا، وە بینینی باغێکی سەوز لە خەودا

**٧٠١٠- قەیسی کوڕی عوباد دەڵێ: من لە کۆڕ و دانیشتنێکدا بووم سەعدی کوڕی مالیك و ئیبنو عومەری ﷺ تیابوو، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﷺ تێپەڕی وتیان: ئەوە پیاوێکە لە خەڵکی بەهەشت، منیش وتم پێی (بە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام) ئەوانە ئاوا و ئاوایان وت (پێت)، وتی: پاك و بێگەردی بۆ خوا، شیاو نییە بۆیان شتێك بڵێن کە زانیاریان پێی نییە، بێگومان لە خەومدا بینیم**

(١) بڕوانە: ٣٨١٣.

شتێك وەکو کۆڵەکە لە ناو باغێکی سەوزدا دانراوە و قاییم کراوە تیایدا، وە سەری کۆڵەکەکە دەسکێکی پێوەیە، وە لە بنی کۆڵەکەکەدا خزمەتکارێکی تیایە، (المِنْصَف) یش واتە: خزمەتکار، جاپێم وترا سەرکەوە پیایدا[١]، منیش پیایدا سەرکەوتم هەردوو دەستم گرت بەدەسکەکەوە[٢]، پاشان ئەو خەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((عەبدوڵلا کاتێ دەمرێت دەستی گرتووە بە (الْعُرْوَةِ الْوُثْقَى) دەسگیرە قایمەکەوە)) [٣].

## ٢٠- بابُ كَشْفِ المَرْأَةِ فِي المَنَامِ

٧٠١١- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُرِيتُكِ فِي المَنَامِ مَرَّتَيْنِ: إِذَا رَجُلٌ يَحْمِلُكِ فِي سَرَقَةِ حَرِيرٍ فَيَقُولُ: هَذِهِ امْرَأَتُكَ. فَأَكْشِفُهَا فَإِذَا هِيَ أَنْتِ، فَأَقُولُ: إِنْ يَكُنْ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ»[٤].

## ٢٠- باسی دەرخستنی (ڕووخساری) ئافرەت لە خەودا[5]

٧٠١١- عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە خەودا دووجار تۆم بینی، دەبینم پیاوێك تۆی لە ناو پارچە ئاوریشمێکی چاکدا هەڵگرتووە و دەڵێ: ئەمە ژنی تۆیە، منیش سەری لا دەدەم دەبینم ئافرەتەکە تۆیت، منیش وتم: ئەگەر ئەمە لە خواوە بێت بە جێی دێنێ)).

---

(١) واتە: بەکۆڵەکەدا سەرکەوە بۆ سەرەوە.
(٢) کە بەبەشی سەرەوەی کۆڵەکەکەوە بوو.
(٣) کە دەستگرتنە بەئیسلامەوە بەقایمی و توندی.
(٤) بڕوانە: ٣٨٩٥.
(٥) واتە: لە خەو بینیندا.

## ٢١- بابُ ثِيَابِ الحَرِيرِ فِي المَنَامِ

٧٠١٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُرِيتُكِ قَبْلَ أَنْ أَتَزَوَّجَكِ مَرَّتَيْنِ: رَأَيْتُ الْمَلَكَ يَحْمِلُكِ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ، فَقُلْتُ لَهُ: اكْشِفْ. فَكَشَفَ فَإِذَا هِيَ أَنْتِ، فَقُلْتُ: إِنْ يَكُنْ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ. ثُمَّ أُرِيتُكِ يَحْمِلُكِ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ، فَقُلْتُ: اكْشِفْ. فَكَشَفَ فَإِذَا هِيَ أَنْتِ، فَقُلْتُ: إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ»[1].

## ٢١- باسی بینینی پۆشاکی ئاوریشم لە خەودا [2]

**٧٠١٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((پێش ئەوەی مارەت بکەم و بتهێنم دوو جار لە خەومدا تۆیان نیشان دام، فریشتەکەم دی لە پارچە ئاوریشمێکدا هەڵیگرتبووی، منیش پێم وت سەری لادە، ئەویش سەری لادا دەبینم تۆی، منیش وتم: ئەگەر ئەمە (ی بینیم) لە لایەن خواوە بێت بەدی دێنێ، پاشان تۆم نیشان درا (فریشتەکە) لە پارچە ئاوریشمێکدا هەڵیگرتبووی، منیش وتم: سەری لادە ئەویش سەری لادا، جا دەبینم تۆیت، منیش وتم: ئەگەر ئەمە (ی بینیم) لە لایەن خواوە بێت بەدی دێنێ)).**

## ٢٢- بابُ المَفَاتِيحِ فِي اليَدِ

٧٠١٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَبَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الأَرْضِ، فَوُضِعَتْ فِي يَدِي». قَالَ

(١) بڕوانە: ٣٨٩٥.

(٢) واتە: لە خەو بینیندا.

مُحَمَّدٌ: وَبَلَغَنِي أَنَّ جَوَامِعَ الكَلِمِ أَنَّ اللَّهَ يَجْمَعُ الأُمُورَ الْكَثِيرَةَ الَّتِي كَانَتْ تُكْتَبُ فِي الْكُتُبِ قَبْلَهُ فِي الأَمْرِ الوَاحِدِ وَالأَمْرَيْنِ. أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ[١].

## ٢٢- باسی (بینینی) کلیل لە ناو دەست بوون (لە خەودا)

**٧٠١٣- سەعیدی کوڕی موسەییەب دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بە پێغەمبەرێتی نێردراوم بەوتەی کورتی پڕ ماناوە، وە بەترس و بیمی بەتین سەرخراوم، جا لە کاتێکدا کە لە خەودا بووم کلیلی گەنجینەکانی زەویم پێدرا و خرایە ناو دەستم)).**

**موحەممەد (ی کوڕی شیهابی زوهری) دەڵێ: پێم گەشتووە کە مەبەست بە: (جَوَامِعَ الكَلِمِ) ئەوەیە کە خوا شتانێکی زۆر کە لە کتێبەکانی پێش خۆیدا[٢] دەنووسرا لە یەك یا دووشت دا بۆی کۆدەکاتەوە یان هاوشێوەی ئەوە.**

## ٢٣- بَابُ التَّعْلِيقِ بِالْعُرْوَةِ وَالْحَلْقَةِ

٧٠١٤- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا أَزْهَرُ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ ح. وَحَدَّثَنِي خَلِيفَةُ، حَدَّثَنَا مُعَاذٌ، حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا قَيْسُ بْنُ عُبَادٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلاَمٍ قَالَ: رَأَيْتُ كَأَنِّي فِي رَوْضَةٍ، وَسَطَ الرَّوْضَةِ عَمُودٌ فِي أَعْلَى العَمُودِ عُرْوَةٌ، فَقِيلَ لِي: ارْقَهْ. قُلْتُ: لاَ أَسْتَطِيعُ. فَأَتَانِي وَصِيفٌ فَرَفَعَ ثِيَابِي فَرَقِيتُ، فَاسْتَمْسَكْتُ بِالْعُرْوَةِ، فَانْتَبَهْتُ وَأَنَا مُسْتَمْسِكٌ بِهَا، فَقَصَصْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «تِلْكَ الرَّوْضَةُ رَوْضَةُ الإِسْلاَمِ، وَذَلِكَ الْعَمُودُ عَمُودُ الإِسْلاَمِ، وَتِلْكَ الْعُرْوَةُ عُرْوَةُ الْوُثْقَى، لاَ تَزَالُ مُسْتَمْسِكًا بِالإِسْلاَمِ حَتَّى تَمُوتَ»[٣].

---

(١) بڕوانە: ٢٩٧٧.

(٢) مەبەستی پێغەمبەرمانە ﷺ.

(٣) بڕوانە: ٣٨١٣.

## ٢٣- باسی (خەو بینین بە) خۆ هەڵواسین بە دەستگیر و هەڵقەدا

٧٠١٤- قەیسی كوڕی عوباد لە عەبدوڵڵای كوڕی سەلامەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە خەومدا وەك لە ناو باخێكدا بم، لە ناوەڕاستی باخەكەدا كۆڵەكەیەكی تیایە، لای سەرویەوە دەسكێكی هەبوو، جا پێم وترا: سەركەوە پیایدا. وتم: ناتوانم، غوڵامێ هات و لە پشتەوە پۆشاكەكەی هەلگرتم و سەركەوتم و دەستم گرت بەدەسكەكەوە، جا كە خەبەرم بوویەوە دەسكەكە بەدەستمەوە بوو! ئینجا گێڕامەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: ((ئەو باغە باخی ئیسلامە، ئەو كۆڵەكەیە كۆڵەكەی ئیسلامە، ئەو دەسگیرەش (عُرْوَةُ الْوُثْقَى) یە، كەواتە تۆ لە سەر ئیسلامی هەتا دەمری)).

## ٢٤- بابُ عَمُودِ الفُسْطَاطِ تحت وِسادته

## ٢٤- باسی (خەو بینین بە) كۆڵەكەی چادرەوە لە ژێر سەرینەكەیدا بێت

## ٢٥- بابُ الإِسْتَبْرَقِ وَدُخُولِ الجَنَّةِ فِي المَنَامِ

٧٠١٥- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ فِي يَدِي سَرَقَةً مِنْ حَرِيرٍ لاَ أَهْوِي بِهَا إِلَى مَكَانٍ فِي الْجَنَّةِ إِلاَّ طَارَتْ بِي إِلَيْهِ، فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ[1].

---

(١) بڕوانە: ٤٤٠.

## ٢٥- باسی ئاوریشمی ئەستوور بینین لە خەودا، هەروەها ڕۆشتنە بەهەشت لە خەودا

**٧٠١٥- عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: خەوم بینی لە خەومدا وەك ئەوە وا بوو پارچەیەك ئاوریشمم بەدەستەوە بێت، جا حەزم لە هەر شوێنێك بووایە لە بەهەشت لەگەڵ خۆی بەفڕین دەیبردمە ئەو شوێنەوە، منیش ئەو خەوەم گێڕایەوە بۆ حەفصە.**

٧٠١٦ - فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ أَخَاكِ رَجُلٌ صَالِحٌ». أَوْ قَالَ: «إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ رَجُلٌ صَالِحٌ»[١].

**٧٠١٦- (عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ:) حەفصەش ﷺ ئەو خەوەی[٢] گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((بێگومان براكەت پیاوێكی چاكە))، یان فەرمووی: ((بەڕاستی عەبدوڵڵا پیاوێكی چاكە)).**

## ٢٦- بابُ القَيْدِ فِي المَنَامِ

٧٠١٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، سَمِعْتُ عَوْفًا، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ تَكْذِبُ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ، وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ.» قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَنَا أَقُولُ هَذِهِ قَالَ: وَكَانَ يُقَالُ: الرُّؤْيَا ثَلاَثٌ: حَدِيثُ النَّفْسِ، وَتَخْوِيفُ الشَّيْطَانِ، وَبُشْرَى مِنَ اللَّهِ، فَمَنْ رَأَى شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلاَ يَقُصُّهُ عَلَى أَحَدٍ، وَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ. قَالَ: وَكَانَ يُكْرَهُ الْغُلُّ فِي النَّوْمِ،

---

(١) بروانە: ١١٢٢.

(٢) عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ.

وَكَانَ يُعْجِبُهُمُ الْقَيْدُ، وَيُقَالُ: الْقَيْدُ ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ. وَرَوَى قَتَادَةُ وَيُونُسُ وَهِشَامٌ وَأَبُو هِلاَلٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَأَدْرَجَهُ بَعْضُهُمْ كُلَّهُ فِي الْحَدِيثِ، وَحَدِيثُ عَوْفٍ أَبْيَنُ. وَقَالَ يُونُسُ: لاَ أَحْسِبُهُ إِلاَّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْقَيْدِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: لاَ تَكُونُ الأَغْلاَلُ إِلاَّ فِي الأَعْنَاقِ[1].

## ٢٦- باسی کۆت و زنجیر بینین لە خەودا[2]

**٧٠١٧-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کاتی (هاتنی قیامەت) نزیك بوویەوە[3]، زۆر نزیکە خەو بینینی باوەڕدار هەڵە نەبێت، وە خەو بینینی باوەڕدار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی)).**

**-موحەممەد (ی کوڕی سیرین) دەڵێ: منیش ئەمە[4] دەڵێم، دەڵێ: لە ڕابردوودا وتراوە[5]: خەو بینین سێ جۆرە: (خەوێ) کە دالغەی دەروونی ئەو کەسە خۆیەتی، وە ترساندی شەیتان[6] (بۆ مرۆڤ)وە مژدە لە لایەن خواوە[7]، جا هەر کەس خەوێکی بینی پێی ناخۆش بوو نەیگێڕێتەوە بۆ کەس و هەستێ نوێژ بکات، دەڵێ: تەوقی گەردن بینینی بەلاوە ناپەسەند بوو، بەڵام کۆت و زنجیریان لا پەسەند بوو، وە دەوترا: کۆت و زنجیری دەست و پێ دامەزراویە لە ئایندا.**

**-قەتادە و یونس و هیشام و ئەبو هیلال لە ئیبنو سیرینەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە ئەویش لە ئەبی هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

---

(١) بڕوانە: ٦٩٨٨.

(٢) ئەگەر کەسێک خەو ببینێ لە خەویدا دەست و پێی کۆت و زنجیر کراوە مانای چیە؟.

(٣) یان کاتێ شەو ڕۆژ وەک یەکیان لێهات لە کورت و درێژیدا.

(٤) کە ئەم ئوممەتی ئیسلام لەو کاتدا بەزۆری خەو بینین هەڵە نابێت.

(٥) ئەبو هورەیرە ﷺ وتوویەتی.

(٦) بە بینینی خەوی ناخۆش.

(٧) کە خەو بینین باش و چاکە.

وە هەندێك لە گێڕەرەوەكان ئەمەیان هەموو[1] بۆ فەرموودەكە زیاد كردوە، فەرموودەكەی عون گێڕاویەتیەوە ڕوونترە، یونسیش دەڵێ: من هەروا دەزانم گومان دەبەم ئەوەی دەربارەی ئەو تەوقە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: تەوق هەر لە گەردندا دەبێت[2].

## ٢٧- بابُ العَيْنِ الجَارِيَةِ فِي المَنَامِ

٧٠١٨- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الله، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أُمِّ الْعَلاَءِ -وَهْيَ امْرَأَةٌ مِنْ نِسَائِهِمْ بَايَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: طَارَ لَنَا عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ فِي السُّكْنَى حِينَ اقْتَرَعَتِ الأَنْصَارُ عَلَى سُكْنَى الْمُهَاجِرِينَ، فَاشْتَكَى فَمَرَّضْنَاهُ حَتَّى تُوُفِّيَ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ فِي أَثْوَابِهِ، فَدَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: رَحْمَةُ اللهِ عَلَيْكَ أَبَا السَّائِبِ، فَشَهَادَتِي عَلَيْكَ لَقَدْ أَكْرَمَكَ اللَّهُ. قَالَ: «وَمَا يُدْرِيكِ؟». قُلْتُ: لاَ أَدْرِي وَاللَّهِ. قَالَ: «أَمَّا هُوَ فَقَدْ جَاءَهُ الْيَقِينُ، إِنِّي لأَرْجُو لَهُ الخَيْرَ مِنَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا أَدْرِي -وَأَنَا رَسُولُ اللَّهِ- مَا يُفْعَلُ بِي وَلاَ بِكُمْ». قَالَتْ أُمُّ الْعَلاَءِ: فَوَاللَّهِ لاَ أُزَكِّي أَحَدًا بَعْدَهُ. قَالَتْ: وَرَأَيْتُ لِعُثْمَانَ فِي النَّوْمِ عَيْنًا تَجْرِي، فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: «ذَاكِ عَمَلُهُ يَجْرِي لَهُ»[3].

## ٢٧- باسی سەرچاوەی ئاوی ڕەوان بینین لە خەودا

٧٠١٨- خاریجەی كوڕی زەیدی كوڕی سابیت لە ئوممو لعەلاوە دەگێڕێتەوە - كە ئافرەتێكە لەو ئافرەتانەی كە بەیعەتی بە پێغەمبەر ﷺ دابوو- وتی: عوسمانی كوڕی مەزعون لە تیروپشكدا بۆ نیشتەجێكردن بەر ئێمە كەوت، كاتێ ئەنصارییەكان قورعەكێشیان كرد بۆ نیشتەجێكردنی كۆچەران، ئەنجا عوسمانی

---

(١) لە (قَالَ مُحَمَّدٌ) تا دەگاتە (ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ).

(٢) تایبەت بەمل و گەردنەوە، بەڵام كۆت و زنجیر هی دەست و پێیە.

(٣) بڕوانە: ١٢٤٣.

**كوڕی مەزعون (لای ئێمە نیشتەجێ بوو)، تووشی ئازار و نەخۆشیەك بوو ئێمەش چارەسەرمان دەكرد هەتا ئەوكاتەی وەفاتی كرد، پاشان بەجل و بەرگەكەی خۆیەوە پێچامانەوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆماڵمان، منیش وتم: ڕەحمەتی خوات لێ بێ ئەبو سائیب من شایەتیت بۆ ئەدەم بەڕاستی خوا ڕێزی گرتوویت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تۆ چووزانیت؟)) وتم: وەڵڵاهی نازانم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڵام عوسمان بێگومان مردنی بەسەردا هات، وە بەڕاستی من ئومێدی چاكەی بۆ دەكەم (لای خوا)، وە سوێند بەخوا من نازانم - كە پێغەمبەری خواشم - چی بەمن و ئێوەش دەكرێت)). ئوممو لعەلا وتی: جا سوێند بەخوا ئیتر دوا ئەو فەرموودەیە كەس بەچاك ناژمێرم و باس ناكەم، دەڵێ: وە لە خەومدا كانیاوێكم بینی هی عوسمان بوو (ئاوەكەی) دەڕۆشت، ئەنجا هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خەوەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ((ئەوە كردەوەی عوسمانە دەڕوات بۆی)).**

## ٢٨- بابُ نَزْعِ المَاءِ مِنَ الْبِئْرِ حَتَّى يَرْوَى النَّاسُ

رَوَاهُ أَبُو هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

٧٠١٩- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ كَثِيرٍ، حَدَّثَنَا شُعَيْبُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا صَخْرُ بْنُ جُوَيْرِيَةَ، حَدَّثَنَا نَافِعٌ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَا أَنَا عَلَى بِئْرٍ أَنْزِعُ مِنْهَا إِذْ جَاءَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَأَخَذَ أَبُو بَكْرٍ الدَّلْوَ فَنَزَعَ ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ، وَفِي نَزْعِهِ ضَعْفٌ، فَغَفَرَ اللَّهُ لَهُ، ثُمَّ أَخَذَهَا ابْنُ الْخَطَّابِ مِنْ يَدِ أَبِي بَكْرٍ فَاسْتَحَالَتْ فِي يَدِهِ غَرْبًا، فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا مِنَ النَّاسِ يَفْرِي فَرْيَهُ حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ»[٢].

---

(١) بڕوانە: ٣٦٦٤.

(٢) بڕوانە: ٣٦٣٤.

## ٢٨- باسی (لە خەودا بینینی) ئاو هەڵگوزین لە بیر هەتا خەڵکی پاراو دەبن

ئەبو هوڕەیرە ﷺ ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

٧٠١٩- نافیع دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا (خەوتبووم خۆم دی) لەسەر بیرێك بووم ئاوم لێ دەرئەهێنا، ئەبو بەکر و عومەر هاتن، ئەنجا ئەبو بەکر دۆڵچەکەی وەرگرت دۆڵچەیەك یان دوو دۆڵچە ئاوی دەرئەهێنا، لە دەهێنانەکەشیدا لاواز بوو خوا لێی ببورێ، پاشان ئیبنو خەتتاب دۆڵچەکەی لە دەستی ئەبو بەکر وەرگرت، جا لە دەستی عومەردا دۆڵچەکە گۆڕاو بوو بەدۆڵچەیەکی گەورە، جا هیچ ئازا و لێزانێکم لە ئادەمیزاد نەدیوە وەك ئەوکار بکات (و ئاو دەربێنێ)، ئیتر ئەوەندەی ئاو دەرئەهێنا هەتا خەڵکەکە و وشترەکانیان پاراوبوون و بردنیان بۆ شوێنی حەوانەوەیان)).

## ٢٩- بابُ نَزْعِ الذَّنُوبِ وَالذَّنُوبَيْنِ مِنَ البِئْرِ بِضَعْفٍ

٧٠٢٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُس، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا مُوسَى، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ رُؤْيَا النَّبِيِّ ﷺ فِي أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ قَالَ: «رَأَيْتُ النَّاسَ اجْتَمَعُوا، فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ فَنَزَعَ ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ، وَفِي نَزْعِهِ ضَعْفٌ، وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَهُ، ثُمَّ قَامَ ابْنُ الخَطَّابِ فَاسْتَحَالَتْ غَرْبًا، فَمَا رَأَيْتُ مِنَ النَّاسِ يَفْرِي فَرْيَهُ، حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ»[1].

(١) بڕوانە: ٣٦٣٤.

## ٢٩- باسی (لە خەودا بینینی) هەڵگوزینی دۆڵچەیەک و دوو دۆڵچە ئاو لە بیر بەلاوازی

**٧٠٢٠- سالیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەربارەی خەو بینینی پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە ئەبو بەکر و عومەر ﷺ فەرمووی: ((لە خەومدا خەڵکانێکم بینی کۆبووبوونەوە، جا ئەبو بەکر هەستا دۆڵچەیەك یان دووانی پڕ لە ئاوی (لە بیرێك) هەڵگۆزی و لە هەڵگۆزینەکەیدا لاوازی تیابوو، وە خوا لێی خۆش بێت، پاشان عومەری کوڕی خەتتاب (دۆڵچەکەی لێ وەرگرت)، جا بەدەستیەوە گۆڕا بۆ دۆڵچەیەکی گەورە، جا هیچ ئازا و لێزانێکم لە ئادەمیزاد نەدیوە وەك ئەو کار بکات (و ئاو دەربێنێ)، ئیتر ئەوەندەی ئاوی دەرئەهێنا هەتا خەڵکەکە و وشترەکانیان پاراوبوون و بردنیان بۆ شوێنی حەوانەوەیان)).**

**٧٠٢١-** حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي سَعِيدٌ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي عَلَى قَلِيبٍ وَعَلَيْهَا دَلْوٌ، فَنَزَعْتُ مِنْهَا مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أَخَذَهَا ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ فَنَزَعَ مِنْهَا ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ، وَفِي نَزْعِهِ ضَعْفٌ، وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَهُ، ثُمَّ اسْتَحَالَتْ غَرْبًا فَأَخَذَهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا مِنَ النَّاسِ يَنْزِعُ نَزْعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ»[1].

**٧٠٢١- سەعید دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەومدا خۆم دی ئەوەتام لەسەر بیرێك دوڵچەیەکی لەسەرە، ئەنجا ئەوەندەی خوا ویستی (بەو دوڵچە) ئاوم لەو بیرە هەڵگۆزی و دەرهێنا، پاشان کوڕی ئەبی قوحافە[2] دۆڵچەکەی وەرگرت و**

---

(١) بڕوانە: ٣٦٦٤.

(٢) واتە: ئەبو بەکر ﷺ.

دوڵچەیەك یان دووان ئاوی لێ هەڵگۆزی، وە لە هەڵگۆزینەکەشیدا لاوازییەکی تیابوو، خوا لێی خۆش بێت، پاشان دوڵچەکە گۆڕا بۆ دوڵچەیەکی گەورە و عومەری کوڕی خەتتاب وەری گرت، جا هیچ ئازا و لێزانێکم لە ئادەمیزاد نەدیوە بەوێنەی ئاو هەڵگۆزینی عومەر ئاو هەڵگۆزێ، هەتا ئەوەندەی هەڵگۆزی خەڵك و وشترەکانیان پاراو کرد و بردنیان بۆ شوێنی حەوانەوەیان)).

## ٣٠- بَابُ الِاسْتِرَاحَةِ فِي المَنَامِ

٧٠٢٢- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ أَنِّي عَلَى حَوْضٍ أَسْقِي النَّاسَ، فَأَتَانِي أَبُو بَكْرٍ فَأَخَذَ الدَّلْوَ مِنْ يَدِي لِيُرِيحَنِي، فَنَزَعَ ذَنُوبَيْنِ وَفِي نَزْعِهِ ضَعْفٌ، وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَهُ، فَأَتَى ابْنُ الخَطَّابِ فَأَخَذَ مِنْهُ، فَلَمْ يَزَلْ يَنْزِعُ حَتَّى تَوَلَّى النَّاسُ وَالْحَوْضُ يَتَفَجَّرُ»[1].

## ٣٠- باسی پشوودان لە خەو بینیندا

٧٠٢٢-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا من خەوتبوم لە خەودا خۆم دی لەسەر حەوزێك بووم ئاوم دەدا بە دەم خەڵکەوە، ئینجا ئەبو بەکر ﷺ هات بۆ لام و دۆڵچەکەی لە دەستم گرت تاپشووم پێ بدات، جا دوو دۆڵچەی هەڵگۆزی، وە لە هەڵگوزینەکەیدا لاوازی هەبوو، خوا لێی خۆش بێت، ئینجا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هات دوڵچەکەی لە ئەبو بەکر وەرگرت، ئیتر بەردەوام هەر ئاوی هەڵدەگوزی هەتا خەڵکەکە (پاراو بوون و) ڕۆشتن و پشتیان هەڵکرد، حەوزەکەش هەر ئاوی لێ هەڵدەقوڵا)).

---

(١) بڕوانە: ٣٦٦٤.

## ٣١- بَابُ الْقَصْرِ فِي الْمَنَامِ

٧٠٢٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي فِي الْجَنَّةِ فَإِذَا امْرَأَةٌ تَتَوَضَّأُ إِلَى جَانِبِ قَصْرٍ، قُلْتُ: لِمَنْ هَذَا الْقَصْرُ؟ قَالُوا: لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ. فَذَكَرْتُ غَيْرَتَهُ فَوَلَّيْتُ مُدْبِرًا». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَبَكَى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ثُمَّ قَالَ: أَعَلَيْكَ -بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ- أَغَارُ؟[١]

## ٣١- باسی کۆشک بینین لە خەودا

**٧٠٢٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بووین کە فەرمووی: ((کاتێ من خەوتبووم خۆم دی لە بەهەشت دام، ئەنجا ئافرەتێکم بینی لە تەنیشت کۆشکێدا دەست نوێژی دەگرت، منیش وتم: ئەم کۆشکە هی کێیە؟ وتیان: هی عومەری کوڕی خەتتابە، منیش غیرەی عومەرم بیرهاتەوە بۆیە بەرەو دوا گەڕامەوە))، ئەبو هورەیرە وتی: جا کوڕی خەتتاب گریا پاشان وتی: - بەباوك و دایکمەوە بە قوربانت بم - من لە بەرانبەری تۆدا غیرە دەکەم ئەی پێغەمبەری خوا؟**

٧٠٢٤- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَإِذَا أَنَا بِقَصْرٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذَا فَقَالُوا: لِرَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ. فَمَا مَنَعَنِي أَنْ أَدْخُلَهُ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ إِلاَّ مَا أَعْلَمُ مِنْ غَيْرَتِكَ». قَالَ: وَعَلَيْكَ أَغَارُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟[٢]

---

(١) بڕوانە: ٣٢٤٢.

(٢) بڕوانە: ٣٦٧٩.

**٧٠٢٤-جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕۆشتمە بەهەشتەوە، جا كۆشكێكی ئاڵتوونم بینی، وتم: ئەمە بۆ كێیە؟ وتیان: بۆ پیاوێكی قورەیشییە، جا ئەی كوڕی خەتتاب تەنها شتێك كە ڕێگرم بوو كە بڕۆمە ناویەوە ئەوە بوو كەمن شارەزابووم لە غیرەی تۆ))، عومەر ﷺ وتی: لە تۆ غیرە بكەم ئەی پێغەمبەری خوا؟.**

## ٣٢- بابُ الوُضُوءِ فِي المَنَامِ

٧٠٢٥- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي فِي الْجَنَّةِ، فَإِذَا امْرَأَةٌ تَتَوَضَّأُ إِلَى جَانِبِ قَصْرٍ، فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذَا القَصْرُ؟ فَقَالُوا: لِعُمَرَ. فَذَكَرْتُ غَيْرَتَهُ فَوَلَّيْتُ مُدْبِرًا». فَبَكَى عُمَرُ وَقَالَ: عَلَيْكَ -بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ- أَغَارُ؟[1]

## ٣٢- باسی بینینی دەستنوێژگرتن لە خەودا

**٧٠٢٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە كاتێكدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین فەرمووی: ((كاتێ من خەوتبووم خۆم دی لە بەهەشت دام، ئەنجا ئافرەتێكم بینی لە تەنیشت كۆشكێدا دەست نوێژی دەگرت، منیش وتم: ئەم كۆشكە هی كێیە؟ وتیان: هی عومەرە، منیش غیرەی عومەرم بیرهاتەوە بۆیە بەرەو دوا گەڕامەوە))، جا عومەر گریا و وتی: - بەباوك و دایكمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا- من لە بەرانبەری تۆدا غیرە دەكەم؟**

(١) بڕوانە: ٣٢٤٢.

## ٣٣- بابُ الطَّوَافِ بِالْكَعْبَةِ فِي المَنَامِ

٧٠٢٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي أَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ، فَإِذَا رَجُلٌ آدَمُ سَبْطُ الشَّعَرِ بَيْنَ رَجُلَيْنِ يَنْطِفُ رَأْسُهُ مَاءً، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: ابْنُ مَرْيَمَ. فَذَهَبْتُ أَلْتَفِتُ فَإِذَا رَجُلٌ أَحْمَرُ جَسِيمٌ جَعْدُ الرَّأْسِ أَعْوَرُ الْعَيْنِ اليُمْنَى، كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ، قُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا الدَّجَّالُ. أَقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهًا ابْنُ قَطَنٍ». وَابْنُ قَطَنٍ رَجُلٌ مِنْ بَنِي المُصْطَلِقِ مِنْ خُزَاعَةَ[1].

## ٣٣- باسی بینینی تەواف کردن بە دەوری کەعبەدا لە خەودا

**٧٠٢٦-سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ وتی: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەومدا خۆم دی تەوافم دەکرد بە دەوری کەعبەدا، لەوکاتەدا پیاوێکی ئەسمەری قژ خاوم بینی لە نێوان دوو پیاودا بوو (دەستی لەسەر شانیان بوو لە ڕۆشتندا) سەری ئاوی لێ دەتکا، وتم: ئەمە کێیە؟ وتیان: ئیبنو مەریەم، جا ڕۆشتم و لام کردەوە لەوکاتەدا پیاوێکی سوور و سپی زۆر زلی قژلولی چاو ڕاست کوێرم بینی، چاوی وەك دەنکە ترێ لە بۆڵ دەرچوو وابوو، وتم: ئەمە کێیە؟ وتیان: ئەمە دەججالە نزیکترین کەس لە شێوەی ئەودا ئیبنو قەتەنیە))، زوهری دەڵێ: ئیبنو قەتەن پیاوێك بوو لە بەنی موستەلەق لە هۆزی خوزاعە.**

---

(١) بڕوانە: ٣٤٤٠.

## ٣٤- بابٌ: إِذَا أَعْطَى فَضْلَهُ غَيْرَهُ فِي النَّوْمِ

٧٠٢٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ مِنْهُ، حَتَّى إِنِّي لأَرَى الرِّيَّ يَجْرِي، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلَهُ عُمَرَ». قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الْعِلْمُ»[1].

## ٣٤- باسێک: ئەگەر کەسێک پاشماوە (ی خواردنەوە)کەی بدات بەکەسێکی تر لە خەویدا

**٧٠٢٧- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەوەکەمدا پەرداخێك شیریان بۆ هێنام منیش لێم خواردەوە (بەجۆرێ پاراو بوومەوە)، هەتا وامدەزانی پاراوی لە نینۆکەکانمەوە دەردەچێ، پاشان پاشماوەکەیم دا بە عومەر)) ،عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خەوەت بەچی لێك دایەوە؟ فەرمووی: ((بە عیلم و زانست)).**

## ٣٥- بابُ الأَمْنِ وَذَهَابِ الرَّوْعِ فِي الْمَنَامِ

٧٠٢٨- حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا صَخْرُ بْنُ جُوَيْرِيَةَ، حَدَّثَنَا نَافِعٌ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ قَالَ: إِنَّ رِجَالاً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانُوا يَرَوْنَ الرُّؤْيَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيَقُصُّونَهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَيَقُولُ فِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا شَاءَ اللَّهُ، وَأَنَا غُلاَمٌ حَدِيثُ السِّنِّ وَبَيْتِي الْمَسْجِدُ قَبْلَ أَنْ أَنْكِحَ، فَقُلْتُ فِي نَفْسِي: لَوْ كَانَ فِيكَ خَيْرٌ لَرَأَيْتَ مِثْلَ مَا يَرَى هَؤُلاَءِ. فَلَمَّا اضْطَجَعْتُ لَيْلَةً قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ فِيَّ خَيْرًا فَأَرِنِي

---

(١) بڕوانە: ٨٢.

رُؤْيَا. فَبَيْنَمَا أَنَا كَذَلِكَ إِذْ جَاءَنِي مَلَكَانِ فِي يَدِ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مَقْمَعَةٌ مِنْ حَدِيدٍ، يُقْبِلاَ بِي إِلَى جَهَنَّمَ، وَأَنَا بَيْنَهُمَا أَدْعُو اللَّهَ: اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ جَهَنَّمَ. ثُمَّ أُرَانِي لَقِيَنِي مَلَكٌ فِي يَدِهِ مِقْمَعَةٌ مِنْ حَدِيدٍ فَقَالَ: لَنْ تُرَاعَ، نِعْمَ الرَّجُلُ أَنْتَ لَوْ تُكْثِرُ الصَّلاَةَ. فَانْطَلَقُوا بِي حَتَّى وَقَفُوا بِي عَلَى شَفِيرِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ، لَهُ قُرُونٌ كَقَرْنِ الْبِئْرِ، بَيْنَ كُلِّ قَرْنَيْنِ مَلَكٌ بِيَدِهِ مِقْمَعَةٌ مِنْ حَدِيدٍ، وَأَرَى فِيهَا رِجَالاً مُعَلَّقِينَ بِالسَّلاَسِلِ، رُءُوسُهُمْ أَسْفَلَهُمْ، عَرَفْتُ فِيهَا رِجَالاً مِنْ قُرَيْشٍ، فَانْصَرَفُوا بِي عَنْ ذَاتِ الْيَمِينِ[1].

## ٣٥- باسی دڵنیایی و نەمانی ترس لە خەوندا

**٧٠٢٨- نافیع دەگێڕێتەوە کە ئیبنو عومەر ﷺ وتی: لە ڕاستیدا پیاوانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خەویان دەبینی و دەیانگێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ئەوی خوا بیویستایە دەربارەی خەوەکان دەیفەرموو، منیش مێرد منداڵێکی کەم تەمەن بووم، مزگەوت ماڵم بوو پێش ئەوەی ژن بێنم، جا لە دڵی خۆمدا وتم: (بەخۆم) ئەگەر خێرت تێدا بوایە تۆش خەوت دەبینی وەکو ئا ئەوانە خەو دەبینن، ئینجا شەوێك ڕاکشام و پاڵ کەوتم وتم: خودایە ئەگەر دەزانی من خێرم تێدایە ئەوە خەوێکم نیشان بدە، جا لە کاتێکدا من بەو شێوەیە (خەوت) بووم، دوو فریشتە هاتن بۆ لام هەریەکەیان گاڵۆکێکی ئاسنی بەدەستەوە بوو، بردمیان بۆ دۆزەخ، منیش لە نێوانیاندا بووم دەپاڕامەوە دەموت: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە دۆزەخ، پاشان وابزانم فریشتەیەك گەشت پێم گاڵۆکێکی ئاسنی بەدەستەوە بوو وتی: ترست لەسەر نییە، تۆ چەند پیاوێکی چاکی ئەگەر نوێژت زۆر بکردایە، ئینجا بردمیان هەتا قەراغی دۆزەخ ڕایان گرتم، جا بینیم وەکو**

(١) بڕوانە: ٤٤٠.

**بیری هەڵبەستراو دیواری چواردەوری بۆ کراوە[1] چەند کۆڵەکەیەکی هەیە وەك کۆڵەکەی بیر، لە نێوان هەردوو کۆڵەکەیەکدا فریشتەیەك وەستاوە گاڵۆکێکی ئاسنی بەدەستەوەیە، وە لە دۆزەخدا پیاوانێکم دەبینی بەزنجیر هەڵواسراون سەریان لە خوارەوەیانەوەیە[2] پیاوانێکی قورەیشیم تیا دەناسییەوە، ئینجا ئیتر بەرەو لای ڕاست بردمیان.**

٧٠٢٩ - فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ رَجُلٌ صَالِحٌ». فَقَالَ نَافِعٌ: لَمْ يَزَلْ بَعْدَ ذَلِكَ يُكْثِرُ الصَّلاَةَ[3].

**٧٠٢٩- ئینجا (عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەڵێ:) ئەو خەوەم گێڕایەوە بۆ حەفصە ﵂، حەفصەش گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان عەبدوڵلا پیاوێکی چاکە)). نافیع وتی: دوا ئەوە عەبدوڵلا بەردەوام نوێژی زۆری دەکرد.**

## ٣٦- بابُ الأَخْذِ عَلَى اليَمِينِ فِي النَّوْمِ

٧٠٣٠- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كُنْتُ غُلاَمًا شَابًّا عَزَبًا فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، وَكُنْتُ أَبِيتُ فِي المَسْجِدِ، وَكَانَ مَنْ رَأَى مَنَامًا قَصَّهُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ لِي عِنْدَكَ خَيْرٌ فَأَرِنِي مَنَامًا يُعَبِّرُهُ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَنِمْتُ فَرَأَيْتُ مَلَكَيْنِ أَتَيَانِي فَانْطَلَقَا بِي، فَلَقِيَهُمَا مَلَكٌ آخَرُ فَقَالَ لِي: لَنْ تُرَاعَ، إِنَّكَ رَجُلٌ صَالِحٌ، فَانْطَلَقَا بِي إِلَى النَّارِ، فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ،

---

(١) بە بەرد هەڵچنراوە ڕێک و پێک کراوە.

(٢) واتە سەر بەرەو خوار هەڵواسراون.

(٣) بڕوانە: ١١٢٢.

وَإِذَا فِيهَا نَاسٌ قَدْ عَرَفْتُ بَعْضَهُمْ، فَأَخَذَا بِي ذَاتَ الْيَمِينِ، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِحَفْصَةَ[1].

## ٣٦- باسی (کەسێک) لە خەونیدا خۆی ببینێت بیگرن و ببیەن بۆ لای ڕاست

**٧٠٣٠- سالیم دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ وتی: من لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کوڕێکی لاو بووم ژنم نەهێنابوو، وە من لە مزگەوتدا دەمامەوە، ئینجا هەر کەس خەوێکی بدیایە دەیگێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، منیش وتم: خودایە ئەگەر من لە لای تۆ چاکە و خێرێکم هەیە خەوێکم نیشان بدە، پێغەمبەری خوا ﷺ خەو پەرژینی کات بۆم، ئیتر خەوتم دوو فریشتەم بینی هاتن بۆ لام و بردمیان، جا فریشتەیەکی تر پێیان گەشت و پێی وتم هیچ مەترسە، بەڕاستی تۆ پیاوێکی چاکیت، ئینجا بردمیان بەرەو دۆزەخ، جا بینیم وەکو بیری هەڵبەستراو دیواری چواردەوری بۆ کراوە[2]، ئینجا لە ناویدا خەڵکانێکی تیابوو هەندێکیانم دەناسی، ئیتر دوو فریشتەکە بەرەو لای ڕاست بردمیان، جا کە ڕۆژم کردەوە ئەو خەوەم گێڕایەوە بۆ حەفصە ﵂.**

٧٠٣١ - فَزَعَمَتْ حَفْصَةُ أَنَّهَا قَصَّتْهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ عَبْدَ اللهِ رَجُلٌ صَالِحٌ لَوْ كَانَ يُكْثِرُ الصَّلاَةَ مِنَ اللَّيْلِ». قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بَعْدَ ذَلِكَ يُكْثِرُ الصَّلاَةَ مِنَ اللَّيْلِ[3].

**٧٠٣١- حەفصەش ﵂ وتی: کە ئەو خەوەی (منی) بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە، ئەویش فەرموویەتی: ((بێگومان عەبدوڵڵا پیاوێکی چاکە ئەگەر لە شەودا**

---

(١) بڕوانە: ٤٤٠.
(٢) بە بەرد هەڵچنراوە ڕێک و پێک کراوە.
(٣) بڕوانە: ١١٢٢.

نوێژی زۆر بکردایە))، زوهری وتی: وە عەبدوڵڵا لەو کاتە بەدواوە لە شەودا نوێژی زۆر دەکرد.

## ٣٧- بابُ القَدَحِ فِي النَّوْمِ

٧٠٣٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ مِنْهُ، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ». قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الْعِلْمَ»[1].

## ٣٧- باسی جام بینین لە خەودا (بدرێ بە کەسێک)

**٧٠٣٢- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەوەکەمدا پەرداخێك شیریان بۆ هێنام منیش لێم خواردەوە، پاشان پاشماوەکەممدا بەعومەری کوڕی خەتتاب))، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خەوەت بەچی لێك دایەوە؟ فەرمووی: ((بە عیلم و زانست)).**

## ٣٨- بابٌ: إِذَا طَارَ الشَّيْءُ فِي المَنَامِ

٧٠٣٣- حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ عُبَيْدَةَ بْنِ نَشِيطٍ قَالَ: قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ عَنْ رُؤْيَا رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّتِي ذَكَرَ[2].

---

(١) بڕوانە: ٨٢.

(٢) بڕوانە: ٣٦٢٠.

## ٣٨- باسێک: ئەگەر شتێک لە خەو (ی کەسێک)ـدا بفڕێت [١]

**٧٠٣٣-عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: پرسیارم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ کرد دەربارەی ئەو خەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەباسی کرد.**

٧٠٣٤- فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ذُكِرَ لِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ أَنَّهُ وُضِعَ فِي يَدَيَّ سِوَارَانِ مِنْ ذَهَبٍ، فَفُظِعْتُهُمَا وَكَرِهْتُهُمَا، فَأُذِنَ لِي فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا، فَأَوَّلْتُهُمَا كَذَّابَيْنِ يَخْرُجَانِ». فَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَحَدُهُمَا الْعَنْسِيُّ الَّذِي قَتَلَهُ فَيْرُوزٌ بِالْيَمَنِ، وَالآخَرُ مُسَيْلِمَةُ[٢].

**٧٠٣٤- ئیبنو عەبباس وتی: بۆم گێڕدرایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەومدا بینیم کە دوو بازنی ئاڵتوون کرایە هەردوو دەستم، جا لەو دوو بازنە ترسام و ڕقم لێیان بوو، ئەنجا مۆڵەت درام و فوم کرد بەهەردووکیاندا و ڕۆشتن بەئاسماندا (فڕین)، جا ئەو دوو (بازن)ـەم بەوە لێك دایەوە دوو درۆزنن پەیدا دەبن))، عوبەیدوڵڵاش وتی: یەکێکیان عەنسییە کە فەیرۆز لە یەمەن کوشتی، ئەوی کەشیان موسەیلەمەیە.**

## ٣٩- بَابٌ: إِذَا رَأَى بَقَرًا تُنْحَرُ

٧٠٣٥- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ جَدِّهِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى - أُرَاهُ- عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أُهَاجِرُ مِنْ مَكَّةَ إِلَى أَرْضٍ بِهَا نَخْلٌ، فَذَهَبَ وَهَلِي إِلَى أَنَّهَا اليَمَامَةُ أَوْ هَجَرٌ، فَإِذَا هِيَ المَدِينَةُ يَثْرِبُ، وَرَأَيْتُ فِيهَا بَقَرًا -وَاللَّهُ خَيْرٌ- فَإِذَا هُمُ الْمُؤْمِنُونَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَإِذَا الْخَيْرُ مَا جَاءَ اللَّهُ مِنَ الْخَيْرِ وَثَوَابِ الصِّدْقِ الذِي أَتَانَا اللَّهُ بِهِ بَعْدَ يَوْمِ بَدْرٍ»[٣].

---

(١) کە بە سروشتی نافڕێت.

(٢) بڕوانە: ٣٦٢١.

(٣) بڕوانە: ٣٦٢٢.

## ٣٩- باسێک: ئەگەر (کەسێک) لە خەویدا بینی چەندین مانگا سەر دەبڕدرێن

٧٠٣٥- ئەبو موسا دەگێڕێتەوە -وابزانم- لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((لە خەودا بینیم من لە مەککەوە کۆچ دەکەم بۆ وڵاتێك دار خورمای تێدایە، جا گومانم بۆ ئەوە چوو کە ئەو شوێنە یەمامە یان هەجەر بێت، کەچی (دەرکەوت) ئەو شوێنە مەدینەیە (کە ناوی) یەسریبە، وە لەو خەوەدا چەند مانگایەکم بینی- سوێند بەخوا (لەو کارەدا) خێر هەیە-ئەویش[١] ئەو باوەڕدارانە بوو کە (شەهیدبوون) لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا، وە خەیرەکەش بریتی بوو لەو خەیر و پاداشتی ڕاستییەی خوای گەورە بۆی هێنایین دوای ڕۆژی غەزای بەدر)).

## ٤٠- بابُ النَّفْخِ فِي المَنَامِ

٧٠٣٦- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الحَنْظَلِيُّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ قَالَ: هَذَا مَا حَدَّثَنَا بِهِ أَبُو هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ»[٢].

## ٤٠- باسی بینینی فووکردن[٣] لە خەودا

٧٠٣٦- هەممامی کوڕی مونەببیە دەڵێ: ئەمە ئەو فەرموودەیە کە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆی گێڕاینەوە و فەرمووی: ((ئێمەین کۆتاهەمینی پێشکەوتووان)).

---

(١) ئەو چەند مانگایەش کە لە خەوەکەدا بینی.

(٢) بڕوانە: ٢٣٨.

(٣) فووکردن بە شتێکدا بەخەو بینین.

٧٠٣٧- وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ أُوتِيتُ خَزَائِنَ الأَرْضِ، فَوُضِعَ فِي يَدَيَّ سِوَارَانِ مِنْ ذَهَبٍ، فَكَبُرَا عَلَيَّ وَأَهَمَّانِي، فَأُوحِيَ إِلَيَّ أَنِ انْفُخْهُمَا، فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا، فَأَوَّلْتُهُمَا الْكَذَّابَيْنِ اللَّذَيْنِ أَنَا بَيْنَهُمَا: صَاحِبَ صَنْعَاءَ، وَصَاحِبَ اليَمَامَةِ»[1].

**٧٠٣٧- وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەومدا گەنجینەکانی دونیام پێدرا، وە دوو بازنی ئاڵتوون کرایە هەردوو دەستم، جا ئەو دوو بازنە قورس بوون بەلامەوە و خەفەتباریان کردم، ئەنجا نیگام بۆ کرا کە فووم بکەم بە هەردووکیاندا، منیش فوم کرد بە هەردووکیاندا و ڕۆشتن بە ئاسماندا (فڕین) جا ئەو دوو (بازن)ەم بەوە لێکدایەوە دوو درۆزنەکەن کە من لە نێوانیاندام: خاوەن و گەورەی صەنعا و خاوەن و گەورەی یەمامە)).**

## ٤١- بابٌ إِذَا رَأَى أَنَّهُ أَخْرَجَ الشَّيْءَ مِنْ كُورَةٍ فَأَسْكَنَهُ مَوْضِعًا آخَرَ

٧٠٣٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنِي أَخِي عَبْدُ الْحَمِيدِ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بِلاَلٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ كَأَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الرَّأْسِ خَرَجَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ حَتَّى قَامَتْ بِمَهْيَعَةَ -وَهْيَ: الْجُحْفَةُ- فَأَوَّلْتُ أَنَّ وَبَاءَ الْمَدِينَةِ نُقِلَ إِلَيْهَا»[2].

## ٤١- باسێک: ئەگەر کەسێک لە خەویدا بینی کە شتێکی لە شوێنێک دەرهێنا و لە جێگایەکی تردا داینا

**٧٠٣٨- سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لە خەومدا بینیم وەك بڵێی ئافرەتێکی ڕەش پێست قژ بژ و**

(١) بڕوانە: ٣٦٢١.

(٢) بڕوانە: ٧٠٣٩، ٧٠٤٠.

ئاڵسکاو لە مەدینە دەربچێت بڕوا بۆ مەهیەعە وابوو- واتە بۆ جوحفە [1] -جا من وام لێك دایەوە کە دەرم و پەتایەکەی مەدینە گوێزراوەتەوە بۆ مەهیەعە)).

## ٤٢- بابُ المَرْأَةِ السَّوْدَاءِ

٧٠٣٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ الْمُقَدَّمِيُّ، حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ فِي رُؤْيَا النَّبِيِّ ﷺ فِي الْمَدِينَةِ: «رَأَيْتُ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الرَّأْسِ خَرَجَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ، حَتَّى نَزَلَتْ بِمَهْيَعَةَ، فَتَأَوَّلْتُهَا أَنَّ وَبَاءَ الْمَدِينَةِ نُقِلَ إِلَى مَهْيَعَةَ». وَهْيَ الجُحْفَةُ[2].

## ٤٢- باسی ئافرەتێکی ڕەش پێست (کەسێک لە خەودا ببینێت)

**٧٠٣٩- سالیمی کوڕی عەبدوڵلا لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ﵄ دەگێڕێتەوە دەربارەی خەو بینینەکەی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە فەرمووی: ((لە خەومدا ئافرەتێکی ڕەش پێستی قژ بژ و ئاڵسکاوم بینی لە مەدینە دەرچوو ڕۆشت هەتا گەشتە مەهیەعە، جا خەوەکەم وا لێك دایەوە کە بێگومان دەرم و پەتایەکەی مەدینە گوێزراوەتەوە بۆ مەهیەعە)). مەهیەعەش: جوحفەیە.**

## ٤٣- بابُ المَرْأَةِ الثَّائِرَةِ الرَّأْسِ

٧٠٤٠- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ، حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الرَّأْسِ

(١) وتراوە ئەم ماناکردنە وتەی موسای کوڕی عوقبەیە و خراوەتە ناو فەرموودەکە.
(٢) بڕوانە: ٧٠٣٨.

خَرَجَتْ مِنَ المَدِينَةِ حَتَّى قَامَتْ بِمَهْيَعَةَ، فَأَوَّلْتُ أَنَّ وَبَاءَ المَدِينَةِ نُقِلَ إِلَى مَهْيَعَةَ». وَهْيَ الْجُحْفَةُ[1].

## ٤٣- باسی ئافرەتێکی قژ ئاڵسکاو (کەسێک لە خەودا بیبینێت)

**٧٠٤٠- سالیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لە خەومدا ئافرەتێکی ڕەش پێست قژ بژ و ئاڵسکاوم بینی لە مەدینە دەرچوو (ڕۆشت) هەتا لە مەهیەعە وەستا، جا من وام لێك دایەوە کە درم و پەتایەکەی مەدینە گوێزراوەتەوە بۆ مەهیەعە)). مەهیەعەش: جوحفەیە.**

## ٤٤- بَابٌ: إِذَا هَزَّ سَيْفًا فِي المَنَامِ

٧٠٤١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ، بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ جَدِّهِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى -أُرَاهُ- عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ فِي رُؤْيَا أَنِّي هَزَزْتُ سَيْفًا فَانْقَطَعَ صَدْرُهُ، فَإِذَا هُوَ مَا أُصِيبَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، ثُمَّ هَزَزْتُهُ أُخْرَى فَعَادَ أَحْسَنَ مَا كَانَ، فَإِذَا هُوَ مَا جَاءَ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْفَتْحِ وَاجْتِمَاعِ الْمُؤْمِنِينَ»[2].

## ٤٤- باسێک: ئەگەر کەسێک شمشێرەکەی ڕاوەشێنێت لە خەویدا

**٧٠٤١- بورەیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی بورەیدە لە باپیرەیەوە کەئەبی بوردەیە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی بوردە دەگێڕێتەوە ئەویش لە ئەبو موساوە دەگێڕێتەوە- وابزانم- لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((خەوێکم بینی کە شمشێرێکم ڕاوەشاند و لووتەکەی قرتا، ئەوسا دەرکەوت ئەوە بوو کە لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا تووشی باوەڕداران بوو، پاشان جارێکی تر ڕاموەشاند**

---

(١) بڕوانە: ٧٠٣٨.

(٢) بڕوانە: ٣٦٢٢.

ئینجا چاك بوویەوە چاكتر لە پێشوو، ئەویش ئەوەبوو كە خوا پێشی هێنا بۆ باوەڕداران ئازادكردنی مەككە و كۆبوونەوەی باوەڕداران)).

## ٤٥- بابُ مَنْ كَذَبَ فِي حُلُمِهِ

٧٠٤٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَحَلَّمَ بِحُلُمٍ لَمْ يَرَهُ كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ، وَلَنْ يَفْعَلَ، وَمَنِ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ -أَوْ يَفِرُّونَ مِنْهُ- صُبَّ فِي أُذُنِهِ الآنُكُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ صَوَّرَ صُورَةً عُذِّبَ وَكُلِّفَ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ». قَالَ سُفْيَانُ وَصَلَهُ لَنَا أَيُّوبُ. وَقَالَ قُتَيْبَةُ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَوْلَهُ: مَنْ كَذَبَ فِي رُؤْيَاهُ. وَقَالَ شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي هَاشِمٍ الرُّمَّانِيِّ: سَمِعْتُ عِكْرِمَةَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ قَوْلَهُ: مَنْ صَوَّرَ، وَمَنْ تَحَلَّمَ، وَمَنِ اسْتَمَعَ.

٧٠٤٢م- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: «مَنِ اسْتَمَعَ، وَمَنْ تَحَلَّمَ، وَمَنْ صَوَّرَ. نَحْوَهُ. تَابَعَهُ هِشَامٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَوْلَهُ[1].

## ٤٥- باسی (تاوانی) كەسێک درۆ بكات لە خەو بینینەكەیدا[2]

**٧٠٤٢-ئیبنو عەبباس ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمووی: ((هەركەس بە درۆ خەوێك هەڵبەستێ كە نەیدیوە، (لە قیامەتدا) زۆری لێدەكرێ دوو دەنك جۆ پێكەوە گرێ بدات، ئەوەشی بۆ ناكرێ، وە هەر كەس گوێ بگرێ بۆ قسەی (نهێنی) خەڵكانێك كە ئەوان ئەو گوێگرتنەی ئەویان پێ ناخۆشە-یان ئەوان لێی دوور بكەونەوە[3] - لە ڕۆژی قیامەتدا قورقوشمی تواوە**

---

(١) بڕوانە: ٢٢٢٥.

(٢) هەر خەوەكەی نەبینیبێت و بڵێ خەوم بینیوە، یان خەوی بینیبێت درۆ بكات لە گێڕانەوەكەیدا.

(٣) تا گوێی لە قسەكەیان نەبێت.

دەکەنە گوێیەکانیەوە، وە هەر کەس وێنەیەك دروست بکات سزا دەدرێ، وە زۆری لێدەکرێ کە گیان بکات بەبەریدا، ناشتوانێ گیان بکات بەبەریدا)).

سوفیان دەڵێ: ئەیوب ڕەشتەی ئەم فەرموودەی پەیوەست کردوە بۆمان.

قوتەیبە دەڵێ: ئەبو عەوانە بۆی گێڕاینەوە لە قەتادەوە لە عیکریمەوە لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ کە وتوویەتی: هەر کەس درۆ بکات لە خەو بینینەکەیدا. شوعبە لە ئەبی هاشیمی ڕومانیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە عیکریمەم بیستووە وتی: ئەمە وتەی ئەبو هوڕەیرەیە ﷺ کە وتوویەتی: هەر کەس وێنەیەك دروست بکات، وە هەرکەس بەدرۆ خەو هەڵبەستێت، وە کەسێ گوێی بۆ بگرێ.

٧٠٤٢م- عیکریمە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: هەر کەس گوێ بگرێ بۆ قسەی کەسانێك، هەرکەس بەدرۆ خەو هەڵبەستێ، وە هەر کەس وێنەیەك بکێشێت هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشوو دەگێڕێتەوە.

هیشام لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە بەوتەی خۆی (ئیبنو عەبباس) گێڕاویەتەوە.

٧٠٤٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ -مَوْلَى ابْنِ عُمَرَ- عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مِنْ أَفْرَى الفِرَى أَنْ يُرِيَ عَيْنَيْهِ مَا لَمْ تَرَ».

٧٠٤٣-ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە گەورەترینی درۆیەکان ئەوەیە (بڵێ) لە خەومدا ئەوەم دیوە بەچاو درۆ بکات و نەیدیبێت)).

## ٤٦- بَابٌ: إِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلاَ يُخْبِرْ بِهَا وَلاَ يَذْكُرْهَا

٧٠٤٤- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ يَقُولُ: لَقَدْ كُنْتُ أَرَى الرُّؤْيَا فَتُمْرِضُنِي، حَتَّى سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ يَقُولُ: وَأَنَا كُنْتُ لأَرَى الرُّؤْيَا تُمْرِضُنِي، حَتَّى سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنَ اللهِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ فَلاَ يُحَدِّثْ بِهِ إِلاَّ مَنْ يُحِبُّ، وَإِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنْ شَرِّهَا وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ، وَلْيَتْفِلْ ثَلاَثًا، وَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا أَحَدًا، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ»[1].

## ٤٦- باسێک: ئەگەر کەسێک لە خەویدا شتێکی بینی پێی ناخۆش بوو ئەوە با بۆ کەسی نەگێڕێتەوە و باسی نەکات

**٧٠٤٤- ئەبو سەلەمە دەڵێ: سوێند بەخوا خەوم دەبینی بەخۆمە نەخۆشی دەخستم، هەتا لە ئەبو قەتادەم ﷺ بیست دەیوت منیش خەوم دەبینی بە خۆمەوە نەخۆشی دەخستم، هەتا لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((خەو بینینی چاك لە خواوەیە، جا ئەگەر کەسێکتان خەوێکی بینی پێی خۆش بوو تەنها بۆ کەسێکی بگێڕێتەوە کە خۆشی دەوێت، وە ئەگەر خەوێکی بینی پێی خۆش نەبوو (کە لە خەو هەستا) با پەنا بگرێت بەخوا لە زیانی ئەو خەوە و لە شەڕ و خراپەی شەیتان، وە باسێ جار تف بکاتە (لای چەپی)، وە نەیگێڕێتەوە بۆ هیچ کەس، چونکە بەدڵنیاییەوە زیانی پێ ناگەیەنێت)).**

٧٠٤٥- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي حَازِمٍ وَالدَّرَاوَرْدِيُّ، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الرُّؤْيَا يُحِبُّهَا فَإِنَّهَا مِنَ اللهِ، فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ عَلَيْهَا وَلْيُحَدِّثْ بِهَا، وَإِذَا رَأَى غَيْرَ ذَلِكَ مِمَّا يَكْرَهُ فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَلْيَسْتَعِذْ مِنْ شَرِّهَا، وَلاَ يَذْكُرْهَا لأَحَدٍ، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ»

---

(١) بروانە: ٣٢٩٢.

**٧٠٤٥- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر کەسێکتان خەوێکی بینی پێی خۆش بوو، ئەوە بێگومان لە خواوەیە، وە با سوپاسی خوای لەسەر بکات و بیگێڕێتەوە[1]، وە ئەگەر خەوێکی بینی جگە لەمە کە پێی خۆش نەبوو، ئەوە بێگومان لە شەیتانەوەیە، با پەنا بگرێت بەخوا لە شەڕی ئەو خەوە، وە نەیگێڕێتەوە بۆ کەس، ئیتر بەدڵنیاییەوە زیانی پێ ناگەیەنێت)).**

## ٤٧- بَابُ مَنْ لَمْ يَرَ الرُّؤْيَا لأَوَّلِ عَابِرٍ إِذَا لَمْ يُصِبْ

٧٠٤٦- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ فِي الْمَنَامِ ظُلَّةً تَنْطِفُ السَّمْنَ وَالْعَسَلَ، فَأَرَى النَّاسَ يَتَكَفَّفُونَ مِنْهَا فَالْمُسْتَكْثِرُ وَالْمُسْتَقِلُّ، وَإِذَا سَبَبٌ وَاصِلٌ مِنَ الأَرْضِ إِلَى السَّمَاءِ، فَأَرَاكَ أَخَذْتَ بِهِ فَعَلَوْتَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلاَ بِهِ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلاَ بِهِ ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَانْقَطَعَ ثُمَّ وُصِلَ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَاللَّهِ لَتَدَعَنِّي فَأَعْبُرَهَا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اعْبُرْ». قَالَ: أَمَّا الظُّلَّةُ فَالإِسْلاَمُ، وَأَمَّا الَّذِي يَنْطِفُ مِنَ الْعَسَلِ وَالسَّمْنِ فَالْقُرْآنُ حَلاَوَتُهُ تَنْطُفُ، فَالْمُسْتَكْثِرُ مِنَ الْقُرْآنِ وَالْمُسْتَقِلُّ، وَأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصِلُ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ فَالْحَقُّ الَّذِي أَنْتَ عَلَيْهِ تَأْخُذُ بِهِ فَيُعْلِيكَ اللَّهُ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ فَيَعْلُو بِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُ رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُهُ رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ بِهِ ثُمَّ يُوَصَّلُ لَهُ فَيَعْلُو بِهِ، فَأَخْبِرْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ -بِأَبِي أَنْتَ- أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتُ؟. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَصَبْتَ بَعْضًا وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا». قَالَ: فَوَاللَّهِ لَتُحَدِّثَنِّي بِالَّذِى أَخْطَأْتُ. قَالَ: «لاَ تُقْسِمْ»[2].

---

(١) بۆ کەسێک کە خۆشی دەوێ و کەسێکی ژیر و دانایە.

(٢) بڕوانە: ٧٠٠٠.

## ٤٧- باسی ئەو كەسەی كە ڕای وا نییە مانای خەوەكە ئەوەیە یەكەم خەو پەرژینەر لێكی دەداتەوە ئەگەر نەیزانی

٧٠٤٦-عەبدوڵلای كوڕی عەبباس  دەگێڕێتەوە كە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من ئەمشەو لە خەومدا پەڵە هەورێكم دی ڕۆن و هەنگوینی لێدەتكا، جا خەڵكیشم بینی بەمشت لێیان دەبرد، جا هەبوو زۆر و هەبوو كەمی (ی دەبرد)، وە گوریسێكم دی لەئاسمانەوە شۆڕ بووبۆوە گەشتبووە سەر زەوی، ئینجا تۆم دی ئەو گوریسەت گرتبوو و بەرز بوویتەوە، پاشان پیاوێكی تر دەستی پێوە گرت وبەرزبوویەوە پێی، لە پاشان پیاوێكی تر دەستی پێوەگرت بەرز بوویەوە پێی، پاشان پیاوێكی تر دەستی پێوەگرت بچڕا پاشان پەیوەست كرایەوە، ئەبو بەكریش  وتی: ئەی پێغەمبەری خوا -باوكم بەفیدات بێ- وەڵلاهی وازم لێ دێنی و لێكی دەدەمەوە،پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لێكی دەرەوە)) وتی:جا پەڵە هەورەكە ئاینی ئیسلامە، ئەو هەنگوین و ڕۆنەی دەتكا ئەوە قورئانە شیرینیەكەی دەتكێ، جا هەیە قورئانی زۆر وەرگرتووە هەیە كەم، ئەو گوریسەش لە ئاسمانەوە شۆڕبۆتەوە تا سەر زەوی ئەو هەق و ڕاستییە تۆی لەسەرەوە و دەستی پێوەدەگری (و لەسەری دەڕۆیت) و خوا تۆ پێ بەرزو پایەدار دەكات، پاشان لە دوای تۆ پیاوێكی تر دەستی پێوەدەگری پێی بەرز دەبێتەوە، لە پاشان پیاوێكی تر دەستی پێوە دەگرێ پێی بەرز دەبێتەوە، لە پاشان پیاوێكی تر دەستی پێوە دەگرێ دەپچڕێ بەدەستیەوە، پاشان پەیوەست دەكرێتەوە بۆی ئەویش پێی بەرز دەبێتەوە، جا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ بەباوك و دایكمەوە بەفیدات بم ڕاستم كرد (لە لێكدانەوەكەیدا) یان هەڵەم كرد؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لە بەشێكیدا ڕاستت كرد و لە بەشێكیدا هەڵەت كرد))، ئەبو بەكر وتی: دەی سوێند بەخوا پێم دەڵێی لە چیدا هەڵەم كرد، فەرمووی: ((سوێند مەخۆ)).

## ٤٨- بابُ تَعْبِيرِ الرُّؤْيَا بَعْدَ صَلَاةِ الصُّبْحِ

٧٠٤٧- حَدَّثَنِي مُؤَمَّلُ بْنُ هِشَامٍ أَبُو هِشَامٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا عَوْفٌ، حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا سَمُرَةُ بْنُ جُنْدَبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِمَّا يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ لِأَصْحَابِهِ: «هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنْ رُؤْيَا؟». قَالَ: فَيَقُصُّ عَلَيْهِ مَنْ شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُصَّ، وَإِنَّهُ قَالَ ذَاتَ غَدَاةٍ: «إِنَّهُ أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتِيَانِ، وَإِنَّهُمَا ابْتَعَثَانِي، وَإِنَّهُمَا قَالاَ لِي: انْطَلِقْ. وَإِنِّي انْطَلَقْتُ مَعَهُمَا، وَإِنَّا أَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُضْطَجِعٍ، وَإِذَا آخَرُ قَائِمٌ عَلَيْهِ بِصَخْرَةٍ، وَإِذَا هُوَ يَهْوِي بِالصَّخْرَةِ لِرَأْسِهِ، فَيَثْلَغُ رَأْسَهُ فَيَتَهَدْهَدُ الْحَجَرُ هَا هُنَا، فَيَتْبَعُ الْحَجَرَ فَيَأْخُذُهُ، فَلاَ يَرْجِعُ إِلَيْهِ حَتَّى يَصِحَّ رَأْسُهُ كَمَا كَانَ، ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ فَيَفْعَلُ بِهِ مِثْلَ مَا فَعَلَ الْمَرَّةَ الأُولَى. قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: سُبْحَانَ اللَّهِ! مَا هَذَانِ؟ قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقْ قَالَ: فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُسْتَلْقٍ لِقَفَاهُ، وَإِذَا آخَرُ قَائِمٌ عَلَيْهِ بِكَلُّوبٍ مِنْ حَدِيدٍ، وَإِذَا هُوَ يَأْتِي أَحَدَ شِقَّيْ وَجْهِهِ فَيُشَرْشِرُ شِدْقَهُ إِلَى قَفَاهُ، وَمَنْخِرَهُ إِلَى قَفَاهُ وَعَيْنَهُ إِلَى قَفَاهُ -قَالَ: وَرُبَّمَا قَالَ أَبُو رَجَاءٍ: فَيَشُقُّ- قَالَ: ثُمَّ يَتَحَوَّلُ إِلَى الجَانِبِ الآخَرِ فَيَفْعَلُ بِهِ مِثْلَ مَا فَعَلَ بِالْجَانِبِ الأَوَّلِ، فَمَا يَفْرُغُ مِنْ ذَلِكَ الْجَانِبِ حَتَّى يَصِحَّ ذَلِكَ الجَانِبُ كَمَا كَانَ، ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ فَيَفْعَلُ مِثْلَ مَا فَعَلَ الْمَرَّةَ الأُولَى. قَالَ: قُلْتُ: سُبْحَانَ اللَّهِ! مَا هَذَانِ؟ قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقْ. فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى مِثْلِ التَّنُّورِ -قَالَ: فَأَحْسِبُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ:- فَإِذَا فِيهِ لَغَطٌ وَأَصْوَاتٌ. قَالَ: فَاطَّلَعْنَا فِيهِ، فَإِذَا فِيهِ رِجَالٌ وَنِسَاءٌ عُرَاةٌ، وَإِذَا هُمْ يَأْتِيهِمْ لَهَب مِنْ أَسْفَلَ مِنْهُمْ، فَإِذَا أَتَاهُمْ ذَلِكَ اللَّهَبُ ضَوْضَوْا. قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: مَا هَؤُلاَءِ؟ قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقِ انْطَلِقْ. قَالَ: فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى نَهَرٍ -حَسِبْتُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ:- أَحْمَرَ مِثْلِ الدَّمِ، وَإِذَا فِي النَّهَرِ رَجُلٌ سَابِحٌ يَسْبَحُ، وَإِذَا عَلَى شَطِّ النَّهَرِ رَجُلٌ قَدْ جَمَعَ عِنْدَهُ حِجَارَةً كَثِيرَةً، وَإِذَا ذَلِكَ السَّابِحُ يَسْبَحُ مَا يَسْبَحُ، ثُمَّ يَأْتِي ذَلِكَ الَّذِي قَدْ جَمَعَ عِنْدَهُ الْحِجَارَةَ فَيَفْغَرُ لَهُ فَاهُ فَيُلْقِمُهُ حَجَرًا، فَيَنْطَلِقُ يَسْبَحُ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَيْهِ، كُلَّمَا رَجَعَ إِلَيْهِ فَغَرَ لَهُ فَاهُ فَأَلْقَمَهُ حَجَرًا. قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: مَا هَذَانِ؟ قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقِ انْطَلِقْ. قَالَ: فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ كَرِيهِ المَرْآةِ كَأَكْرَهِ مَا أَنْتَ رَاءٍ رَجُلاً مَرْآةً، وَإِذَا عِنْدَهُ نَارٌ يَحُشُّهَا وَيَسْعَى حَوْلَهَا قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: مَا هَذَا؟

قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقِ انْطَلِقْ. فَانْطَلَقْنَا فَأَتَيْنَا عَلَى رَوْضَةٍ مُعْتَمَّةٍ فِيهَا مِنْ كُلِّ نَوْرِ الرَّبِيعِ، وَإِذَا بَيْنَ ظَهْرَيِ الرَّوْضَةِ رَجُلٌ طَوِيلٌ لاَ أَكَادُ أَرَى رَأْسَهُ طُولاً فِي السَّمَاءِ، وَإِذَا حَوْلَ الرَّجُلِ مِنْ أَكْثَرِ وِلْدَانٍ رَأَيْتُهُمْ قَطُّ. قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: مَا هَذَا؟ مَا هَؤُلاَءِ؟ قَالَ: قَالاَ لِي: انْطَلِقِ انْطَلِقْ. قَالَ: فَانْطَلَقْنَا فَانْتَهَيْنَا إِلَى رَوْضَةٍ عَظِيمَةٍ لَمْ أَرَ رَوْضَةً قَطُّ أَعْظَمَ مِنْهَا وَلاَ أَحْسَنَ. قَالَ: قَالاَ لِي: ارْقَ فِيهَا. قَالَ: فَارْتَقَيْنَا فِيهَا فَانْتَهَيْنَا إِلَى مَدِينَةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذَهَبٍ وَلَبِنِ فِضَّةٍ، فَأَتَيْنَا بَابَ الْمَدِينَةِ فَاسْتَفْتَحْنَا فَفُتِحَ لَنَا، فَدَخَلْنَاهَا فَتَلَقَّانَا فِيهَا رِجَالٌ شَطْرٌ مِنْ خَلْقِهِمْ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ، وَشَطْرٌ كَأَقْبَحِ مَا أَنْتَ رَاءٍ.قَالَ: قَالاَ لَهُمُ: اذْهَبُوا فَقَعُوا فِي ذَلِكَ النَّهَرِ. قَالَ: وَإِذَا نَهَرٌ مُعْتَرِضٌ يَجْرِي كَأَنَّ مَاءَهُ المَحْضُ فِي البَيَاضِ، فَذَهَبُوا فَوَقَعُوا فِيهِ، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَيْنَا قَدْ ذَهَبَ ذَلِكَ السُّوءُ عَنْهُمْ، فَصَارُوا فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ. قَالَ: قَالاَ لِي: هَذِهِ جَنَّةُ عَدْنٍ، وَهَذَاكَ مَنْزِلُكَ. قَالَ: فَسَمَا بَصَرِي صُعُدًا، فَإِذَا قَصْرٌ مِثْلُ الرَّبَابَةِ البَيْضَاءِ. قَالَ: قَالا لِيَ: هَذَاكَ مَنْزِلُكَ. قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: بَارَكَ اللَّهُ فِيكُمَا، ذَرَانِي فَأَدْخُلَهُ. قَالاَ: أَمَّا الآنَ فَلاَ وَأَنْتَ دَاخِلُهُ. قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: فَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ مُنْذُ اللَّيْلَةِ عَجَبًا، فَمَا هَذَا الَّذِي رَأَيْتُ؟ قَالَ: قَالاَ لِي: أَمَا إِنَّا سَنُخْبِرُكَ، أَمَّا الرَّجُلُ الأَوَّلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ يُثْلَغُ رَأْسُهُ بِالْحَجَرِ، فَإِنَّهُ الرَّجُلُ يَأْخُذُ الْقُرْآنَ فَيَرْفُضُهُ وَيَنَامُ عَنِ الصَّلاَةِ المَكْتُوبَةِ، وَأَمَّا الرَّجُلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ يُشَرْشَرُ شِدْقُهُ إِلَى قَفَاهُ وَمَنْخِرُهُ إِلَى قَفَاهُ وَعَيْنُهُ إِلَى قَفَاهُ، فَإِنَّهُ الرَّجُلُ يَغْدُو مِنْ بَيْتِهِ فَيَكْذِبُ الكَذْبَةَ تَبْلُغُ الآفَاقَ، وَأَمَّا الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ الْعُرَاةُ الَّذِينَ فِي مِثْلِ بِنَاءِ التَّنُّورِ فَإِنَّهُمُ الزُّنَاةُ وَالزَّوَانِي، وَأَمَّا الرَّجُلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ يَسْبَحُ فِي النَّهَرِ وَيُلْقَمُ الْحَجَرَ فَإِنَّهُ آكِلُ الرِّبَا، وَأَمَّا الرَّجُلُ الْكَرِيهُ المَرْآةِ الَّذِي عِنْدَ النَّارِ يَحُشُّهَا وَيَسْعَى حَوْلَهَا، فَإِنَّهُ مَالِكٌ خَازِنُ جَهَنَّمَ، وَأَمَّا الرَّجُلُ الطَّوِيلُ الَّذِي فِي الرَّوْضَةِ فَإِنَّهُ إِبْرَاهِيمُ ﷺ، وَأَمَّا الوِلْدَانُ الَّذِينَ حَوْلَهُ فَكُلُّ مَوْلُودٍ مَاتَ عَلَى الْفِطْرَةِ». قَالَ: فَقَالَ بَعْضُ الْمُسْلِمِينَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَأَوْلاَدُ المُشْرِكِينَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَأَوْلاَدُ الْمُشْرِكِينَ، وَأَمَّا الْقَوْمُ الَّذِينَ كَانُوا شَطْرٌ مِنْهُمْ حَسَنًا وَشَطَرٌ مِنْهُمْ قَبِيحًا فَإِنَّهُمْ قَوْمٌ خَلَطُوا عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا، تَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهُمْ»[١].

(١) بروانه: ٨٤٥.

# ٤٨- باسی خەو پەرژین كردن پاش نوێژی بەیانی

**٧٠٤٧- ئەبو ڕەجا وتی: سەمورەی كوڕی جوندەب ﷺ بۆی گێڕاینەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو وتانەی زۆر دەیفەرموو ئەوە بوو كە بەهاوەڵانی فەرموو: ((ئایا كەسێكتان خەوێكی بینیوە؟)) (سەموورە) وتی: جا ئەو كەسەی بیویستایە خەو بگێڕێتەوە بۆی دەگێڕایەوە، وە (پێغەمبەر ﷺ) بەیانیەكیان فەرمووی: ((بەڕاستی ئەم شەو (لە خەومدا) دوو پیاو هاتن بۆ لام، هەردووكیان هەڵیان ساندم، وە هەردووكیان پێیان وتم: دەرچۆ برۆ، منیش لەگەڵیاندا ڕۆشتم و ئێمە چووینە لای پیاوێك ڕاكشابوو، كەسێكی تریش بە بەردێكی گەورەوە بەسەریەوە ڕاوەستابوو، جا ئەو پیاوە بەردەكەی نزم دەكردەوە دەیدا بەسەریدا و سەری دەشكاند، ئینجا بەردەكە خلۆر دەبوویەوە بۆ ئائەوێ، پیاوەكەش دەڕۆشت بەردەكەی دەهێنایەوە جا نەدەگەڕایەوە بۆ لای هەتا سەری چاك نەبوایەتەوە وەك خۆی لێ نەهاتایەتەوە، پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای جاری یەكەم چی لێكردووە، بەهەمان شێوەی لێ دەكردەوە، دەڵێ: منیش بەهەردووكیانم وت: پاك و بێگەردی بۆ خوا! ئەم دوو پیاوە چی بوون؟ دەڵێ: هەردووكیان پێیان وتم: برۆ دەڵێ: جا ڕۆشتین و چووینە لای پیاوێ بە پشتا ڕاكشابوو، كەسێكی تر بەسەریەوە وەستابوو بەچەند قولاپێكی ئاسنەوە، ئینجا ئەو پیاوە دەهات بۆ لایەكی ڕووخساری (بەو قولاپە) لە لالغاوەی تا پشتی سەری هەڵئەدڕی، وە لە لووتیەوە تا پشتی سەری هەڵئەدڕی، وە چاوی تا پشتی سەری هەڵئەدڕی - دەڵێ: هەندێ جار ئەبو ڕەجا دەڵێ فەرمووی: هەڵی ئەتلێشان- دەڵێ: ئینجا دەڕۆشت بۆ لایەكەی تری چی لە لای یەكەمی كردوە، هەمان شت بەلاكەی تریشی دەكرد، جا لەم لایەیان تەواو نەدەبوو هەتا لایەكەی تری چاك دەبوەوە وەكو خۆی لێدەهاتەوە، پاشان دەگەڕایەوە سەری وەكو جاری یەكەمی لێدەكردەوە، دەڵێ:**

وتم پاك و بێگەردی بۆ خوا ئەم دووانە چین؟ دەڵێ: هەردووکیان پێیان وتم: بڕۆ، ئیتر ڕۆشتین ئینجا چووینە لای شتێك وەك تەنوور وابوو - وتی: وابزانم دەیوت: جا دەبینم گاڵە گاڵ و دەنگە دەنگیان بوو - دەڵێ: ئینجا سەیری ناویمان کرد دەبینین پیاوان و ژنانی ڕووتی تیایە، جا ئەوانە لە ژێریانەوە گڕو گڵپەی ئاگریان بۆ دەهات، ئەنجا کەئەو گڕ و گڵپەیان بۆ دەهات هاوار قیژەیان دەکرد، دەڵێ: وتم بە هەردووکیان: ئائەمانە کێن؟ دەڵێ: هەردووکیان پێیان وتم: بڕۆ بڕۆ، دەڵێ جا ڕۆشتین تا چووینە سەر ڕووبارێ - وابزانم دەیفەرموو - سوور بوو وەك خوێن، جا بینیم لە ناو ڕووبارەکەدا پیاوێکی مەلەوان مەلە دەکات، وە بینیم پیاوێکیش لە قەراغی ڕووبارەکە دایە، کە بەردێکی زۆری لای خۆیدا کۆکردۆتەوە، ئینجا ئەو پیاوە مەلەوانە ئەوەندەی مەلەی بکردایە مەلەی دەکرد، پاشان دەهات بۆ لای ئەو پیاوە کە بەردەکانی لای خۆیدا کۆکردبوویەوە، دەمی بۆی دەکردەوە ئەویش بەردێکی فڕێ دەدایە ناو دەمی، ئیتر دەڕۆشت مەلەی دەکرد لە پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای، جا هەر کاتێ بگەڕایەتەوە بۆلای دەمی دەکردەوە بۆی، ئەویش بەردێکی فڕێ دەدایە ناو دەمیەوە، دەڵێ: بەهەردووکیانم وت: ئەم دووانە چین؟ دەڵێ: هەردووکیان پێیان وتم: بڕۆ بڕۆ دەڵێ: ئیتر ڕۆشتین ئینجا چووینە لای پیاوێك دیمەن ناشرین وەك ناشرینترین پیاوێك لە دیمەندا کە بینیبێتت، وە بینیم ئاگرێکی لایە هەڵی دەگیرسێنێت و بەدەوریدا دەسوڕێتەوە، دەڵێ: وتم بەهەردووکیان ئەم پیاوە چییە؟ دەڵێ: هەردووکیان پێیان وتم: بڕۆ بڕۆ، ئەوسا ڕۆشتین جا ڕۆشتینە لای باغێکی چڕ و سەوز کە درەختی بەرز و گەورەی تیابوو، لە هەموو جۆرە گوڵێکی بەهارەی تیابوو، لە ناوەڕاستی باغەکەدا پیاوێکی باڵابەرزی تیابوو، نەمدەتوانی سەری ببینم ئەوەندە باڵای بەرز بوو لە ئاسماندا، وە دەبینم ئەو پیاوە ئەوەندە منداڵی لە دەورە کە هەرگیز منداڵی ئەوەندە زۆرم نەدیبوو دەڵێ: وتم بە

هەردووکیان: ئەمە چییە ئائەمانە چین؟ دەڵێ هەردووکیان پێیان وتم: برۆ برۆ، دەڵێ: ئیتر ڕۆشتین تا گەیشتینە باغێکی تری زۆر گەورە، هەرگیز باغی لەوە گەورەتر و جوانترم نەدیبوو، دەڵێ: هەردووکیان پێیان وتم: سەرکەوە بەو درەختەدا، دەڵێ: ئینجا پیادا سەرکەوتین تا گەشتینە شارێك [١] دروستکرابوو بەخشتێکی ئاڵتوون و خشتێکی زیو، جا چووینە لای دەرگای شارەکە داوای کردنەوەیمان کرد و کرایەوە بۆمان و ڕۆشتینە ناویەوە و پیاوانێکمان پێ گەیشت لایەکی لاشەی جوانترین شێوە بوو کە تۆ بینیبێتت، لایەکەی تریان وەك ناشرینترین شێوە بوو کە بینی بێتت، دەڵێ: هەدووکیان: بەو کەسانەیان وت: بڕۆن خۆتان بخەنە ئەو ڕووبارەوە، دەڵێ: ئەو ڕووبارەش بەوێدا دەڕۆشت[٢] ئاوەکەی لە سپێیەتیدا وەك شیری ڕووت وابوو، ئەوانیش ڕۆشتن و خۆیان خستە ناویەوە، لە پاشان گەڕانەوە بۆ لامان ئەو ناشرینییەی هەیان بوو نەما و ڕۆشت، ئەوسا بوون بەکەسانێکی زۆر جوان، دەڵێ: هەردووکیان پێیان وتم: ئەوە بەهەشتی هەمیشەیە، ئائەوەش شوێنی و جێگای تۆیە، وتی: چاوم بەرز کردەوە بۆ سەرەوە، جا دەبینم کۆشکێکە وەك هەوری سپی وایە، دەڵێ: هەردووکیان پێیان وتم: ئەو شوێنە ماڵەکەتە، دەڵێ: بەهەردووکیانم وت: خوا فەڕ و بەرەکەت بڕژێ بەسەرتاندا لێم گەڕێن با بڕۆمە ناویەوە، هەردووکیان وتیان: ئێستا نابێ بە دڵنیاییەوە بچیتە ناویەوە، دەڵێ: بەهەردووکیانم وت: بەڕاستی من لە شەوەوە زۆر شتی سەر سوڕهێنەرم دی، دەی ئەوە چیبوو کە دیمن؟ دەڵێ: هەردووکیان پێیان وتم: جا پێت دەڵێین ئەو پیاوەی یەکەمیان کە ڕۆشتیەتە لای بەبەرد سەریان دەشکاند، ئەوە بێگومان پیاوێکە قورئان فێر دەبێ و کاری پێ ناکات، وە دەخەوێت و نوێژە فەرزەکانی ناکات، ئەو پیاوەش کە چوویتە لای

---

(١) لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێ کۆشکێک.
(٢) یان لە ڕێگەیان دابوو، وەک و ڕێگایان پێ بگرێت.

لالغاوی تا پشتی سەری هەڵدەدڕا، وە لووتی تاپشتی سەری و چاوی تا پشتی سەری، ئەوە پیاوێکە کە بەیانی لە ماڵەوە دەردەچێت درۆیەکی ئەوەندە گەورە دەکات دەگاتە ئاسمانەکان، ئەو پیاو و ژنانەش کە ڕووت بوون لە شوێنێکی وەکو تەنووردا بوون، ئەوانەش پیاو و ژنی زیناکەرن، ئەو پیاوەش کە چوویتە لای لە ڕووبارەکدا مەلەی دەکرد و بەرد دەخرایە ناو دەمی، ئەوە بێگومان سوو خۆرە، ئەو پیاوەش کە ڕووخساری ناشرین بوو کە لای ئاگرەکەدا بوو هەڵیدەگیرساند و بەدەوریدا دەسوڕایەوە، ئەوە مالیکە ﷺ سەرپەرشتیاری دۆزەخە، ئەو پیاوە بالاّ بەرزەی لە باغەکەدا بوو ئەوەش ئیبراهیمە ﷺ، ئەو منداڵانەش کە بەدەوریدا بوون هەموو منداڵێکە لەسەر سروشتی باوەڕدار بمرێت))، (سەمورە) دەڵێ: هەندێ لە مسوڵمانان عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ئەی منداڵی هاوبەش دانەران؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (( (بەڵێ) منداڵی هاوبەش دانەرانیش (لەو منداڵانەن)، وە ئەو کەسانەش لایەکی لاشەیان جوان بوو لایەکی تریان ناشرین بوو، ئەوانە کەسانێکن کرداری چاك و کرداری خراپیان تێکەڵ کردوە و خوا لێیان بوراوە و عەفوی کردوون.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٩٢- كِتَابُ الفِتَنِ

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٩٢- پەڕاوی ئاشوب و ئاژاوەکان

## ١- بابُ مَا جَاءَ فِي قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ ٢٥﴾ الأنفال وَمَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحَذِّرُ مِنَ الفِتَنِ

٧٠٤٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ السَّرِيِّ، حَدَّثَنَا نَافِعُ بْنُ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: قَالَتْ أَسْمَاءُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَنَا عَلَى حَوْضِي أَنْتَظِرُ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ، فَيُؤْخَذُ بِنَاسٍ مِنْ دُونِي فَأَقُولُ: أُمَّتِي. فَيَقُولُ: لاَ تَدْرِي، مَشَوْا عَلَى القَهْقَرَى». قَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ أَنْ نَرْجِعَ عَلَى أَعْقَابِنَا أَوْ نُفْتَنَ[1].

## ١- باسی ئەوەی دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند هاتووە: (وە خۆتان بپارێزن لە ئاشووب و بەڵایەک کە تووشی ستەم کارانتان نابێت بەتایبەتی (هەمووتان دەگرێتەوە) )، وە باسی ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ بێداری داوە دەربارەی ئاشووب و ئاژاوەکان

**٧٠٤٨- ئەسما رضي الله عنها لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((من (لە ڕۆژی قیامەتدا) لەسەر حەوزەکەم دەبم چاوەڕوان دەکەم کێ لە ئێوە دێت بۆ**

---

(١) بڕوانە: ٦٥٩٣.

**لام، وە كەسانێك ڕێگەیان پێ نادرێت بگەنە لای من دەبرێن، منیش دەڵێم: ئەوانە ئوممەتی منن، (خوا) دەفەرمووی: تۆ نازانی ئەوانە پاشە و پاش گەڕاونەتەوە (پاشگەز بوونەتەوە) )).**

**ئیبنو ئەبی مولەیكە دەڵێ: خودایە ئێمە پەنا بە تۆ دەگرین كە پاش گەز ببینەوە لە ئیسلام یان (لەسەر ئاینەكەمان) تاقی بكرێینەوە.**

٧٠٤٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ، لَيُرْفَعَنَّ إِلَيَّ رِجَالٌ مِنْكُمْ حَتَّى إِذَا أَهْوَيْتُ لأُنَاوِلَهُمُ اخْتُلِجُوا دُونِي، فَأَقُولُ: أَيْ رَبِّ، أَصْحَابِي. يَقُولُ: لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ»[1].

**٧٠٤٩ ـعەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لە ڕاستیدا من پێشكەوتەی ئێوەم لەسەر حەوزەكە، بێگومان پیاوانێك لە ئێوەم نیشان دەدرێ، (دەرۆم) هەتا كە نزیك دەبمەوە بیان هێنم لە من دوور دەخرێنەوە، منیش دەڵێم ئەی پەروەردگارم ئەوانە هاوەڵانی[2] منن (خواش) دەفەرمووی: تۆ نازانیت پاش تۆ ئەوان چییان داهێناوە و كردوە)).**

٧٠٥٠ -٧٠٥١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ، مَنْ وَرَدَهُ شَرِبَ مِنْهُ، وَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ لَمْ يَظْمَأْ بَعْدَهُ أَبَدًا، لَيَرِدُ عَلَيَّ أَقْوَامٌ أَعْرِفُهُمْ وَيَعْرِفُونِي، ثُمَّ يُحَالُ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ».

---

(١) بڕوانە: ٦٥٧٥.

(٢) مەبەستی لە ئوممەتی ئەو نەک هاوەڵانی سەردەمی خۆی، چونكە ئیبنو حەجەر دەڵێ، كەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پاشگەز نەبۆتەوە لە پاش خۆی.

قَالَ أَبُو حَازِمٍ: فَسَمِعَنِي النُّعْمَانُ بْنُ أَبِي عَيَّاشٍ وَأَنَا أُحَدِّثُهُمْ هَذَا، فَقَالَ: هَكَذَا سَمِعْتَ سَهْلاً؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: وَأَنَا أَشْهَدُ عَلَى أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ لَسَمِعْتُهُ يَزِيدُ فِيهِ: قَالَ: «إِنَّهُمْ مِنِّي، فَيُقَالُ إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا بَدَّلُوا بَعْدَكَ فَأَقُولُ: سُحْقًا سُحْقًا لِمَنْ بَدَّلَ بَعْدِي»[١].

**٧٠٥٠-٧٠٥١-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((من پێشکەوتەی ئێوەم لەسەر حەوزەکە، هەر کەسێك بێتە لای لێی دەخواتەوە، هەر کەسیش لێی خواردەوە دوا ئەوە هەرگیز تینووی نابێت، کەسانێك دێن بۆ لام من ئەوان دەناسم و ئەوانیش من دەناسن، لە پاشان من و ئەوان لە یەکتری جیا دەکرێینەوە)).**

**ئەبو حازیم دەڵێ: کاتێ من ئەم فەرموودەیەم بۆ دەگێڕانەوە نوعمانی کوڕی ئەبی عەییاش لێی بیستم، جا وتی: ئاوەها لە سەهلت بیستووە؟ وتم: بەڵێ، وتی: منیش شایەتی دەدەم لەسەر ئەبی سەعیدی خودری کە لێم بیست و ئەمەی لە فەرموودەکە زیاد کرد، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((بێگومان ئەوانە لە ئوممەتی منن، ئینجا دەوترێت: بەراستی تۆ نازانیت لە پاش تۆ چییان داهێناوە و گۆڕیوە، منیش دەڵێم دووربن دووربن بەوانەی پاش من ئایینیان گۆڕی)).**

## ٢- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «سَتَرَوْنَ بَعْدِي أُمُورًا تُنْكِرُونَهَا»

وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي عَلَى الحَوْضِ»[٢].

## ٢- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: (( بێگومان لەمەولا دوای من شتانێک دەبینن بەلاتانەوە خراپە))

**-عەبدوڵڵای کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دان بەخۆتاندا بگرن و بەئارام بن هەتا لەسەر حەوزەکە بەمن دەگەن)).**

---

(١) بڕوانە: ٦٥٨٣، ٦٥٨٤.

(٢) بڕوانە: ٤٣٣٠.

٧٠٥٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ وَهْبٍ، سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً وَأُمُورًا تُنْكِرُونَهَا». قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَدُّوا إِلَيْهِمْ حَقَّهُمْ، وَسَلُوا اللَّهَ حَقَّكُمْ»[1].

**٧٠٥٢- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێمان: ((بێگومان لە پاش من (کاربەدەستان لەگەڵتان) خود ویستی دەکەن[2] و شتانێك کە پێچەوانەی شەرعن بەلاتانەوە دەبینن))، هاوەڵانی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جاچ فەرمانێکمان پێ دەکەیت؟ فەرمووی: ((ئەوەی مافە لەسەرتان جێبەجێی بکەن و ئەوەی مافی خۆتانە لە خوای داوا بکەن)).**

٧٠٥٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّد، عَنْ عَبْدِ الوَارِثِ، عَنِ الجَعْدِ، عَنْ أَبِي رَجَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ:«مَنْ كَرِهَ مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا فَلْيَصْبِرْ، فَإِنَّهُ مَنْ خَرَجَ مِنَ السُّلْطَانِ شِبْرًا مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً»[3].

**٧٠٥٣-ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((هەر کەسێك لە شتێکی [4] فەرمانڕەواکەی ناڕازی بوو با ئارام بگرێت، چونکە بەڕاستی هەر کەس بستێ لە فەرمانبەرداری فەرمانڕەوا دەرچێت و بمرێ، بەمردنێکی نەفامی دەمرێت)).**

٧٠٥٤- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنِ الجَعْدِ أَبِي عُثْمَانَ، حَدَّثَنِي أَبُو رَجَاءٍ الْعُطَارِدِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَصْبِرْ عَلَيْهِ، فَإِنَّهُ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ شِبْرًا فَمَاتَ إِلاَّ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً»[5].

---

(١) بڕوانە: ٣٦٠٣.

(٢) بەم جۆرەش دروستە مانا بکرێت: کاربەدەستان فەزڵی کەسانی تر دەدەن بەسەر ئێوەدا. یان چی باشە بۆ خۆیانی دەبەن و هەڵدەبژێرن.

(٣) بڕوانە: ٧٠٥٤، ٧١٤٣.

(٤) ڕەفتارێکی و کردەوەیەکی لە کاروباری ئایین.

(٥) بڕوانە: ٧٠٥٣.

**٧٠٥٤- ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((هەر كەس لە فەرمانڕەواكەی شتێكی بینی كە پێی ناڕازییە، ئەوە بائارام بگرێت لەسەری، چونكە بەڕاستی هەر كەس بستێ لە كۆمەڵی مسوڵمانان جیا بێتەوە و بمرێت، ئیللا بەمردنێكی نەفامییانە دەمرێت)).**

٧٠٥٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ جُنَادَةَ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ وَهْوَ مَرِيضٌ قُلْنَا: أَصْلَحَكَ اللَّهُ، حَدِّثْ بِحَدِيثٍ -يَنْفَعُكَ اللَّهُ بِهِ- سَمِعْتَهُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ. قَالَ: دَعَانَا النَّبِيُّ ﷺ فَبَايَعْنَاهُ[1].

**٧٠٥٥- عەمر لە بوكەیرەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە بوسری كوڕی سەعیدەوە لە جونادەی كوڕی ئەبی ئومەییەوە دەڵێ: ڕۆشتیم بۆ لای عوبادەی كوڕی صامیت ﷺ لە كاتێكدا كە نەخۆش بوو، وتمان: خوا چاكت بكاتەوە و شیفات بدات، فەرموودەیەك بگێڕەرەوە-كە خوا بە هۆیەوە قازانج و سوودت پێ بگەیەنێت- كە لە پێغەمبەرت ﷺ بیستبێت، (عوبادەش) وتی: پێغەمبەر ﷺ بانگی كردین و ئێمەش بەیعەتمان پێدا (لە شەوی عەقەبەدا).**

٧٠٥٦ - فَقَالَ: فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا وَأَثَرَةٍ عَلَيْنَا، وَأَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ: إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا، عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ"[2].

**٧٠٥٦-جا پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو مەرجانەی لەسەرمانی دانا كە پەیمانمان پێدا لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەری خۆشی و ناخۆشیماندا و لە تەنگانە و ئاسوودەییماندا، ئەگەر چی فەرمان ڕەواكانمان فەزڵی كەسانی تریش بدەن**

---

(١) بڕوانە: ١٨.

(٢) بڕوانە: ٧٢٠٠.

بەسەرماندا[١]، (وە پەیمانمان پێدا) کە کێشە و ئاژاوە لەگەڵ کاربەدەستە مسوڵمانەکانماندا نەکەین، فەرمووی: ((مەگەر کوفر و بێ باوەڕی ئاشکراو دیار (یان لێ) ببینین لە لایەن خواوە، بەڵگەی بەهێزتان هەبێت لەسەری[٢])).

٧٠٥٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اسْتَعْمَلْتَ فُلاَنًا وَلَمْ تَسْتَعْمِلْنِي. قَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً، فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي»[٣].

**٧٠٥٧- ئەنەسی کوڕی مالیك لە ئوسەیدی کوڕی حوزەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکت بەفلان کەس سپاردووە بەلام کارێکت بەمن نەسپاردووە؟ فەرمووی: ((بێگومان لە پاش (مردنی) من خود ویستی[٤] دەبینن، جا کە وابوو دان بەخۆتاندا بگرن هەتا (لەسەر حەوزی کەوسەر) بەمن ئەگەن)).**

## ٣- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «هَلاَكُ أُمَّتِي عَلَى يَدَيْ أُغَيْلِمَةٍ سُفَهَاءَ مِنْ قُرَيْشٍ»

٧٠٥٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَدِّي قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ وَمَعَنَا مَرْوَانُ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: سَمِعْتُ الصَّادِقَ الْمَصْدُوقَ يَقُولُ: «هَلَكَةُ أُمَّتِي عَلَى يَدَيْ غِلْمَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ».

---

(١) نازی ئەم و ئەو دان بەسەرتاندا.
(٢) دەقی ئایەتێک یان فەرموودەیەکی ڕاست و دروست کەمانای تر هەڵنەگرێت.
(٣) بڕوانە: ٣٧٩٢.
(٤) نازی ئەم و ئەو بدەن بەسەرماندا.

فَقَالَ مَرْوَانُ: لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ غِلْمَةً. فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لَوْ شِئْتُ أَنْ أَقُولَ بَنِي فُلَانٍ وَبَنِي فُلَانٍ لَفَعَلْتُ. فَكُنْتُ أَخْرُجُ مَعَ جَدِّي إِلَى بَنِي مَرْوَانَ حِينَ مَلَكُوا بِالشَّأْمِ، فَإِذَا رَآهُمْ غِلْمَانًا أَحْدَاثًا قَالَ لَنَا: عَسَى هَؤُلَاءِ أَنْ يَكُونُوا مِنْهُمْ: قُلْنَا: أَنْتَ أَعْلَمُ[1].

## ٣- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((تێداچوونی ئوممەتم لەسەر دەستی چەند هەرزەکارێکی بێ عەقڵی نەزاندا دەبێت لە قورەیش)).

**٧٠٥٨-مووسا کوڕی ئیسماعیل بۆی گێڕاینەوە وتی: عەمری کوڕی یەحیای کوڕی سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە وتی: باپیرەم بۆی گێڕامەوە وتی: من لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ لە مەدینە لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا ﷺ دانیشتبووم، مەروانیشمان لەگەڵ بوو ئەبو هورەیرە ﷺ وتی لە ڕاستگۆی بەڕاستگۆ دانراو (لە لایەن خواوە)وەم بیست دەیفەرموو: ((تیاچوونی ئوممەتم لەسەر دەستی هەرزەکارانێك لە قورەیش دەبێت))، مەروانیش وتی: نەفرینی خوایان لەسەر بێت چ هەرزەکارانێکن، ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: ئەگەر بمەوێ بڵێم: بەنی فلان و بەنی فلان دەتوانم بیڵێم، (عەمری کوڕی یەحیا دەڵێ) جا من لەگەڵ باپیرەمدا دەڕۆیشتین بۆ لای بەنی مەروان، کاتێ بوونە دەسەڵاتدار لە شامدا، جا (باپیرم) کە دەیبینین هەرزەکار و کەم تەمەن و منداڵن دەیوت پێمان: لەوانەیە ئەمانە لەوانەبن [2]؟ ئێمەش دەمانوت: تۆ شارەزاتری.**

---

(١) بڕوانە: ٣٦٠٤.

(٢) کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردوون کە تیاچوونی ئوممەتەکەی لەسەر دەستی ئەمانە دایە.

## ٤- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ»

٧٠٥٩- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ الزُّهْرِيَّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ ﷺ أَنَّهَا قَالَتِ: اسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ النَّوْمِ مُحْمَرًّا وَجْهُهُ يَقُولُ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَاجُوجَ وَمَاجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ». وَعَقَدَ سُفْيَانُ تِسْعِينَ أَوْ مِائَةً. قِيلَ: أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الخَبَثُ»[1].

## ٤- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((هاوار بۆ عەرەب لە خراپە و ئاژاوەیەک کە نزیک بۆتەوە))

**٧٠٥٩- ئوممو حەبیبە لە زەینەبی کچی جەحشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و کە ئەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەو هەستا و دەم و چاوی سوور بوو بوویەوە و دەیفەرموو: ((هیچ پەرستراوێك ڕاست نییە جگە لە خوا، هاوار بۆ عەرەب لە کارەساتێکی خراپ نزیك بۆتەوە (لێیان)، ئەمڕۆ لە بەربەستەکەی (دروستکرابوو لەبەردەم) یەئجوج و مەئجوجدا ئەوەندەی ئەمەی کون کراوە))، سوفیان پەنجەی کردە ژمارە نەوەد یان سەد[2]. وترا: ئایا ئێمە لە ناو دەبرێین لە کاتێکدا خەڵکانی چاکیشمان لە ناودا بێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ ئەگەر گوناه و تاوان زۆر بێت)).**

٧٠٦٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَحَدَّثَنِي مَحْمُودٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: أَشْرَفَ النَّبِيُّ

---

(١) بڕوانە: ٣٣٤٦.

(٢) ژمارە نەوەد بە پەنجە بەم جۆرەیە سەر پەنجەی شایەتومان دەستی ڕاست بخرێتە بنی پەنجە گەورە وەک هەڵقەیەکی لێ دێت، ژمارە سەدیش : هەروەک ژمارە نەوەد وایە بەڵام پەنجەی شایەتومانی دەستی چەپ بخرێتە بنی پەنجە گەورەی دەستی ڕاست.

ﷺ عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِ الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: «هَلْ تَرَوْنَ مَا أَرَى؟». قَالُوا: لاَ. قَالَ: «فَإِنِّي لأَرَى الْفِتَنَ تَقَعُ خِلاَلَ بُيُوتِكُمْ كَوَقْعِ الْقَطْرِ»[1].

**٧٠٦٠- ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەر قەڵایەك لە قەڵاكانی مەدینە سەرنجیدا و فەرمووی: ((ئەوەی من دەیبینم ئێوەش دەیبینن؟)) عەرزیان کرد نەخێر، فەرمووی: ((بێگومان ئاشوب و ئاژاوە دەبینم لە ناو ماڵ و خانووەكانتاندا ڕوو دەدات وەك بارینی دڵۆپی باران)).**

## ٥- بابُ ظُهُورِ الفِتَنِ

٧٠٦١- حَدَّثَنَا عَيَّاشُ بْنُ الوَلِيدِ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ، وَيَنْقُصُ الْعَمَلُ، وَيُلْقَى الشُّحُّ، وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ، وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّمَ هُوَ؟ قَالَ: «الْقَتْلُ الْقَتْلُ»[2].

وَقَالَ شُعَيْبٌ وَيُونُسُ وَاللَّيْثُ وَابْنُ أَخِي الزُّهْرِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ٥- باسی دەرکەوتنی ئاشووب و ئاژاوەکان

**٧٠٦١-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کات نزیك دەبێتەوە کردەوە کەم دەبێتەوە، ڕژدەیی دەخرێتە نێوان خەڵکەوە، ئاشوب پەیدا دەبێت و دەردەکەوێت، هەرەج زۆر دەبێت))، عەرزیان کرد هەرەج چییە؟ فەرمووی: ((کوشتنە کوشتن)).**

**-شوعەیب و یونس و لەیس و کوڕی برای زوهری لە زوهرییەوە گێڕاویانەتەوە ئەویش لەحومەیدەوە لە ئەبی هوڕەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

(١) بڕوانە: ٧٢٠٠.

(٢) بڕوانە: ٨٥.

٧٠٦٢- ٧٠٦٣- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ وَأَبِي مُوسَى فَقَالاَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ لَأَيَّامًا يَنْزِلُ فِيهَا الجَهْلُ، وَيُرْفَعُ فِيهَا الْعِلْمُ، وَيَكْثُرُ فِيهَا الْهَرْجُ» وَالْهَرْجُ: الْقَتْلُ[1].

**٧٠٦٢-٧٠٦٣- شەقیق دەڵێ: من لەگەڵ عەبدوڵلا و ئەبی موسادا ﷺ بووم، هەردووکیان وتیان: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لە پێش هاتنی قیامەتدا ڕۆژانێك هەن نەزانی تیایاندا دادەبارێ (و بڵاو دەبێتەوە)، زانست تیایاندا هەڵدەگیرێ[2] و هەرەج تیایاندا زۆر دەبێت))، هەرەجیش واتە: کوشتن.**

٧٠٦٤- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا شَقِيقٌ قَالَ: جَلَسَ عَبْدُ اللَّهِ وَأَبُو مُوسَى فَتَحَدَّثَا، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ أَيَّامًا يُرْفَعُ فِيهَا الْعِلْمُ، وَيَنْزِلُ فِيهَا الْجَهْلُ، وَيَكْثُرُ فِيهَا الْهَرْجُ». وَالْهَرْجُ: الْقَتْلُ[3].

**٧٠٦٤- شەقیق دەڵێ: عەبدوڵلا و ئەبی موسادا ﷺ دانیشتن و پێکەوە قسەیان دەکرد، ئەبو موسا ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لە پێش هاتنی قیامەتدا ڕۆژانێك هەن زانست تیایاندا هەڵدەگیرێ[4]، نەزانی تیایاندا دادەبارێ (و بڵاو دەبێتەوە) و هەرەج تیایاندا زۆر دەبێت))، هەرەجیش: کوشتنە.**

٧٠٦٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: إِنِّي لَجَالِسٌ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ وَأَبِي مُوسَى ﷺ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ مِثْلَهُ، وَالْهَرْجُ بِلِسَانِ الحَبَشَةِ: القَتْلُ[5].

---

(١) بڕوانە: ٧٠٦٤، ٧٠٦٥، ٧٠٦٦.
(٢) بەمردنی زانایان زانست نامێنێ.
(٣) بڕوانە: ٧٠٦٣.
(٤) بەمردنی زانایان زانست نامێنێ.
(٥) بڕوانە: ٧٠٦٣.

**٧٠٦٥-ئەبو وائیل وتی: من لەگەڵ عەبدوڵلا و ئەبو موسادا ﷺ دانیشتبووم ئینجا ئەبو موسا وتی: لە پێغەمبەر ﷺ بیست. جا هاوشێوەی فەرموودەكەی پێشوو دەگێڕێتەوە، هەرەجیش بە زمانی حەبەشی: كوشتنە.**

٧٠٦٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ وَاصِلٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ - وَأَحْسِبُهُ رَفَعَهُ- قَالَ: «بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ أَيَّامُ الهَرْجِ، يَزُولُ العِلْمُ، وَيَظْهَرُ فِيهَا الجَهْلُ». قَالَ أَبُو مُوسَى: وَالْهَرْجُ: القَتْلُ بِلِسَانِ الحَبَشَةِ[1].

**٧٠٦٦ -ئەبو وائیل لە عەبدوڵلاوە ﷺ دەگێڕێتەوە وابزانم بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((لە پێش هاتنی قیامەتدا ڕۆژانی هەرِەجە، زانست نامێنێ و نەزانین تیایاندا ئاشكرا و بڵاو دەبێتەوە))، ئەبو موسا وتی: هەرەج بە زمانی حەبەشی: كوشتنە.**

٧٠٦٧ - وَقَالَ أَبُو عَوَانَة، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنِ الأَشْعَرِيِّ أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ: تَعْلَمُ الأَيَّامَ الَّتِي ذَكَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَيَّامَ الْهَرْجِ. نَحْوَهُ. قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مِنْ شِرَارِ النَّاسِ مَنْ تُدْرِكُهُمُ السَّاعَةُ وَهُمْ أَحْيَاءٌ».

**٧٠٦٧-ئەبوعەوانە لە عاصیمەوە دەگێڕێتەوە لە ئەبی وائیلەوە لە (ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەگێڕێتەوە كە بەعەبدوڵلای وتووە: ئەو ڕۆژانە دەزانیت كە پێغەمبەر ﷺ بەرۆژانی هەرِەج باسی كردوە؟ ئیتر هاوشێوەی فەرموودەكەی پێشوو دەگێڕێتەوە.**

**عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە خراپترینەكانی خەڵك ئەو كەسانەن قیامەتیان دەگاتێ و زیندوون)).**

---

(١) بڕوانە: ٧٠٦٢.

## ٦- بابٌ: لاَ يَأْتِي زَمَانٌ إلاَّ الذي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ

٧٠٦٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ عَدِيٍّ قَالَ: أَتَيْنَا أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ مَا نَلْقَى مِنَ الْحَجَّاجِ، فَقَالَ: «اصْبِرُوا، فَإِنَّهُ لاَ يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ إِلاَّ الَّذِي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ، حَتَّى تَلْقَوْا رَبَّكُمْ». سَمِعْتُهُ مِنْ نَبِيِّكُمْ ﷺ.

## ٦- باسێک: هیچ سەردەمێک نایەت ئیللا ئەو سەردەمەی دوای ئەو دێ خراپترە لەو

**٧٠٦٨-زوبیری کوڕی عەدیی وتی: چووینە لای ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ سکاڵای ئەوەمان لای کرد لە لایەن حەجاجەوە تووشمان دەبێت، ئەنەسیش وتی: ((ئارام بگرن چونکە دڵنیابن هیچ سەردەمێکتان بەسەردا نایات ئیللا ئەوەی دوای ئەو دێت لەو خراپترە، هەتا دەگەنە خزمەت پەروەردگارتان))، ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بیستووە.**

٧٠٦٩- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ح. وَحَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَتِيقٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ هِنْدٍ بِنْتِ الحَارِثِ الفِرَاسِيَّةِ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتِ: اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةً فَزِعًا يَقُولُ: «سُبْحَانَ اللَّهِ! مَاذَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ الخَزَائِنِ؟ وَمَاذَا أُنْزِلَ مِنَ الفِتَنِ؟ مَنْ يُوقِظُ صَوَاحِبَ الْحُجُرَاتِ -يُرِيدُ: أَزْوَاجَهُ- لِكَيْ يُصَلِّينَ؟ رُبَّ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ فِي الآخِرَةِ»[1].

**٧٠٦٩- هیندی کچی حاریسی فیراسییە دەگێڕێتەوە کە ئوممو سەلەمەی ﵄ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك لە خەو هەستا بەپەشۆکاوی و ترسەوە دەیفەرموو: ((پاك و بێگەردی بۆخوا، خوا چەند**

(١) بڕوانە: ١١٥.

**گەنجینەو خەزێنە دەبەخشێت (مسوڵمانان بە غەنیمەت دەیگرن) وە چەند ئاشوب و فیتنەیەك دادەبەزێنرێ؟! كێ ئافەرەتانی ئەم ماڵانە - مەبەستی خێزانەكانی بوو- خەبەر دەكاتەوە بۆ ئەوەی (شەو)نوێژ بكەن؟ زۆر كەس لە دونیادا پۆشتەیە بەڵام لە دوارۆژدا ڕووت و قووتە)).**

## ٧- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاَحَ فَلَيْسَ مِنَّا»

٧٠٧٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاَحَ فَلَيْسَ مِنَّا»[1].

## ٧- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ:(( هەر كەس چەك هەڵگرێ لە دژمان ئەوە لە ئێمە نییە))

**٧٠٧٠-عەبدوڵلای كوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر كەس چەك لە دژمان هەڵگرێ ئەوە لە ئێمە نییە)).**

٧٠٧١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاَحَ فَلَيْسَ مِنَّا».

**٧٠٧١- ئەبو موسا رضي الله عنه دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر كەس چەك لە دژمان هەڵگرێ ئەوە لە ئێمە نییە)).**

٧٠٧٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يُشِيرُ أَحَدُكُمْ عَلَى أَخِيهِ بِالسِّلاَحِ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِي يَدِهِ فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ».

---

(١) بڕوانە: ٦٨٧٤.

**٧٠٧٢-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هیچ کەسێکتان چەکەکە ڕوو پێ نەکاتە براکەی، چونکە بەڕاستی نازانێ، لەوانە شەیتان لە دەستی دەربێنێ و ئینجا بکەوێتە (تاوانێك بەهۆیەوە بکەوێتە) چاڵێکی ئاگری دۆزەخەوە)).**

٧٠٧٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: قُلْتُ لِعَمْرٍو: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ، سَمِعْتَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: مَرَّ رَجُلٌ بِسِهَامٍ فِي المَسْجِدِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمْسِكْ بِنِصَالِهَا؟». قَالَ: نَعَمْ[1].

**٧٠٧٣- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پیاوێك چەند تیرێکی پێ بوو بەمزگەوتدا تێپەڕی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێی: ((دەست بگرە بەنووکەکانیانەوە)).**

٧٠٧٤- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ جَابِرٍ أَنَّ رَجُلاً مَرَّ فِي الْمَسْجِدِ بِأَسْهُمٍ قَدْ أَبْدَى نُصُولَهَا، فَأُمِرَ أَنْ يَأْخُذَ بِنُصُولِهَا، لاَ يَخْدِشُ مُسْلِمًا[2].

**٧٠٧٤-جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك بەچەند تیرێکەوە کە نووکی تیرەکانی دەرخستبوو لە مزگەوتدا تێپەڕی، بۆیە فەرمانی پێ کرا کە دەست بگرێت بە نووکەکەیانەوە بۆ ئەوەی مسوڵمانێك بریندار[3] نەکات.**

٧٠٧٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ فِي مَسْجِدِنَا أَوْ فِي سُوقِنَا وَمَعَهُ نَبْلٌ فَلْيُمْسِكْ عَلَى نِصَالِهَا -أَوْ قَالَ: فَلْيَقْبِضْ بِكَفِّهِ- أَنْ يُصِيبَ أَحَدًا مِنَ المُسْلِمِينَ مِنْهَا شَيْءٌ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٤٥١.

(٢) بڕوانە: ٤٥١.

(٣) (یخدش): واتە پێستەکەی نەروشێنێ کە سەرەتای بریندارکردنە.

**٧٠٧٥- ئەبو موسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ئەگەر كەسێكتان تێپەڕی بەمزگەوتەكەماندا، یان بەبازاڕەكەماندا و تیری پێبوو، با دەست بگرێت بەنووكەیەكەیوە-یان فەرمووی با بەناو لەپی بیگرێت - نەوەك شوێنێكی (تیرەكە) بەر مسوڵمانێك بكەوێت)).**

## ٨- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ:«لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»

٧٠٧٦- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا شَقِيقٌ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «سِبَابُ المُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[٢].

## ٨- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((پاش من كافر مەبنەوە هەندێكتان بدەن لە گەردنی هەندێكتان))

**٧٠٧٦- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جنێودان بە مسوڵمان دەرچوونە لە دینداری ڕاستەقینە، جەنگ كردنیش لە دژی كوفر و بێ باوەڕییە)).**

٧٠٧٧- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنِي وَاقِدٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[٣].

**٧٠٧٧-ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كەلە پێغەمبەری ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((لە پاش من كافر مەبنەوە هەندێكتان بدەن لە گەردنی هەندێكتان)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٥٢.
(٢) بڕوانە: ٤٨.
(٣) بڕوانە: ١٧٤٢.

٧٠٧٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا قُرَّةُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ سِيرِينَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ -وَعَنْ رَجُلٍ آخَرَ هُوَ أَفْضَلُ فِي نَفْسِي مِنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ- أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: «أَلاَ تَدْرُونَ أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ. فَقَالَ: «أَلَيْسَ بِيَوْمِ النَّحْرِ؟». قُلْنَا بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «أَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟ أَلَيْسَتْ بِالْبَلْدَةِ؟». قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ وَأَبْشَارَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ؟». قُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ: «اللَّهُمَّ اشْهَدْ، فَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَإِنَّهُ رُبَّ مُبَلِّغٍ يُبَلِّغُهُ مَنْ هُوَ أَوْعَى لَهُ -فَكَانَ كَذَلِكَ- قَالَ: لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ». فَلَمَّا كَانَ يَوْمَ حُرِّقَ ابْنُ الْحَضْرَمِيِّ حِينَ حَرَّقَهُ جَارِيَةُ بْنُ قُدَامَةَ. قَالَ: أَشْرِفُوا عَلَى أَبِي بَكْرَةَ. فَقَالُوا: هَذَا أَبُو بَكْرَةَ يَرَاكَ. قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: فَحَدَّثَتْنِي أُمِّي عَنْ أَبِي بَكْرَةَ أَنَّهُ قَالَ: لَوْ دَخَلُوا عَلَيَّ مَا بَهَشْتُ بِقَصَبَةٍ[1].

**٧٠٧٨- ئیبنو سیرین دەیگێڕێتەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی بەکرەوە لە ئەبی بەکرە ﷺ، وە لە پیاوێکی ترەوە کە بەلامەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی بەکرە باشترە، ئەویش لە ئەبو بەکرەوە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریدا بۆ خەڵك و فەرمووی: ((ئایا دەزانن ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە؟)) وتیان: خوا پێغەمبەرەکەی دەزانن، (جا بێدەنگ بوو)، هەتا وامان دەزانی ناوی لێ دەنێ بە ناوێك جگە لە ناوەکەی خۆی، ئینجا فەرمووی: ((ئەمڕۆ ڕۆژی یەکەمی جەژن قوربان نییە؟)) وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ڕۆژی جەژنە)، فەرمووی: ((ئەم شارە کوێیە؟ ئایا شارە ڕێزگیراوەکە نییە؟)) وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((جا بێگومان خوێنتان و ماڵتان و ناموستان و پێستتان لە یەکتر حەرامە، وەك حەرامی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتاندا لەم**

(١) بڕوانە: ٦٧.

**شارەتاندا، ئاگاداربن ئایا گەیاندم؟)) وتمان: بەڵێ، فەرمووی: ((خوایە تۆ شایەت بە دەی با ئەوەی ئامادەیە (ئەم وتانە) بگەیەنێت بەوەی ئامادە نییە (لێرە)، چونکە زۆر پێگەیەنراو هەیە لە بیسەر چاکتر لەبەری دەکات و لێی تێدەگات -جا هەرواش بوو- فەرمووی: ((دوای من بێ دین و کافر مەبنەوە هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکتان)).**

**(عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی بەکرە دەڵێ:) جا کاتێ کە ئەو ڕۆژە بوو ئیبنو لحەچرمی[1] سوتێنرا، کاتێك جارییەی کوڕی قودامە سوتاندی (جارییە بە لەشکرەکەی) وت: سەیری ئەبو بەکرە بکەن[2]، ئەوانیش وتیان: ئەوە ئەبو بەکرەیە دەتبینێت. عەبدوڕەحمان دەڵێ: دایکم لە ئەبو بەکرەوە بۆی گێڕامەوە کە وتوویەتی: ئەگەر بهاتنایەتە ماڵەوە بۆم بە دارێکیش بەرگریم لە خۆم نەدەکرد.**

٧٠٧٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِشْكَابٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَرْتَدُّوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[3].

**٧٠٧٩-ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لە پاش من پاشگەز مەبنەوە و کافربن، هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکتان)).**

٧٠٨٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ مُدْرِكٍ، سَمِعْتُ أَبَا زُرْعَةَ بْنَ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ جَدِّهِ جَرِيرٍ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ «اسْتَنْصِتِ النَّاسَ». ثُمَّ قَالَ: «لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[1].

---

(١) ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عەمرە، موعاویە ﵁ ناردی تا بەصرە بگرێت بۆی لەو کاتەدا زیادی کوڕی سومەییە والی بەصرە بوو لە لایەن عەلییەوە ﵁ داوای پشتیوانی لە عەلی کرد، ئەویش جارییەی کوڕی قودامەی بۆ نارد گەمارۆی عەبدوڵڵای حەضرەمیدا و خانووەکەی سووتاند بەسەریدا. بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٦/١٥.
(٢) بزانن خۆی دەدات بەدەستەوە و گوێڕایەڵ دەبێت یان نا؟.
(٣) بڕوانە: ١٧٣٩.

**٧٠٨٠- ئەبو زورعەی كوڕی عەمری كوڕی جەریر لە جەریری باپیرەیەوە ﷺ دەگێڕێەوە كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا فەرمووی پێم: ((خەڵك بێ دەنگ بكە)). پاشان فەرمووی: ((دوای (مردنی) من كافر مەبنەوە لە گەردنی یەكتری بدەن)).**

## ٩- بابٌ: تَكُونُ فِتْنَةٌ الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ

٧٠٨١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. قَالَ إِبْرَاهِيمُ: وَحَدَّثَنِي صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَتَكُونُ فِتَنٌ، القَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ، وَالْقَائِمُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي، وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي، مَنْ تَشَرَّفَ لَهَا تَسْتَشْرِفْهُ، فَمَنْ وَجَدَ فِيهَا مَلْجَأً أَوْ مَعَاذًا فَلْيَعُذْ بِهِ»[٢].

## ٩- باسێک: ئاشوبێک دەبێت دانیشتوو تێیدا باشترە لەوەی بە پێوەیە و ڕاوەستاوە

**٧٠٨١- ئەبو هورەیرە[٣] ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لەداهاتوودا ئاژاوە و ئاشووب (لە نێوان مسوڵمانان‌دا) ڕوو دەدات، ئەو كەسەی لە ناو ئەو (ئاشووبە)دا دانیشتبێت لەو كەسە چاكترە بەپێوەیە، وە ئەو كەسەش بەپێوەیە تیایدا لەو كەسە چاكترە بەپێ دەڕوات، ئەو كەسەش بەپێ دەڕوات تیایدا لەو كەسە چاكترە بەخێرایی دەڕوات و ڕادەكات، ئەو كەسەش سەیری**

(١) بڕوانە: ١٢١.

(٢) بڕوانە: ٣٦٠١.

(٣) ئەم فەرموودە دوو ڕشتەی هەیە هەردووكیان لەڕێگەی ئەبو هورەیرەوەیە ﷺ.

**دەكات ئاژاوەكە بانگی دەكات بڕواتە ناویەوە، جا هەر كەس حەشارگە و پەناگایەكی دەست كەوت با پەنای بۆ ببات (و بەشداری تیادا نەكات بەهیچ شێوەیەك) )).**

٧٠٨٢- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَتَكُونُ فِتَنٌ، الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ، وَالْقَائِمُ خَيْرٌ مِنَ المَاشِي، وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي، مَنْ تَشَرَّفَ لَهَا تَسْتَشْرِفْهُ، فَمَنْ وَجَدَ مَلْجَأً أَوْ مَعَاذًا فَلْيَعُذْ بِهِ»[1].

**٧٠٨٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لە داهاتوودا ئاژاوە و ئاشووب (لە نێوان مسوڵمانانندا) ڕوو دەدات، ئەو كەسەی لە ناو ئەو (ئاشووبە)دا دانیشتبێت لەو كەسە چاكترە بەپێوەیە، وە ئەو كەسەش بەپێوەیە تیایدا لەو كەسە چاكترە بەپێ دەڕوات، ئەو كەسەش بەپێ دەڕوات تیایدا لەو كەسە چاكترە بەخێرایی دەڕوات و ڕادەكات، ئەو كەسەش سەیری دەكات ئاژاوەكە بانگی دەكات بڕواتە ناویەوە، جا هەر كەس حەشارگە و پەناگایەكی دەست كەوت با پەنای بۆ ببات (و بەشداری تیادا نەكات بەهیچ شێوەیەك) )).**

## ١٠- بابٌ: إِذَا التَقَى المُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا

٧٠٨٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ رَجُلٍ لَمْ يُسَمِّهِ، عَنِ الحَسَنِ قَالَ: خَرَجْتُ بِسِلاَحِي لَيَالِيَ الْفِتْنَةِ، فَاسْتَقْبَلَنِي أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قُلْتُ: أُرِيدُ نُصْرَةَ ابْنِ عَمِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا

---

(١) بڕوانە: ٣٦٠١.

فَكِلاَهُمَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ». قِيلَ: فَهَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: «إِنَّهُ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ». قَالَ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ: فَذَكَرْتُ هَذَا الْحَدِيثَ لأَيُّوبَ وَيُونُسَ بْنِ عُبَيْدٍ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ يُحَدِّثَانِي بِهِ، فَقَالاَ: إِنَّمَا رَوَى هَذَا الحَدِيثَ الحَسَنُ، عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ.

## ١٠- باسێك: ئەگەر دوو مسوڵمان بە شیرەكانیانەوە ڕوو بەڕووی یەكتری بوونەوە

**٧٠٨٣-حەمماد لە پیاوێكەوە كە ناوی نەبردووە[1] ئەویش لە حەسەنەوە گێڕاویەتی و دەڵێ: بەچەكەكەمەوە شەوانی ئاژاوەكە دەرچووم، ئینجا ئەبو بەكرە ﵁ ڕووبەرووم هات و وتی: دەتەوێ بۆ كوێ بڕۆیت؟ وتم: دەمەوێ یارمەتی كوڕی مامی[2] پێغەمبەری خوا ﷺ بدەم، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر دوو مسوڵمان بە شیرەكانیانەوە ڕووبەڕووی یەكتری ببنەوە ئەوە هەردووكیان لە دۆزەخیانن))، وترا: ئەوە بكوژەكە (دۆزەخیە) ئەی كوژراوەكە تاوانی چییە؟ فەرمووی: ((بێگومان ئەویش ویستویەتی هاوڕێكەی بكوژێت)).**

**حەمماد كوڕی زەید دەڵێ: جا ئەم فەرموودەیەم باس كرد بۆ ئەیوب و یونسی كوڕی عوبەید، وە دەمویست كە هەردووكیان ئەم فەرموودەیەم بۆبگێڕنەوە، جا هەردووكیان وتیان: ئەم فەرموودەیە حەسەن لە ئەحنەفی كوڕی قەیسەوە گێڕاویەتیەوە ئەویش لە ئەبی بەكرەوە ﵁.**

٧٠٨٣ -/م حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ بِهَذَا.وَقَالَ مُؤَمَّلٌ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ وَيُونُسُ وَهِشَامٌ وَمُعَلَّى بْنُ زِيَادٍ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنِ الأَحْنَفِ عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ

---

(١) كە عەمری كوڕی عوبەیدە یەكێك لە سەرانی موعتەزیلە، كە لەبەر بوونی خراپ بووە (فتح الباري: ٣٢/٣٣).
(٢) مەبەستی عەلی كوڕی ئەبی تاڵیبە ﵁.

ﷺ. وَرَوَاهُ مَعْمَرٌ، عَنْ أَيُّوبَ. وَرَوَاهُ بَكَّارُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ. وَقَالَ غُنْدَرٌ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَلَمْ يَرْفَعْهُ سُفْيَانُ عَنْ مَنْصُورٍ[1].

**٧٠٨٣- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) سولەیمان بۆی گێڕاینەوە وتی: حەمماد ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە.**

**-موئەممەل وتی: حەممادی کوڕی زەید بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەیوب و یونس و هیشام و موعەللای کوڕی زیاد لە حەسەنەوە گێڕایانەوە ئەویش لە ئەحنەفەوە لە ئەبی بەکرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە. وە مەعمەر لە ئەیوبەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

**-وە بەکاری کوڕی عەبدولعەزیز لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە ئەویش لە ئەبی بەکرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

**-وە غوندەر دەڵێ: شوعبە بۆی گێڕاینەوە لە مەنصورەوە لە ڕەبیعی کوڕی حیراشەوە لە ئەبی بەکرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودەی گێڕایەوە.**

**-سوفیان ئەم فەرموودەی لە مەنصوورەوە گێڕایەوە بە فەرموودی پێغەمبەر ﷺ نەیهێنا.**

## ١١- بابٌ كَيْفَ الْأَمْرُ إِذَا لَمْ تَكُنْ جَمَاعَةٌ؟

٧٠٨٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ جَابِرٍ، حَدَّثَنِي بُسْرُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ الحَضْرَمِيُّ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا إِدْرِيسَ الخَوْلَانِيَّ، أَنَّهُ سَمِعَ حُذَيْفَةَ بْنَ اليَمَانِ يَقُولُ: كَانَ النَّاسُ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الخَيْرِ، وَكُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنِ الشَّرِّ، مَخَافَةَ أَنْ يُدْرِكَنِي

(١) بڕوانە: ٣١.

فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا فِي جَاهِلِيَّةٍ وَشَرٍّ، فَجَاءَنَا اللَّهُ بِهَذَا الْخَيْرِ، فَهَلْ بَعْدَ هَذَا الخَيْرِ مِنْ شَرٍّ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قُلْتُ: وَهَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الشَّرِّ مِنْ خَيْرٍ؟ قَالَ: «نَعَمْ، وَفِيهِ دَخَنٌ». قُلْتُ: وَمَا دَخَنُهُ؟ قَالَ: «قَوْمٌ يَهْدُونَ بِغَيْرِ هَدْيِي، تَعْرِفُ مِنْهُمْ وَتُنْكِرُ». قُلْتُ: فَهَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الخَيْرِ مِنْ شَرٍّ؟ قَالَ: «نَعَمْ، دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ، مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، صِفْهُمْ لَنَا. قَالَ: «هُمْ مِنْ جِلْدَتِنَا، وَيَتَكَلَّمُونَ بِأَلْسِنَتِنَا». قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ؟ قَالَ: «تَلْزَمُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَإِمَامَهُمْ». قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ وَلاَ إِمَامٌ؟ قَالَ: «فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ بِأَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ»[1].

## ١١- باسێک: کار و باری (مسوڵمانان) چۆن دەبێت ئەگەر کۆمەڵێک نەبوو (مسوڵمانان یەکدەنگ بن لە سەر دەسەڵاتدارێک)؟

**٧٠٨٤- ئەبو ئیدریسی خەولانی دەڵێ: کە ئەو لە حوزەیفەی کوڕی یەمانی ﷺ بیست دەیوت: خەڵکی هەمیشە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد دەربارەی شتە چاکەکان، بەڵام من دەربارەی شەڕ و خراپە پرسیارم لێ دەکرد، لە ترسی ئەوەی نەوەك یەخەم بگرێت و تووشم ببێت، بۆیە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان ئێمە لە ڕابردوودا لە نەفامی و خراپەدا بووین، ئەنجا خوای گەورە ئەم خێر و چاکەی [2] بۆ ناردین. ئایا پاش ئەم خێر و چاکەیە خراپە و شەڕ پەیدا دەبێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) وتم: ئایا پاش ئەوخراپە و شەڕە خێر و چاکە پەیدا دەبێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ بەڵام دوکەڵاوی وتەم و مژاویە))، وتم: دوکەڵاویەکەی چییە؟ فەرمووی: ((کەسانێك پەیدا دەبن بەگوێرەی سوننەتی من ڕەفتار ناکەن، شتیان هەیە دەزانی چاکە (و لەگەڵ ئیسلام ڕێکە)، شتیشیان هەیە دەزانی خراپە (و پێچەوانەی ئیسلامە) ))، وتم:**

---

(١) بڕوانە: ٣٦٠٦.

(٢) کە ناردنی پێغەمبەر و ئایینی ئیسلام و نەمانی کوفر و بێ باوەڕییە.

ئەی پاش ئەو خێر و چاكە خراپە پەیدا دەبێتەوە؟ فەرمووی: ((بەڵێ كەسانێك پەیدا دەبن لەبەر دەرگاكانی دۆزەخدا خەڵكی بانگ دەكەن، هەر كەس بەگوێیان بكات فڕێی دەدەنە دۆزەخەوە))، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا: ناونیشانی ئەو كە سانەمان پێ بڵێ، ئەویش فەرمووی: ((ئەوانە لە خۆمانن (بەڕواڵەت) و بەزمانی خۆمان دەدوێن))، وتم: كەواتە چ فەرمانێكم پێ دەدەی ئەگەر كەوتمە ئەو كات و حاڵەوە؟ فەرمووی: ((لەگەڵ كۆمەڵی مسوڵمانان وپێشەواكەیاندابە))، وتم: ئەی ئەگەر نەكۆمەڵیان هەبوو نە پێشەوا (چی بكەم)؟ فەرمووی: ((واز لە گشت ئەو دەستە و كۆمەڵانە بێنە و كەنار بگرە، ئەگەر قەپ بكەیت بەقەدی درەختێكدا تا (دوور لەو دەستانە) لەسەر ئەو حاڵەتە دەمریت)).

## ١٢- بابُ مَنْ كَرِهَ أنْ يُكَثِّرَ سَوَادَ الفِتَنِ وَالظُّلْمِ

٧٠٨٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنَا حَيْوَةُ وَغَيْرُهُ قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَسْوَدِ. وَقَالَ اللَّيْثُ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ قَالَ: قُطِعَ عَلَى أَهْلِ الْمَدِينَةِ بَعْثٌ فَاكْتُتِبْتُ فِيهِ فَلَقِيتُ عِكْرِمَةَ فَأَخْبَرْتُهُ، فَنَهَانِي أَشَدَّ النَّهْيِ، ثُمَّ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ أَنَّ أُنَاسًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا مَعَ الْمُشْرِكِينَ يُكَثِّرُونَ سَوَادَ الْمُشْرِكِينَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ،فَيَأْتِي السَّهْمُ فَيُرْمَى فَيُصِيبُ أَحَدَهُمْ، فَيَقْتُلُهُ أَوْ يَضْرِبُهُ فَيَقْتُلُهُ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴿٩٧﴾ ﴾ النساء[1].

## ١٢- باسی ئەو كەسەی حەز ناكات ڕەشایی و ژمارەی (بەشدارانی) ئاشووب و ستەم زۆر كات

٧٠٨٥- ئەبو لئەسوەد[2] دەڵێ: لەسەر خەڵكی شاری مەدینە پێویست كرا سوپایەك بنێرن (بۆ جەنگ لەگەڵ خەڵكی شامدا)، منیش لەو سوپایەدا ناوم

---

(١) بڕوانە: ٤٥٩٦.

(٢) ئەم فەرموودە دوو ڕشتە و ڕێگەی هەیە لە موحەممەدی كوڕی عەبدورەحمان ناسراو بە ئەبو لئەسوەد.

**نووسرا، ئینجا لەو سوپایەدا گەشتم بە عیکریمە [(١)] هەواڵی ناو نووسینەکەی خۆم پێدا، ئەویش زۆر بەتوندی ڕێگری (ئەو کارەی) لێ کردم لە پاشان وتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ بۆی گێڕامەوە کە بێگومان کەسانێکی مسوڵمان لەگەڵ بتپەرستاندا بوون ژمارە و ڕەشایی بتپەرستانیان لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دەکرد، جا تیرێك ئەهاوێژرا و دەهات دەیدا لە کەسێکیان و دەیکوشت، یان شیرێکی لێ دەدرا و دەکوژرا، بەو هۆیەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: (بێگومان ئەوانەی فریشتەکان گیانیان دەکێشن لە کاتێکدا کە ستەمیان لەخۆیان دەکرد (بە کۆچ نەکردنیان) ).**

## ١٣- بابٌ: إِذَا بَقِيَ فِي حُثَالَةٍ مِنَ النَّاسِ

٧٠٨٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ، حَدَّثَنَا حُذَيْفَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَدِيثَيْنِ رَأَيْتُ أَحَدَهُمَا وَأَنَا أَنْتَظِرُ الآخَرَ، حَدَّثَنَا: «أَنَّ الأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ، ثُمَّ عَلِمُوا مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ عَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ». وَحَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِهَا قَالَ: «يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ أَثَرِ الْوَكْتِ، ثُمَّ يَنَامُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ، فَيَبْقَى فِيهَا أَثَرُهَا مِثْلَ أَثَرِ الْمَجْلِ، كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ عَلَى رِجْلِكَ فَنَفِطَ فَتَرَاهُ مُنْتَبِرًا وَلَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ، وَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ فَلاَ يَكَادُ أَحَدٌ يُؤَدِّي الأَمَانَةَ، فَيُقَالُ: إِنَّ فِي بَنِي فُلاَنٍ رَجُلاً أَمِينًا. وَيُقَالُ لِلرَّجُلِ: مَا أَعْقَلَهُ، وَمَا أَظْرَفَهُ، وَمَا أَجْلَدَهُ. وَمَا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ". وَلَقَدْ أَتَى عَلَيَّ زَمَانٌ وَلاَ أُبَالِي أَيُّكُمْ بَايَعْتُ، لَئِنْ كَانَ مُسْلِمًا رَدَّهُ عَلَيَّ الإِسْلاَمُ، وَإِنْ كَانَ نَصْرَانِيًّا رَدَّهُ عَلَيَّ سَاعِيهِ، وَأَمَّا الْيَوْمَ فَمَا كُنْتُ أُبَايِعُ إِلاَّ فُلاَنًا وَفُلاَنًا»[(٢)].

---

(١) کە ئازادکراوی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بوو ﷺ.

(٢) بڕوانە: ٦٤٩٧.

## ١٣- باسێک: ئەگەر (مسوڵمان) لە ناو خەڵکانێکی بێ کەڵکدا مایەوە

٧٠٨٦- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو فەرمایشتی فەرموو بۆمان، یەکێکیانم دی (هاتەدی)، وە من چاوەڕوانی ئەوی کەشیان[١] دەکەم، فەرمووی پێمان: ((بێگومان سەرەتا ڕاسپاردە[٢]، دابەزیە ناخ و دڵی پیاو (چاکانەوە)، ئینجا قورئان (دابەزی و) فێری بوون پاشان لە سوننەتیش فێر بوون))، پاشان دەربارەی نەمانی سپاردە بۆمان دوا و فەرمووی: ((پیاو سەرخەوێك دەشكێنێت ئەوسا سپاردە لە دڵی دەردەهێنرێت، ئینجا شوێنەكەی وەك شوێنی خاڵێكی بچووك دەمێنێتەوە (لە دڵیدا)، پاشان سەرخەوێكی تر دەشكێێت، ئیتر سپاردە (لە دڵیدا دەردەهێنرێت، ئینجا شوێنەكەی وەك شوێنی تلۆقێكی لێ دێت، وەك پشكۆیەك خلۆریكەیتەوە بەسەر قاچتدا و تلۆق بكات، جا دەیبینی هەڵاوساوە و هیچیشی تێدا نییە، ئینجا خەڵكی كڕین و فرۆشتن دەكەن، جا وای لێ دێت كەس نەبێت سپاردە بەجێ بێنێ (و بیپارێزێت)، ئەوسا دەوترێت: لە نەوەی فلانە كەسدا پیاوێكی سپاردەپارێز هەیە، (وای لێ دێت) بە پیاوێك دەوترێت: ئای چەند ژیرە ئای چەند ناسك ونازدارە ئای چەند ئازایە، كەچی بە ئەندازەی دەنكە خەرتەلەیەك باوەڕ لە دڵیدا نییە))، (حوزەیفە دەڵێ): سوێند بەخوا ڕۆژگارێكم بەسەردا تێپەڕی لام گرنگ نەبوو كڕین و فرۆشتنم لەگەڵ هەركامتان بكردایە، چونكە ئەگەر مسوڵمان بوایە ئیسلام ڕێگری لێ دەكرد (گزی و ناپاكیم لێ بكات)، وە ئەگەر گاوور بوایە سەركارەكەی سەری ڕێگری لێ دەكرد (گزیم لێ بكات)، بەڵام ئەمڕۆ من كڕین و فرۆشتن ناكەم لەگەڵ فلان كەس و فلانە كەسدا نەبێت.

---

(١) كە نەمانی ئەمانەتە.

(٢) ئەمانەت.

## ١٤- بَابُ التَّعَرُّبِ فِي الفِتْنَةِ

٧٠٨٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا حَاتِمٌ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى الحَجَّاجِ فَقَالَ: يَا ابْنَ الأَكْوَعِ، ارْتَدَدْتَ عَلَى عَقِبَيْكَ، تَعَرَّبْتَ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَذِنَ لِي فِي البَدْوِ. وَعَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: لَمَّا قُتِلَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ خَرَجَ سَلَمَةُ بْنُ الأَكْوَعِ إِلَى الرَّبَذَةِ، وَتَزَوَّجَ هُنَاكَ امْرَأَةً وَوَلَدَتْ لَهُ أَوْلاَدًا، فَلَمْ يَزَلْ بِهَا حَتَّى قَبْلَ أَنْ يَمُوتَ بِلَيَالٍ، فَنَزَلَ المَدِينَةَ.

## ١٤- باسی خۆکردن بە عەرەبی دەشتەکی[1] لە کاتی ئاشووب و ئاژاوەدا

**٧٠٨٧-یەزیدی کوڕی ئەبی عوبەید لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە ؓ دەگێڕێتەوە کەچوویە لای حەججاج، جا (حەججاج) وتی: پاشە و پاشی خۆت هەلگەڕایتەوە خۆت کردۆتەوە بە عەرەبی کۆچەری؟ (سەلەمە) وتی: نەخێر، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دام لە بیاباندا نیشتەجێ بم، وە یەزیدی کوڕی ئەبی عوبەیدەوە دەڵێ: کاتێ عوسمانی کوڕی عەففان کوژرا، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع لە مەدینە چوویە دەرەوە بۆ ڕەبزە، وە لەوێ ئافرەتێکی مارە کرد و چەند منداڵی لێ بوو، جا بەردەوام هەر لەوێ بوو هەتا چەند شەوێك پێش ئەوەی کە بمرێت ئیتر هات و لە مەدینە دانیشت (تا مردنی).**

٧٠٨٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ؓ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ المُسْلِمِ غَنَمٌ، يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الجِبَالِ وَمَوَاقِعَ القَطْرِ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الفِتَنِ»[2].

---

(١) یان بەزۆر خۆی وەک عەرەبی بیابان نیشین لێکرد.

(٢) بڕوانە: ١٩.

**٧٠٨٨- عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی صەعصەعە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نزیکە کە چاکترین ماڵ و سەروەتی مسوڵمان مێگەلێك بێت، بیانداتە بەر بۆ لووتکەی چیاکان و ئەو شوێنانەی بارانی لێ دەبارێ (کە دۆڵەکانە)، بەهۆی ئایینەکەیەوە هەڵدێ و دوور دەکەوێتەوە لە بەڵا و فیتنە (نەوەك تووشی ببێت) )).**

## ١٥- بابُ التَّعَوُّذِ مِنَ الفِتَنِ

٧٠٨٩- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: سَأَلُوا النَّبِيَّ ﷺ حَتَّى أَحْفَوْهُ بِالْمَسْأَلَةِ، فَصَعِدَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ الْمِنْبَرَ فَقَالَ: «لاَ تَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ بَيَّنْتُ لَكُمْ». فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ يَمِينًا وَشِمَالاً فَإِذَا كُلُّ رَجُلٍ رَأْسُهُ فِي ثَوْبِهِ يَبْكِي، فَأَنْشَأَ رَجُلٌ كَانَ إِذَا لاَحَى يُدْعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، مَنْ أَبِي؟ فَقَالَ: «أَبُوكَ حُذَافَةُ». ثُمَّ أَنْشَأَ عُمَرُ فَقَالَ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ سُوءِ الْفِتَنِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا رَأَيْتُ فِي الْخَيْرِ وَالشَّرِّ كَالْيَوْمِ قَطُّ، إِنَّهُ صُوِّرَتْ لِي الجَنَّةُ وَالنَّارُ حَتَّى رَأَيْتُهُمَا دُونَ الْحَائِطِ». قَالَ قَتَادَةُ: يُذْكَرُ هَذَا الْحَدِيثُ عِنْدَ هَذِهِ الآيَةِ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ ﴿١٠١﴾ ﴾ المائدة[1].

## ١٥- باسی پەناگرتن بە خوا لە ئاشووب

**٧٠٨٩- قەتادە لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: (هاوەڵانی) پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد هەتا ڕۆچوون لە پرسیارکردندا لێی، بۆیە ڕۆژێکیان**

(١) بروانە: ٩٣.

پێغەمبەر ﷺ چوویە سەر دوانگەكە و فەرمووی: ((پرسیاری هەر شتێكم لێ بكەن ڕوونی دەكەمەوە بۆتان))، منیش دەستم كرد بە ڕوانین بەڕاست و چەپدا، جا بینیم هەر كەسە و سەری لە ناو پۆشاكەكەی دایە و دەگری، ئینجا پیاوێك كە دەمەقاڵێی دەبوو لەگەڵ كەسانی تردا پێیان دەوت زۆڵ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا كێ باوكمە؟ فەرمووی: ((باوكت حوزافەیە))، جا عومەر ﷺ هەستا وتی: ئێمە ڕازی بووین خوا پەروەردگارمان بێت و ئیسلام ئاینمان بێت وموحەممەد ﷺ پێغەمبەرمان بێت، پەنا دەگرین بە خوا لە ئاشووب بەڵای خراپ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوەی ئەمڕۆم بینیم لە چاكە و خراپەدا هەرگیز شێوەیم نەدیوە، بێگومان وێنەی بەهەشت و دۆزەخم نیشاندرا (بەجۆرێ) هەردووكیانم لە پشت ئەو دیوارەوە[1] بینی))، قەتادە دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لە كاتی خوێندنەوەی ئەم ئایەتەدا باس دەكرا (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە پرسیار مەكەن لە شتانێك ئەگەر ئاشكرا بكرێن بۆتان، ناخۆش و خراپ دەبێت بۆتان).

٧٠٩٠ - وَقَالَ عَبَّاسٌ النَّرْسِيُّ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ. بِهَذَا، وَقَالَ كُلُّ رَجُلٍ لاَفًّا رَأْسَهُ فِي ثَوْبِهِ يَبْكِي. وَقَالَ: عَائِذًا بِاللَّهِ مِنْ سُوءِ الْفِتَنِ. أَوْ قَالَ أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ سُوءِ الْفِتَنِ[2].

٧٠٩٠-عەبباسی نەرسیی دەڵێ: یەزیدی كوڕی زورەیع بۆی گێڕاینەوە وتی: سەعید بۆی گێڕاینەوە وتی: قەتادە بۆی گێڕاینەوە كە ئەنەس ﷺ ئەو فەرموودەی پێشووی بۆ گێڕاینەوە وتی: هەر پیاوێكیان سەری كردبوو بەناو جل و پۆشاكەكەیدا و دەگریا، وە هەر پیاوێكیان قسەی دەكرد پەنای دەگرت

(١) دیواری میحرابەكەی لە مزگەوتدا.
(٢) بڕوانە: ٩٣.

**بەخوا لە خراپە ئاشووب و فیتنە، یان دەیوت: پەنا دەگرم بەخوا لە خراپەی ئاژەوە و فیتنە.**

٧٠٩١ - وَقَالَ لِي خَلِيفَةُ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ وَمُعْتَمِرٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ قَتَادَةَ أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَذَا، وَقَالَ عَائِذًا بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ الْفِتَنِ[١].

**٧٠٩١-وە خەلیفە پێ وتم: یەزیدی كوڕی زورەیع بۆی گێڕاینەوە وتی: سەعید و موعتەمیر بۆیان گێڕاینەوە لە باوكی (ی موعتەمیرە)، وە ئەویش لە قەتادەوە گێڕایەوە كە ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەو فەرموودە پێشووی بۆ گێڕانەوە، وە فەرمووی: ئەو پەنای گرتووە بە خوا لە خراپی ئاژاوە و فیتنە.**

## ١٦- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «الفِتْنَةُ مِنْ قِبَلِ المَشْرِقِ»

٧٠٩٢- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَامَ إِلَى جَنْبِ المِنْبَرِ فَقَالَ: «الْفِتْنَةُ هَا هُنَا، الْفِتْنَةُ هَا هُنَا، مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ». أَوْ قَالَ: «قَرْنُ الشَّمْسِ»[٢].

## ١٦- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((ئاشووب لە لای ڕۆژهەڵاتەوە دەبێت)) [٣]

**٧٠٩٢- سالیم لە باوكیەوە (كە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرە) ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ لە تەنشت**

(١) بڕوانە: ٩٣.

(٢) بڕوانە: ٣١٠٤.

(٣) واتە: لە ڕۆژهەڵاتەوە ئاشووب سەرهەڵدەدات و پەیدا دەبێت.

**دوانگەکەدا وەستا و فەرمووی: ((ئاژاوە ئا لەوێوە دێت، ئاژاوە ئا لەوێوە دێت، لەو جێگاوەی شاخی شەیتان هەڵدێت و بەدەر دەکەوێت[1])). یان فەرمووی: ((تیشکی خۆر هەڵدێت و بە دەردەکەوێت)).**

٧٠٩٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ مُسْتَقْبِلٌ المَشْرِقَ يَقُولُ: «أَلاَ إِنَّ الفِتْنَةَ هَا هُنَا مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ»[2].

**٧٠٩٣- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست لە کاتێکدا ڕووی لە ڕۆژهەڵات بوو دەیفەرموو: ((ئاگاداربن ئاژاوە ئا لەوێوە دێت (ئاماژەی بۆ ڕۆژهەڵات دەکرد)، لەو شوێنەوە شاخی شەیتان دەردەکەوێت و سەردەردێنێت)).**

٧٠٩٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا أَزْهَرُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَأْمِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا». قَالُوا وَفِي نَجْدِنَا. قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَأْمِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَفِي نَجْدِنَا فَأَظُنُّهُ قَالَ فِي الثَّالِثَةَ: «هُنَاكَ الزَّلاَزِلُ وَالْفِتَنُ، وَبِهَا يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ»[3].

**٧٠٩٤- نافیع لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوایە پیت و فەڕمان بۆ بخەیتە شاممانەوە، خوایە پیت و فەڕمان بۆ بخەیتە یەمەنمانەوە))، هاوەڵان وتیان: پیت و فەڕ بخەیتە نەجدیشمانەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرموو: ((خوایە پیت و فەڕمان بۆ بخەیتە**

---

(١) بۆیە وای فەرمووە چونکە سەر و شاخی شەیتان لەگەڵ خۆردا پێکەوە بەدەر دەکەون.

(٢) بڕوانە: ٣١٠٤.

(٣) بڕوانە: ١٠٣٧.

**شاممانەوە، خوایە پیت و فەڕمان بۆ بخەیتە یەمەنمانەوە))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا پیت و فەڕ بخەیتە نەجدیشمانەوە، عەبدوڵلا دەڵێ: وا گومان دەبەم لە سێیەم جاردا فەرمووی: ((لەوێدا بوومەلەزە و ئاژاوەکان پەیدا دەبن، هەر لەوێشەوە شەیتان شاخی دەردێنێ))** [1].

٧٠٩٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الوَاسِطِيُّ، حَدَّثَنَا خَلِفٌ، عَنْ بَيَانٍ، عَنْ وَبَرَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، فَرَجَوْنَا أَنْ يُحَدِّثَنَا حَدِيثًا حَسَنًا. قَالَ: فَبَادَرَنَا إِلَيْهِ رَجُلٌ فَقَالَ:يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ،حَدِّثْنَا عَنِ القِتَالِ فِي الفِتْنَةِ وَاللَّهُ يَقُولُ ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ ﴿١٩٣﴾ ﴾ البقرة. فَقَالَ: هَلْ تَدْرِي مَا الْفِتْنَةُ ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ إِنَّمَا كَانَ مُحَمَّدٌ ﷺ يُقَاتِلُ الْمُشْرِكِينَ، وَكَانَ الدُّخُولُ فِي دِينِهِمْ فِتْنَةً، وَلَيْسَ كَقِتَالِكُمْ عَلَى الْمُلْكِ[2].

**٧٠٩٥- سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ هات بۆ لامان، ئێمەش بەتەمابووین کە فەرموودەیەکی چاکمان بۆ بگێڕێتەوە، دەڵێ: جا پیاوێك پێش دەستی کرد لە ئێمە و چوویە لای و وتی: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان، باسی جەنگ کردنمان بۆ بکە لە ئاشووب و ئاژاوەدا، وە خواش دەفەرموێ: (جەنگیان لەگەڵ بکەن تا دوژمنایەتی ئاینی نەمێنێ)، (عەبدوڵلای کوڕی عومەر) وتی: تۆ دەزانی فیتنە چییە؟ دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات؟ بێگومان موحەممەد ﷺ لە دژی هاوبەش دانەران دەجەنگا، وە لەو کاتەدا چوونە ناو ئایینەکەیان فیتنە بوو، نەك وەك جەنگ کردنی ئێوە کە بۆ (بەدەست هێنانی) دەسەڵات و پاشایەتییە.**

---

(١) قابیسی دەڵێ: ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ وشەی پێغەمبەر نەنووسراوە لە دەست نووسەکاندا و لە بیرکراوە، ئەگینا هەیە. بڕوانە: (فتح الباري:٣/٦٦٣).

(٢) بڕوانە: ٣١٣٠.

## ١٧- بابُ الفِتْنَةِ التِي تَمُوجُ كَمَوْجِ البَحْرِ

وَقَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ خَلَفِ بْنِ حَوْشَبٍ: كَانُوا يَسْتَحِبُّونَ أَنْ يَتَمَثَّلُوا بِهَذِهِ الأَبْيَاتِ عِنْدَ الفِتَنِ

الْحَرْبُ أَوَّلُ مَا تَكُونُ فَتِيَّةً ... تَسْعَى بِزِينَتِهَا لِكُلِّ جَهُولِ

حَتَّى إِذَا اشْتَعَلَتْ وَشَبَّ ضِرَامُهَا...وَلَّتْ عَجُوزًا غَيْرَ ذَاتِ حَلِيل

شَمْطَاءَ يُنْكَرُ لَوْنُهَا وَتَغَيَّرَتْ ... مَكْرُوهَةً لِلشَّمِّ وَالتَّقْبِيلِ

## ١٧- باسی ئەو ئاشووب و فیتنەی کە وەک شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدات

**-ئیبنو عویەینە دەڵێ: خەلەف کوڕی حەوشەب گێڕایەوە وتی: (پێشینە چاکەکان) لە کاتی ئاژاوە و ئاشووبدا پێیان خۆش بوو ئەم چەند هۆنراوەیە بکەنە نموونە، وە بیڵێن: (ئوممو ئوقەیس دەڵێ:)**

**جەنگ سەرەتا کە دروست دەبێ وەك کچێکی لاوی جوانە**

**(جەنگ) هەوڵدەدات بە جوانیەکەی خۆی هەموو نەزانێ (بخەڵەتێنێ)**

**تا کاتێ هەڵگیرسا و گڕەکەی بەرز بوویەوە**

**کە پشت هەڵدەکات وەکو پیرەژنی وایە کەس حەز ناکات مارەی کات**

**سەر و قژی بۆز بوو بێت ڕەنگیشی گۆڕا بێت و نەناسرێتەوە**

**حەز لە بۆنی و ماچی نەکرێت**

٧٠٩٦- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا شَقِيقٌ، سَمِعْتُ حُذَيْفَةَ يَقُولُ: بَيْنَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ عُمَرَ إِذْ قَالَ: أَيُّكُمْ يَحْفَظُ قَوْلَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الفِتْنَةِ؟ قَالَ: «فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ تُكَفِّرُهَا الصَّلاَةُ وَالصَّدَقَةُ وَالأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ المُنْكَرِ». قَالَ: لَيْسَ عَنْ هَذَا أَسْأَلُكَ، وَلَكِنِ التِي تَمُوجُ كَمَوْجِ الْبَحْرِ.

قَالَ: لَيْسَ عَلَيْكَ مِنْهَا بَأْسٌ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا. قَالَ عُمَرُ: أَيُكْسَرُ الْبَابُ أَمْ يُفْتَحُ؟ قَالَ: بَلْ يُكْسَر. قَالَ عُمَرُ: إِذًا لاَ يُغْلَقَ أَبَدًا. قُلْتُ: أَجَلْ. قُلْنَا لِحُذَيْفَةَ: أَكَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ الْبَابَ؟ قَالَ: نَعَمْ كَمَا أَعْلَمُ أَنَّ دُونَ غَدٍ لَيْلَةً، وَذَلِكَ أَنِّي حَدَّثْتُهُ حَدِيثًا لَيْسَ بِالأَغَالِيطِ. فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَهُ مَنِ البَابُ، فَأَمَرْنَا مَسْرُوقًا فَسَأَلَهُ فَقَالَ مَنِ الْبَابُ؟ قَالَ: عُمَرُ[1].

**٧٠٩٦- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: لە لای عومەردا ﷺ دانیشتبووین کاتێ وتی: کامتان دەربارەی ئاژاوە و بەڵا فەرموودەی پێغەمبەری خوای ﷺ لەبەرە؟ حوزەیفە وتی: ((بەڵا و ئاشووب کە تووشی کەسێك دەبێ بەهۆی کەس و کار و ماڵ و منداڵ و دراوسێیەوە، نوێژ و ماڵ بەخشین و فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە دەیسڕێتەوە))، عومەر وتی: لە بارەی ئەوەوە پرسیارت لێ ناکەم، بەڵکو پرسیاری ئەوەت لێ دەکەم کە وەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدات، حوزەیفە وتی: ئەو ئاژاوەیە هیچ زیانێکی بۆ تۆ نابێ ئەی گەورەی ئیمانداران، بەڕاستی لە نێوان تۆ و ئەو ئاژاوەدا دەرگایەکی داخراو هەیە، عومەر وتی: ئایا ئەو دەرگا دەشکێنرێ یا دەکرێتەوە؟ حوزەیفە وتی: دەشکێنرێ، عومەر وتی: کەواتە هەتا هەتایە داناخرێتەوە، وتم: بەڵێ وایە، (شەقیق) دەڵێ وتمان بە حوزەیفە: ئایا عومەر دەیزانی ئەو دەرگا چییە؟ وتی: بەڵێ دەیزانی وەك چۆن دەزانم ئەم شەو پێش سبەینێیە، بێگومان من فەرموودەیەکم بۆ گێڕایەوە هیچ غەڵەت و تێکەڵ و پێکەڵیەکی تێدا نییە. (شەقیق دەڵێ:) جا ترساین پرسیار لە حوزەیفە بکەین دەرگاکە کێیە، بۆیە بەمەسروقمان وت، ئیتر ئەو پرسیاری لێ کرد و وتی: دەرگاکە کێیە؟ وتی: عومەرە.**

---

(١) بڕوانە: ٥٢٥.

٧٠٩٧- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى حَائِطٍ مِنْ حَوَائِطِ الْمَدِينَةِ لِحَاجَتِهِ، وَخَرَجْتُ فِي إِثْرِهِ، فَلَمَّا دَخَلَ الحَائِطَ جَلَسْتُ عَلَى بَابِهِ وَقُلْتُ: لأَكُونَنَّ اليَوْمَ بَوَّابَ النَّبِيِّ ﷺ، وَلَمْ يَأْمُرْنِي فَذَهَبَ النَّبِيُّ ﷺ وَقَضَى حَاجَتَهُ، وَجَلَسَ عَلَى قُفِّ الْبِئْرِ، فَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ وَدَلاَّهُمَا فِي البِئْرِ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ عَلَيْهِ لِيَدْخُلَ، فَقُلْتُ: كَمَا أَنْتَ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ لَكَ فَوَقَفَ فَجِئْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺفَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ عَلَيْكَ. قَالَ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ». فَدَخَلَ فَجَاءَ عَنْ يَمِينِ النَّبِيِّ ﷺ فَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ وَدَلاَّهُمَا فِي الْبِئْرِ، فَجَاءَ عُمَرُ فَقُلْتُ: كَمَا أَنْتَ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ لَكَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ». فَجَاءَ عَنْ يَسَارِ النَّبِيِّ ﷺ فَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ فَدَلاَّهُمَا فِي البِئْرِ، فَامْتَلأَ الْقُفُّ فَلَمْ يَكُنْ فِيهِ مَجْلِسٌ، ثُمَّ جَاءَ عُثْمَانُ فَقُلْتُ: كَمَا أَنْتَ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ لَكَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ، مَعَهَا بَلاَءٌ يُصِيبُهُ». فَدَخَلَ فَلَمْ يَجِدْ مَعَهُمْ مَجْلِسًا، فَتَحَوَّلَ حَتَّى جَاءَ مُقَابِلَهُمْ عَلَى شَفَةِ الْبِئْرِ، فَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ ثُمَّ دَلاَّهُمَا فِي الْبِئْرِ. فَجَعَلْتُ أَتَمَنَّى أَخًا لِي وَأَدْعُو اللَّهَ أَنْ يَأْتِيَ. قَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: فَتَأَوَّلْتُ ذَلِكَ قُبُورَهُمْ، اجْتَمَعَتْ هَا هُنَا، وَانْفَرَدَ عُثْمَانُ[١].

**٧٠٩٧-سەعیدی كوڕی موسەییەب لە ئەبی مووسای ئەشعەریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ باخێك لە باخەكانی مەدینە بۆ پێویستی خۆی[٢]، منیش بە شوێنیدا ڕۆیشتم، ئینجا كە چوویە ناو باخەكە من لەبەر دەرگاكەیدا دانیشتم، وتم: من ئەمڕۆ دەبمە دەرگاوانی پێغەمبەر ﷺ كە خۆی فەرمانیشی پێ نەكردبووم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت و دەستی بەئاو گەیاند، وە لەسەر قەراغی بیرەكە[٣] دانیشت، جاهەردوو قاچی هەڵماڵی و شۆڕی كردنەوە بۆ ناو**

(١) بڕوانە: ٣٦٧٤.
(٢) دەست بە ئاو گەیاندن.
(٣) كە ناوی بیری ئەریس بوو.

بیرەکە، ئینجا ئەبو بەکر ﷺ هات مۆڵەتی خواست تا بڕواتە ژوورەوە بۆ لای، منیش وتم: چۆن وەستاوی هەروا لە شوێنی خۆت ڕاوەستە هەتا داوای مۆڵەتت بۆ دەکەم، ئەویش وەستا، منیش ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو بەکر مۆڵەت دەخوازێ بێت بۆ لات، فەرمووی: ((مۆڵەتی بدە و مژدەی بەهەشتیشی پێ بدە))، ئیتر هاتە ژوورەوە و لە لای ڕاستی پێغەمبەرەوە ﷺ دانیشت و هەردوو قاچی هەڵکرد و شۆڕی کردنەوە بۆناو بیرەکە، ئینجا عومەر ﷺ هات، منیش وتم: چۆن وەستاوی هەروا لە شوێنی خۆت ڕاوەستە، هەتا داوای مۆڵەتت بۆ دەکەم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مۆڵەتی بدەو مژدەی بەهەشتیشی پێ بدە))، ئیتر ئەویش هات لای چەپی پێغەمبەر ﷺ (دانیشت) ئەویش هەردوو قاچی هەڵکردو شۆڕی کردنەوە بۆ ناو بیرەکە. ئیتر قەراغی بیرەکە پڕ بوو شوێنی دانیشتنی نەما، لە پاشان عوسمان هات وتم: لە شوێنی خۆت ڕاوەستە چۆن وەستا و هەتا مۆڵەتت بۆ وەردەگرم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((مۆڵەتی بدە و مژدەی بەهەشتی پێ بدە، لەگەڵیشیدا بەڵایەکی توش دەبێت))، جا هاتە ژووەروە لە لای ئەواندا شوێنی دانیشتنی نەمابوو، بۆیە شوێنەکەی گۆڕی و هەتا چوویە بەرانبەریان لەسەر قەراغی بییرەکە دانیشت و هەردوو قاچی هەڵکردوو شۆڕی کردنەوە بۆناو بیرەکە، ئینجا منیش ئاواتم بۆ براکەم خواست وە لە خوا دەپاڕامەوە کە بێت[١] ئیبنو لموسەییەب دەڵێ: من ئەوەم[٢] بە گۆڕەکانیان لێکدایەوە، کۆبوونەوەیان[٣] ئاوەها لێرەدا وە بەتەنها بوونی عوسمانیش.

---

(١) بۆ ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین، مەبەستی ئەبو بوردەی برایەتی یان ئەبو ڕەهم.

(٢) کۆبوونەوەی ئەبو بەکر و عومەر ﷺ لەگەڵیدا لە ڕاست و چەپیەوە بە جیا بوونی عوسمان لێیان.

(٣) پێغەمبەر ﷺ ئەبو بەکر و عومەر ﷺ.

٧٠٩٨- حَدَّثَنِي بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ قَالَ: قِيلَ لأُسَامَةَ: أَلاَ تُكَلِّمُ هَذَا؟ قَالَ: قَدْ كَلَّمْتُهُ مَا دُونَ أَنْ أَفْتَحَ بَابًا أَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يَفْتَحُهُ، وَمَا أَنَا بِالَّذِي أَقُولُ لِرَجُلٍ بَعْدَ أَنْ يَكُونَ أَمِيرًا عَلَى رَجُلَيْنِ: أَنْتَ خَيْرٌ. بَعْدَ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «يُجَاءُ بِرَجُلٍ فَيُطْرَحُ فِي النَّارِ، فَيَطْحَنُ فِيهَا كَطَحْنِ الحِمَارِ بِرَحَاهُ، فَيُطِيفُ بِهِ أَهْلُ النَّارِ فَيَقُولُونَ: أَيْ فُلاَنُ، أَلَسْتَ كُنْتَ تَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وتنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ؟ فَيَقُولُ: إِنِّي كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَلاَ أَفْعَلُهُ، وَأَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ وَأَفْعَلُهُ»[1].

**٧٠٩٨-ئەبو وائل دەڵێ: وترا بە ئوسامە ﷺ: ئەوە بۆ قسە لەگەڵ فلانە کەسدا[2] ناکەیت؟ (ئوسامەش) وتی: دڵنیابە قسەم لەگەڵدا کردوە، بە بێ ئەوەی دەرگایەك بکەمەوە من یەکەم کەس بم بیکەمەوە [3]، وە من ئەو کەسە نابم بەپیاوێك بڵێم تۆ چاکتری پاش ئەوەی دەبێتە ئەمیر بەسەر دوو کەسەوە، دوا ئەوەی لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: (( (لە قیامەتدا) پیاوێك دەهێنرێت و فڕێ دەدرێتە ئاگری دۆزەخەوە، ئینجا دەسوڕێتەوە تیایدا وەك سوڕانەوەی گوێدرێژ بەدەوری ئەو گەنمەی گێڕەی دەکات [4]، جا دۆزەخیەکان دەوری دەدەن و پێی دەڵێن: ئەی فلانە کەس ئایا تۆفەرمانت بەچاکە نەدەکرد و ڕێگریت لە خراپە نەدەکرد؟ ئەویش دەڵێ: (بەڵێ) من خۆم فەرمانم دەکرد بە چاکە و خۆم نەمدەکرد، وە ڕێگریم لە خراپە دەکرد و خۆم دەمکرد)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٢٦٧.

(٢) مەبەستی عوسمانی کوڕی عەففانە ﷺ.

(٣) مەبەستی دەرگای ئاشووب و ئاژاوەیە.

(٤) چەند گوێدرێژێک پێکەوە دەبەستن و گەنمێک کە دروێنە کراوە لە خەرماندا کۆکراوەتەوە، ئەو گوێدرێژانە بەسەریدا دەسوڕێننەوە تا دەیکوتن و گەنمەکە کا و پوشەکەی لە یەکتری جیا دەبێتەوە.

## ١٨- بابٌ

٧٠٩٩- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ الْهَيْثَمِ، حَدَّثَنَا عَوْفٌ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: لَقَدْ نَفَعَنِي اللَّهُ بِكَلِمَةٍ أَيَّامَ الْجَمَلِ، لَمَّا بَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ أَنَّ فَارِسًا مَلَّكُوا ابْنَةَ كِسْرَى قَالَ: «لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً»[١].

## ١٨- باسێک

**٧٠٩٩- ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: سوێند بەخوا بەدڵنیاییەوە بەوشەیەك کە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست خوا سوودی پێگەیاندم لە ڕۆژەکانی جەنگی جەمەلدا[٢]: کاتێك هەواڵی گەشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە خەڵکی فارس کچی کیسرایان کردۆتە پادشای خۆیان فەمووی: ((گەلێك کاروباری خۆیان بەئافرەتێك بسپێرن هەرگیز سەکەوتوو نابن)).**

٧١٠٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، بْنُ آدَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، حَدَّثَنَا أَبُو حَصِينٍ، حَدَّثَنَا أَبُو مَرْيَمَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زِيَادٍ الأَسَدِيُّ قَالَ: لَمَّا سَارَ طَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَعَائِشَةُ إِلَى البَصْرَةِ بَعَثَ عَلِيٌّ عَمَّارَ بْنَ يَاسِرٍ وَحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ، فَقَدِمَا عَلَيْنَا الْكُوفَةَ فَصَعِدَا الْمِنْبَرَ، فَكَانَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ فَوْقَ الْمِنْبَرِ فِي أَعْلاَهُ وَقَامَ عَمَّارٌ أَسْفَلَ مِنَ الحَسَنِ، فَاجْتَمَعْنَا إِلَيْهِ، فَسَمِعْتُ عَمَّارًا يَقُولُ: إِنَّ عَائِشَةَ قَدْ سَارَتْ إِلَى البَصْرَةِ، وَوَاللَّهِ إِنَّهَا لَزَوْجَةُ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَلَكِنَّ اللَّهَ ﷻ ابْتَلاَكُمْ لِيَعْلَمَ إِيَّاهُ تُطِيعُونَ أَمْ هِيَ[٣].

**٧١٠٠- ئەبو مەریەم کە عەبدوڵڵای کوڕی زیادی ئەسەدییە وتی: کاتێ تەڵحە و زوبەیر و عائیشە ﷺ ڕۆشتن بۆ بەصرە، عەلی ﷺ عەمماری کوڕی یاسیر و**

---

(١) بڕوانە: ٤٤٢٥.

(٢) کە لەشکرەکەی عائیشە ﷺ بو بە هاوڕێیەتی هەر یەک لە تەڵحە و زوبەیر ﷺ لە دژی لەشکری عەلی ﷺ.

(٣) بڕوانە: ٣٧٧٢.

**حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ نارد، ئینجا هاتن بۆ لامان لە کوفە، جا هەردووکیان ڕۆشتنە سەر دوانگەکە، ئینجا حەسەنی کوڕی عەلی ڕۆشتە سەر بەشی سەرەوەی دوانگە، کە عەمماریش لە خوارتری حەسەنەوە وەستابوو، ئێمەش لە لایاندا کۆبووینەوە، جا گوێم لە عەممار بوو ﷺ دەیوت: بێگومان عائیشە ﷺ ڕۆشتووە بۆ بەصرە، وە سوێند بەخوا ئەو هاوسەری پێغەمبەرەکەتانە لە دونیا و دواڕۆژدا، بەڵام خوا ﷻ ئێوە تاقی دەکاتەوە تا دەرکەوێ گوێڕایەڵی ئەو (خوا) دەکەن یان عائیشە.**

## ١٩- بابٌ

٧١٠١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي غَنِيَّةَ عَنِ الحَكَمِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ: قَامَ عَمَّارٌ عَلَى مِنْبَرِ الكُوفَةِ، فَذَكَرَ عَائِشَةَ وَذَكَرَ مَسِيرَهَا وَقَالَ: إِنَّهَا زَوْجَةُ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَلَكِنَّهَا مِمَّا ابْتُلِيتُمْ(١).

## ١٩- باسێک

**٧١٠١-ئەبو وائیل دەڵێ: عەممار لەسەر دوانگەی (مزگەوتی) کوفە وەستا و باسی عائیشەی ﷺ کرد و باسی ڕۆشتنەکەی کرد (بۆ بەصرە)، وە وتی: بێگومان عائیشە ﷺ خێزانی پێغەمبەرەکەتانە لە دونیا و قیامەتدا بەڵام ئەو (عائیشە) لەو شتانەیە کە تاقی کراونەتەوە پێی.**

٧١٠٢- ٧١٠٣- ٧١٠٤- حَدَّثَنَا بَدَلُ بْنُ المُحَبَّرِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنِي عَمْرٌو سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ يَقُولُ: دَخَلَ أَبُو مُوسَى وَأَبُو مَسْعُودٍ عَلَى عَمَّارٍ، حَيْثُ بَعَثَهُ عَلِيٌّ إِلَى أَهْلِ الْكُوفَةِ

---

(١) بڕوانە: ٣٧٧٢.

يَسْتَنْفِرُهُمْ. فَقَالاَ: مَا رَأَيْنَاكَ أَتَيْتَ أَمْرًا أَكْرَهَ عِنْدَنَا مِنْ إِسْرَاعِكَ فِي هَذَا الأَمْرِ مُنْذُ أَسْلَمْتَ. فَقَالَ عَمَّارٌ: مَا رَأَيْتُ مِنْكُمَا مُنْذُ أَسْلَمْتُمَا أَمْرًا أَكْرَهَ عِنْدِي مِنْ إِبْطَائِكُمَا عَنْ هَذَا الأَمْرِ. وَكَسَاهُمَا حُلَّةً حُلَّةً، ثُمَّ رَاحُوا إِلَى المَسْجِدِ[١].

**٧١٠٢- ٧١٠٣- ٧١٠٤- عەمر دەڵێ: لە ئەبی وائیلم بیست دەیوت: ئەبو مووسا و ئەبو مەسعوود ﷺ چوون بۆ لای عەممار ﷺ، کاتێ عەلی عەمماری ناردبوو بۆ لای خەڵکی کوفە داوای دەرچوونی لێ دەکردن (لەگەڵ عەلی بۆ بەصرە دژی عائیشە)، ئینجا هەردووکیان[٢] وتیان: ئێمە تۆمان نەدیوە لەو ڕۆژەوەی مسوڵمان بوویت کارێکت کردبێ ناپەسەندتربێت بەلای ئێمەوە لە پەلەکردنت لەم کارەدا؟ عەممماریش وتی: منیش لەو ڕۆژەوەی هەردووکتان مسوڵمان بوون کارێکم لە هەردووکتان نەدیوە ناپەسەندتربێت بەلامەوە لە سستی کردنتان لەم کارەدا، وە (ئەبو مەسعوود)[٣] هەریەکەیان پۆشاکێکی پێدان بیپۆشن لە پاشان هەموویان ڕۆشتن بۆ مزگەوت.**

٧١٠٥- ٧١٠٦- ٧١٠٧- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ أَبِي مَسْعُودٍ وَأَبِي مُوسَى وَعَمَّارٍ، فَقَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: مَا مِنْ أَصْحَابِكَ أَحَدٌ إِلاَّ لَوْ شِئْتُ لَقُلْتُ فِيهِ غَيْرَكَ، وَمَا رَأَيْتُ مِنْكَ شَيْئًا مُنْذُ صَحِبْتَ النَّبِيَّ ﷺ أَعْيَبَ عِنْدِي مِنِ اسْتِسْرَاعِكَ فِي هَذَا الأَمْرِ. قَالَ عَمَّارٌ: يَا أَبَا مَسْعُودٍ، وَمَا رَأَيْتُ مِنْكَ وَلاَ مِنْ صَاحِبِكَ هَذَا شَيْئًا مُنْذُ صَحِبْتُمَا النَّبِيَّ ﷺ أَعْيَبَ عِنْدِي مِنْ إِبْطَائِكُمَا فِي هَذَا الأَمْرِ. فَقَالَ أَبُو مَسْعُودٍ -وَكَانَ مُوسِرًا- يَا غُلاَمُ هَاتِ حُلَّتَيْنِ. فَأَعْطَى إِحْدَاهُمَا أَبَا مُوسَى وَالأُخْرَى عَمَّارًا وَقَالَ رُوحَا فِيهِ إِلَى الجُمُعَةِ[٤].

---

(١) بڕوانە: ٧١٠٥، ٧١٠٦، ٧١٠٧.

(٢) ئەبو مووسا و ئەبو مەسعوود ﷺ.

(٣) وەک لە فەرموودە دواتردا دەردەکەوێ.

(٤) بڕوانە: ٧١٠٢، ٧١٠٣، ٧١٠٤.

٧١٠٥- ٧١٠٦- ٧١٠٧- شەقیق كوڕی سەلەمە دەڵێ: من لەگەڵ ئەبی مەسعوود و ئەبی موسا و عەممار‌دا ﷺ دانیشتبووم، ئینجا ئەبو مەسعوود ﷺ وتی: (بەعەممار) هیچ كەس نییە لە هاوەڵەكانت ئیللا ئەگەر بمەوێ لە بارەیەوە شتێك دەڵێم جگە لە تۆ، وە من لەو كاتەوەی تۆ بوویتە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێكم لێ نەدیوی بەلامەوە عەیبتربێت لە پەلەكردنت لەم كارەدا، عەماریش ﷺ وتی: ئەی ئەبو مەسعوود منیش لەو كاتەوەی تۆ و هاوڕێكەت بوونەتە هاوەڵی پێغەمەر ﷺ هیچ شتێكم لێتان نەدیوە عەیبتربێت بەلامەوە لە سستی كردنتان لەم كارەدا، ئینجا ئەبو مەسعود-كە دەوڵەمەندبوو -وتی: ئەی غولامەكە دوو پۆشاك بێنە یەكێكیان بدە بە ئەبو موسا و ئەوەی كەشیان بدە بە عەممار وتی: بەو بەرگ و پۆشاكەوە هەردووكتان بڕۆن بۆ نوێژی هەینی.

## ٢٠- بابٌ: إِذَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِقَوْمٍ عَذَابًا

٧١٠٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُثْمَانَ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِقَوْمٍ عَذَابًا أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ، ثُمَّ بُعِثُوا عَلَى أَعْمَالِهِمْ».

## ٢٠- باسێک: ئەگەر خوا سزای نارد بۆ کەسانێک

٧١٠٨-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر خوا سزا دابەزێنێ بۆ گەلێك، هەر كەسێكیان تیا بێت سزاكە تووشی دەبێت، لە پاشان لەسەر نیەتی كردەوەكانیان زیندوو دەكرێنەوە)).

## ٢١- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ: «إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ»

٧١٠٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ أَبُو مُوسَى -وَلَقِيتُهُ بِالْكُوفَةِ جَاءَ إِلَى ابْنِ شُبْرُمَةَ فَقَالَ: أَدْخِلْنِي عَلَى عِيسَى فَأَعِظَهُ. فَكَأَنَّ ابْنَ شُبْرُمَةَ خَافَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَفْعَلْ- قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَسَنُ قَالَ: لَمَّا سَارَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ رضي الله عنهما إِلَى مُعَاوِيَةَ بِالْكَتَائِبِ. قَالَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ لِمُعَاوِيَةَ: أَرَى كَتِيبَةً لاَ تُوَلِّي حَتَّى تُدْبِرَ أُخْرَاهَا. قَالَ مُعَاوِيَةُ: مَنْ لِذَرَارِيِّ الْمُسْلِمِينَ؟. فَقَالَ. أَنَا. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَامِرٍ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ: نَلْقَاهُ فَنَقُولُ لَهُ: الصُّلْحَ. قَالَ الحَسَنُ: وَلَقَدْ سَمِعْتُ أَبَا بَكْرَةَ قَالَ: بَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ جَاءَ الْحَسَنُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ»[١].

## ٢١- باسی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بەحەسەنی کوڕی عەلی: ((بێگومان ئەم کوڕەی من گەورەیە، وە لەوانەیە خوا بەو ڕێک کەوتن و ئاشتەوایی بکات لە نێوان دوو کۆمەڵ لە مسوڵمانان))

**٧١٠٩-سوفیان دەڵێ: ئیسرائیل کە ئەبو موسایە[٢] -کە لە کوفە پێی گەیشتم- بۆی گێڕاینەوە هاتبوو بۆ لای ئیبنو شوبرومە و وتی: بمبەرە ژوورەوە بۆلای عیسا[٣] با ئامۆژگاری بکەم، جا وەك ئەوەی ئیبنو شوبرومە ترسی لێ هەبێ[٤] کارەکەی نەکردبوو، (ئیسرائیل) وتی: حەسەن[٥] بۆی گێڕاینەوە وتی: کاتێ حەسەنی**

(١) بڕوانە: ٢٧٠٤.

(٢) ناوی ئەبو مووسای بەصرییە.

(٣) عیسا کوڕی مووسا برازای مەنصوور، کە لەو کاتە ئەمیری کووفە بوو.

(٤) تووشی بەڵاو-گرفت ببێ.

(٥) حەسەنی بەصری.

**کوڕی عەلی ﷺ بە لەشکر و سوپاکەوە ڕۆشت بۆ (جەنگ لە دژی) موعاویە، عەمری کوڕی عاص بەموعاوییەی وت: وا دەزانم ئەو لەشکرە پشت هەڵناکات (ناشکێت) هەتا لە شکرەکەی تر[1] (کە دوژمنەکەیەتی) پشت هەڵە نەکات و نەشکێت، موعاویە ﷺ وتی: ئەی کێ سەرپەرەشتی ژن و منداڵی مسوڵمانان بکات[2]؟ (عومەر) وتی: من، ئینجا عەبدوڵلای کوڕی عامیر و عەبدوڕەحمانی کوڕی سەمورە وتیان: ئێمە (بە موعاویە) دەگەین و پێی دەڵێین: داوای ڕێك کەوتن دەکەین، حەسەنی (بەصری) دەڵێ: بێگومان من لە ئەبی بەکرەم ﷺ بیست وتی: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا حەسەن[3] هات پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەم کوڕەی من گەورە و سەییدە، لەوانەیە خوا بەهۆیەوە ئاشتەوایی و ڕێککەوتن بکات لە نێوان دوو کۆمەڵدا لە مسوڵمانان)).**

٧١١٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: قَالَ عَمْرٌو: أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيٍّ، أَنَّ -حَرْمَلَةَ مَوْلَى أُسَامَةَ أَخْبَرَهُ -قَالَ عَمْرٌو: وَقَدْ رَأَيْتُ حَرْمَلَةَ- قَالَ: أَرْسَلَنِي أُسَامَةُ إِلَى عَلِيٍّ وَقَالَ: إِنَّهُ سَيَسْأَلُكَ الآنَ فَيَقُولُ: مَا خَلَّفَ صَاحِبَكَ؟ فَقُلْ لَهُ: يَقُولُ لَكَ لَوْ كُنْتَ فِي شِدْقِ الأَسَدِ لأَحْبَبْتُ أَنْ أَكُونَ مَعَكَ فِيهِ، وَلَكِنَّ هَذَا أَمْرٌ لَمْ أَرَهُ. فَلَمْ يُعْطِنِي شَيْئًا، فَذَهَبْتُ إِلَى حَسَنٍ وَحُسَيْنٍ وَابْنِ جَعْفَرٍ فَأَوْقَرُوا لِي رَاحِلَتِي.

**٧١١٠-عەمر دەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەلی بۆی گێڕامەوە کە حەرمەلەی ئازادکراوی ئوسامە هەواڵی پێدا**

**-عەمر دەڵێ: بە دڵنیاییەوە حەرمەلەم دیت - وتی: ئوسامە ﷺ ناردمی بۆ لای عەلی ﷺ[4] وتی: پێگومان ئەو (عەلی) ئێستا پرسیارت لێدەکات و دەڵێ: چ**

(١) یان تا لەشکرێکی تری خۆیان دێن شوێنیان دەگرنەوە.

(٢) ئەگەر باوکیان بکوژرێت.

(٣) کچەزای کوڕی عەلی و فاتیمە ﷺ.

(٤) داوای یارمەتی و هاوکاری دارای لێکردبوو.

**شتێك هاوڕێکەتی وا لێکردوە جێ بێمنێ (لە هاوکاری من)[١]؟ تۆش پێی بڵێ: ئوسامە بێت دەڵێ: ئەگەر تۆ لە ناو دەمی شێردا بویتای دەڵنیابە پێم خۆش بوو لەوێدا لەگەڵتدا بم، بەڵام ئەمە کارێکە ڕام لێی نییە، (حەرمەلە دەڵێ: ڕۆشتم بۆ لای و پەیامەکەم پێگەیاند) بەڵام هیچی وەڵامێکی نەدامەوە (یان هیچی پێنەدام )، ئەوسا چووم بۆ لای حەسەن و حوسەین و عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ هەردوو وشترەکەمیان بۆ بارکردم لە کەل و پەل[٢].**

## ٢٢- بابٌ: إِذَا قَالَ عِنْدَ قَوْمٍ شَيْئًا ثُمَّ خَرَجَ فَقَالَ بِخِلَافِهِ

٧١١١- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: لَمَّا خَلَعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ يَزِيدَ بْنَ مُعَاوِيَةَ جَمَعَ ابْنُ عُمَرَ حَشَمَهُ وَوَلَدَهُ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يُنْصَبُ لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». وَإِنَّا قَدْ بَايَعْنَا هَذَا الرَّجُلَ عَلَى بَيْعِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِنِّي لاَ أَعْلَمُ غَدْرًا أَعْظَمَ مِنْ أَنْ يُبَايَعَ رَجُلٌ عَلَى بَيْعِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ، ثُمَّ يُنْصَبُ لَهُ الْقِتَالُ، وَإِنِّي لاَ أَعْلَمُ أَحَدًا مِنْكُمْ خَلَعَهُ وَلاَ بَايَعَ فِي هَذَا الأَمْرِ إِلاَّ كَانَتِ الْفَيْصَلَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ[٣].

## ٢٢- باسێک: ئەگەر کەسێک لای خەڵکانێک شتێک بڵێ، پاشان کە ڕۆشتە دەرەوە بە پێچەوانەی ئەوەی وتوویەتی قسە بکات و بڵێ

**٧١١١- نافیع دەڵێ:کاتێ خەڵکی مەدینە یەزیدی کوڕی موعاوییەیان (لە ئەمیری) لابرد، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ خزمەتکار و کوڕەکانی کۆکردەوە**

---

(١) بۆ نایەت لەگەڵ مندا بێت لەم تەنگانەیەدا.

(٢) هەتا وشترەکان بتوانن هەڵیگرن بۆیان بارکردم.

(٣) بڕوانە: ٣١٨٨.

**و وتی: من له پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووه دەیفەرموو: ((له ڕۆژی قیامەت بەیداغێك بۆ هەموو پەیمان شكێنەر و ناپاكێك هەڵدەدرێت))، وه بێگومان ئێمه پەیمانمان داوه بەو پیاوه[1] لەسەر پەیمانی خوا و پێغەمبەرەكەی[2]، وه من هیچ ناپاكیەك نازانم لەوه گەورەتربێت كەسێك لەسەر مەرجی خوا و پێغەمبەرەكەی پەیمان بەكەسێك بدات، له پاشان جەنگی له دژ بكات، وه من بەهەر كەسێكتان بزانم یەزیدی له ئەمیری لابردووه و بەیعەتی داوه (بەكەسێكی تر)، لەم كارەدا ئەو نێوانی من و ئەو كەسەتان بچڕان و لێكدابڕانه.**

٧١١٢- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا أَبُو شِهَابٍ، عَنْ عَوْفٍ، عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ قَالَ: لَمَّا كَانَ ابْنُ زِيَادٍ وَمَرْوَانُ بِالشَّأْمِ، وَوَثَبَ ابْنُ الزُّبَيْرِ بِمَكَّةَ، وَوَثَبَ القُرَّاءُ بِالْبَصْرَةِ، فَانْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي إِلَى أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ حَتَّى دَخَلْنَا عَلَيْهِ فِي دَارِهِ -وَهْوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ عُلِّيَّةٍ لَهُ مِنْ قَصَبٍ- فَجَلَسْنَا إِلَيْهِ، فَأَنْشَأَ أَبِي يَسْتَطْعِمُهُ الحَدِيثَ فَقَالَ: يَا أَبَا بَرْزَةَ، أَلاَ تَرَى مَا وَقَعَ فِيهِ النَّاسُ؟ فَأَوَّلُ شَيْءٍ سَمِعْتُهُ تَكَلَّمَ بِهِ: إِنِّي احْتَسَبْتُ عِنْدَ اللَّهِ أَنِّي أَصْبَحْتُ سَاخِطًا عَلَى أَحْيَاءِ قُرَيْشٍ، إِنَّكُمْ يَا مَعْشَرَ الْعَرَبِ كُنْتُمْ عَلَى الْحَالِ الذِي عَلِمْتُمْ مِنَ الذِّلَّةِ وَالْقِلَّةِ وَالضَّلاَلَةِ، وَإِنَّ اللَّهَ أَنْقَذَكُمْ بِالإِسْلاَمِ وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ حَتَّى بَلَغَ بِكُمْ مَا تَرَوْنَ، وَهَذِهِ الدُّنْيَا الَّتِي أَفْسَدَتْ بَيْنَكُمْ، إِنَّ ذَاكَ الذِي بِالشَّأْمِ وَاللَّهِ إِنْ يُقَاتِلُ إِلاَّ عَلَى الدُّنْيَاوإِنَّ هؤلاء الذين بين أظهرِكُم، واللهِ إن يُقاتلونَ إلاّ على الدُّنيا،وإنَّ ذاك الذي بمكةَواللهِ إن يُقاتلُ إلاّ على الدُّنيا[3].

**٧١١٢- عەوف له ئەبی مینهالەوه دەگێڕێتەوه دەڵێ: كاتێ ئیبنو زیاد و مەروان له شام بوون، ئیبنو زوبەیریش له مەككه دەستی گرت بەسەر مەككەدا، قورئان خوێنەكانیش دەستیان گرت بەسەر بەصرەدا (ئەبو مینهال دەڵێ): منیش**

---

(١) یەزیدی كوڕی موعاویه.

(٢) واته: لەسەر ئەو مەرجەی خوا و پێغەمبەرەكەی فەرمانیان پێ كردوه.

(٣) بڕوانه: ٧٢٧١.

**لەگەڵ باوکمدا چووین بۆ لای ئەبو بەرزەی ئەسلەمی هەتا لەماڵەکەی خۆیدا ڕۆشتینە لای – کە دانیشتبوو لە ژێر سێبەر هۆدەیەکی بەرزی خۆیدا کە لە قامیش بوو - ئێمەش لایدا دانیشتین، ئینجا باوکم دەستی کرد بەوەی بیهێنێتە قسە و وتی: ئەی ئەبو بەرزە، ئایا نابینی خەڵکی کەوتوونەتە چ حاڵێکەوە؟ جا یەکەم شتێك کە لێم بیست کە قسەی پێ کرد وتی: من چاوەڕوانی پاداشتم لای خوا (بەمەی) کە من توڕەم لە چەند تیرە و هۆزێکی قوڕەیش، بێگومان ئێوە ئەی کۆمەڵی عەرەب، ئێوە پێشتر ئەوە حاڵ و بارتان بوو لەسەر شۆڕی و کەم دەستی و گومڕاییدا بوون، وە خوا بەئیسلام و بەموحەممەد ﷺ ڕزگاری کردن هەتا گەیاندنیە ئەو پلەی کەدەیبینن[1] هەروەها ئەم (بەدەست هێنانی) دونیایەکە نێوانتانی تێك داوە، بێگومان ئەو کابرای لە شامە[2] سوێند بەخوا تەنها لەسەر دونیا دەجەنگێت[3]، وە[4] بێگومان ئائەوانەی لە ناو ئێوەدان (قورئان خوێنەکان) سوێند بەخوا تەنها لە پێناو دونیادا دەجەنگن، وە بەڕاستی ئەو کەسەش لە مەککەیە سوێند بەخوا تەنها لە پێناو دونیادا دەجەنگێ.**

٧١١٣- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ وَاصِلٍ الأَحْدَبِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ قَالَ: إِنَّ الْمُنَافِقِينَ الْيَوْمَ شَرٌّ مِنْهُمْ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، كَانُوا يَوْمَئِذٍ يُسِرُّونَ، وَالْيَوْمَ يَجْهَرُونَ.

**٧١١٣-ئەبو وائیل لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە ﵁ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بێگومان ناپاك و دووڕووەکانی ئەم ڕۆژگارمان خراپترن لە دوو ڕووەکانی سەردەم**

---

(١) لەسەر بەرزی و دەسەڵات و هیدایەت.

(٢) مەروانی کوڕی حەکەم.

(٣) واتە: مەبەستی ئیسلام نییە بەڵکو بۆ دەسەڵات و ماڵ و سامان دەجەنگێ.

(٤) لەوێوە (وإنَّ هؤلاء) تا (إن يُقاتلُ إلاّ على الدُّنيا) کە کۆتایی وتەکەی ئەبی بەرزەیە لە گێڕانەوە نەبی زەڕدا لە صەحیحی بوخاری هاتووە، بەڵام لە گێڕانەوەکانی تردا نەهاتووە. إرشاد الساري:٦٠/١٥.

**پێغەمبەر ﷺ، ئەوان لەو ڕۆژگارەدا (بێ باوەڕییەكەیان) دەشاردەوە بەڵام (ئەمانەی) ئەمڕۆ ئاشكرای دەكەن.**

٧١١٤- حَدَّثَنَا خَلاَّدٌ، حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: إِنَّمَا كَانَ النِّفَاقُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَإِنَّمَا هُوَ الكُفْرُ بَعْدَ الإِيمَانِ.

**٧١١٤- ئەبو شەعسا لە حوزەیفەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەڕاستی ناپاكی لەسەر دەمی پێغەمبەردا ﷺ بوو، بەڵام ئەمڕۆ بێگومان كافر بوونی پاش باوەڕ هێنانە.**

## ٢٣- بابٌ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُغْبَطَ أَهْلُ الْقُبُورِ

٧١١٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ»[1].

## ٢٣- باسێک: قیامەت هەڵناسێت هەتا (زیندوو) ئاوات بەخەڵكی گۆڕستان نەخوازێت

**٧١١٥-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((قیامەت هەڵناسێت هەتا كەسێك بەلای گۆڕی كەسێكدا دەڕوات و دەڵێ: خۆزگە من لە جێگای ئەو مردووە بوومایە)).**

(١) بڕوانە: ٨٥.

## ٢٤- بابُ تَغْيِيرِ الزَّمَانِ حَتَّى تُعْبَدَ الأَوْثَانَ

٧١١٦- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: قَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ أَخْبَرَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَضْطَرِبَ أَلْيَاتُ نِسَاءِ دَوْسٍ عَلَى ذِي الْخَلَصَةِ». وَذُو الْخَلَصَةَ طَاغِيَةُ دَوْسٍ التِي كَانُوا يَعْبُدُونَ فِي الجَاهِلِيَّةِ.

## ٢٤- باسی گۆران بەسەر ڕۆژگاردا دێت هەتا (خەڵک) بت و دار و بەرد دەپەرەستن[1]

**٧١١٦-سەعیدی کوڕی موسەییەب دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قیامەت بەرپا نابێت هەتا سمت وکلۆکی ژنانی دەوس نەلەرێتەوە (لە سوڕانەوەیاندا) بەدەوری زی لخەلصەدا))، زولخەلصە: بت و پەرەستراوێکی هۆزی دەوس بوو کە لە سەردەمی نەفامیدا دەیان پەرەست.**

٧١١٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ ثَوْرٍ، عَنْ أَبِي الغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ يَسُوقُ النَّاسَ بِعَصَاهُ»[2].

**٧١١٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ڕۆژی دوایی نایەت هەتا پیاوێکی قەحتانی پەیدا دەبێت بە گۆچانەکەی خەڵك دەداتە بەر[3])).**

---

(١) یان هەتا بت و دارو بەرد دەپەرسترێن.

(٢) بڕوانە: ٣٥١٧.

(٣) واتە: زاڵ دەبێت بەسەریاندا و حوکمیان دەکات.

## ٢٥- بابُ خُرُوجِ النَّارِ

وَقَالَ أَنَسٌ ﷺ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ نَارٌ تَحْشُرُ النَّاسَ مِنَ المَشْرِقِ إِلَى المَغْرِبِ»[١].

٧١١٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ سَعِيدُ بْنُ المُسَيَّبِ: أَخْبَرَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الْحِجَازِ تُضِيءُ أَعْنَاقَ الإِبِلِ بِبُصْرَى».

## ٢٥- باسی دەرچوونی ئاگر (لە وڵاتی حیجاز)

**-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((یەکەم نیشانەی (هەستانی) قیامەت ئاگرێکە هەموو خەڵکی لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆر ئاوا کۆدەکاتەوە)).**

**٧١١٨-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((قیامەت بەرپا نابێت هەتا ئاگرێك لە وڵاتی حیجازەوە دەرنەچێت، مل و گەردنی وشتر لە بوصرا ڕووناك نەکاتەوە)).**

٧١١٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ الكِنْدِيُّ، حَدَّثَنَا عُقْبَةُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ خُبَيْبِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ جَدِّهِ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَمَنْ حَضَرَهُ فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا».

قَالَ عُقْبَةُ: وَحَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: «يَحْسِرُ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ».

**٧١١٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هاکا فورات گەنجینەیەك لە ئاڵتوونی دەرخست، ئینجا هەرکەس ئامادەی بوو با هیچی**

---

(١) بڕوانە: ٣٣٢٩.

لێنەبات)). عوقبە دەڵێ: عوبەیدوڵلا بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەبو زیناد لە ئەعرەجەوە بۆی گێڕاینەوە ئەویش لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ، وێنەی فەرموودەكەی پێشووی گێڕایەوە جگە لەوەی كە فەرمووی: (چیایەكی ئاڵتوون دەردەخات)).

## ٢٦- بابٌ

٧١٢٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، حَدَّثَنَا مَعْبَدٌ، سَمِعْتُ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «تَصَدَّقُوا، فَسَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَمْشِي الرَّجُلُ بِصَدَقَتِهِ فَلاَ يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا». قَالَ مُسَدَّدٌ: حَارِثَةُ أَخُو عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ لأُمِّهِ.

## ٢٦- باسێك

٧١٢٠- حاریسەی كوڕی وەهەب ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ماڵ ببەخشن چونكە دڵنیابن ڕۆژگارێك بەسەر خەڵكدا دێت كەسێك زەكات و خێرەكەی دەبات كەسێكی دەست ناكەوێ زەكاتەكەی لێ وەربگرێ)). موسەددەد وتی: حاریسە لە دایكەوە برای دایكیی عوبەیدوڵلای كوڕی عومەرە.

٧١٢١- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ، يَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ، دَعْوَتُهُمَا وَاحِدَةٌ، وَحَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبٌ مِنْ ثَلاَثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ، وَحَتَّى يُقْبَضَ الْعِلْمُ، وَتَكْثُرَ الزَّلاَزِلُ، وَيَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، وَتَظْهَرَ الفِتَنُ وَيَكْثُرَ الْهَرْجُ وَهْوَ القَتْلُ، وَحَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ المَالُ فَيَفِيضَ حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ الْمَالِ مَنْ يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ، وَحَتَّى يَعْرِضَهُ فَيَقُولَ الَّذِي يَعْرِضُهُ عَلَيْهِ: لاَ أَرَبَ لِي بِهِ. وَحَتَّى يَتَطَاوَلَ النَّاسُ فِي

الْبُنْيَانِ، وَحَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ. وَحَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ وَرَآهَا النَّاسُ -يَعْنِي - آمَنُوا أَجْمَعُونَ، فَذَلِكَ حِينَ لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ نَشَرَ الرَّجُلاَنِ ثَوْبَهُمَا بَيْنَهُمَا فَلاَ يَتَبَايَعَانِهِ وَلاَ يَطْوِيَانِهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدِ انْصَرَفَ الرَّجُلُ بِلَبَنِ لِقْحَتِهِ فَلاَ يَطْعَمُهُ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَهْوَ يُلِيطُ حَوْضَهُ فَلاَ يَسْقِي فِيهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ رَفَعَ أُكْلَتَهُ إِلَى فِيهِ فَلاَ يَطْعَمُهَا»[١].

**٧١٢١-ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قیامەت بەرپا نابێت تا دوو كۆمەڵی گەورە جەنگ لە دژی یەكتری دەكەن، كوشتارێكی گەورە و زۆر لە نێوانیاندا دەبێت، هەردوو لایان یەك ئاینیان هەیە [٢]، وە هەتا سەرلێشێوێنەرانی درۆزن پەیدا دەبن، نزیكەی سی كەس دەبن، هەموویان بەدرۆ دەڵێن كە ئەو پێغەمبەرە، وە هەتا (وای لێ دێت) زانست هەڵدەگیرێ و نامێنێ، وە بومەلەرزە زۆر دەبێت، كات نزیك دەبێتەوە [٣] (خێرا دەڕوات) و ئاشووب و ئاژاوەی زۆر دەردەكەوێ و ڕوو دەدات و هەرەج زۆر دەبێت- كە بریتی یە لە كوشتن -، وە هەتا ماڵ و سامان لە ناوتاندا زۆر دەبێت و لەسەری دەڕژێ، هەتا خاوەن ماڵ و سامان لای گرنگە كەسێك هەبێت زەكاتەكەی لێ وەرگرێت، هەتا وای لێ دێ دەڵێ بەكەسێك زەكاتەكەمت پێ بدەم، ئەویش دەڵێ: پێویستم پێ نییە، هەتا (وای لێ دێت) خەڵكی لە دروست كردنی خانوو باڵەخانەی بەرزدا پێشبڕكێ دەكەن، هەتا كەسێك تێدەپەڕێ بەلای گۆڕی كەسێكدا دەڵێ كاشكای من لە شوێنی ئەو مردووەدا بوومایە، وەهەتا خۆر**

---

(١) بڕوانە: ٨٥.

(٢) هەردوو لایان یەک قسەو بانگەوازیان هەیە: كە دەڵێن ئێمە لەسەر هەقین بەرانبەرەكەمان لەسەر ناهەقە.

(٣) خێرو خۆشی ئاسایش پەیدا دەبێ ژیان خۆش دەبێت و كات خێرا دەڕوات بەلای خەڵكەكەوە لەبەر خۆشی و خۆش كوزەرانیان وا دەزانن كاتەكە خێرا تێدەپەڕێ.

له خۆر ئاواوه هه‌ڵدێ، جا كه له (خۆرئاواوه) هه‌ڵهات و خه‌ڵك بینیان - واته - هه‌موویان باوه‌ڕدێنن جا ئه‌وه ئه‌و كاته‌یه ( (كه هه‌ندێ له نیشانه‌كانی قیامه‌ت هات)، باوه‌ڕهێنان سوود ناگه‌یه‌نێت به هیچ كه‌س كه پێشتر باوه‌ڕی نه‌هێنابێ، یا هیچ خێر و چاكه‌یه‌كی نه‌كردبێ له‌گه‌ڵ ئیمانه‌كه‌یدا)، وه بێگومان قیامه‌ت به‌رپا ده‌بێت له كاتێكدا دوو پیاو قوماشه‌كه‌یان له نێوانیاندا كردوّته‌وه، ئینجا نه مامه‌ڵه‌كه‌یان ته‌واو ده‌كه‌ن و نه‌قوماشه‌كه ده‌پێچنه‌وه (قیامه‌ت ڕوو ده‌كات)، وه به‌ڕاستی قیامه‌ت هه‌ڵده‌ستێ له كاتێكدا كه‌سێك شیری وشتره‌كه‌ی بردوّته‌وه (بۆ ماڵه‌وه) و نایخوات، وه بێگومان قیامه‌ت ڕوو ده‌دات كه‌سێك حه‌وزه‌كه‌ی سواغ ده‌دات به‌ڵام (ئاژه‌ڵ و ماڵاته‌كه‌ی) لێ ئاو نادات، وه بێگومان قیامه‌ت په‌رپا ده‌بێت له كاتێكدا كه‌سێك پارویه‌كی به‌رزكردوّته‌وه بۆده‌می به‌ڵام نایخوات (قیامه‌ت ڕوو ده‌دات) )).

## ٢٧- بَابُ ذِكْرِ الدَّجَّالِ

٧١٢٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي قَيْسٌ قَالَ: قَالَ لِي المُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: مَا سَأَلَ أَحَدٌ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الدَّجَّالِ مَا سَأَلْتُهُ، وَإِنَّهُ قَالَ لِي: «مَا يَضُرُّكَ مِنْهُ.؟». قُلْتُ: لأَنَّهُمْ يَقُولُونَ: إِنَّ مَعَهُ جَبَلَ خُبْزٍ وَنَهَرَ مَاءٍ. قَالَ: «بَلْ هُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ ذَلِكَ».

## ٢٧- باسی باس و خواسی ده‌جال

٧١٢٢-قه‌یس ده‌ڵێ: موغیره‌ی كوڕی شوعبه ﷺ ده‌ڵێ: هیچ كه‌س پرسیاری ده‌رباره‌ی ده‌جال له پێغه‌مبه‌ر ﷺ نه‌كردوه ئه‌وه‌نده‌ی من پرسیارم لێ كردوه، وه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی پێم: ((چ زیانێكت لێ ده‌كه‌وێ له لایه‌ن ده‌جاله‌وه؟))

**وتم: چونکه دەڵێن: دججال بەقەدەر شاخێ نان و ڕووبارێ ئاوی لەگەڵ دایە، فەرمووی: ((بەڵکو ئەو (دەججال) لەوە سووکتر و بێ نرختر لە لای خوا))** (١).

٧١٢٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أُرَاهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَعْوَرُ عَيْنِ الْيُمْنَى كَأَنَّهَا عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ»(٢).

**٧١٢٣- نافیع له عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وابزانم له پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((دەججال چاوی ڕاستی کوێرە، وەك دەنکە ترێیەکی دیار و بەرز وایە(٣)))**.

٧١٢٤- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم قال: «يَجِيءُ الدَّجَّالُ حَتَّى يَنْزِلَ فِي نَاحِيَةِ الْمَدِينَةِ، ثُمَّ تَرْجُفُ الْمَدِينَةُ ثَلاَثَ رَجَفَاتٍ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ كُلُّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ»(٤).

**٧١٢٤-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دەججال دێت(٥)، له شوێنێکی (دەرەوەی) مەدینە دادەبەزێ و لادەدا، له پاشان مەدینە سێ جار دەلەرێتەوە، هەرچی کافر و دووڕووی تیایە دەڕۆن بۆ لای دەججال))**.

٧١٢٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَدْخُلُ الْمَدِينَةَ رُعْبُ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَلَهَا يَوْمَئِذٍ سَبْعَةُ أَبْوَابٍ، عَلَى كُلِّ بَابٍ مَلَكَانِ»(١).

---

(١) که ئەوەندە دەسەڵاتی پێ بدات که باوەڕدار گومڕا بکات و سەری لێ بشێوێنێ. فتح الباري:١١٥/١٦.

(٢) بڕوانە: ٣٠٥٧.

(٣) که قۆقزە و له بۆڵه ترێیەکە دەرچووە.

(٤) بڕوانە: ١٨٨١.

(٥) له وڵاتێکی خۆرهەڵاتەوە که ناوی خۆراسانە.

**٧١٢٥- ئەبو بەکرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((ترس و بیمی دەججالی یەك چاو ناڕواتە مەدینەوە، لەو ڕۆژگارەدا مەدینە حەوت دەرگای هەیە، لەبەردەم هەر دەرگایەکدا دوو فریشتە وەستاون و ئێشکی دەگرن)).**

**٧١٢٦-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَدْخُلُ المَدِينَةَ رُعْبُ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، ولَهَا يَوْمَئِذٍ سَبْعَةُ أَبْوَابٍ، عَلَى كُلِّ بَابٍ مَلَكَانِ».
قَالَ: وَقَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ صَالِحِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَدِمْتُ الْبَصْرَةَ فَقَالَ لِي أَبُو بَكْرَةَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِهَذَا[٢].

**٧١٢٦- ئەبو بەکرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((ترس و بیمی دەججالی یەك چاو ناڕواتە مەدینەوە، لەو ڕۆژگارەدا مەدینە حەوت دەرگای هەیە، لەبەردەم هەر دەرگایەکدا دوو فریشتە وەستاون و ئێشکی دەگرن)).**
**(ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئیبنو ئیسحاق وتی و گێڕایەوە لە صاڵحی کوڕی ئیبراهیمەوە لە باوکیەوە وتی: ڕۆشتم بۆ بەصرە، ئەبو بەکرە ﷺ پێی وتم: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست جا ئەم فەرموودەی گێڕایەوە.**

**٧١٢٧-** حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي النَّاسِ فَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: «إِنِّي لأُنْذِرُكُمُوهُ، وَمَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ وَقَدْ أَنْذَرَهُ قَوْمَهُ، وَلَكِنِّي سَأَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ، إِنَّهُ أَعْوَرُ، وَإِنَّ اللهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ»[٣].

---

(١) بڕوانە: ١٨٧٩.
(٢) بڕوانە: ١٨٧٩.
(٣) بڕوانە: ٣٠٥٧.

**٧١٢٧- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو خەڵکەکەدا هەستا و سوپاس و ستایشی خوای کرد بەو جۆرەی شیاوی بێت، پاشان باسی دەججالی کرد و فەرمووی: ((بێگومان من لە دەججال ئاگادارتان دەکەمەوە (دەتان ترسێنم)، هەموو پێغەمبەرێك بەدڵنیاییەوە گەلەکەی ئاگادار کردۆتەوە لە دەججال، بەڵام بەڕاستی من لە بارەی دەججالەوە وتەیەکتان پێ دەڵێم هیچ پێغەمبەرێك پێش من بەگەلەکەی نەوتووە، بێگومان دەججال چاوێکی کوێرە (یەکڵەچاوە) [1]، بەدڵنیاییەوە خوا چاوێکی کوێر نییە (یەکڵەچاو نییە) )).**

٧١٢٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ فَإِذَا رَجُلٌ آدَمُ سَبْطُ الشَّعَرِ يَنْطُفُ -أَوْ يُهَرَاقُ- رَأْسُهُ مَاءً قُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: ابن مَرْيَمَ. ثُمَّ ذَهَبْتُ أَلْتَفِتُ، فَإِذَا رَجُلٌ جَسِيمٌ أَحْمَرُ جَعْدُ الرَّأْسِ أَعْوَرُ الْعَيْنِ، كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ قَالُوا: هَذَا الدَّجَّالُ. أَقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهًا ابن قَطَنٍ». رَجُلٌ مِنْ خُزَاعَةَ[2].

**٧١٢٨- سالیم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم (لە خەومدا دیم) تەوافم دەکرد بە دەوری کەعبەدا، جا پیاوێکی ئەسمەری قژ خاوم بینی لە نێوان دوو پیاودا بەم لاو لادا لاردەبۆوە (لەڕۆشتندا)، سەری ئاوی لێ دەتکا- یان سەری ئاوی پێ دەهاتە خوار - وتم: ئەمە کێیە؟ وتیان: ئیبنو مەریەمە، پاشان ڕۆشتم و لام کردەوە جا پیاوێکم بینی سوور و سپی زۆر زلی زەبەلاحی قژلولی چاوێکی کوێر بوو، وەکو دەنکە ترێی لە بۆڵ دەرچوو وابوو، وتم: ئەمە کێیە؟ وتیان: ئەمە**

(١) یەکڵەچاو: گیاندارێکە کە چاوێکی کوێربێت. (فەرهەنگی خاڵ: ل٦٥٩).
(٢) بڕوانە: ٣٤٤٠.

**دەججاله. نزیکترین کەس کە شێوەی لەو بچێت ئیبنو قەتەنە))، زوهری دەڵێ: ئیبنو قەتەن پیاوێك بوو لە هۆزی خوزاعە.**

٧١٢٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْتَعِيذُ فِي صَلَاتِهِ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ[1].

**٧١٢٩- عوروە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لە نوێژدا پەنای دەگرت بەخوا لە بەڵا و ئاژاوەی دەججال.**

٧١٣٠- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ حُذَيْفَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ فِي الدَّجَّالِ: «إِنَّ مَعَهُ مَاءً وَنَارًا، فَنَارُهُ مَاءٌ بَارِدٌ، وَمَاؤُهُ نَارٌ». قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: أَنَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[2].

**٧١٣٠-ڕەبیعی لە حوزەیفەوە ﵁ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی دەججال فەرمووی: ((بێگومان دەججال ئاو و ئاگری پێیە و لەگەڵ دایە، جا ئاگرەکەی ئاوێکی ساردە و ئاوەکەشی ئاگرە)). ئەبو مەسعوودیش ﵁ دەڵێ: منیش ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە.**

٧١٣١- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا بُعِثَ نَبِيٌّ إِلاَّ أَنْذَرَ أُمَّتَهُ الأَعْوَرَ الْكَذَّابَ، أَلاَ إِنَّهُ أَعْوَرُ وَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ، وَإِنَّ بَيْنَ عَيْنَيْهِ مَكْتُوبٌ كَافِرٌ». فِيهِ أَبُو هُرَيْرَةَ وَابْنُ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[3].

---

(١) بڕوانە: ٣٤٤٠.

(٢) بڕوانە: ٣٤٥٠.

(٣) بڕوانە: ٧٤٠٨.

**٧١٣١-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەرپێغەمبەرێك نێردرابێ گەلەکەی لە کوێرە درۆزنەکە ئاگادار کردۆتەوە، بەڵام بێگومان ئەو (دەججال) کوێرە، وە بێگومان پەروەردگاری ئێوە کوێر نییە، وە لە ڕاستیدا (دەجال) لە نێوان هەردووچاویدا نوسراوە: کافرە)).**

**-هەورەها دەربارەی ئەم باسە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە [1] وە فەرموودەکەی ئیبنو عەبباس [2] هەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە.**

## ٨- بابٌ: لاَ يَدْخُلُ الدَّجَّالُ المَدِينَةَ

٧١٣٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا حَدِيثًا طَوِيلاً عَنِ الدَّجَّالِ، فَكَانَ فِيمَا يُحَدِّثُنَا بِهِ أَنَّهُ قَالَ: «يَأْتِي الدَّجَّالُ -وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْهِ أَنْ يَدْخُلَ نِقَابَ الْمَدِينَةِ- فَيَنْزِلُ بَعْضَ السِّبَاخِ الَّتِي تَلِي المَدِينَةَ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ يَوْمَئِذٍ رَجُلٌ وَهْوَ خَيْرُ النَّاسِ -أَوْ مِنْ خِيَارِ النَّاسِ - فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّكَ الدَّجَّالُ الَّذِي حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَدِيثَهُ. فَيَقُولُ الدَّجَّالُ: أَرَأَيْتُمْ إِنْ قَتَلْتُ هَذَا ثُمَّ أَحْيَيْتُهُ، هَلْ تَشُكُّونَ فِي الأَمْرِ؟ فَيَقُولُونَ: لاَ. فَيَقْتُلُهُ ثُمَّ يُحْيِيهِ، فَيَقُولُ: وَاللَّهِ مَا كُنْتُ فِيكَ أَشَدَّ بَصِيرَةً مِنِّي الْيَوْمَ. فَيُرِيدُ الدَّجَّالُ أَنْ يَقْتُلَهُ فَلاَ يُسَلَّطُ عَلَيْهِ»[3].

## ٢٨- باسێک: دەججال ناچێتە مەدینەوە

**٧١٣٢- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ باسێکی درێژی بۆ باس کردین دەربارەی دەججال، ئەنجا لە ناو باسەدا کە بۆی کردین**

(١) بەژمارە: ٣٣٣٨ لە صەحیحی بوخاریدا.

(٢) بەژمارە: ٣٢٣٩ لە صەحیحی بوخاریدا.

(٣) بڕوانە: ١٨٨٢.

**فەرمووی: ((دەججال دێت-لە كاتێكدا قەدەغەیە لێی لە دەروازەكانی مەدینەوە بڕواتە ناوەوە- ئینجا دێتە هەندێ لەو زەوییە خوێیاوییەی نزیك مەدینە دادەبەزێت، جا لەو ڕۆژ و كاتەدا پیاوێك كە چاكترین كەسە- یا یەكێكە لە كەسە چاكەكان - دەڕواتە دەرەوە بۆلای دەججال و پێی دەڵێ: شایەتی دەدەم كەبەراستی تۆ ئەو دەجالەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی كردوە بۆمان، دەججالیش دەڵێ: پێم بڵێن ئەگەر من ئەم كەسە بكوژم پاشان زیندووی بكەمەوە، ئایا ئیتر گومانتان دەمێنێ لە كارەكەم، ئەوانیش (شوێنكەوتووانی) دەڵێن: نەخێر، دەجالیش ئەو كەسە دەكوژێت پاشان زیندووی دەكاتەوە، جا ئەو كەسە (دەججال زیندووی دەكاتەوە بە دەجال) دەڵێ: بەخوا هیچ كات ئەوەندەی ئەمڕۆ بەرچاو ڕوون نەبووم دەربارەی تۆ (كە دەجالی)، دەجالیش دەیەوێ بیكوژێت بەڵام دەسەڵاتی پێنادرێت بەسەریدا (ناتوانێ بیكوژێ).**

٧١٣٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُجْمِرِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلاَئِكَةٌ، لاَ يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلاَ الدَّجَّالُ»[1].

**٧١٣٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لەسەر ڕێگاكانی (دەرگاكانی) مەدینە چەندەها فریشتە ڕاوەستاون (ئێشكی دەگرن) بۆیە چاوەقوولە و دەججال ناڕۆنە ناویەوە)).**

٧١٣٤- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمَدِينَةُ يَأْتِيهَا الدَّجَّالُ، فَيَجِدُ الْمَلاَئِكَةَ يَحْرُسُونَهَا، فَلاَ يَقْرَبُهَا الدَّجَّالُ قَالَ: وَلاَ الطَّاعُونُ، إِنْ شَاءَ اللَّهُ»[1].

---

(١) بڕوانە: ١٨٨٢.

**٧١٣٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((دەججاڵ دێت بۆ مەدینە، جا دەبینێ فریشتەکان پاسەوانی دەکەن (و دەیپارێزن)، بۆیە دەججال نزیکی ناکەوێتەوە))، وە دەفەرموێ: ((هەروەها چاوقوڵەش نزیکی ناکەوێتەوە بەویستی خوا)).**

## ٢٩- بابُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ

٧١٣٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ح. وَحَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَتِيقٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ زَيْنَبَ ابْنَةَ أَبِي سَلَمَةَ حَدَّثَتْهُ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمًا فَزِعًا يَقُولُ:«لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ». وَحَلَّقَ بِإِصْبَعَيْهِ الإِبْهَامِ وَالَّتِى تَلِيهَا. قَالَتْ زَيْنَبُ ابْنَةُ جَحْشٍ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: «نَعَمْ إِذَا كَثُرَ الْخُبْثُ»[٢].

## ٢٩- باسی یەئجوج و مەئجوج

**٧١٣٥- ئوم حەبیبە کچی ئەبو سوفیان لە زەینەبی کچی جەحشەوە ﷺ و دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا هات بۆ لای بە ترسێکی زۆرەوە[٣] و فەرمووی: ((هیچ پەرستراوێك ڕاست نییە جگە لە خوا، هاوار بۆ عەرەب لە کارەساتێکی خراپ نزیك بۆتەوە (لێیان)، ئەمڕۆ لە بەربەستەکەی (دروستکرابوو لەبەردەم) یەئجوج و مەئجوجدا ئەوەندەی ئەمەندەی لێ کون**

(١) بڕوانە: ١٨٨١.
(٢) بڕوانە: ٣٣٤٦.
(٣) واتە: ترس و شڵەژانێکی زۆری پێوە دیار بوو.

**کراوە))، پەنجە گەورەی و ئەوەی تەنیشتی کرد بە بازنەیەك[1]. زەینەبی کچی جەحش وتی: منیش وتم: ئەی پیغەمبەری خوا: ئایا ئێمە لە ناو دەبرێین لە کاتێکدا پیاوچاکانیشمان لە ناودا بێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ ئەگەر گوناهو تاوان زۆر بوو)).**

٧١٣٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُفْتَحُ الرَّدْمُ رَدْمُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلَ هَذِهِ». وَعَقَدَ وُهَيْبٌ تِسْعِينَ[2].

**٧١٣٦- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((لە بەربەستەکە بەربەستی یەئجوج و مەئجوج بە ئەندازەی ئەمەی کون دەکرێت))، وهەیب پەنجەکانی قوچاند و کردی بە ژمارە نەوەد[3].**

**سلێمانی/ کازیوە ڕۆژی پێنج شەمە**

**٢٠١٩/١٠/٢٥ ئەم بەشەم تەواو کرد**

---

(١) واتە: ئەوەندەی بازنەیەکی بچووکی وەک ئەوەی بە پەنجەکانی کردی بە بازنەیەکی کون کراو.

(٢) بڕوانە: ٣٣٤٧.

(٣) ژمارە نەوەد لای عەرەبەکان بەم شێوەیە: سەری پەنجەی شایەتومان ببەیتەوە بۆ بنەوەی خۆی پەنجە گەورە بخەیتە سەری.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٩٣- كِتابُ الأَحْكَامِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٩٣- پەڕاوی بڕیارەكان

## ١- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۝٥٩﴾ النساء

٧١٣٧- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ أَطَاعَ أَمِيرِي فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ عَصَى أَمِيرِي فَقَدْ عَصَانِي»[1].

## ١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (گوێڕایەڵی خوا گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن، هەروەها (گوێڕایەڵی) كاربەدەستە (عادیلە)كانی خۆتان بن))

**٧١٣٧- ئەبو هورەیرە[2] ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرمووی: ((هەركەس فەرمانبەری من بكات ئەوە بێگومان فەرمانبەری خوای كردوە، هەر كەسیش سەرپێچی من بكات ئەوە بەڕاستی سەرپێچی خوای كردوە، وە هەر كەس فەرمانبەری لێپرسراوەكەی من بكات، ئەوە بەڕاستی فەرمانبەری منی كردوە، هەر كەسیش سەرپێچی لێپرسراوەكەی من بكات، ئەوە بەڕاستی سەرپێچی منی كردوە)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٩٥٧.

(٢) بەهەمان ڕێگە و ڕشتەی فەرموودەی: ٢٩٥٦.

٧١٣٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالإِمَامُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى أَهْلِ بَيْتِ زَوْجِهَا وَوَلَدِهِ وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ، وَعَبْدُ الرَّجُلِ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، أَلاَ فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»[1].

**٧١٣٨- عەبدوڵلای كوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئاگاداربن هەمووتان شوان و بەرپرسن، وە هەمووتان بەرپرسیارن لە شوانیەكەتان، جا پێشەوا بەرپرسە، وە بەرپرسیارە لە بەرپرسیاریەتیەكەی، وە پیاو شوانە لە ناو ماڵ و منداڵیدا و بەرپرسیارە لە شوانیەتیەكەی، وە ئافرەت شوانە لە ماڵی مێرد و منداڵەكانیدا و بەرپرسیارە لێیان، وە بەردەست و خزمەتكاری پیاو شوانە لە ماڵی گەورەكەیدا و بەرپرسە لێی، كەواتە هەمووتان شوان و بەرپرسن، هەمووشتان بەرپرسیارن لە شوانیەكەتان)).**

## ٢- بابٌ: الأُمَرَاءُ مِنْ قُرَيْشٍ

٧١٣٩- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: كَانَ مُحَمَّدُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ يُحَدِّثُ أَنَّهُ بَلَغَ مُعَاوِيَةَ -وَهْوَ عِنْدَهُ فِي وَفْدٍ مِنْ قُرَيْشٍ- أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو يُحَدِّثُ أَنَّهُ سَيَكُونُ مَلِكٌ مِنْ قَحْطَانَ فَغَضِبَ، فَقَامَ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّ رِجَالاً مِنْكُمْ يُحَدِّثُونَ أَحَادِيثَ لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَلاَ تُؤْثَرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأُولَئِكَ جُهَّالُكُمْ، فَإِيَّاكُمْ وَالأَمَانِيَّ الَّتِي تُضِلُّ أَهْلَهَا، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ هَذَا الأَمْرَ فِي قُرَيْشٍ، لاَ يُعَادِيهِمْ أَحَدٌ إِلاَّ كَبَّهُ اللَّهُ عَلَى وَجْهِهِ مَا أَقَامُوا الدِّينَ»[2]. تَابَعَهُ نُعَيْمٌ، عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرٍ.

---

(١) بڕوانە: ٨٩٣.

(٢) بڕوانە: ٣٥٠٠.

## ٢- باسێک: بەرپرسان لە قورەیش دەبن

٧١٣٩- موحەممەدی كوڕی جوبەیری كوڕی موتعیم دەگێڕێتەوە لە كاتێكدا - ئەو لای موعاویە ﷺ بوو لەگەڵ چەند كەسێكی نوێنەری قوڕەیش - بە موعاویە گەیشت كە عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە: كەپادشایەك لە هۆزی قەحتان پەیدا دەبێت موعاویەش تورە بوو، جا هەستایەوە و سوپاس و ستایشی خوای كرد بەو شێوەیە شایستەی بێت، پاشان وتی: پاش ئەمە بێگومان پێم گەشتووە كە پیاوانێك لە ئێوە چەند فەرموودەیەك دەگێڕنەوە نە لە كتێبی خوادا هەیە، وە نە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بێگومان ئەو كەسانە نەزانەكانتانن، جا ئاگاداربن لە شوێنكەوتنی خۆزگە و ئاواتی (پڕ و پوچ)، كە خاوەنەكانیان گومڕا و سەرلێشواو دەكەن، چونكە بەڕاستی من خۆم لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((بێگومان ئەم كارە (فەرمانڕەوایی) لە قوڕەیشدا دەبێت، هەر كەسێك دژایەتیان بكات خوا لەسەر ڕووخساری دەیخات (لە دۆزەخەوە) تا پەیڕەوی ئایینی ئیسلام بكەن[١])).

نوعەیم لە ئیبنو موبارەكەوە گێڕاویەتیەوە ئەویش لە مەعمەرەوە لە زوهرییەوە لە موحەممەدی كوڕی جوبەیرەوە گێڕاویەتیەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی شوعیب دەكات.

٧١٤٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ، سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَزَالُ الأَمْرُ فِي قُرَيْشٍ مَا بَقِيَ مِنْهُمُ اثْنَانِ»[٢].

---

(١) واتە: مانەوەی فەرمانڕەوایی لە ناو قورەیشدا مەرجەكەی ئەوەیە پەیڕەوی ئایینی ئیسلام بكەن.

(٢) بڕوانە: ٣٥٠١.

٧١٤٠- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بەردەوام فەرمانڕەوایەتی لە قورەیشدا دەبێت هەتا دوو کەسیان مابن)).

## ٣- بابُ أَجْرِ مَنْ قَضَى بِالْحِكْمَةِ

لِقَوْلِهِ تَعَالَى ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ المائدة

٧١٤١- حَدَّثَنَا شِهَابُ بْنُ عَبَّادٍ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ، وَآخَرُ آتَاهُ اللَّهُ حِكْمَةً فَهْوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا»[1].

## ٣- باسی پاداشتی ئەو کەسەی بە دانایی بڕیار بدات

بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەزر و بڵند: (وە هەرکەس حوکم نەکات بەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە ئائەوانە بە تەواوی یاخین، وە لە فەرمانی خوا دەرچوون).

٧١٤١- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئاوات و خۆزگە پێ خواستنی گەورە تەنها لە دوو شتدایە: پیاوێك خوا سەروەت و سامانی پێ بەخشیبێ و توانای پێ دابێ لە پێناوی هەق و ڕاستیدا تەفر و تونای بکات (بیبەخشێ)، وە پیاوێکی تر کە خوا دانایی و شارەزایی پێدابێت حوکمی پێ بکات (لە نێوان خەڵکیدا) و فێری خەڵکانی دیکەشی بکات)).

(١) بڕوانە: ٧٣.

## ٤- بابُ السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ لِلإِمَامِ مَا لَمْ تَكُنْ مَعْصِيَةً

٧١٤٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا، وَإِنِ اسْتُعْمِلَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ»[١].

## ٤- باسی بیستن و گوێڕایەڵی بۆ پێشەوا بەمەرجێ سەرپێچی و تاوان نەبێت

**٧١٤٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((گوێڕایەڵ و فەرمانبەردار بن با بەندەیەکی حەبەشیش کار بەدەست بێ بەسەرتانەوە، کە سەری وەکو دەنکە مێوژێك وابێ)).**

٧١٤٣- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنِ الجَعْدِ، عَنْ أَبِي رَجَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ يَرْوِيهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا فَكَرِهَهُ فَلْيَصْبِرْ، فَإِنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ يُفَارِقُ الْجَمَاعَةَ شِبْرًا فَيَمُوتُ إِلاَّ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً»[٢].

**٧١٤٣- ئەبو ڕەجا لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك لە شتێکی[٣] فەرمانڕەواکەی ناڕازی بوو با ئارام بگرێت، چونکە بەڕاستی هەر کەس بستێ لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیابێتەوە و بمرێ، بەمردنێکی نەفامی دەمرێت)).**

(١) بڕوانە: ٦٩٣.
(٢) بڕوانە: ٧٠٥٣.
(٣) ڕەفتارێکی و کردەوەیەکی لە کاروباری ئایین.

٧١٤٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ»[١].

**٧١٤٤ -عەبدوڵلا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((گوێڕایەڵی و ملکەچی هەق و پێویستە لەسەر هەموو کەسێکی مسوڵمان (بۆ فەرمانڕەوا)، لەوەدا پێی خۆشە و لەوەشدا پێی ناخۆشە، بە مەرجێ فەرمان نەکرێ بە گوناه و تاوان، خۆ ئەگەر فەرمانی پێکرا بەگوناه و تاوان، ئەوە گوێڕایەڵی و ملکەچی دروست نییە)).**

٧١٤٥- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ سَرِيَّةً، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ وَأَمَرَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ، فَغَضِبَ عَلَيْهِمْ وَقَالَ: أَلَيْسَ قَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تُطِيعُونِي؟ قَالُوا: بَلَى. قَالَ: عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ لَمَا جَمَعْتُمْ حَطَبًا وَأَوْقَدْتُمْ نَارًا، ثُمَّ دَخَلْتُمْ فِيهَا. فَجَمَعُوا حَطَبًا فَأَوْقَدُوا فَلَمَّا هَمُّوا بِالدُّخُولِ فَقَامَ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، قَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّمَا تَبِعْنَا النَّبِيَّ ﷺ فِرَارًا مِنَ النَّارِ، أَفَنَدْخُلُهَا؟ فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ خَمَدَتِ النَّارُ وَسَكَنَ غَضَبُهُ، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «لَوْ دَخَلُوهَا مَا خَرَجُوا مِنْهَا أَبَدًا، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ»[٢].

**٧١٤٥- عەلی ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ دەستەیەکی نارد و پیاوێکی ئەنصاری کردە سەرکردەیان و فەرمانی پێ کردن کە گوێڕایەڵی بن، جا (سەرکردەکە) توڕە بوو لێیان[٣]، وتی: ئایا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ نەکردن کە گوێڕایەڵم بن؟ وتیان:**

---

(١) بڕوانە: ٢٩٥٥.
(٢) بڕوانە: ٤٣٤٠.
(٣) یان توڕەیان کرد.

بەڵێ وایە، وتی: سوێندم خواردووە لێتان دەبێ هەندی دار کۆبکەنەوە، وە ئاگرێکی پێ بکەنەوە، پاشان بچنە ناویەوە، ئەوانیش هەندی داریان کۆکردەوە و ئاگریان پێوە نا، ئینجا کە ویستیان بچنە ناویەوە، ئەوسا هەستان و سەیری یەکتریان دەکرد، کەسێکیان وتی: بێگومان ئێمە شوێن پێغەمبەر ﷺ کەوتوین لە ئاگر ڕامان کردوە، کەواتە چۆن ئێستا بچینە ناویەوە؟ جا لە کاتێکدا ئەوان ئابەو جۆرە بوون تا ئاگرەکە کوژایەوە، ئەویش توڕەییەکەی نەما و دامردەوە، جا ئەو هەواڵە باسکرا بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: ((ئەگەر بڕۆشتنایەتە ناوی هەرگیز لێی نەدەهاتنە دەرەوە، بێگومان گوێڕایەڵی لە کاری چاکە دایە)).

## ٥- بابٌ: مَنْ لَمْ يَسْأَلِ الإِمَارَةَ أَعَانَهُ اللهُ

٧١٤٦- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ، لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا، وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَكَفِّرْ يَمِينَكَ وَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ»[1].

## ٥- باسێک: کەسێک داوای لێپرسراوێتی نەکات [2] خوا پشتیوانی دەکات لەسەری

٧١٤٦- عەبدوڕەحمانی کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی عەبدوڕەحمانی کوڕی سەمموورە داوای فەرمانڕەوایی مەکە، چونکە

(١) بڕوانە: ٦٦٢٢.

(٢) بکرێت بە لێپرسراو.

بەڕاستی ئەگەر لەسەر داوا کردنی خۆت پێت بدرێ وازت لێ دەهێنرێ بۆ خۆت و کارەکەت، بەڵام ئەگەر بە بێ داوای خۆت پێت درا پشتیوانی دەکرێیت، وە ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێك، ئینجا غەیری ئەوەت بە چاکتر زانی کە سوێندت لەسەر خواردوە، ئەوە کەفارەتی سوێندەکەت بدە و ئەوە بکە کە چاکترە)).

## ٦- بابٌ: مَنْ سَأَلَ الإِمَارَةَ وُكِلَ إِلَيْهَا

٧١٤٧- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ الحَسَنِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ، لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا، وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ وَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ»[1].

## ٦- باسێک: هەر کەس داوای لێپرسراوی بکات ئەوە بەڕا و بۆچوونی خۆی دەسپێردریت

٧١٤٦-٧١٤٧- عەبدوڕەحمانی کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی عەبدوڕەحمانی کوڕی سەموورە داوای فەرمانڕەوایی مەکە، چونکە بەڕاستی ئەگەر لەسەر داوا کردنی خۆت پێت بدرێ وازت لێ دەهێنرێ بۆ خۆت و کارەکەت، بەڵام ئەگەر بە بێ داوای خۆت پێت درا پشتیوانی دەکرێیت، وە ئەگەر سوێندێکت خوارد لەسەر شتێك، ئینجا غەیری ئەوەت بە چاکتر زانی کە سوێندت لەسەر خواردوە، ئەوە ئەوە بکە کە چاکترە و کەفارەتی سوێندەکەت بدە)).

---

(١) بڕوانە: ٦٦٢٢.

## ٧- بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ الحِرْصِ عَلَى الإِمَارَةِ

٧١٤٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ المَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَحْرِصُونَ عَلَى الإِمَارَةِ، وَسَتَكُونُ نَدَامَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَنِعْمَ المُرْضِعَةُ وَبِئْسَتِ الفَاطِمَةُ».

وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُمْرَانَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الحَمِيدِ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الحَكَمِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَوْلَهُ.

## ٧- باسی ئەوەی كە ناپەسەندە لە داكۆكی كردن لەسەر لێپرسراوێتی

**٧١٤٨-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((بێگومان ئێوە داكۆكی كارن لەسەر لێپرسراوێتی، وە لە داهاتوودا لە قیامەتدا دەبێتە مایەی پەشیمانی، ئای بەرپرسیارێتی چەند شیردەرێكی چاكە[١]، بەڵام ئای لێپرسراوێتی چەند لەشیری بڕاوەیەكی خراپە[٢])).**

**-موحەممەدی كوڕی بەششار دەڵێ: عەبدوڵڵای كوڕی حومران بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدولحەمید بۆی گێڕاینەوە لە سەعیدی مەقبوریەروە لە عومەر كوڕی حەكەمەوە لە ئەبی ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ بە وتەی ئەبو هوڕەیرە خۆی (گێڕدراوەتەوە).**

٧١٤٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أَنَا وَرَجُلاَنِ مِنْ قَوْمِي، فَقَالَ أَحَدُ الرَّجُلَيْنِ: أَمِّرْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. وَقَالَ الآخَرُ مِثْلَهُ. فَقَالَ: «إِنَّا لاَ نُوَلِّي هَذَا مَنْ سَأَلَهُ وَلاَ مَنْ حَرَصَ عَلَيْهِ»[٣].

---

(١) مەبەستی ئەو پلە و پارە و سامان و قسە ڕۆشتن و خۆشی دونیای دروێینەیە، بەهۆی لێپرساویەتیەوە.
(٢) مەبەستی جیابوونەوە لە لێپرسراوێتی بەمردن و هەر هۆكارێكی تر ئەو سەرئەنجامە خراپەی دوارۆژ.
(٣) بڕوانە: ٢٢٦١.

**٧١٤٩- ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: خۆم لەگەڵ دوو پیاوی هۆزەکەم چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا یەکێك لە دوو پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بمانکە بە لێپرساوی کارێك، پیاوەکەی کەشیان هەمان قسەی کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی ئێمە نە کەسێك دەخەینە سەر ئەم کارە کە داوای بکات ونەکەسێك سوور بێت لەسەری)).**

## ٨- بابُ مَنِ اسْتُرْعِيَ رَعِيَّةً فَلَمْ يَنْصَحْ

٧١٥٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَشْهَبِ، عَنِ الحَسَنِ، أَنَّ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ زِيَادٍ عَادَ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَقَالَ لَهُ مَعْقِلٌ: إِنِّي مُحَدِّثُكَ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ عَبْدٍ اسْتَرْعَاهُ اللَّهُ رَعِيَّةً فَلَمْ يَحُطْهَا بِنَصِيحَةٍ، إِلاَّ لَمْ يَجِدْ رَائِحَةَ الجَنَّةِ»[1].

## ٨- باسی کەسێک خەڵکانێک بخرێتە ژێر دەستی بەڵام دڵسۆز نەبێت بۆیان

**٧١٥٠-حەسەن دەڵێ: عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد سەردانی مەعقیلی کوڕی یەساری ﷺ کرد لەو نەخۆشییەی کە تیایدا مرد، ئینجا مەعقیل ﷺ پێی وت: من فەرموودەیەکت بۆ دەگێڕمەوە کە خۆم لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە، لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەر بەندەیەك خوا بیکاتە لێپرسراو و چاودێری کۆمەڵێك خەڵك بەدڵسۆزی و ئامۆژگاری خۆی پارێزگار و ئاگاداریان نەبوو، ئیللا بۆنی بەهەشت ناکات)).**

(١) بڕوانە: ٧١٥١.

٧١٥١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، أَخْبَرَنَا حُسَيْنٌ الْجُعْفِيُّ قَالَ: زَائِدَةُ ذَكَرَهُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: أَتَيْنَا مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ نَعُودُهُ، فَدَخَلَ عُبَيْدُ اللهِ فَقَالَ لَهُ مَعْقِلٌ: أُحَدِّثُكَ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: «مَا مِنْ وَالٍ يَلِي رَعِيَّةً مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَيَمُوتُ وَهْوَ غَاشٌّ لَهُمْ إِلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الجَنَّةَ»(١).

**٧١٥١-حەسەن دەڵێ: ڕۆشتین بۆ لای مەعقیلی کوڕی یەسار نەخۆش بوو سەردانیمان کرد، ئینجا عوبەیدوڵلاش هاتە ژوورەوە، مەعقیلیش پێی وت: فەرموودەیەکت بۆ دەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە کە فەرموویەتی: ((هەر کاربەدەستێك کاری کۆمەڵێك مسوڵمان بگرێتە دەست، ئینجا بمرێت و غەشی لێیان کردبێت، ئیللا خوا (چوونە بەهەشتی لێ حەرام دەکات)).**

## ٩- بابٌ: مَنْ شَاقَّ شَقَّ اللَّهُ عَلَيْهِ

٧١٥٢- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الوَاسِطِيُّ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ طَرِيفٍ أَبِي تَمِيمَةَ قَالَ: شَهِدْتُ صَفْوَانَ وَجُنْدَبًا وَأَصْحَابَهُ وَهْوَ يُوصِيهِمْ فَقَالُوا: هَلْ سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْئًا؟ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «مَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ. قَالَ: وَمَنْ يُشَاقِقْ يَشْقُقِ اللَّهُ عَلَيْهِ يَوْمَ القِيَامَةِ». فَقَالُوا: أَوْصِنَا. فَقَالَ: إِنَّ أَوَّلَ مَا يُنْتِنُ مِنَ الإِنْسَانِ بَطْنُهُ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ أَنْ لاَ يَأْكُلَ إِلاَّ طَيِّبًا فَلْيَفْعَلْ، وَمَنِ اسْتَطَاعَ أَنْ لاَ يُحَالَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجَنَّةِ بِمِلْءِ كَفِّهِ مِنْ دَمٍ أَهْرَاقَهُ فَلْيَفْعَلْ». قُلْتُ لأَبِي عَبْدِ اللَّهِ: مَنْ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جُنْدَبٌ؟ قَالَ: نَعَمْ جُنْدَبٌ(٢).

(١) بڕوانە: ٧١٥٠.
(٢) بڕوانە: ٦٤٩٩.

## ٩- باسێک: هەرکەسێك شتی (لەسەر خەڵک) قورس کردبێ خواش لەسەر ئەوی قورس کردوە

**٧١٥٢-تەریف (گە نازناوی) ئەبی تەمیمەیە وتی: صەفوان و جوندەب و هاوڕێکانی (صەفوان)ـم بینی ئەو (صەفوان یا جوندەب) ئامۆژگاری دەکردن، ئەوانیش وتیان: ئایا هیچت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووە؟ وتی: لێم بیست دەیفەرموو: ((هەرکەس بۆ ناوبانگ کاربکات خوا ناوی دەزڕێنێت لە ڕۆژی قیامەتدا))، وە فەرمووی: ((هەر کەسیش کار قورس و گران کات (لەسەر خەڵکی)، خواش کار لەسەر ئەو قورس و گران دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا))، ئینجا عەرزیان کرد: ئامۆژگاریمان بکە (جوندەبیش) وتی: یەکەم شتێك لە لاشەی مرۆڤ کە بۆگەن دەکات ورگێتی، بۆیە هەر کەسێك توانی حەڵاڵ نەبێت نەیخوات باوا بکات، وە هەر کەسێك توانی بەربەست لە نێوان خۆی و بەهەشتدا دروست نەکات بەئەندازەی لویچێك خوێن ڕژاندبێتی باوا بکات، (فیرەبری دەڵێ): بەئەبی عەبدوڵلام وت: کێ دەڵێ لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە جوندەب؟ وتی: بەڵێ جوندەب (دەڵێ).**

## ١٠- بابُ القَضَاءِ وَالْفُتْيَا فِي الطَّرِيقِ

وَقَضَى يَحْيَى بْنُ يَعْمَرَ فِي الطَّرِيقِ. وَقَضَى الشَّعْبِيُّ عَلَى بَابِ دَارِهِ.

**٧١٥٣-** حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ خَارِجَانِ مِنَ المَسْجِدِ فَلَقِيَنَا رَجُلٌ عِنْدَ سُدَّةِ الْمَسْجِدِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟» فَكَأَنَّ

الرَّجُلَ اسْتَكَانَ، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَعْدَدْتُ لَهَا كَبِيرَ صِيَامٍ وَلاَ صَلاَةٍ وَلاَ صَدَقَةٍ، وَلَكِنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. قَالَ: «أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ»[1].

## ١٠- باسی دادووەری و فەتوادان لە ڕێگادا (دروستە)

**-یەحیای کوڕی یەعمەر لە ڕێگادا دادەوری کردوە. هەروەها شەعبی لەبەر دەرگای ماڵەکەیدا دادوەری کردوە.**

**٧١٥٣-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا من و پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت دەهاتینە دەرەوە، جا پیاوێك گەشت پێمان لەبەردەم [2] دەرگای مزگەوتدا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەی قیامەت دەبێت؟ پێغەمبەریش فەرمووی: ((چیت بۆ ئامادە کردوە؟)) وەك ئەوە وابوو پیاوەکە گەردن کەچ بوو بۆی، لە پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکی گەورە و زۆرم بۆ ئامادە نەکردوە لە نوێژ و ڕۆژوو و ماڵ بەخشین، بەڵام خوا و پێغەمبەرەکەیم خۆش دەوێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((تۆ (لە قیامەتدا) لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت ویستووە)).**

## ١١- بابُ مَا ذُكِرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَكُنْ لَهُ بَوَّابٌ

**٧١٥٤-** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا ثَابِتٌ البُنَانِيُّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ يَقُولُ لامْرَأَةٍ مِنْ أَهْلِهِ: تَعْرِفِينَ فُلاَنَةَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِهَا وَهْيَ تَبْكِي عِنْدَ قَبْرٍ فَقَالَ: «اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي». فَقَالَتْ: إِلَيْكَ عَنِّي، فَإِنَّكَ خِلْوٌ مِنْ مُصِيبَتِي. قَالَ: فَجَاوَزَهَا وَمَضَى، فَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ فَقَالَ مَا قَالَ لَكِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟. قَالَتْ: مَا عَرَفْتُهُ.

---

(١) بڕوانە: ٣٦٨٨.

(٢) (سُدَّةِ): بەچەند مانا هاتووە: شتێک سێبەری هەبوو لەبەر دەرگاکەدا لەبەر خۆر و باران، یان هەر مەبەست دەرگاکەیە یان لاشیپانی دەرگاکەیە یان ئەو ڕەوییە لەبەردەم دەرگاکەیان دایە.

قَالَ: إِنَّهُ لَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَجَاءَتْ إِلَى بَابِهِ فَلَمْ تَجِدْ عَلَيْهِ بَوَّابًا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا عَرَفْتُكَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ الصَّبْرَ عِنْدَ أَوَّلِ صَدْمَةٍ»[1].

## ١١- باسی ئەوەی کە وتراوە بێگومان پێغەمبەر ﷺ دەرگاوانی نەبووە

**٧١٥٤-سابیتی بونانی لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە بە ئافرەتێکی خزم خۆی وت: فلانە ئافرەت دەناسیت؟ وتی: بەڵێ (ئەنەس) وتی: پێغەمبەر ﷺ بەلایدا تێپەڕی ئافەرەتەکە لای گۆڕێکدا دەگریا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لە خوا بترسە و ئارام بگەر (مەگری) ))، ئافرەتەکەش وتی برۆ لێم دوور کەوەرەوە چونکە بەڕاستی تۆ لێقەومانی منت نییە، دەڵێ: پێغەمبەریش ﷺ لێی تێپەڕی و ڕۆشت، ئینجا پیاوێك بەلای ئافرەتەکەدا تێپەڕی و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێ وتیت؟ ئافرەتەکەش وتی: نەمناسی، (پیاوەکە) وتی: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ دەڵێ: جا ئافرەتەکە (گەڕایەوە) هاتە لای دەرگای ماڵەکەی پێغەمبەر ﷺ بەڵام هیچ دەرگاوانی نەبینی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: سوێند بەخوا نەمناسیت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی ئارام گرتن لەسەرەتای کارەسەتەکەوەیە)).**

## ١٢- بَابٌ: الحَاكِمِ يَحْكُمُ بِالْقَتْلِ عَلَى مَنْ وَجَبَ عَلَيْهِ دُونَ الإِمَامِ الذِي فَوْقَهُ

٧١٥٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَالِدٍ الذُّهْلِيُّ، حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ قَيْسَ بْنَ سَعْدٍ كَانَ يَكُونُ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ ﷺ بِمَنْزِلَةِ صَاحِبِ الشُّرَطِ مِنَ الأَمِيرِ.

---

(١) بڕوانە: ١٢٥٢.

# ١٢- باسێک: دادوەر بڕیاری کوشتن بدات بەسەر کەسێکدا کە کوشتنی لەسەرە بە بێ (مۆڵەتی) ئەو پێشەوایەی لەسەرووی ئەوەوەیە

**٧١٥٥-ئەنەس ﷺ دەڵێ: قەیسی کوڕی سەعد ﷺ لە بەردەستی پێغەمبەردا ﷺ وەکو سەرۆکی پۆلیسەکان بوو لەگەڵ ئەمیری و لێپرسرادا.**

٧١٥٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ قُرَّةَ، حَدَّثَنِي حُمَيْدُ بْنُ هِلاَلٍ، حَدَّثَنَا أَبُو بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَهُ وَأَتْبَعَهُ بِمُعَاذٍ[١].

**٧١٥٦-ئەبو بوردە لە ئەبو موساوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ ناردی (بۆ یەمەن) بە شوێنیشیدا موعازی نارد.**

٧١٥٧- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الصَّبَّاحِ، حَدَّثَنَا مَحْبُوبُ بْنُ الحَسَنِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى أَنَّ رَجُلاً أَسْلَمَ ثُمَّ تَهَوَّدَ، فَأَتَى مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ -وَهْوَ عِنْدَ أَبِي مُوسَى- فَقَالَ: مَا لِهَذَا؟ قَالَ: أَسْلَمَ ثُمَّ تَهَوَّدَ. قَالَ: لاَ أَجْلِسُ حَتَّى أَقْتُلَهُ، قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﷺ[٢].

**٧١٥٧-ئەبو بوردە لە ئەبی موساوە ﷺ گێڕایەوە کە پیاوێك مسوڵمان بوو پاشان بوویەوە بە جوولەکە، ئینجا موعازی کوڕی جەبەل هات و ئەو کابراش لای ئەبو موسا بوو، (موعاز) وتی: ئەمە چییە؟ (ئەبو موسا) وتی: مسوڵمان بوو پاشان بووەتەوە بە جوولەکە، (موعاز) وتی: دانانیشم هەتا نەیکوژم ئەوە بڕیاری خوا و پێغەمەرەکەیەتی.**

(١) بڕوانە: ٢٢٦١.
(٢) بڕوانە: ٢٢٦١.

## ١٣- بابٌ: هَلْ يَقْضِي الحَاكِمُ أَوْ يُفْتِي وَهُوَ غَضْبَانُ

٧١٥٨- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ المَلِكِ بْنُ عُمَيْرٍ، سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: كَتَبَ أَبُو بَكْرَةَ إِلَى ابْنِهِ -وَكَانَ بِسِجِسْتَانَ- بِأَنْ لاَ تَقْضِيَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ».

## ١٣- باسێک: ئایا دادوەر بڕیار یا فەتوا دەدات لە کاتێکدا کە زۆر توڕە بوو؟

**٧١٥٨- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە دەڵێ: ئەبو بەکرە ﷺ نامەیەکی نوسی بۆ کوڕەکەی[1] - (کە کوڕەکەی قازی بوو) لەسیجیستان- کە بڕیار نەدەیت لە نێوان دوو کەسدا لە کاتێکدا کە توڕەیت، چونکە من لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان قازی نابێت بڕیار بدات لە نێوان دوو کەسدا لە کاتێکدا کە زۆر تووڕەیە)).**

٧١٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي وَاللَّهِ لأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلاَةِ الغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلاَنٍ مِمَّا يُطِيلُ بِنَا فِيهَا. قَالَ: فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَطُّ أَشَدَّ غَضَبًا فِي مَوْعِظَةٍ مِنْهُ يَوْمَئِذٍ، ثُمَّ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيُوجِزْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَذَا الحَاجَةِ»[2].

**٧١٥٩- ئەبو مەسعوودی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەڵڵاهی من دوا دەکەوم لە نوێژی بەیانیان (ناڕۆم بۆ نوێژ)، لەبەر فلانە کەس کە نوێژەکەمان بۆ درێژ**

---

(١) کە ناوی عوبەیدوڵلایە.

(٢) بڕوانە: ٩٠.

دەکاتەوە، دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەرم ﷺ نەدیوە لە ئامۆژگاری کردندا ئەوەندەی ئەو ڕۆژە تورە بووبێت، پاشان فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە، بەڕاستی لە ئێوەدا کەسی واهەیە خەڵکی دوور دەخاتەوە (لە نوێژی بەکۆمەڵ)، جا هەر کامێکتان پێشنوێژی بۆخەڵکی کرد بانوێژەکەی کورت بێت، چونکە بێگومان لەناو نوێژخوێناندا بەتەمەن و نەخۆش و لاواز و خاوەن ئیشیان تێدایە)).

٧١٦٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي يَعْقُوبَ الكِرْمَانِيُّ، حَدَّثَنَا حَسَّانُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا يُونُسُ قَالَ مُحَمَّدٌ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهْيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَتَغَيَّظَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: «لِيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ فَتَطْهُرَ، فَإِنْ بَدَا لَهُ أَنْ يُطَلِّقَهَا فَلْيُطَلِّقْهَا»[1].

٧١٦٠- سالیم دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ بۆی گێڕایەوە کە ئەو (عەبدوڵڵا) خێزانەکەی تەڵاقدا لە کاتێکدا لە حەیزدا بوو، عومەریش بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ باس کردبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ لە بارەیەوە تووڕە بوو بوو، لە پاشان فەرمووی: ((با بیگێڕێتەوە بۆ لای خۆی پاشان ڕایگرێ و بیهێڵێتەوە تا پاک دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتە حەیزەوە ئینجا پاک دەبێتەوە، جا ئەگەر بۆی دەرکەوت کە تەڵاقی بدات (باشە) با تەڵاقی بدات)).

## ١٤- بابُ مَنْ رَأَى لِلْقَاضِي أَنْ يَحْكُمَ بِعِلْمِهِ فِي أَمْرِ النَّاسِ إِذَا لَمْ يَخَفِ الظُّنُونَ وَالتُّهَمَةَ

كَمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِهِنْدَ «خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ». وَذَلِكَ إِذَا كَانَ أَمْرًا مَشْهُورًا.

(١) بڕوانە: ٤٩٠٨.

## ١٤- باسی ئەو کەسە کە ڕای وایە قازی بۆی هەیە لە کاروباری خەڵکدا بە زانیاری خۆی بڕیار بدات، ئەگەر (قازی) لە گومان و تۆمەت بۆ کردن نەترسا[1]

**-وەك پێغەمبەر ﷺ بە هیندی فەرموو: ((ئەوەندەی بەشی (خەرجی) خۆت و کوڕەکەت بکات بە پێی پێویست (لە ماڵی ئەبو سوفیان ببە))، ئەوەش کاتێك دەبێ ئەگەر بابەتەکە شتێکی ئاشکراو دیار بوو (لە ناو خەڵکدا).**

٧١٦١- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: جَاءَتْ هِنْدٌ بِنْتُ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَهْلُ خِبَاءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ يَذِلُّوا مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ، وَمَا أَصْبَحَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَهْلُ خِبَاءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ يَعِزُّوا مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ. ثُمَّ قَالَتْ: إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مِسِّيكٌ، فَهَلْ عَلَيَّ مِنْ حَرَجٍ أَنْ أُطْعِمَ الَّذِي لَهُ عِيَالَنَا؟ قَالَ لَهَا: «لاَ حَرَجَ عَلَيْكِ أَنْ تُطْعِمِيهِمْ مِنْ مَعْرُوفٍ»[2].

**٧١٦١- عائیشە ﵂ دەڵێ: هیندی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە[3] هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ڕووی زەوی بنەماڵەیەك نەبوو کەبەئەندازەی بنەماڵەکەی تۆ حەز بکەم زەلیل و داماو ببن، پاشان ئەمڕۆ لەسەر ڕووی زەوی هیچ بنەماڵەیەك نییە بەئەندازەی بنەماڵەکەی تۆ حەز بکەم سەر بەرز و سەروەربن، پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیل و ڕژدمیە، ئایا گوناهم دەگات لەو سامانەی هی ئەوە خۆراك بدەم بەماڵ و منداڵەکانم؟ فەرمووی پێی: ((گوناهت ناگات ئەگەر بەپێی پێویست و عورف بێت)).**

---

(١) کرابێت بۆ ئەوکەسەی تاوانبار کراوە.

(٢) بڕوانە: ٢٢١١.

(٣) کە دایکی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانە ﵄.

## ١٥- بابُ الشَّهَادَةِ عَلَى الخَطِّ المَخْتُومِ، وَمَا يَجُوزُ مِنْ ذَلِكَ وَمَا يَضِيقُ عَلَيْهِمْ، وَكِتَابِ الْحَاكِمِ إِلَى عَامِلِهِ وَالْقَاضِي إِلَى القَاضِي

وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: كِتَابُ الْحَاكِمِ جَائِزٌ إِلاَّ فِي الحُدُودِ. ثُمَّ قَالَ إِنْ كَانَ القَتْلُ خَطَأً فَهْوَ جَائِزٌ لأَنَّ هَذَا مَالٌ بِزَعْمِهِ، وَإِنَّمَا صَارَ مَالاً بَعْدَ أَنْ ثَبَتَ القَتْلُ، فَالْخَطَأُ وَالْعَمْدُ وَاحِدٌ. وَقَدْ كَتَبَ عُمَرُ بن الخطاب ﷺ إِلَى عَامِلِهِ فِي الحُدُودِ. وَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ فِي سِنٍّ كُسِرَتْ. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: كِتَابُ الْقَاضِي إِلَى الْقَاضِي جَائِزٌ إِذَا عَرَفَ الْكِتَابَ وَالْخَاتَمَ. وَكَانَ الشَّعْبِيُّ يُجِيزُ الكِتَابَ المَخْتُومَ بِمَا فِيهِ مِنَ الْقَاضِي. وَيُرْوَى عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ نَحْوُهُ. وَقَالَ مُعَاوِيَةُ بْنُ عَبْدِ الكَرِيمِ الثَّقَفِيُّ: شَهِدْتُ عَبْدَ المَلِكِ بْنَ يعلى قَاضِيَ البَصْرَةِ، وَإِيَاسَ بْنَ مُعَاوِيَةَ، وَالْحَسَنَ، وَثُمَامَةَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَنَسٍ، وَبِلاَلَ بْنَ أَبِي بُرْدَةَ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ بُرَيْدَةَ الأَسْلَمِيَّ، وَعَامِرَ بْنَ عَبِيدَةَ، وَعَبَّادَ بْنَ مَنْصُورٍ يُجِيزُونَ كُتُبَ القُضَاةِ بِغَيْرِ مَحْضَرٍ مِنَ الشُّهُودِ، فَإِنْ قَالَ الَّذِي جِيءَ عَلَيْهِ بِالْكِتَابِ: إِنَّهُ زُورٌ. قِيلَ لَهُ: اذْهَبْ فَالْتَمِسِ المَخْرَجَ مِنْ ذَلِكَ. وَأَوَّلُ مَنْ سَأَلَ عَلَى كِتَابِ القَاضِي البَيِّنَةَ ابْنُ أَبِي لَيْلَى وَسَوَّارُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ. وَقَالَ لَنَا أَبُو نُعَيْمٍ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُحْرِزٍ: جِئْتُ بِكِتَابٍ مِنْ مُوسَى بْنِ أَنَسٍ قَاضِي البَصْرَةِ، وَأَقَمْتُ عِنْدَهُ البَيِّنَةَ أَنَّ لِي عِنْدَ فُلاَنٍ كَذَا وَهْوَ بِالْكُوفَةِ، وَجِئْتُ بِهِ القَاسِمَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ فَأَجَازَهُ. وَكَرِهَ الحَسَنُ وَأَبُو قِلاَبَةَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَى وَصِيَّةٍ حَتَّى يَعْلَمَ مَا فِيهَا؛ لأَنَّهُ لاَ يَدْرِي لَعَلَّ فِيهَا جَوْرًا. وَقَدْ كَتَبَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى أَهْلِ خَيْبَرَ: «إِمَّا أَنْ تَدُوا صَاحِبَكُمْ، وَإِمَّا أَنْ تُؤْذِنُوا بِحَرْبٍ». وَقَالَ الزُّهْرِيُّ فِي شَهَادَةٍ عَلَى الْمَرْأَةِ مِنْ وَرَاءِ السِّتْرِ: إِنْ عَرَفْتَهَا فَاشْهَدْ، وَإِلاَّ فَلاَ تَشْهَدْ.

## ١٥- باسی (حوكمی) شایەتیدان لەسەر دەسوخەتێكی مۆركراو، وە ئەوەی دروستە لەو شایەتیدانە، وە ئەوەی ڕێگەیان نادرێ (شایەتی بدەن بۆیان)، هەروەها (حوكمی) نامەی كاربەدەست بۆ كارمەندەكانی، وە نامەی دادوەر بۆ دادوەرێكی تر

وە هەندێ كەس[١] دەڵێ: نامەی كاربەدەست (بۆ كارمەندەكانی) دروستە ئەگەر لە سزا شەرعیەكاندا نەبێ، پاشان (هەر ئەو كەسە) دەڵێ: ئەگەر كوشتنەكە بەهەڵەبوو ئەوە (نامەی كاربەدەستەكە) دروستە، چونكە ئەوە (كوشتنە هەڵە) تۆڵەكەی ماڵ و سامانە[٢] بە قسەی ئەو، وە بێگومان كاتێ بووەتە ماڵ و سامان دوا ئەوەی كوشتنەكە سەلماوە، چونكە كوشتنی هەڵە و ئەنقەست (لە سەرەتادا) وەك یەكن. وە بێگومان عومەر ﷺ نامەی نووسی بۆ كارمەندەكەی دەربارەی سزا شەرعییەكان. وە عومەری كوڕی عەبدولعەزیز نامەی نووسی (بۆ زورەیقی كوڕی حەكیم)[٣] دەربارەی ددانێك شكێنرابوو.

-وە ئیبراهیم[٤] دەڵێ: نامەی قازی بۆ قازیەكی تر دروستە ئەگەر (قازی نامە بۆ نوسراو) نامە و مۆرەكەی ناسی و زانی (كە هی ئەو قازییەیە بۆی نووسیوە). شەعبیش نامەی مۆركراو و ئەوەی تیایدا نووسراوە لە لایەن قازیەوە بە دروست دەزانێ.

-وە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ وێنەی ئەوەی (لە شەعبیەوە گێڕاویانەتەوە) گێردراوەتەوە.

---

(١) مەبەستی ئیمام ئەبو حەنیفە و زانایانی مەزهەبەكەیەتی رەحمەتی خوایان لێ بێت.
(٢) واتە: كوشتنەوە نییە.
(٣) كە كارمەند بوو.
(٤) ئیبراهیم نەخەعی.

**-موعاوییەی کوڕی عەبدولکەریمی سەقەفی دەڵێ: ئامادەبووم لای عەبدولمەلیکی کوڕی یەعلای قازی بەصرە و ئیياسی کوڕی موعاوییە و حەسەن (ی بەصری) و سومامەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەنەس[1] و بیلالی کوڕی ئەبی بوردە و عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدەی ئەسلەمەی و عامری کوڕی عوبیدە و عەببادی کوڕی مەنصور هەموویان نامەی قازیەکان بە دروست دەزانن و کاری پێدەکەن، بە بێ ئامادەبوونی شایەتەکان، جا ئەگەر ئەو قازییەی نامەکەی بۆ هاتووە وتی: ئەم نامە درۆیە[2]، پێی دەوترێت: بڕۆ بەدوای دەرچیەکدا بگەڕێ (بەکار نەکردن بەناوەڕۆکی نامەکە)[3].**

**-وە یەکەم کەسێك کە پرسیاری شایەتی کردوە لەسەر نامەی قازی ئیبنو ئەبی لەیلا و سەوواری کوڕی عەبدوڵڵا بووە.**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئەبو نوعەیم پێی وتین عوبەیدوڵڵای کوڕی موحریز بۆی گێڕاینەوە وتی: لە مووسای کوڕی ئەنەسەوە کە قازی بەصرە بوو نامەیەکم هێنا و لای خۆی شایەتم لەسەر گرت کە من ئەوە ئەوەندەم لای فلانە کەسە، لە کاتێکدا ئەو فلانە کەسە لە کوفەیە، وە ئەو نامەیەم هێنا بۆ قاسیمی کوڕی عەبدوڕەحمان (ی قازی کوفە) نامەکەی بە دروست دانا (و کاری پێکرد).**

**-وە حەسەن و ئەبی قیلابە لایان ناپەسەندە شایەتی بدرێت لەسەر وەسیەتێك تا نەزانرێ چی تیایە، چونکە نازانێ لەوانە ستەم و ناڕەوایی تیا بێت.**

**-وە بێگومان پێغەمبەر ﷺ نامەی نووسی بۆ خەڵکی خەیبەر: ((یان خوێنی هاوڕێکەتان[4] بدەن یان ئاگاداربن بە جەنگ کردن لەگەڵتاندا)).**

---

(١) قازی و دادوەری بەسرە بووە.

(٢) نامەی ئەو قازیە نیيە.

(٣) یان بەڕەخنە گرتن لە شایەتەکان کە شایەتی نامەی قازی بوون کە شایەتی عادیل نین، یا بیسەلمێنێ کە شایەتیدانەکەیان پەیوەندی بە ناوەڕۆکی نامەکەوە نییە.

(٤) عەبدوڵڵای کوڕی سەهل موسڵمان بوو، بۆیە دەفەرموێ هاوڕێکەتان چونکە لە خەیبەر لە ناو جوولەکەکاندا کوژرا.

-وە زوهری دەربارەی شایەتی دان لەسەر ئافرەت لە پشت پەردەوە دەڵێ: ئەگەر ئافرەتەكەت ناسی ئەوە شایەتی بدە ( لەسەری)، ئەگەر نەتناسی شایەتی مەدە لەسەری.

٧١٦٢- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَمَّا أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى الرُّومِ قَالُوا: إِنَّهُمْ لاَ يَقْرَءُونَ كِتَابًا إِلاَّ مَخْتُومًا. فَاتَّخَذَ النَّبِيُّ ﷺ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِهِ، وَنَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ[1].

**٧١٦٢- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: كاتێ پێغەمبەر ﷺ ویستی نامە بنووسێت بۆ ڕۆمەكان وتیان: لە ڕاستیدا ئەوان نامەیەك ناخوێننەوە مۆر نەكرابێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەموستیلەیەكی لە زیوو دروست كرد، دەڵێی سەیری سپیەتی مۆرەكەی دەكەم، نەخشەكەی: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) بوو لە مۆرەكە هەڵكەنرابوو.**

## ١٦- بابٌ: مَتَى يَسْتَوْجِبُ الرَّجُلُ الْقَضَاءَ؟

وَقَالَ الحَسَنُ: أَخَذَ اللَّهُ عَلَى الحُكَّامِ أَنْ لاَ يَتَّبِعُوا الهَوَى، وَلاَ يَخْشَوُا النَّاسَ ﴿ وَلَا تَشْتَرُوا بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًا ﴿٤٤﴾ ﴾ المائدة. ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾ ﴾ ص، وَقَرَأَ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ

---

(١) بروانە: ٦٥.

ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ المائدة، وَقَرَأَ: ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ ﴿٧٩﴾ ﴾ الأنبياء، فَحَمِدَ سُلَيْمَانَ وَلَمْ يَلُمْ دَاوُدَ، وَلَوْلاَ مَا ذَكَرَ اللَّهُ مِنْ أَمْرِ هَذَيْنِ لَرَأَيْتُ أَنَّ القُضَاةَ هَلَكُوا، فَإِنَّهُ أَثْنَى عَلَى هَذَا بِعِلْمِهِ وَعَذَرَ هَذَا بِاجْتِهَادِهِ. وَقَالَ مُزَاحِمُ بْنُ زُفَرَ: قَالَ لَنَا عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ: خَمْسٌ إِذَا أَخْطَأَ القَاضِي مِنْهُنَّ خَصْلَةً كَانَتْ فِيهِ وَصْمَةٌ: أَنْ يَكُونَ فَهِمًا، حَلِيمًا، عَفِيفًا، صَلِيبًا، عَالِمًا سَئُولاً عَنِ العِلْمِ.

## ١٦- باسێک: پیاو کەی شایستەی ئەوەیە ببێتە قازی

**-حەسەن (ی بەصری) دەڵێ: خوا پەیمانی لە کاربەدەست وەرگرتووە کە شوێنی هەوا و ئارەزوو نەکەون و لە خەڵك نەترسن، خوای گەورە دەفەرمووێ: (وە ئایاتەکانی من مەگۆڕنەوە بەنرخێکی کەمی دونیای)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ئەی داوود بێگومان ئێمە تۆمان کرد بە جێنشین (ی پێغەمبەرانی پێش خۆت) لە زەویدا، کەوابوو تۆش لە نێوان خەڵکدا بەڕاستی فەرمانڕەوایی بکەو شوێن هەوا و ئارەزووت مەکەوە، با لە ڕێگەی خوا لات نەدات، بێگومان ئەوانەی لە ڕێگای خوا لا دەدەن و گومڕا دەبن سزای سەختیان بۆ هەیە، چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لەبیر کردبوو)، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (بێگومان ئێمە تەوراتمان ناردە خوارەوە کە ڕێنموونی و ڕووناکی تێدابوو، ئەو پێغەمبەرانەی حوکمیان پێ دەکرد کە مسوڵمان و مل کەچ بوون بۆ ئەوانەی کە جوولەکە بوون، هەروەها زانا خواناسەکان و زانا شەرع زانەکان (حوکمیان پێ**

دەکرد بەهۆی ئەوەی فەرمانی پارێزگاری کتێبی خوا (تەورات) یان پێ کرابوو (لە لایەن پێغەمبەرەکانیانەوە)، وە شایەتیش بوون لەسەری، کەواتە (زانایانی جولەکە) لە خەڵکی مەترسن، بەڵکو تەنها لە من بترسن، بەڵگە و فەرمانەکانی من مەگۆڕنەوە (مەفرۆشن) بەنرخێکی کەم، وە هەرکەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە ئائەوانە بێ باوەڕن و مسوڵمان نین)، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وە باسی داوود و سولەیمان بکە ﷺ کاتێ بڕیاریان دەرکرد دەربارەی ئەو کشتوکاڵە کە بەشە و ئاژەڵی کەسانێك تێیدا لەوەڕابوون (زیانیان لێ دابوو)، وە ئێمە بۆ دادوەری بڕیارەکەیان ئامادەبووین، ئەوسا ئێمە ئەو (دادوەری چاکتر)مان فێری سولەیمان کرد (سولەیمان وتی: ئاژەڵە زیان خۆرەکە بدرێتە دەستی خاوەن کشتوکاڵەکە کەڵك لە شیر و بەرهەمیان وەربگرێ، وە کشتوکاڵە کەش بدرێتە دەست خاوەن ئاژەڵەکە بەر و بوومەکەی بخۆن و خزمەتی بکەن، تاوەك پێش زیان لێکەوتنەکەی لێدێتەوە، لەو کاتەدا ئاژەڵەکە بگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی و کشتوکاڵەکەش بۆ خاوەنەکەی)، وە بەهەر کام لەو دووانە [1] پێغەمبەرێتی (دادوەری) و زانستمان پێدان).

(حەسەن وتی) جا خوا ستایشی سولەیمانی کرد[2]، وە سەرزەنشتی داوودی نەکرد، ئەگەر ئەو باسکردنە خوا نەبووایە بۆی کاری (دادوەری) ئەو دووانە (سولەیمان و داوود)، بێگومان دەتبینی کە قازییەکان (لە قیامەتدا) تیا دەچوون، چونکە بێگومان خوا ستایشی ئەوەیانی کرد بەزانیاری و زانستیەکەی، وە عوزری ئەوەشیانی وەرگرت لەبەر (گەڕان بە شوێن وەڵامەکەدا و) ماندووبوونی.

---

(١) داوود و سولەیمان ﷺ.

(٢) چونکە ڕای ڕاستر پێکا و حوکمی پێکرد.

-وە موزاحیمی کوڕی زوفەر دەڵێ: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز وتی پێمان: پێنج شت هەن قازی ئەگەر لە یەکێك لەو پێنجەدا هەڵەی کرد، ئەوە ناتەواوی و عەیبێکی تیایە: ئەبێ تێگەشتووبێت، لەسەر خۆ بێت، خۆپارێزبێت (لە حەرام) بەهێزبێت[1]، زانابێت زۆر پرسیارکەر بێت دەربارەی زانست و زانیاری.

## ١٧- بَابُ رِزْقِ الْحُكَّامِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا

وَكَانَ شُرَيْحٌ الْقَاضِي يَأْخُذُ عَلَى الْقَضَاءِ أَجْرًا. وَقَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: يَأْكُلُ الْوَصِيُّ بِقَدْرِ عُمَالَتِهِ، وَأَكَلَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ ﵄.

## ١٧- باسی موچەی کاربەدەست و کارمەندانی حکومەت[2]

-شورەیحی قازی لەسەر دادوەری موچەی وەردەگرت.

- عائیشە ﵂ دەڵێ: سەرپەرەشتیاری هەتیو بەئەندازەی کرێی کارەکەی (لە ماڵی هەتیوەکە) دەخوات.

-وە ئەبو بەکر و عومەر ﵄ (کاتێ بوونە جێنشین لە سامانی گشتییان) دەخوارد (بەئەندازەی پێویست).

٧١٦٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ -ابْنُ أُخْتِ نَمِرٍ- أَنَّ حُوَيْطِبَ بْنَ عَبْدِ الْعُزَّى أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ السَّعْدِيِّ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَدِمَ عَلَى عُمَرَ فِي خِلاَفَتِهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَلَمْ أُحَدَّثْ أَنَّكَ تَلِي مِنْ أَعْمَالِ النَّاسِ أَعْمَالاً، فَإِذَا أُعْطِيتَ الْعُمَالَةَ كَرِهْتَهَا؟ فَقُلْتُ: بَلَى. فَقَالَ عُمَرُ: مَا تُرِيدُ إِلَى ذَلِكَ؟ قُلْتُ إِنَّ لِي أَفْرَاسًا وَأَعْبُدًا، وَأَنَا

(١) لە ئاست هەقدا و لێی لا نەدات.
(٢) یان کارمەندانی کۆکەرەوەی زەکات.

بِخَيْرٍ، وَأُرِيدُ أَنْ تَكُونَ عُمَالَتِي صَدَقَةً عَلَى الْمُسْلِمِينَ. قَالَ عُمَرُ: لاَ تَفْعَلْ، فَإِنِّي كُنْتُ أَرَدْتُ الَّذِي أَرَدْتَ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعْطِينِي الْعَطَاءَ فَأَقُولُ أَعْطِهِ أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي. حَتَّى أَعْطَانِي مَرَّةً مَالاً فَقُلْتُ: أَعْطِهِ أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «خُذْهُ فَتَمَوَّلْهُ وَتَصَدَّقْ بِهِ، فَمَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا الْمَالِ -وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ وَلاَ سَائِلٍ- فَخُذْهُ، وَإِلاَّ فَلاَ تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ»[1].

**٧١٦٣-ئەبولیەمان بۆی گێڕاینەوە وتی: شوعەیب بۆی گێڕاینەوە لە زوهرییەوە وتی: سائیبی کوڕی یەزید - کوڕی خوشکی نەمیر - بۆی گێڕامەوە کە حووەیتیبی کوڕی عەبدولعوززا بۆی گێڕایەوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی سەعدیی بۆی گێڕایەوە: کە ئەو ڕۆشت بۆ لای عومەر ﷺ لە سەردەمی جێنشینی ئەودا، ئینجا عومەر پێی وت: ئایا ئەوە تۆ نیت کە بۆیان گێڕاومەتەوە چەند کار و ئیش لە کاروباری خەڵك بەڕێوە دەبەیت، ئینجا کاتێ کرێی کارەکەت پێ بدرێ پێت ناخۆشە، (عەبدوڵلا) دەڵێ: منیش وتم: بەڵێ وایە، عومەریش ﷺ وتی: مەبەستت چییە بەوەی وا دەکەیت؟ وتم: بێگومان من چەندین ئەسپ و مایین و کۆیلەم[2] هەیە، وە من حاڵم باشە، دەمەوێ کرێی کارکردنم خێر و بەخشین بێت بۆ مسوڵمانان، عومەر وتی: وا مەکە، چونکە من کاتی خۆی ئەوەی تو ویستت ویستم وابکەم، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەخشش و ماڵی پێدەدام منیش دەموت: بیدە بە لە من هەژارتر، هەتا جارێك سامانێکی پێدام و منیش وتم بیدە بەکەسێکی نەدارتر لە من، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وەریگرە بیکەرە ماڵی خۆت و بیبەخشە، ئینجا ئەوەی لەم سامانە بۆت هات و پێیان دایت لە کاتێکدا تۆ چاوت لێی نییە و داوای ناکەیت، ئەوە وەری بگرە ئەگەر نا خۆت بە دوایدا مەڕۆ و داوای مەکە)).**

---

(١) بڕوانە: ١٤٧٣.

(٢) لە گێڕانەوەیەکدا (وأعتُدًا) واتە: ماڵ و سامانی کۆکراوە و هەڵگیراو گەنجینەم هەیە. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٢١/١٥.

٧١٦٤- وَعَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْطِينِي العَطَاءَ فَأَقُولُ: أَعْطِهِ أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي. حَتَّى أَعْطَانِي مَرَّةً مَالاً فَقُلْتُ: أَعْطِهِ مَنْ هُوَ أَفْقَرُ إِلَيْهِ مِنِّي. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «خُذْهُ فَتَمَوَّلْهُ وَتَصَدَّقْ بِهِ، فَمَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا الْمَالِ -وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ وَلاَ سَائِلٍ- فَخُذْهُ، وَمَا لاَ فَلاَ تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ»[1].

**٧١٦٤-زوهری وتی: سالیمی کوڕی عەبدوڵلا بۆی گێڕامەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ﷺ وتی: لە عومەرم بیست دەیوت: جاران پێغەمبەر ﷺ بەخشش و ماڵی پێدەدام منیش دەموت: بیدە بەلە من هەژارتر (زیاتر پێویستی پێیەتی)، هەتا جارێك سامانێکی پێدام و منیش وتم بیدە بەکەسێکی نەدارتر لە من، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وەرگرە و بیکەرە ماڵی خۆت و بیبەخشە، ئینجا ئەوەی لەم سامانە بۆت هات و پێیان دایت -لە کاتێکدا تۆ چاوت لێی نییە و داوای ناکەیت- ئەوە وەری بگرە ئەگەر نا خۆت بە دوایدا مەڕۆ و داوای مەکە)).**

## ١٨- بابُ مَنْ قَضَى وَلاَعَنَ فِي المَسْجِدِ

وَلاَعَنَ عُمَرُ ﷺ عِنْدَ مِنْبَرِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَضَى شُرَيْحٌ وَالشَّعْبِيُّ وَيَحْيَى بْنُ يَعْمَرَ فِي المَسْجِدِ، وَقَضَى مَرْوَانُ عَلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ بِالْيَمِينِ عِنْدَ المِنْبَرِ. وَكَانَ الْحَسَنُ وَزُرَارَةُ بْنُ أَوْفَى يَقْضِيَانِ فِي الرَّحَبَةِ خَارِجًا مِنَ المَسْجِدِ.

## ١٨- باسی کەسێک دادوەری و نەفرین کردن (لە نێوان ژن و مێرددا) بکات لە مزگەوتدا

**-عومەر ﷺ نەفرین کردنی (نێوان ژن و مێردی) ئەنجامدا لای دوانگەکەی پێغەمبەردا ﷺ.**

(١) بڕوانە: ١٤٧٣.

-شورەیح و شەعبی و یەحیای کوڕی یەعمەر لە مزگەوتدا دادوەریان کردوە.

-وە مەروان بڕیاریدا بەسەر سابیتدا بە سوێند خواردن لای دوانگە (ی مزگەوت)دا.

-هەروەها حەسەن (ی بەصری) زوورارەی کوڕی ئەوفا دادوەریان کرد لە حەوشەی دەرەوەی مزگەوتدا[1].

٧١٦٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: شَهِدْتُ الْمُتَلاَعِنَيْنِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ فُرِّقَ بَيْنَهُمَا[2].

٧١٦٥-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: من تەمەنم پانزە ساڵ بوو ئامادەی دوو نەفەرین کەر بوو (ژن و مێردێك) لە یەکتری جیاکرانەوە.

٧١٦٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ سَهْلٍ - أَخِي بَنِي سَاعِدَةَ- أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ؟ فَتَلاَعَنَا فِي الْمَسْجِدِ وَأَنَا شَاهِدٌ[3].

٧١٦٦-ئیبنو شیهاب لە سەهلی بەنی ساعیدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی ئەنصاری هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: پێم بڵێ ئەگەر پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێ ببینێ (زینا بکات) ئایا پیاوەکە بیکوژێت؟ ئینجا هەردووکیان (ژن و مێردەکە) لە مزگەوتدا نەفرینیان کرد و منیش ئامادەبووم.

---

(١) مزگەوت ئەو خانووەیەکە نوێژی تیا دەکرێ، حەوشەش دەرەوەی مزگەوتە و بە دیوار چواردەوری گیراوە. بڕوانە: إرشاد الساري:١٢٣/١٥.

(٢) بڕوانە: ٤٢٣.

(٣) بڕوانە: ٤٢٣.

## ١٩- بابُ مَنْ حَكَمَ فِي المَسْجِدِ حَتَّى إِذَا أَتَى عَلَى حَدٍّ أَمَرَ أَنْ يُخْرَجَ مِنَ المَسْجِدِ فَيُقَامَ

وَقَالَ عُمَرُ رضي الله عنه أَخْرِجَاهُ مِنَ الْمَسْجِدِ. (وَاضْرِبَاهُ). وَيُذْكَرُ عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه نَحْوُهُ.

٧١٦٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ فِي الْمَسْجِدِ فَنَادَاهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي زَنَيْتُ. فَأَعْرَضَ عَنْهُ. فَلَمَّا شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعًا قَالَ: «أَبِكَ جُنُونٌ؟». قَالَ: لاَ. قَالَ: «اذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ»[1].

## ١٩- باسی ئەوەی لە مزگەوتدا دادوەری کرد هەتا کاتێ گەیشتە (جێبەجێ کردنی) سزایەک فەرمانی کرد کە ئەو کەسە (ی شیاوی سزاکەیە) لە مزگەوت ببردرێتە دەرەوە و سزاکەی لەسەر جێبەجێ بکرێت

-عومەر رضي الله عنه وتی هەردووکتان ئەو (تاوانبارە) لە مزگەوت ببەنە دەرەوە و (لەوێ لێی بدەن)، لە عائیشەوە رضي الله عنها هاوشێوەی وتەکەی (عومەر) گێڕدراوەتەوە.

٧١٦٧- ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا بوو پیاوێك هاتە خزمەتی و بانگی کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من زینام کردوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لێ وەرچەرخان، جا کە چوار جار شایەتیدا لەسەر خۆی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تۆ شێتیت؟)) وتی: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیبەن بەرد بارانی بکەن)).

---

(١) بڕوانە: ٥٢٧١.

٧١٦٨ - قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنْتُ فِيمَنْ رَجَمَهُ بِالْمُصَلَّى. رَوَاهُ يُونُسُ وَمَعْمَرٌ وَابْنُ جُرَيْجٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الرَّجْمِ[1].

**٧١٦٨-ئیبنو شیهاب دەڵێ: كەسێك كە لە جابیری كوڕی عەبدوڵڵای ﷺ بیستووە بۆی گێڕامەوە وتی: من لەو كەسانەبووم كە بەرد بارانمان كرد لە نوێژگە[2].**

**-وە ئەو فەرموودەی یونس و مەعمەر و ئیبنو جورەیج لە زوهرییەوە گێڕاویانەتەوە ئەویش لە ئەبی سەلەمەوە لە جابیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، لە باسی بەردباران كردندا.**

## ٢٠- بَابُ مَوْعِظَةِ الإِمَامِ لِلْخُصُومِ

٧١٦٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ فَأَقْضِي نَحْوَ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا فَلاَ يَأْخُذْهُ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ»[3].

## ٢٠- باسی ئامۆژگاری كردنی پێشەوا بۆ كەسە ناكۆكەكان

**٧١٦٩- ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان منیش مرۆڤكم، بەڕاستی ئێوەش ناكۆكی و كێشەتان دێننە لام، وە**

(١) بڕوانە: ٥٢٧١.

(٢) نوێژگە جێگایەكە لە دەرەوەی مەدینە بوو لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنەكان و نوێژە بارانە و ئەو جۆرە بابەتانەی تیا كراوە. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٢٥/١٥.

(٣) بڕوانە: ٢٤٥٨.

لەوانەیە هەندێکتان چاکتر لەوانیتر بتوانن بەڵگەکەتان بخەنەڕوو [١]، منیش بڕیار دەدەم لەسەر ئەوەی دەیبیستم، جا هەر کەس بڕیاری شتێکم بۆیدا لە مافی براکەی ئەوە وەری نەگرێت، چونکە بەدڵنیاییەوە پارچەیەك لە ئاگری (دۆزەخی) بۆ دەبڕم )).

## ٢١ - بابُ الشَّهَادَةِ تَكُونُ عِنْدَ الحَاكِمِ فِي وِلاَيَتِهِ الْقَضَاءِ أَوْ قَبْلَ ذَلِكَ لِلْخَصْمِ

وَقَالَ شُرَيْحٌ الْقَاضِي، وَسَأَلَهُ إِنْسَانٌ الشَّهَادَةَ فَقَالَ: ائْتِ الأَمِيرَ حَتَّى أَشْهَدَ لَكَ. وَقَالَ عِكْرِمَةُ: قَالَ عُمَرُ ﷺ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ: لَوْ رَأَيْتَ رَجُلاً عَلَى حَدٍّ -أَوْ سَرِقَةٍ- وَأَنْتَ أَمِيرٌ؟ فَقَالَ: شَهَادَتُكَ شَهَادَةُ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ. قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ عُمَرُ ﷺ لَوْلاَ أَنْ يَقُولَ النَّاسُ: زَادَ عُمَرُ فِي كِتَابِ اللَّهِ. لَكَتَبْتُ آيَةَ الرَّجْمِ بِيَدِي.

وَأَقَرَّ مَاعِزٌ بن مالك عِنْدَ رسول اللهﷺ أَرْبَعًا، فَأَمَرَ بِرَجْمِهِ، وَلَمْ يُذْكَرْ أَنَّه ﷺ أَشْهَدَ مَنْ حَضَرَهُ. وَقَالَ حَمَّادٌ: إِذَا أَقَرَّ مَرَّةً عِنْدَ الحَاكِمِ رُجِمَ. وَقَالَ الحَكَمُ: أَرْبَعًا.

## ٢١- باسی (حوکمی) شایەتیدان کەلای قازی بێت لە کاتی بەرپرسیارێتی دادگادا یان پێش ئەوەی بوبێت بە قازی بۆ یەکێک لە ناکۆکەکان[٢]

- شورەیحی قازی وتی: لە کاتێکدا کەسێك داوای لێکرد شایەتی بدات، شورەیحیش وتی: بڕۆ بۆ لای ئەمیر هەتا شایەتیت بۆ بدەم.

---

(١) زمان پاراوترین و قسەزانترین بەخستنە ڕووی بەڵگەکەتان.

(٢) واتە: کەسێک شایەتە لە بابەتێکدا لە هەمان کاتدا قازییە یان پێش و بوون بە قازی شایەت بوو لە کێشەیەکدا، ئایا ئێستە دەتوانێ کار بەو زانیارییەی خۆی بکات لەو کێشەدا، یان بیان نێرێ بۆ لای قازییەکی تر.

**-عیکریمه وتی: عومەری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عوف وتی: ئەگەر کەسێك ببینی بەسەر تاوانی زیناوە یان دزیەوە تۆ ئەمیری بیت؟ (عومەر) وتی: شایەتیدانت وەك شایەتی دانی کەسێکە لە مسوڵمانان، وتی: ڕاست دەکەیت.**

**-عومەر ﷺ وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە خەڵك دەیان وت: عومەر شتی بۆ قورئان زیاد کردوە، ئایەتی بەردباران کردنم بە دەستی خۆم دەنووسی.**

**-وە ماعیز چوار جار لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانی بەوە دانا کە زینای کردوە، ئینجا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمانی کرد بە بەردباران کردنی، وە باس نەکراوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی ئامادەبوون بە شایەتی گرتبن.**

**-وە حەمماد دەڵێ: ئەگەر (زیناکەر) لای قازیدا یەکجار دانی بە زیناکردنەکەیدا بنێت بەردباران دەکرێت، وە حەکەم دەڵێ: چوار جار[1].**

٧١٧٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عُمَرَ بْنِ كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي مُحَمَّدٍ -مَوْلَى أَبِي قَتَادَةَ- أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ: «مَنْ لَهُ بَيِّنَةٌ عَلَى قَتِيلٍ قَتَلَهُ فَلَهُ سَلَبُهُ». فَقُمْتُ لأَلْتَمِسَ بَيِّنَةً عَلَى قَتِيلٍ فَلَمْ أَرَ أَحَدًا يَشْهَدُ لِي، فَجَلَسْتُ، ثُمَّ بَدَا لِي فَذَكَرْتُ أَمْرَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ: سِلاَحُ هَذَا الْقَتِيلِ الذِي يَذْكُرُ عِنْدِي. قَالَ: فَأَرْضِهِ مِنْهُ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: كَلاَّ، لاَ يُعْطِهِ أُصَيْبِغَ مِنْ قُرَيْشٍ وَيَدَعَ أَسَدًا مِنْ أُسْدِ اللَّهِ يُقَاتِلُ عَنِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ. قَالَ: فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَدَّاهُ إِلَيَّ، فَاشْتَرَيْتُ مِنْهُ خِرَافًا فَكَانَ أَوَّلَ مَالٍ تَأَثَّلْتُهُ. قَالَ لِي عَبْدُ اللَّهِ، عَنِ اللَّيْثِ فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَدَّاهُ إِلَيَّ. وَقَالَ أَهْلُ الحِجَازِ: الحَاكِمُ لاَ يَقْضِي بِعِلْمِهِ، شَهِدَ بِذَلِكَ فِي وِلاَيَتِهِ أَوْ قَبْلَهَا. وَلَوْ أَقَرَّ خَصْمٌ عِنْدَهُ لآخَرَ بِحَقٍّ فِي مَجْلِسِ القَضَاءِ فَإِنَّهُ لاَ يَقْضِي عَلَيْهِ فِي قَوْلِ بَعْضِهِمْ، حَتَّى يَدْعُوَ بِشَاهِدَيْنِ فَيُحْضِرَهُمَا إِقْرَارَهُ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِرَاقِ مَا سَمِعَ أَوْ رَآهُ فِي مَجْلِسِ القَضَاءِ قَضَى بِهِ، وَمَا كَانَ فِي غَيْرِهِ لَمْ يَقْضِ إِلاَّ

(١) دان بەزیناکەیدا بنێت ئەوسا بەرد باران دەکرێت.

بِشَاهِدَيْنِ. وَقَالَ آخَرُونَ مِنْهُمْ بَلْ يَقْضِي بِهِ لأَنَّهُ مُؤْتَمَنٌ، وَإِنَّمَا يُرَادُ مِنَ الشَّهَادَةِ مَعْرِفَةُ الْحَقِّ، فَعِلْمُهُ أَكْثَرُ مِنَ الشَّهَادَةِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: يَقْضِي بِعِلْمِهِ فِي الأَمْوَالِ، وَلاَ يَقْضِي فِي غَيْرِهَا. وَقَالَ القَاسِمُ: لاَ يَنْبَغِي لِلْحَاكِمِ أَنْ يُمْضِيَ قَضَاءً بِعِلْمِهِ دُونَ عِلْمِ غَيْرِهِ، مَعَ أَنَّ عِلْمَهُ أَكْثَرُ مِنْ شَهَادَةِ غَيْرِهِ، وَلَكِنَّ فِيهِ تَعَرُّضًا لِتُهَمَةِ نَفْسِهِ عِنْدَ الْمُسْلِمِينَ وَإِيقَاعًا لَهُمْ فِي الظُّنُونِ وَقَدْ كَرِهَ النَّبِيُّ ﷺ الظَّنَّ فَقَالَ: «إِنَّمَا هَذِهِ صَفِيَّةُ»[1].

**٧١٧٠- ئەبو موحەممەدی - ئازاد كراوی ئەبو قەتادە - دەگێڕێتەوە كە ئەبو قەتادە ؓ وتی: لە ڕۆژی غەزای حونەیندا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەس شایەتی هەبێت لەسەر كوژراوێك كە ئەو كوشتوویەتی، ئەوە شت و مەكی كوژراوەكە بۆ ئەو كەسەیە))، (ئەبو قەتادە وتی:) منیش هەستام تا بگەڕێم بە دوای شایەتێكدا لەسەر كوژراوەكەم، بەڵام كەسم نەدی شایەتیم بۆ بدات بۆیە دانیشتمەوە، پاشان بۆم ڕوون بوویەوە ئەو باسەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس كرد، پیاوێكیش لەوانەی لە خزمەتیدا دانیشتبوو وتی: چەكی ئەو كوژراوە ئەو باسی دەكات لای منە، دەی ڕازی بكە وازی لێ بێنێ (بۆ من)، ئەبو بەكریش وتی: نەخێر، نابێ بیداتە هیچ لێ نەهاتوویەكی قوڕەیشی و نەیدات بە شێرێ لە شێرەكانی خوا كە لە پێناوی خوا و پێغەمبەرەكەیدا دەجەنگێت، دەڵێ: ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد و كەل و پەلەكەی پێدام، منیش (فرۆشتم و) بە پارەكەی باخێكم كڕی، جا ئەوە یەكەم ماڵ و سامانێك بوو كردمە دەست مایەی خۆم.**

**(ئیمای بوخاری دەڵێ) عەبدوڵلا[2] پێی وتم و لە لەیسەوە گێڕایەوە (ئەبو قەتادە) وتی: جا پێغەمبەر ﷺ هەستا و (كەل و پەلی كوژراوەكەی) پێ دام.**

---

(١) بڕوانە: ٢١٠٠.

(٢) عەبدوڵلای كوڕی صالح نووسەری لەیسە.

**(ئیمای بوخاری دەڵێ): خەڵکی حیجاز دەڵێن: قازی نابێ بە زانیاری خۆی بڕیار بدات، لە کاتی قازییەتیدا شایەت بووبێ یان پێش ئەوە، وە ئەگەر داوچیەکیان لای قازی دانی نا بەماف کەسێکی تردا لە کۆڕی دادوەریدا، ئەوە بێگومان بڕیار نادات بەسەریدا بەوتەی هەندێکیان، هەتا دوو شایەت بانگ نەکات و ئامادەیان کات بۆ دان پێدا نانەکەی.**

**وە هەندێ لە خەڵکی عێراق دەڵێن: ئەوەی قازی لە دانیشتنی دادگادا بیبیستێ یان ببینێت بڕیاری پێ دەدا، بەڵام ئەوەی لە دانیشتنی دادگادا نەبێ بڕیاری پێ نادات، مەگەر دوو شایەت ئامادە (ی بینینی و بیستنەکە) بن.**

**وە خەڵکانێکی تریان (لە خەڵکی عێراق) دەڵێن: بەڵکو بڕیاری پێ دەدات، چونکە قازی باوەڕ پێکراوە، بێگومان مەبەست لە شایەتی دان زانینی ڕاستیە، دەی زانینی قازی لە شایەتی زیاتر و بەهێزترە (بۆ زانینی ڕاستی).**

**وە هەندێکیان دەڵێ: (قازی) بە زانینی خۆی بڕیار دەدات دەربارەی ماڵ و سامان و بەڵام بۆ غەیری سامان بڕیاری پێ نادات.**

**-قاسیم دەڵێ: نابێ قازی بەزانیاری خۆی هیچ بڕیارێك بدات بە بێ زانیاری غەیری خۆی، لەگەڵ ئەوەدا کە زانیاری خۆی لە شایەتی غەیری خۆی بەهێزترە، بەڵام لای مسوڵمانان خۆی دەخاتە بەر گومانی تۆمەت بارکردن، وە ئەوانیش دەخاتە گومانەوە، وە پێغەمبەریش ﷺ گومان بردن لای ناپەسەند بووە و فەرموویەتی: ((دڵنیابن ئەم ئافرەتە صەفییەیە))** [1].

**٧١٧١-** حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَتَتْهُ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍ، فَلَمَّا رَجَعَتِ انْطَلَقَ مَعَهَا، فَمَرَّ بِهِ رَجُلَانِ مِنَ

---

(١) وەک لە فەرموودەی: ٧١٧٦ هاتووە لە صەحیحی بوخاریدا کاتێ پێغەمبەر ﷺ بەشەو لەگەڵیدا وەستابوو، دوو لە هاوەڵان بەلایاندا تێپەڕین فەرمووی: ((ئەمە صەفییەیە)).

الأَنْصَارِ، فَدَعَاهُمَا فَقَالَ: «إِنَّمَا هِيَ صَفِيَّةُ». قَالاَ: سُبْحَانَ اللهِ! قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنِ ابْنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ».رَوَاهُ شُعَيْبٌ وَابْنُ مُسَافِرٍ وَابْنُ أَبِي عَتِيقٍ وَإِسْحَاقُ بْنُ يَحْيَى، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ -يَعْنِي ابْنَ حُسَيْنٍ- عَنْ صَفِيَّةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٧١٧١-عەلی کوڕی حوسەین دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ صەفیەی کچی حویەیی هات بۆ خزمەتی، جا کاتێ گەڕایەوە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیدا ڕۆیشت و دوو پیاوی ئەنصاری بەلایدا تێپەڕین، پێغەمبەریش ﷺ بانگی کردن و فەرمووی: ((بێگومان ئەم ژنە صەفییەیە))، وتیان: پاك و بێگەردی بۆ خوا، فەرمووی (پێیان): ((بەڕاستی شەیتان لە لاشەی ئادەمیزاددا دەگەڕێ وەك گەڕانی خوێن تیایدا)).**

**-ئەم فەرموودەیە شوعیب و ئیبنو موسافیر و ئیبنو عەتیق و ئیسحاقی کوڕی یەحیا لە زوهریەوە گێڕاویانەتەوە ئەویش لە عەلییەوە - واتە کوڕی حوسەین- لە صەفییەوە ﵂ ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەیتەوە.**

## ٢٢- بابُ أَمْرِ الوَالِي إِذَا وَجَّهَ أَمِيرَيْنِ إِلَى مَوْضِعٍ أَنْ يَتَطَاوَعَا وَلاَ يَتَعَاصَيَا

٧١٧٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا العَقَدِيُّ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ أَبِي وَمُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ عَلَى اليَمَنِ فَقَالَ: «يَسِّرَا وَلاَ تُعَسِّرَا، وَبَشِّرَا وَلاَ تُنَفِّرَا، وَتَطَاوَعَا». فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى: إِنَّهُ يُصْنَعُ بِأَرْضِنَا الْبِتْعُ. فَقَالَ: «كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ». وَقَالَ النَّضْرُ وَأَبُو دَاوُدَ وَيَزِيدُ بْنُ هَارُونَ وَوَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سَعِيدٍ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٠٣٥.

(٢) بڕوانە: ٢٢٦١.

## ٢٢- باسی فەرمانی کاربەدەست ئەگەر دوو لێپرسراو بنێرێت بۆ وڵاتێک کە بە گوێی یەکتری بکەن و سەرپێچی یەکتری نەکەن

٧١٧٢- سەعیدی کوڕی ئەبو بوردە دەڵێ: لە باوکم بیست وتی: پێغەمبەر ﷺ باوکم و موعازی کوڕی جەبەلی ﷺ نارد بۆ یەمەن، فەرمووی (پێیان) ((ئاسانکاری بکەن و شت قورس مەکەن، موژدە دەربن خەڵك دوور مەخەنەوە، گوێڕایەڵی یەکتری بن (و جیاواز مەبن)، جا ئەبو موسا عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی لەو وڵاتەی ئێمەدا بیتع (خواردنەوەیەکە لە هەنگوین) دروست دەکرێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە)).

نەزر و ئەبو داوود و یەزیدی کوڕی هارون و وەکیع ئەم فەرموودەیان لە شوعبەوە گێڕاوەتەوە ئەویش لە سەعیدەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

## ٢٣- بابُ إِجَابَةِ الحَاكِمِ الدَّعْوَةَ

وَقَدْ أَجَابَ عُثْمَانُ ﷺ عَبْدًا لِلْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ.

٧١٧٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنِي مَنْصُورٌ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فُكُّوا الْعَانِيَ، وَأَجِيبُوا الدَّاعِيَ»[١].

---

(١) بڕوانە: ٣٠٤٦.

## ٢٣- باسی بەدەمەوە چوونی کاربەدەست بۆ بانگ کردنی نان خواردن

-بەدڵنیاییەوە عوسمان ﷺ چوو بەدەم بانگکردنی نان خواردنی کۆیلەیەکی موغەیەری کوڕی شوعبەوە ﷺ.

٧١٧٣- ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((دیل ئازاد بکەن [١] و بڕۆن بەدەم داوەت و بانگ کردنی نان خواردنەوە)).

## ٢٤- بابُ هَدَايَا العُمَّالِ

٧١٧٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّهُ سَمِعَ عُرْوَةَ، أَخْبَرَنَا أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ قَالَ: اسْتَعْمَلَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ لَهُ: ابْنُ الأُتَبِيَّةِ عَلَى صَدَقَةٍ، فَلَمَّا قَدِمَ قَالَ: هَذَا لَكُمْ وَهَذَا أُهْدِيَ لِي. فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ -قَالَ سُفْيَانُ أَيْضًا فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ- فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «مَا بَالُ الْعَامِلِ نَبْعَثُهُ، فَيَأْتِي يَقُولُ: هَذَا لَكَ وَهَذَا لِي؟ فَهَلاَّ جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ فَيَنْظُرُ أَيُهْدَي لَهُ أَمْ لاَ؟! وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يَأْتِي بِشَيْءٍ إِلاَّ جَاءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَحْمِلُهُ عَلَى رَقَبَتِهِ، إِنْ كَانَ بَعِيرًا لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةً تَيْعَرُ». ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْنَا عُفْرَتَيْ إِبْطَيْهِ: «أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ؟» ثَلاَثًا. قَالَ سُفْيَانُ: قَصَّهُ عَلَيْنَا الزُّهْرِيُّ. وَزَادَ هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعَ أُذُنَايَ وَأَبْصَرَتْهُ عَيْنِي، وَسَلُوا زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ فَإِنَّهُ سَمِعَهُ مَعِي. وَلَمْ يَقُلِ الزُّهْرِيُّ: سَمِعَ أُذُنِي[٢].

﴿ خُوَارٌ ﴿١٤٨﴾ ﴾ الأعراف. صَوْتٌ، وَالجُؤَارُ مِنْ ﴿ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ النحل، كَصَوْتِ البَقَرَةِ.

---

(١) لە هەمان فەرموودەدا کە لە صەحیحی بوخاریدا بە ژمارە: ٣٠٤٦ هێناویەتی دەڵێ: ( العانى - يعنى الأسير-) واتە: (العاني): یانی دیل و ئەسیر.

(٢) بڕوانە: ٩٢٥.

# ٢٤- باسی (حوکمی) دیاری (وەرگرتنی) کارمەندان

**٧١٧٤- ئەبوحومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی هۆزی ئەزد کە پێیان دەوت ئیبنو لئوتەبییە کردیە سەرپەرشتیاری کۆکردنەوەی زەکات، جا کاتێ (کارەکەی تەواو کرد و) هاتەوە وتی: ئەمە (زەکاتەکە) بۆ ئێوە ئەمەشیان دیاریە و بەخشراوە بەمن. پێغەمبەر ﷺ هەستا چووە سەر دوانگەکە- سوفیانیش وتی: چووە سەر دوانگەکە-جا سوپاس و ستایشی خوای کرد پاشان فەرمووی: ((ئەوە چییە کاربەدەستێك دەنێرین، کە دێتەوە دەڵێ: ئەوە بۆ تۆ و ئەوش بۆ من؟ ئەگەر وایە دەی بۆ ئەو کەسە لە ماڵی باوك و دایکیدا دانەنیشت، ئەوسا سەیر بکات ئایا دیاری بۆ دەهێنرێ یانا؟ سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە شتێك ناهێنێ (و بیبات بۆ خۆی)، ئیللا لە ڕۆژی دواییدا ئەو شتە دێنێت بەسەر ملیەوە هەڵیدەگرێت، ئەگەر وشترێك بوو بۆڕە بۆڕی دێ، یا مانگایەك بوو بۆڕە بۆڕی دێ، یامەڕێك بوو باعەباعی دێ))، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا هەپۆرای هەردوو بن هەنگڵیمان بینی و فەرمووی: ((خوایە ئەوا من گەیاندم)). سێ جاری فەرموو.**

**-سوفیان دەڵێ: زوهری ئەمەی بۆ گێڕاینەوە، هیشامیش ئەمەی لێ زیاد کرد: لە باوکیەوە لە ئەبی حومەیدەوە گێڕایەوە و وتی: هەردوو گوێم بیستی و چاوم بینی، وە پرسیار لە زەیدی کوڕی سابیت بکەن، ئەویش لەگەڵ مندا ئەو فەرموودەیەی بیستووە، وە زوهری نەیوت گوێم بیستی.**

**(خُوَارٌ): دەنگە، (الجُؤَارُ) لە (تَجئَرُونَ)[1] وەیە، (ڕیشەیان یەکە) وەك (بۆڕەو) دەنگی مانگا.**

(١) (خُوَارٌ): بۆ دەنگە بەگشتی مرۆڤ بێت یان مانگا، بەڵام (جُؤَار) بۆ دەنگی وەک مانگایە. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٥/١٣٥.

## ٢٥- بابُ اسْتِقْضَاءِ الْمَوَالِي [١] وَاسْتِعْمَالِهِمْ

٧١٧٥- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي ابْنُ جُرَيْجٍ، أَنَّ نَافِعًا أَخْبَرَهُ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ أَخْبَرَهُ قَالَ: كَانَ سَالِمٌ -مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ- يَؤُمُّ الْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ وَأَصْحَابَ النَّبِيِّ ﷺ فِي مَسْجِدِ قُبَاءٍ، فِيهِمْ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَأَبُو سَلَمَةَ وَزَيْدٌ وَعَامِرُ بْنُ رَبِيعَةَ[٢].

## ٢٥- باسی دانانی كۆیلەی ئازاد كراو بە قازی و دادوەر، وە كار پێ سپاردنیان[٣]

**٧١٧٥-ئیبنو جورەیج دەڵێ: نافیع بۆی گێڕایەوە كە ئیبنو عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە و وتی: سالیمی ئازاد كراوی ئەبی حوزەیفە ﷺ پێشنوێژی دەكرد بۆ كۆچەرە یەكەمینەكان و هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی قوبادا، كە لە ناویاندا ئەبو بەكر و عومەر و ئەبو سەلە و زەید و عامیری كوڕی ڕەبیعە ﷺ هەبوون[٤].**

## ٢٦- بابُ الْعُرَفَاءِ لِلنَّاسِ

٧١٧٦- ٧١٧٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَمِّهِ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: حَدَّثَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الحَكَمِ وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَخْبَرَاهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ حِينَ أَذِنَ لَهُمُ الْمُسْلِمُونَ فِي عِتْقِ سَبْيِ هَوَازِنَ: «إِنِّي لاَ أَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ، فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ».

---

(١) (المَوَالِي): بە غەیری عەرەبیش دەوترێت، بەڵام لەسەر باسەكەدا ئەوەی مەبەستە نووسیومانە.

(٢) بڕوانە: ٦٩٢.

(٣) وەک كۆكەرەوەی زەكات و هەر كارێكی تری گشتی وەک كارمەند و بەرپرس.

(٤) چونكە لە هەموویان زیاتر قورئانی لەبەر بوو، سەیری فەرموودەی (٦٩٢) بكە.

فَرَجَعَ النَّاسُ، فَكَلَّمَهُمْ عُرَفَاؤُهُمْ، فَرَجَعُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرُوهُ أَنَّ النَّاسَ قَدْ طَيَّبُوا وَأَذِنُوا[١].

## ٢٦- باسی نوێنەر و سەرپەرەشتیار بۆ خەڵکی

**٧١٧٦ -٧١٧٧- عوروەی کوڕی زوبەیری دەگێڕێتەوە کە مەروانی کوڕی حەکەم و میسوەری کوڕی مەخرەمە بۆیان گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ مسوڵمانان مۆڵەتیان پێدا بۆ ئازادکردنی ژن و منداڵەکانی هۆزی هەوازن، فەرمووی: ((من نازانم کێتان مۆڵەتی داوە جیا لەوانەی مۆڵەتیان نەداوە کەواتە بگەڕێنەوە (بۆ جێگای خۆتان)، هەتا نوێنەر و سەرپەرشتیارەکانتان بڕیاری ئێوە بەرز دەکەنەوە بۆمان))، ئینجا خەڵکەکە گەڕانەوە و نوێنەرەکانیان قسەیان لەگەڵیاندا کرد، پاشان نوێنەرەکان گەڕانەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێیان ڕاگەیاند کە بەدڵنیاییەوە خەڵکەکە پێیان خۆشە و ڕازین و مۆڵەتیاندا (بەگێڕانەوەیان).**

## ٢٧- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنْ الثَّنَاءِ عَلَى السُّلْطَانِ، وَإِذَا خَرَجَ قَالَ غَيْرَ ذَلِكَ

**٧١٧٨-** حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ أُنَاسٌ لِابْنِ عُمَرَ: إِنَّا نَدْخُلُ عَلَى سُلْطَانِنَا فَنَقُولُ لَهُمْ خِلَافَ مَا نَتَكَلَّمُ إِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِمْ قَالَ: كُنَّا نَعُدُّهَا نِفَاقًا.

---

(١) بڕوانە: ٢٣٠٧، ٢٣٠٨.

## ٢٧- باسی ئەوەی کە ناپەسەندە لە پیاهەڵدانی دەسەڵاتدار، وە کاتێ (ئەو کەسە) هاتە دەرەوە (لای دەسەڵاتدارەکە) بە پێچەوانەوە قسە بکات [١]

**٧١٧٨-عاصیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی زەیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: خەڵکانێك بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان وت ﷺ ئێمە دەڕۆین بۆ لای دەسەڵاتدارانمان شتانێکیان پێ دەڵێین پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی دەیڵێین کاتێ لای ئەوان هاتینە دەرەوە، (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ) وتی: ئێمە لە ڕابردوودا ئەوەمان بە دووڕوویی دادەنا و دەژمارد.**

٧١٧٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ عِرَاكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ شَرَّ النَّاسِ ذُو الْوَجْهَيْنِ، الذِي يَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ وَهَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ»[٢].

**٧١٧٩- عیراك لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە فەرموویەتی: ((بێگومان خراپترین خەڵك ئەو کەسە دووڕوومیە، کەسێکە دێت بۆ لای ئائەوانە بەڕوویەکەوە و وە دێت بۆ لای ئەوانەی تر بەڕوویەکی ترەوە)).**

## ٢٨- بابُ الْقَضَاءِ عَلَى الغَائِبِ

٧١٨٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ هِنْدَ قَالَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، فَأَحْتَاجُ أَنْ آخُذَ مِنْ مَالِهِ. قَالَ: «خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ»[١].

---

(١) واتە: کە دەڕوات بۆ لای دەسەڵاتدار بەشان و باڵیدا دەڵێ: کەهاتە دەروە قسەی پێ دەڵێ.

(٢) بڕوانە: ٣٤٩٤.

## ٢٨- باسی بڕیار دان لەسەر کەسی ئامادە نەبوو

**٧١٨٠- عائیشه ﵂ دەڵێ: هیند ﵂ به پێغەمبەری خوای ﷺ وت: بێگومان ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیل و ڕژدەیه، منیش پێویستمه (بەدزییەوه) له پارەی ئەو ببەم، فەرمووی: ((ئەوەندەی خۆت و منداڵەکانت پێویستان بێت ببه))[1].**

## ٢٩- بَابُ مَنْ قُضِيَ لَهُ بِحَقِّ أَخِيهِ فَلاَ يَأْخُذْهُ، فَإِنَّ قَضَاءَ الحَاكِمِ لاَ يُحِلُّ حَرَامًا وَلاَ يُحَرِّمُ حَلاَلاً

٧١٨١- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ زَيْنَبَ ابْنَةَ أَبِي سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ خُصُومَةً، بِبَابِ حُجْرَتِهِ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ فَقَالَ: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّهُ يَأْتِينِي الخَصْمُ، فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَادِقٌ فَأَقْضِي لَهُ بِذَلِكَ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ، فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ، فَلْيَأْخُذْهَا أَوْ لِيَتْرُكْهَا»[2].

## ٢٩- باسی کەسێک بڕیاری بۆ درابێت بەمافی براکەی[3]، با وەری نەگرێت، چونکه بێگومان بڕیاری قازی حەرام حەڵاڵ ناکات، وە حەڵاڵ حەرام ناکات

**٧١٨١-عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە بۆی گێڕاوەتەوە کە ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە له**

(١) بڕوانه: ٢٢١١.

(٢) بڕوانه: ٢٤٥٨.

(٣) بەرانبەرەکەی.

**پێغەمبەری خواوە ﷺ، کە لەبەر دەرگای ژوورەکەیدا گوێی لە مشتومڕێك بوو، ئەویش هاتە دەرەوە بۆ لایان وفەرمووی: ((بێگومان من مرۆڤێکم، و بەڕاستی داواچی دێنە لام، جا لەوانەیە هەندێکتان لە هەندێکتان قسەزانترو زمانپاراوتر بن، منیش وا گومان دەبەم ڕاست دەکات، ئیتر حوکم دەدەم بە قازانجی ئەو، ئەوسا هەر کەس بڕیارم بۆدا کە مافی مسوڵمانێك ببات، ئەوە بێگومان پارچەیەکە لە ئاگری دۆزەخ، جا خۆی ئازادە بیبات یا وازی لێ بێنێت)).**

٧١٨٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ عُتْبَةُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ عَهِدَ إِلَى أَخِيهِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ أَنَّ ابْنَ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ مِنِّي، فَاقْبِضْهُ إِلَيْكَ. فَلَمَّا كَانَ عَامُ الفَتْحِ أَخَذَهُ سَعْدٌ فَقَالَ: ابْنُ أَخِي، قَدْ كَانَ عَهِدَ إِلَيَّ فِيهِ. فَقَامَ إِلَيْهِ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فَقَالَ: أَخِي وَابْنُ وَلِيدَةِ أَبِي، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ. فَتَسَاوَقَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْنُ أَخِي، كَانَ عَهِدَ إِلَيَّ فِيهِ. وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ أَخِي وَابْنُ وَلِيدَةِ أَبِي، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ بْنَ زَمْعَةَ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ». ثُمَّ قَالَ لِسَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ «احْتَجِبِي مِنْهُ». لِمَا رَأَى مِنْ شَبَهِهِ بِعُتْبَةَ، فَمَا رَآهَا حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ تَعَالَى[1].

**٧١٨٢- عوروەی کوڕی زوبەیر لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە عائیشە وتی: عوتبەی کوڕی ئەبی وەققاص بەسەعدی برای وت: (عەبدوڕەحمانی) کە کوڕی کەنیزەکەکەی زەمعەیە لە منە و وەریگرەوە و بیهێنەوە لای خۆت، ئەنجا ئەو ساڵەی مەککە ئازادکرا سەعد ئەو کوڕەی بردە لای خۆی وتی: برازامە، لە ڕاستیدا براکەم پێی وتووم بیهێنمە لای خۆم، عەبدی کوڕی زەمعەش هەستا بۆی وتی: ئەمە برامە کوڕی کەنیزەکی باوکمە**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٥٣.

کاتێ لە دایك بوو لە ماڵ و جێگەی باوکمدا بوو[1]، جا هەردووکیان یەکتریان بە پاڵنان برد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا سەعد وتی: ئەمە برازامە براکەم پێی وتووم بیهێنمە لای خۆم، عەبدی کوڕی زەمعەش وتی: ئەمە برامە کوڕی کەنیزەکی باوکمە، ئەو کەنیزەکە هی باوکم بووە کاتێ ئەم کوڕی بووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی عەبدی کوڕی زەمعە ئەم کوڕە بۆ تۆیە))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مندالْ هی ئەو کەسەیە کە لە ماڵ و جێگەی ئەودا بێت، ئەوەش زینای لەگەڵا کردوە بێ بەشی بۆ هەیە))، پاشان بەسەودەی کچی زەمعەی فەرموو: ((خۆتی لێ داپۆشەو با نەتبینێ))، کاتێ بینی عەبدوڕەحمان لە عوتبە دەچێ، ئیتر عەبدوڕەحمان سەودەی نەبینی تا مرد و گەشتەوە بە پەروەردگاری بەرز و بڵندی.

## ٣٠- بابُ الحُكْمِ فِي البِئْرِ وَنَحْوِهَا

٧١٨٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ وَالأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَحْلِفُ عَلَى يَمِينِ صَبْرٍ يَقْتَطِعُ مَالاً وَهْوَ فِيهَا فَاجِرٌ إِلاَّ لَقِيَ اللَّهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ». فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ﴿٧٧﴾ ﴾ الآيَةَ. آل عمران[2].

## ٣٠- باسی بڕیار دان دەربارەی بیر و شتی لەو جۆرە[3]

٧١٨٣- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس سوێندێکی پابەندکەر[1] بخوات بۆ ئەوەی ماڵ و سامانێکی پێ ببچڕێت (بۆ خۆی) لە

---

(١) واتە: ئەو کەنیزەکە کاتێ عەبدوڕەحمان بووە ئەبی زەمعە خاوەن و گەورەی بووە.

(٢) بڕوانە: ٢٣٥٦.

(٣) وەک حەوز و خانوو.

**کاتێکدا لەو سوێند خواردنەیدا درۆزنە، (لە ڕۆژی دواییدا) کە دەگات بەخوا، خوا زۆر لێی توڕەیە))، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن ئەوانە بێ بەشن (لە بەهرەی خوا) لە ڕۆژی دواییدا، وە خوا لە ڕۆژی دواییدا قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات و لە گوناهیان خۆش نابێت، وە ئەوان سزای بەئازاریان بۆ هەیە).**

٧١٨٤ - فَجَاءَ الأَشْعَثُ وَعَبْدُ اللهِ يُحَدِّثُهُمْ فَقَالَ: فِيَّ نَزَلَتْ وَفِي رَجُلٍ خَاصَمْتُهُ فِي بِئْرٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَلَكَ بَيِّنَةٌ؟». قُلْتُ: لاَ. قَالَ: «فَلْيَحْلِفْ». قُلْتُ: إِذًا يَحْلِفُ. فَنَزَلَتْ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ﴿٧٧﴾ ﴾ الآيَةَ. آل عمران[٢].

**٧١٨٤- ئینجا ئەشعەس ﷺ هات لەو کاتەدا عەبدوڵلا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ فەرموودەی بۆ دەگێڕانەوە، (ئەشعەس) وتی: دەربارەی من و پیاوێك کە داواچی بووم لە دژی لەسەر بیرێك ئەو ئایەتە دابەزی، پێغەمبەریش فەرمووی (بە من): ((ئایا تۆ شایەتت هەیە؟)) وتم: نەخێر فەرمووی: ((کەواتە با ئەو سوێند بخوات))، وتم: کەوابوو سوێند دەخوات، ئیتر بەهۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانی خۆیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن)، تا کۆتای ئایەتەکە.**

---

(١) قەستەلانی دەڵێ: (مَن حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ صَبْرٍ) واتە: زۆری لێکرا هەتا سوێندی خوارد، یان بە بوێری و ئازایانە سوێندی خوارد. (إرشاد الساري:٩٤/١٥) بەو دوو شێوە مانای کردوە، هەروەها دەڵێ: (يَمِينٍ صَبْرٍ) ئەو سوێندەیە قازی سوێند بۆ خوراوەکەی پێ پابەند دەکات. (إرشاد الساري:١٤٣/١٠). ئیبنو لئەسیریش دەڵێ: (يَمِين صَبْر) واتە: سوێندێکە پابەند کرابێت پێی و لەسەری زیندانی کرابێت، وە لە ڕووی حوکم و بڕیارەوە پابەندکەر بێت بۆ خاوەنەکەی. (النهاية في غريب الحديث والأثر لإبن الأثير:١٠/٢ ).
(٢) بڕوانە: ٢٣٥٧.

## ٣١- بابُ القضَاءِ فِي كَثِيرِ المَالِ وَقَلِيلِه

وَقَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ ابْنِ شُبْرُمَةَ: الْقَضَاءُ فِي قَلِيلِ المَالِ وَكَثِيرِهِ سَوَاءٌ.

٧١٨٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ زَيْنَبَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ، عَنْ أُمِّهَا أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ جَلَبَةَ خِصَامٍ عِنْدَ بَابِهِ، فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ فَقَالَ: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّهُ يَأْتِينِي الْخَصْمُ، فَلَعَلَّ بَعْضًا أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ أَقْضِي لَهُ بِذَلِكَ وَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَادِقٌ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ، فَلْيَأْخُذْهَا أَوْ لِيَدَعْهَا»[1].

## ٣١- باسی دادوەری لە زۆر و کەمی ماڵ و ساماندا

ئیبنو عویەینە لە ئیبنو شوبرومەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: دادوەری لە کەم و زۆری ماڵ و ساماندا یەکسانە.

٧١٨٥- عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێ: کە زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە بۆ گێڕاوەتەوە لە دایکییەوە کە ئوممو سەلەمەیە رضي الله عنها وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر دەرگای ژوورەکەیدا گوێی لە دەنگە دەنگی داواچیان بوو، ئەویش هاتە دەرەوە و بۆ لایان و فەرمووی: ((بێگومان من مرۆڤێکم، وە بەڕاستی داواچی دێنە لام، جا لەوانەیە هەندێکتان لە هەندێکتان قسەزانتر و زمانپاراوتر بن، منیش حوکم دەدەم بە قازانجی ئەو، وا گومان دەبەم ڕاست دەکات، ئەوسا هەر کەس بڕیارم بۆ دا کە مافی مسوڵمانێك ببات، ئەوە بێگومان پارچەیەکە لە ئاگری دۆزەخ، جا با بیبات یا وازی لێ بێنێت)).

(١) بڕوانە: ٢٤٥٨.

## ٣٢- بَابُ بَيْعِ الإِمَامِ عَلَى النَّاسِ أَمْوَالَهُمْ وَضِيَاعَهُمْ

وَقَدْ بَاعَ النَّبِيُّ ﷺ مُدَبَّرًا مِنْ نُعَيْمِ بْنِ النَّحَّامِ

٧١٨٦- حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ كُهَيْلٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: بَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِهِ أَعْتَقَ غُلاَمًا عَنْ دُبُرٍ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرَهُ، فَبَاعَهُ بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ ثُمَّ أَرْسَلَ بِثَمَنِهِ إِلَيْهِ[1].

## ٣٢- باسی (حوکمی) فرۆشتنی پێشەوا بۆ ماڵ و سامان و زەویی و زاری خەڵکی

**بێگومان پێغەمبەر ﷺ ئازادکراوێکی دوا مردنی[2] فرۆشت بە نوعەیمی کوڕی نەححام.**

**٧١٨٦-جابیر ﷺ دەڵێ: بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت کە پیاوێك لە هاوەڵانی کۆیلەیەکی گەنجی ئازاد کرد دوای مردنی [3]، وە جگەلە ئەو کۆیلەیە ماڵی و سامانی نەبوو، پێغەمبەریش ﷺ فرۆشتی بە هەشت سەد درهەم، پاشان پارەکەی بۆ نارد.**

## ٣٣- بَابُ مَنْ لَمْ يَكْتَرِثْ بِطَعْنِ مَنْ لاَ يَعْلَمُ فِي الأُمَرَاءِ حَدِيثًا

٧١٨٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْثًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ،

---

(١) بڕوانە: ٢١٤١.

(٢) کۆیلەیەکە خاوەنەکەی دەڵێ: هەر کاتێ من مردم تۆ ئازادی، جا کە خاوەنەکە مرد ئازاد دەبێت، جا نوعەیمە کۆیلەکەی خۆی وا لێ کردبوو بەڵام هیچ ماڵی نەبوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بۆی فرۆشت و پارەکەی پێدا.

(٣) واتە: دوا مردنی خاوەنەکە نەک کۆیلەکە.

فَطُعِنَ فِي إِمَارَتِهِ، وَقَالَ: «إِنْ تَطْعَنُوا فِي إِمَارَتِهِ فَقَدْ كُنْتُمْ تَطْعَنُونَ فِي إِمَارَةِ أَبِيهِ مِنْ قَبْلِهِ، وَايْمُ اللَّهِ إِنْ كَانَ لَخَلِيقًا لِلإِمْرَةِ، وَإِنْ كَانَ لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ، وَإِنَّ هَذَا لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ بَعْدَهُ»[١].

## ٣٣- باسی کەسێک [٢] گوێ نەدات بە ڕەخنە و قسەی کەسێک دژی لێپرسراوان بە نەزانی بیکات و بیڵێت

**٧١٨٧- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەیە لە هاوەڵانی نارد (بۆ شوێنێك) ئوسامەی کوڕی زەیدی ﵄ کرد بە فەرماندەیان، ئینجا هەندێ کەس ڕەخنەیان لە فەرماندەییەکەی گرت[٣]، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ڕەخنە لە فەرماندەیەتی ئەو (ئوسامە) دەگرن، ئەوە بێگومان پێشتریش ڕەخنەتان لە فەرماندەیەتی باوکی دەگرت، سوێند بەخوا زەید شیاو بوو بۆ فەرماندەیەتی، وە بەڕاستی (زەید) خۆشەویسترین کەسە لای من، وە بێگومان ئەم (ئوسامە) ش دوای ئەو خۆشەویسترین کەسە لای من)).**

## ٣٤- بابُ الألَدِّ الخَصِمِ وَهْوَالدَّائِمُ فِي الخُصُومَةِ

﴿لُّدًّا ﴿٩٧﴾﴾ مريم: عُوجًا.

**٧١٨٨-** حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبْغَضُ الرِّجَالِ إِلَى اللَّهِ الأَلَدُّ الخَصِمُ»[٤].

---

(١) بڕوانە: ٣٧٣٠.

(٢) کار بەدەست و دەسەڵاتدار.

(٣) وتیان چۆن دەبێ کۆیلەیەکی ئازاد کراو فەرماندەی کەسانی ئازاد بێ.

(٤) بڕوانە: ٢٤٥٧.

## ٣٤- باسی چەلەحانێکەرێکی سەرسەخت ئەو کەسەیە بەردەوامە لە دوژمنایەتی و ناکۆکیدا

﴿ لُدًّا ﴾: دوژمنانی سەرسەخت.

٧١٨٨- ئیبنو ئەبی مولەیکە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بوغزاوترینی پیاوان لای خوا ئەو کەسانەن کە سەرسەختانە چەلەحانێ[1] دەکەن)).

## ٣٥- بابٌ: إِذَا قَضَى الحَاكِمُ بِجَوْرٍ أَوْ خِلاَفِ أَهْلِ العِلْمِ فَهُوَ رَدٌّ

٧١٨٩- حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ خَالِدًا ح وَحَدَّثَنِي نُعَيْمٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ إِلَى بَنِي جَذِيمَةَ، فَلَمْ يُحْسِنُوا أَنْ يَقُولُوا: أَسْلَمْنَا، فَقَالُوا: صَبَأْنَا صَبَأْنَا، فَجَعَلَ خَالِدٌ يَقْتُلُ وَيَأْسِرُ، وَدَفَعَ إِلَى كُلِّ رَجُلٍ مِنَّا أَسِيرَهُ، فَأَمَرَ كُلَّ رَجُلٍ مِنَّا أَنْ يَقْتُلَ أَسِيرَهُ، فَقُلْتُ وَاللَّهِ لاَ أَقْتُلُ أَسِيرِي، وَلاَ يَقْتُلُ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِي أَسِيرَهُ. فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ». مَرَّتَيْنِ[2].

## ٣٥- باسێک: ئەگەر دادوەر بەستەم بڕیاریدا، یان بەپێچەوانەی ڕای زانایانەوە ئەوە بڕیارەکەی ڕەد دەکرێتەوە

٧١٨٩- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) مەحمود بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدوڕەزاق بۆی گێڕاینەوە وتی: مەعمەر لە زوهرییەوە بۆی گێڕاینەوە ئەویش لە سالیمەوە لە

(١) (الأَلَدُّ الخَصِمُ) بەدوو شێوە مانا کراوە: چەلەحانێ کردنی زۆر، وە توندی لە چەلەحانێ کردندا. (إرشاد الساري: ١٥/١٤٦).

(٢) بڕوانە: ٤٣٣٩.

**عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ خالیدی ﷺ نارد. وە نوعەیم بۆی گێڕامەوە وتی: عەبدوڵڵا بۆی گێڕاینەوە وتی: مەعمەر لە زوهریەوە بۆی گێڕاینەوە ئەویش لە سالیمەوە لە باوكیەوە گێڕایەوە[1] وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ خالیدی كوڕی وەلید ﷺ نارد بۆ سەر بەنی جەزیمە (و بانگی كردن بۆ هاتنە ناو ئیسلامەوە )، بەڵام نەیانزانی بە ڕێك و پێكی بڵێن مسوڵمان بووین، بەڵكو وتیان: لە ئایین دەرچووین (بۆ ناو ئیسلام) لە ئایین دەرچووین (بۆ ناو ئیسلام)، بۆیە خالیدیش دەستی كرد بە كوشتن و دیل كردنیان، وە هەر پیاوێكمان دیلەكەی خۆی دایە دەستی، وە فەرمانی كرد كە هەر كەسێكمان دیلەكەی خۆی بكوژێت (عەبدوڵڵا دەڵێ) منیش وتم: وەڵڵاهی من دیلەكەی خۆم ناكوژم، وە هیچ كام لە هاوەڵكانیشم دیلەكەی ناكوژێت. (گەڕاینەوە و) ئەو باسەمان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوایە بەڕاستی من بەریبوونی خۆم لای تۆ دەردەبڕم لەوەی خالید كردوویەتی)). دوو جار فەرمووی.**

## ٣٦- بابُ الإِمَامِ يَأْتِي قَوْمًا فَيُصْلِحُ بَيْنَهُمْ

٧١٩٠- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ المَدِينِيُّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: كَانَ قِتَالٌ بَيْنَ بَنِي عَمْرٍو، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَصَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ أَتَاهُمْ يُصْلِحُ بَيْنَهُمْ، فَلَمَّا حَضَرَتْ صَلاَةُ العَصْرِ فَأَذَّنَ بِلاَلٌ وَأَقَامَ، وَأَمَرَ أَبَا بَكْرٍ فَتَقَدَّمَ، وَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ فِي الصَّلاَةِ فَشَقَّ النَّاسَ حَتَّى قَامَ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَتَقَدَّمَ فِي الصَّفِّ الذِي يَلِيهِ. قَالَ: وَصَفَّحَ الْقَوْمُ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلاَةِ لَمْ يَلْتَفِتْ حَتَّى يَفْرُغَ، فَلَمَّا

(١) بۆیە سەنەدەكەمان مانا كردوە چونكە فەرموودەكە دوو سەنەدی هەیە، جار جار ئەو جۆرە سەنەدانە مانا دەكەین بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونی.

رَأَى التَّصْفِيحَ لاَ يُمْسَكُ عَلَيْهِ الْتَفَتَ فَرَأَى النَّبِيَّ ﷺ خَلْفَهُ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ أَنِ امْضِهْ وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ هَكَذَا، وَلَبِثَ أَبُو بَكْرٍ هُنَيَّةً يَحْمَدُ اللَّهَ عَلَى قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ مَشَى الْقَهْقَرَى، فَلَمَّا رَأَى النَّبِيُّ ﷺ ذَلِكَ تَقَدَّمَ فَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ بِالنَّاسِ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ قَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا مَنَعَكَ إِذْ أَوْمَأْتُ إِلَيْكَ أَنْ لاَ تَكُونَ مَضَيْتَ؟». قَالَ لَمْ يَكُنْ لاِبْنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يَؤُمَّ النَّبِيَّ ﷺ. وَقَالَ لِلْقَوْمِ: «إِذَا نَابَكُمْ أَمْرٌ فَلْيُسَبِّحِ الرِّجَالُ وَلْيُصَفِّحِ النِّسَاءُ»[1].

## ٣٦- باسی پێشەوا بێت بۆ لای کەسانێک و نێوانیان چاک کاتەوە

**٧١٩٠-سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: بەنی عەمر لە نێوانیاندا جەنگ ڕوویدابوو ئەو هەواڵە گەشت بە پێغەمبەر ﷺ جا نوێژی نیوەڕۆی کرد پاشان ڕۆشت بۆ لایان، تا نێوانیان چاك كاتەوە، ئینجا کە کاتی نوێژی عەسر بوو بیلال ﷺ بانگیدا و قامەتی کرد و داوای کرد لە ئەبو بەکر ﷺ ئەویش ڕۆشتە پێشەوە (پێشنوێژی بۆ کردن)، پێغەمبەر ﷺ هاتەوە و ئەبو بەکر لە نوێژەکەدا بوو، پێغەمبەر ﷺ بەناو خەڵکەکەدا ڕۆشت هەتا لە پشتی ئەبو بەکرەوە ﷺ وەستا و پێش کەوت لەو ڕیزەی لە دوای ئەبو بەکرەوەیە[2]، (سەهل) دەڵێ: خەڵکەکە چەپڵەیان لێدا، ئەبو بەکریش ﷺ ئەگەر بڕۆشتایەتە ناو نوێژەوە لای نەدەکردەوە هەتا تەواو دەبوو، ئینجا کە زانی چەپڵە لێدانەکە بۆی لێدرا و نەوەستێنرا لای کردەوە و پێغەمبەری ﷺ بینی لە دوایەوەیە، پێغەمبەریش ئاماژەی بۆ کرد کە بەردەوامبە، وە بەدەستی ئاوەها ئاماژەی کرد، ئەبو بەکریش ﷺ ماوەیەکی کەم مایەوە و سوپاسی خوای کرد لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ پاشان پشتا و پشت هاتە دواوە، ئینجا کە پێغەمبەریش ئەوەی بینی چووە پێشەوە، جا پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی کرد بۆ خەڵکەکە، ئینجا کە نوێژەکەی**

(١) بڕوانە: ٦٨٤.

(٢) واتە: ڕۆشتە پێش ڕیزی یەکەم و دوای ئەبو بەکرەوە ﷺ.

**تەواوكرد فەرمووی: ((ئەی ئەبو بەكر كە من ئاماژەم بۆ كردی چی ڕێگرت بوو كە بەردەوام نەبوویت؟)) ئەبو بەكر وتی: بۆ كوڕی ئەبی قوحافە نییە كە پێشنوێژی بۆ پێغەمبەر ﷺ بكات، وە فەرمووی بەخەڵكەكە: ((ئەگەر (لە نوێژدا) شتێك لێی ڕوودان با پیاوان** سبحانه الله **بكەن و ژنانیش چەپڵە لێ بدەن)).**

## ٣٧- بابٌ: يُسْتَحَبُّ لِلْكَاتِبِ أَنْ يَكُونَ أَمِينًا عَاقِلاً

٧١٩١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ أَبُو ثَابِتٍ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ السَّبَّاقِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ لِمَقْتَلِ أَهْلِ الْيَمَامَةِ وَعِنْدَهُ عُمَرُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ: إِنَّ الْقَتْلَ قَدِ اسْتَحَرَّ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ، وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ فِي الْمَوَاطِنِ كُلِّهَا فَيَذْهَبَ قُرْآنٌ كَثِيرٌ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَأْمُرَ بِجَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ: كَيْفَ أَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ عُمَرُ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي فِي ذَلِكَ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِى شَرَحَ لَهُ صَدْرَ عُمَرَ وَرَأَيْتُ فِي ذَلِكَ الذِي رَأَى عُمَرُ. قَالَ زَيْدٌ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَإِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ لاَ نَتَّهِمُكَ، قَدْ كُنْتَ تَكْتُبُ الوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَتَبَّعِ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ. قَالَ زَيْدٌ: فَوَاللَّهِ لَوْ كَلَّفَنِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الجِبَالِ مَا كَانَ بِأَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا كَلَّفَنِي مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلاَنِ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ يَزَلْ يَحُثُّ مُرَاجَعَتِي حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِى شَرَحَ اللَّهُ لَهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَرَأَيْتُ فِي ذَلِكَ الذِي رَأَيَا، فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الْعُسُبِ وَالرِّقَاعِ وَاللِّخَافِ وَصُدُورِ الرِّجَالِ، فَوَجَدْتُ آخِرَ سُورَةِ التَّوْبَةِ ﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة. إِلَى آخِرِهَا مَعَ خُزَيْمَةَ -أَوْ أَبِي خُزَيْمَةَ- فَأَلْحَقْتُهَا فِي سُورَتِهَا، وَكَانَتِ الصُّحُفُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ

حَيَاتَهُ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ ﷻ، ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَيَاتَهُ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ: اللِّخَافُ يَعْنِي: الخَزَفَ[1].

## ٣٧- باسێک: سوننەتە نوسەر (ی بڕیاری قازی) متمانە پێکراو و ژیر بێت

**٧١٩١- ئیبنو شیهاب دەڵێ: عوبەیدی کوڕی سەبباق دەگێڕێتەوە لە زیدی کوڕی سابیتەوە ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ لە ڕۆژی کوژرانی خەڵکی (لە) یەمامە ناردی بەشوێنمدا (و ڕۆشتم) عومەریشی لابوو، ئەنجا ئەبو بەکر وتی: عومەر هاتووە بۆ لام وتی: بەڕاستی لە ڕۆژی (جەنگی) یەمامەدا کوشتار زۆر بوو لە قورئان خوێنان، وە بەڕاستی من دەترسم لە هەموو شوێنەکانی (جەنگ)ـدا کوشتار زۆر ببێ لە ناو قورئان خوێناندا، بەهۆیەوە زۆرێك لە قورئان بفەوتێت و نەمێنێ، وە بەڕاستی من ڕام وایە کە فەرمان بکەیت بە کۆکردنەوەی قورئان، منیش وتم: چۆن شتێك بکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردوە، عومەریش وتی: وەڵڵاهی ئەو (کۆکردنەوەیە) کارێکی چاکە، جا بەردەوام عومەر لەو بارەیەوە پێی دەوتمەوە تا خوا دڵمی گوشاد کرد و ڕازی بووم، بۆ ئەوکارەی دڵی عومەری گوشادکرد و ڕازی بوو، وە ڕا و بۆچوونی منیش لەو باریەوە هەمان ڕا و بۆچوونی عومەر بوو، زەید وتی: ئەبو بەکر وتی: تۆ کەسێکی گەنج و ژیری متمانەمان پێتە[2]، بێگومان تۆ پێشتر نیگات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەنووسیەوە، کەواتە بگەڕێ بە شوێن (ئایەت و سوڕەتەکانی) قورئاندا کۆی بکەرەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٨٠٧.

(٢) ناترسین درۆ بکەیت یان شتت لە بیر بچێت کە زیان بە قورئانەکە بگەیەنێت.

**زەید وتی: جا سوێند بەخوا ئەگەر داوای گواستنەوەی شاخێك لە شاخەكانی لێ بكردمایە لەو فەرمانەی پێكردم قورستر نەبوو بەلامەوە كە كۆكردنەوەی قورئانە، (زەید دەڵێ) وتم: چۆن هەردووكتان شتێك دەكەن كە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیكردوە؟ ئەبو بەكر ﷺ وتی: وەڵڵاهی ئەوە كارێكی چاكە جا بەردەوام قسەی لەگەڵ دەكردم و هانی دەدام، تا خوا دڵی منیشی گوشاد كرد و ڕازی بووم بۆ ئەو كارەی خوا دڵی ئەبو بەكر و دڵی عومەری بۆ گوشاد كردبوو، وە ڕای منیش لەو بارەیەوە هەمان ڕا و بۆچوونی ئەوان بوو، ئیتر منیش هەستام و گەڕام بە شوێن (سوڕەت و ئایەتەكانی) قورئاندا و كۆم دەكردەوە لە پێست و ئێسكی دەڤ شان (ی ئاژەڵ) و پەلی دار خورما[1]، وە سنگی كەسەكان[2] (هەمووی گەڕام) تا كۆتایی سوڕەتی تەوبەم: (سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمەرێكتان لە خۆتان بۆ هاتووە)، تا كۆتای سوڕەتەكە، لای خوزەیمە- یان ئەبی خوزەیمە - دۆزیمەوە و خستمە پاڵ سوڕەتەكەی خۆی (كە سوڕەتی تەوبەیە).**

**وە ئەو پەڕەو وشتانەی كە قورئانیان تیادا كۆكرابۆوە لای ئەبو بەكر بوو، ئەوەندەی لە ژیاندا بوو تا وەفاتی كرد، لە پاشان لای عومەر بوو ئەوەندەی لە ژیاندا بوو تا وەفاتی كرد، لە پاشان لای حەفصەی كچی عومەر بوو ﷺ.**

**موحەممەدی كوڕی عوبەیدوڵلا[3] دەڵێ: (اللِّخَافُ): واتە: سواڵەت[4].**

## ٣٨- بابُ كِتَابِ الحَاكِمِ إِلَى عُمَّالِهِ، وَالْقَاضِي إِلَى أُمَنَائِهِ

٧١٩٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي لَيْلَى ح. حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي لَيْلَى بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَهْلٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ أَنَّهُ

---

(١) لقی دار خورماكە گەڵاكانی لێ كرابێتەوە تەنگ و ڕێكیان كردوە لەسەریان نووسیوە.

(٢) كە قورئانیان لەبەر كردوە لە سنگیاندا.

(٣) مامۆستای ئیمامی بوخاریە كە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

(٤) قوری بە ئاگر سووركراوە.

أَخْبَرَهُ هُوَ وَرِجَالٌ مِنْ كُبَرَاءِ قَوْمِهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْ، فَأُخْبِرَ مُحَيِّصَةُ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ قُتِلَ وَطُرِحَ فِي فَقِيرٍ -أَوْ عَيْنٍ- فَأَتَى يَهُودَ فَقَالَ: أَنْتُمْ وَاللَّهِ قَتَلْتُمُوهُ. قَالُوا: مَا قَتَلْنَاهُ وَاللَّهِ. ثُمَّ أَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِهِ فَذَكَرَ لَهُمْ، وَأَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ -وَهْوَ أَكْبَرُ مِنْهُ- وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ، فَذَهَبَ لِيَتَكَلَّمَ -وَهْوَ الَّذِي كَانَ بِخَيْبَرَ- فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِمُحَيِّصَةَ: «كَبِّرْ كَبِّرْ». يُرِيدُ السِّنَّ، فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ، وَإِمَّا أَنْ يُؤْذِنُوا بِحَرْبٍ». فَكَتَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَيْهِمْ بِهِ، فَكُتِبَ: مَا قَتَلْنَاهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِحُوَيِّصَةَ وَمُحَيِّصَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ: «أَتَحْلِفُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ؟». قَالُوا: لاَ. قَالَ: «أَفَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ؟». قَالُوا لَيْسُوا بِمُسْلِمِينَ. فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ مِائَةَ نَاقَةٍ حَتَّى أُدْخِلَتِ الدَّارَ. قَالَ سَهْلٌ: فَرَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ[1].

## ٣٨- باسی نامە نوسینی کاربەدەست بۆ بەرپرس و کارمەندەکانی، وە نامە نووسینی دادوەر بۆ نوێنەرەکان[2]

**٧١٩٢-ئەبی لەیلای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی سەهل لە سەهلی کوڕی ئەبی حەسمەوە، خۆی و چەند گەورە پیاوانی هۆزەکەی بۆیان گێڕایەوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەییسە دەڕۆن بۆ خەیبەر لەبەر نەبوونی و برسێتی کە تووشیان بوو بوو. ئینجا هەواڵ درا بەموحەییسە کە عەبدوڵڵا کوژراوە و فڕێ دراوەتە چاڵێکەوە (کە نەمامی تیا دەنێژن) -یان کارێزێکەوە-، جا هات بۆ لای جولەکەکان و پێی وتن: بەخوا ئێوە کوشتووتانە، ئەوانیش وتیان: بەخوا ئێمە نەمان کوشتووە، لە پاشان هاتەوە تا گەشتەوە ناو هۆزەکەی و ڕووداوەکەی بۆ باس کردن، وە خۆی و حوومەییصەی برای -کە لەو**

(١) بڕوانە: ٢٧٠٢.

(٢) وەک ئەو ئەمیندارانەی بە فەرمانی قاز ی و دادوەر ماڵ و سامانی خەڵک دەپارێزن.

گەورەتر بوو-لەگەڵ عەبدوڕەحمانی كوڕی سەهل هاتن (بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ) جا موحەییصە ویستی قسە بكات- ئەوەیان بوو كە لە خەیبەر بوو- پێغەمبەر ﷺ بەموحەییصەی فەرموو: ((گەورەترەكە گەورەترەكە)) مەبەستی تەمەن بوو[1]، جا حوەییصە قسەی كرد پاشان موحەییصە قسەی كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((یان دەبێت ئەوان (جولەكەكان) خوێنی هاوەڵەكەتان بدەن یان دەبێ جەنگ ڕاگەیەنن))، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە نامەی بۆ نووسین، نامەی بۆ نووسرایەوە (نووسیبویان): كە ئێمە نەمان كوشتووە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بەحووەیصە و موحەییصە و عەبدوڕەحمانی فەرموو: ((ئایا ئێوە سوێند دەخۆن تا خوێنی هاوەڵەكەتان مسۆگەر بكەن؟)) وتیان: نەخێر، فەرمووی: ((ئەی جولەكەكان سوێنتان بۆ بخۆن؟[2])) وتیان: ئەوان مسوڵمان نین، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن خۆیەوە خوێنەكەی بۆدان كە سەد وشتر بوو بۆی ناردن، تا كرانە ژوورەوە بۆ ماڵەوەیان-سەهل وتی: وشترێكیان لەقەیەكی لێدام.

## ٣٩- بابٌ: هَلْ يَجُوزُ لِلْحَاكِمِ أَنْ يَبْعَثَ رَجُلاً وَحْدَهُ لِلنَّظَرِ فِي الأُمُورِ؟

٧١٩٣- ٧١٩٤- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ قَالاَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ. فَقَامَ خَصْمُهُ فَقَالَ: صَدَقَ، فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ. فَقَالَ الأَعْرَابِيُّ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، فَقَالُوا لِي: عَلَى ابْنِكَ الرَّجْمُ. فَفَدَيْتُ ابْنِي مِنْهُ بِمِائَةٍ مِنَ الْغَنَمِ وَوَلِيدَةٍ، ثُمَّ سَأَلْتُ أَهْلَ العِلْمِ فَقَالُوا: إِنَّمَا عَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ.

---

(١) واتە: با بەتەمەنتر لە تۆ قسە بكات.

(٢) باوەڕ بەسوێندەكەیان دەكەن.

فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ، أَمَّا الوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ فَرَدٌّ عَلَيْكَ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَأَمَّا أَنْتَ يَا أُنَيْسُ -لِرَجُلٍ- فَاغْدُ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا فَارْجُمْهَا». فَغَدَا عَلَيْهَا أُنَيْسٌ فَرَجَمَهَا[1].

## ٣٩- باسێک: ئایا دروسته بۆ کار بەدەست کە یەک پیاو بە تەنها بنێرێت بۆ بینین و سەرنجدانی کاروبار (ی مسوڵمانان)

**٧١٩٣- ٧١٩٤- ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی ﵄ هەردووکیان دەڵێن: پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەکتێبەکەی خوا بڕیاربدە لە نێوانماندا، جا ڕکابەرەکەی هەستا و وتی: ڕاست دەکات، بەکتێبەکەی خوا بڕیاربدە لە نێوانماندا، عەرەبە دەشتەکیەکە وتی: لە ڕاستیدا کوڕەکەی من کرێکار بووە لای ئەم پیاوە، وە زینای کردوە لەگەڵ خێزانەکەیدا، بەمنیان وتووە: کوڕەکەی تۆ بەردبارانکردنی لەسەرە. منیش سەد سەر مەڕ و کەنیزەکێك بریتی کوڕەکەممدا (تا کوڕەکەم ڕەجم نەکرێ)، پاشان پرسیارم کرد لە زانایان وتیان: بێگومان کوڕەکەت سەد شەلاق و یەك ساڵ دوور خستنەوەی لەسەرە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بێ بەکتێبەکەی خوا بڕیار دەدەم لە نێوانتاندا، کەنیزەك و سەد مەڕەکە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ تۆ، کوڕەکەشت سەد شەلاق و یەك ساڵ دوور خستنەوەی لەسەرە، جا تۆش ئونەیس (بەپیاوێکی فەرموو) سەر لە بەیانی بڕۆ بۆ لای ژنی ئەم پیاوە و بەردبارانی بکە))، جا ئونەیسیش بەیانیەکەی ڕۆشت بۆ لای ئافرەتەکە و بەردبارانی کرد.**

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٥، ٢٣١٤.

## ٤٠- بابُ تَرْجَمَةِ الحُكَّامِ، وَهَلْ يَجُوزُ تُرْجُمَانٌ وَاحِدٌ؟

٧١٩٥ - وَقَالَ خَارِجَةُ بْنُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يَتَعَلَّمَ كِتَابَ اليَهُودِ، حَتَّى كَتَبْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ كُتُبَهُ وَأَقْرَأْتُهُ كُتُبَهُمْ إِذَا كَتَبُوا إِلَيْهِ، وَقَالَ عُمَرُ - وَعِنْدَهُ عَلِيٌّ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ وَعُثْمَانُ- مَاذَا تَقُولُ هَذِهِ؟ قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ حَاطِبٍ: فَقُلْتُ: تُخْبِرُكَ بِصَاحِبِهِمَا الذِي صَنَعَ بِهِمَا. وَقَالَ أَبُو جَمْرَةَ: كُنْتُ أُتَرْجِمُ بَيْنَ ابْنِ عَبَّاسٍ وَبَيْنَ النَّاسِ. وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: لاَ بُدَّ لِلْحَاكِمِ مِنْ مُتَرْجِمَيْنِ.

## ٤٠- باسی وەرگێڕان بۆ کاربەدەستان، وە ئایا یەک وەرگێڕ دروستە؟

**٧١٩٥- خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیت وتی و گێڕایەوە لە زەیدی کوڕی سابیتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد کە فێری نووسینی (زمانی) جوولەکە ببێت (منیش فێربووم)، هەتا نامەکانم بۆ پێغەمبەر ﷺ دەنووسی، وە نامەی ئەوان (جوولەکەکانم) بۆ دەخوێندەوە کاتێ نامەیان بۆ دەنووسی.**

**-وە عومەر ﷺ -لە کاتێکدا عەلی و عەبدوڕەحمان و عوسمان لای بوون- وتی: ئەم ژنە چی دەڵێت؟ عەبدوڕەحمانی کوڕی حاتیب وتی: منیش وتم: هەواڵت پێ دەدا بە هاوڕێکەی هەردووکیان کە ئاوای لە هەردووکیان کردوە.**

**-ئەبوجەمرە دەڵێ: من لە نێوان ئیبنو عەبباس ﷺ و خەڵکەکەدا وەرگێڕانم دەکرد، وە هەندێ کەس[1] دەڵێن: کاربەدەست و دەسەڵاتدار دەبێ دوو وەرگێڕی هەبێت.**

٧١٩٦- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ هِرَقْلَ أَرْسَلَ إِلَيْهِ فِي رَكْبٍ مِنْ

---

(١) چونکە وەرگێڕانیش وەك شایەتی وایە دەبێ دوو کەس بن.

قُرَيْشٍ، ثُمَّ قَالَ لِتَرْجُمَانِهِ: قُلْ لَهُمْ: إِنِّي سَائِلٌ هَذَا، فَإِنْ كَذَبَنِي فَكَذِّبُوهُ. -فَذَكَرَ الْحَدِيثَ- فَقَالَ لِلتَّرْجُمَانِ: قُلْ لَهُ: إِنْ كَانَ مَا تَقُولُ حَقًّا فَسَيَمْلِكُ مَوْضِعَ قَدَمَيَّ هَاتَيْنِ[1].

**٧١٩٦-عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ بۆی گێڕایەوە کە ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب بۆی گێڕایەوە، کە هیرەقل ناردی بەدوایدا لە کاروانەکەی قوڕەیشدا، پاشان بەوەرگێڕەکەی وت: پێیان بڵێ: من پرسیار لەم کابرا دەکەم، جا ئەگەر درۆی کرد بەدرۆی بخەنەوە، ئیتر فەرموودەکەی باس کرد- ئینجا بەوەرگێڕەکەی وت: پێی بڵێ: ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵەیت ڕاست بێت، ئەوە ئەو (موحوممەدە) شوێنی ئەم دوو پێیەی من دەبێتە موڵکی ئەو.**

## ٤١- بابُ مُحَاسَبَةِ الإِمَامِ عُمَّالَهُ

**٧١٩٧**- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَعْمَلَ ابْنَ الأُتَبِيَّةِ عَلَى صَدَقَاتِ بَنِي سُلَيْمٍ، فَلَمَّا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَحَاسَبَهُ قَالَ: هَذَا الذِي لَكُمْ، وَهَذِهِ هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَهَلاَّ جَلَسْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وَبَيْتِ أُمِّكَ حَتَّى تَأْتِيَكَ هَدِيَّتُكَ إِنْ كُنْتَ صَادِقًا؟!». ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَخَطَبَ النَّاسَ وَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَسْتَعْمِلُ رِجَالاً مِنْكُمْ عَلَى أُمُورٍ مِمَّا وَلاَّنِي اللَّهُ، فَيَأْتِي أَحَدُكُمْ فَيَقُولُ: هَذَا لَكُمْ وَهَذِهِ هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي. فَهَلاَّ جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَبَيْتِ أُمِّهِ حَتَّى تَأْتِيَهُ هَدِيَّتُهُ إِنْ كَانَ صَادِقًا؟! فَوَاللَّهِ لاَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مِنْهَا شَيْئًا -قَالَ هِشَامٌ: بِغَيْرِ حَقِّهِ- إِلاَّ جَاءَ اللَّهَ يَحْمِلُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أَلاَ فَلأَعْرِفَنَّ مَا جَاءَ اللَّهَ رَجُلٌ بِبَعِيرٍ لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بِبَقَرَةٍ لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةٍ تَيْعَرُ». ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ: «أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ؟»[2].

---

(١) بڕوانە: ٧.

(٢) بڕوانە: ٩٢٥.

## ٤١- باسی لێپرسینەوەی پێشەوا بۆ کاربەدەستانی

**٧١٩٧- ئەبو حومەیدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیبنو لئوتەبییەی کردە کارمەندی کۆکەرەوەی زەکاتی بەنی سولەیم، جا کاتێ هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرد، (ئیبنو لئوتەبییە) وتی: ئەم ماڵ و سامانە هی ئێوەیە، ئەمەش دیاریە بەخۆمیان داوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ڕاستگۆیت دەی بۆ لە ماڵی باوك و ماڵی دایکتدا دانەنیشتیت هەتا دیارییەکەت بۆ بێت؟!)) لە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایەوە و وتارێکی بۆ خەڵکەکەدا، جا سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: ((دوا ئەمە جا بەڕاستی من پیاوانێك لە ئێوە لەو کارانەی خوا داویەتیە دەستم لە کارێکدا بەکاری دێنم، ئینجا کەسێکتان دێتەوە و دەڵێ: ئەوە (زەکاتەکەی) ئێوەیە، ئەوەش دیاریە و بەدیاری هێنراوە بۆ خۆم، ئەگەر ڕاستگۆیت دەی بۆ لە ماڵی باوك و ماڵی دایکیدا دانەنیشت هەتا دیارییەکەی بۆ بێت؟! سا سوێند بەخوا هەر کەسێ لە ئێوە لەو کارەدا شتێك وەربگرێ- هیشام دەڵێ: بەناڕەوا- ئیللا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو شتە دێت و بەکۆڵیەوە هەڵیگرتووە، جا بێگومان کەسێکتان دەناسمەوە کە بەخزمەتی خوا دەگات و حوشترێکی بەکۆڵەوەیە و هەڵیگرتووە بارە باڕێتی، یان مانگایەکە بۆڕەی دێ یان مەڕێکە باعە باعیەتی))، پاشان دەستی بەرزکردەوە هەتا سپیایی هەردوو بن باڵیم بینی و فەرمووی: ((خودایە ئایا گەیاندم؟)).**

## ٤٢- بابُ بِطَانَةِ الإِمَامِ وَأَهْلِ مَشُورَتِهِ

الْبِطَانَةُ: الدُّخَلاَءُ.

٧١٩٨- حَدَّثَنَا أَصْبَغ، أَخْبَرَنَا ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا بَعَثَ اللَّهُ مِنْ نَبِيٍّ وَلاَ اسْتَخْلَفَ مِنْ خَلِيفَةٍ، إِلاَّ

كَانَتْ لَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشَّرِّ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، فَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللَّهُ تَعَالَى».

وَقَالَ سُلَيْمَانُ، عَنْ يَحْيَى: أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ بِهَذَا. وَعَنِ ابْنِ أَبِي عَتِيقٍ وَمُوسَى، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ مِثْلَهُ. وَقَالَ شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَوْلَهُ. وَقَالَ الأَوْزَاعِيُّ وَمُعَاوِيَةُ بْنُ سَلاَّمٍ: حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ، حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَالَ ابْنُ أَبِي حُسَيْنٍ وَسَعِيدُ بْنُ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَوْلَهُ. وَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي جَعْفَرٍ: حَدَّثَنِي صَفْوَانُ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ[١].

## ٤٢- باسی كەسانی جێی ڕاز و نیازی پێشەوا و خەڵكانی ڕاوێژكاری ئەو

**(الْبِطَانَةُ): كەسانی جێی ڕاز و نیاز،كەسانی نزیك و تایبەتی (پێشەوا).**

**٧١٩٨- ئەبو سەعید خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((خوا هەر پێغەمبەرێكی ناردبێت هەر جێنشینێكی كردبێت بە جێنشین، دوو جۆر دەست و پێوەندی هەیە: دەست و پێوەندێكیان فەرمانی پێ دەكات بەچاكە و هانی دەدات لەسەری، دەست و پێوەندێكی تریان فەرمانی پێدەكات بە خراپە و هانی دەدات لەسەری، پارێزراویش كەسێكە كە خوای بەرز و بڵند بیپارێزێت)).**

**-سولەیمان لە یەحیاوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئیبنو شیهاب ئەم فەرموودەی بۆ گێڕامەوە.**

**-شوعەیب لە زوهریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەبو سەلەمە بۆی گێڕامەوە لە ئەبی سەعیدەوە ﷺ بە وتەی ئەبی سەعید گێڕاویەتیەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٦٦١١.

-ئەوزاعی و موعاویەی کوڕی سەلام دەڵێن: زوهری بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەبو سەلەمە بۆی گێڕامەوە لە ئەبی هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

-وە ئیبنو ئەبی حوسەین و سەعیدی کوڕی زیاد لە ئەبی سەلەمەوە گێڕایانەوە لە ئەبی سەعیدەوە ﷺ بەوتەی خۆی.

-وە عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبی جەعفەر وتی: صەفوان لە ئەبی سەلەمەوە گێڕایەوە لە ئەبی ئەیوبەوە ﷺ وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست.

## ٤٣- بَابٌ: كَيْفَ يُبَايِعُ الإِمَامُ النَّاس؟

٧١٩٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَادَةُ بْنُ الوَلِيدِ، أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ[1].

## ٤٣- باسێک: پێشەوا چۆن پەیمان لە خەڵکی وەردەگرێت؟

**عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پەیمانمان بە پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەر بیستن و گوێڕایەڵی لەخۆشی و ناخۆشیدا.**

٧٢٠٠ - وَأَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ، وَأَنْ نَقُومَ -أَوْ نَقُولَ- بِالْحَقِّ حَيْثُمَا كُنَّا لاَ نَخَافُ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لاَئِمٍ[2].

**٧٢٠٠- (وە پەیمانمان پێدا) کە کێشە و ئاژاوە لەگەڵ کاربەدەستە (مسوڵمان) کانماندا نەکەین، وە هەستین بەهەق-یان بیڵێین- لە هەرشوێنێکدا بین لەبەر ڕەزامەندی خوا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسین.**

(١) بڕوانە: ١٨.

(٢) بڕوانە: ٧٠٥٦.

٧٢٠١- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فِي غَدَاةٍ بَارِدَةٍ وَالْمُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ يَحْفِرُونَ الْخَنْدَقَ فَقَالَ:

«اللَّهُمَّ إِنَّ الخَيْرَ خَيْرُ الآخِرَهْ... فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ»

فَأَجَابُوا:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا... عَلَى الجِهَادِ مَا بَقِينَا أَبَدَا[1].

**٧٢٠١- حومەید دەڵێ: گوێم لێبوو ئەنەس ﷺ دەیوت: پێغەمبەر ﷺ و کۆچەران و یاریدەدەران لە بەیانیەکی سارددا ڕۆشتنە دەرەوە خەندەقەکەیان هەڵدەکەند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خودایە ژیانی ڕاستەقینە تەنها ژیانی دواڕۆژە، دەی کەواتە لە کۆچەران و یاریدەدەران خۆش بە))، هاوەڵانیش وەڵامیان دەدایەوە: ئێمە ئەوانەین بەیعەتمان بە موحەممەد داوە ..... لەسەر جیهاد هەتا ماوین.**

٧٢٠٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ يَقُولُ لَنَا «فِيمَا اسْتَطَعْتَ».

**٧٢٠٢- عەبدوڵڵای کوڕی دینار لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کەوتی: ئێمە کاتێ پەیمانمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا لەسەر بیستن و گوێڕایەڵی دەیفەرموو پێمان: ((لەوەی لە تواناتان دایە)).**

٧٢٠٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ: شَهِدْتُ ابْنَ عُمَرَ حَيْثُ اجْتَمَعَ النَّاسُ عَلَى عَبْدِ الْمَلِكِ. قَالَ: كَتَبَ: إِنِّي أُقِرُّ بِالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ لِعَبْدِ الْمَلِكِ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى سُنَّةِ اللهِ وَسُنَّةِ رَسُولِهِ مَا اسْتَطَعْتُ، وَإِنَّ بَنِيَّ قَدْ أَقَرُّوا بِمِثْلِ ذَلِكَ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٨٣٤.

(٢) بڕوانە: ٧٢٠٥، ٧٢٧٢.

**٧٢٠٣- عەبدەڵڵای کوڕی دینار دەڵێ: ئەو کاتەی مسوڵمانان یەك دەنگ کۆبوونەوە لەسەر عەبدولمەلیك [١].**

**ئیبنو عومەر نووسی[٢]: من دان دەنێم بەبیستن وگوێڕایەڵی بۆعەبدولمەلیك وەك: (أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ) لەسەر سوننەتی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوندەی لە تواناماندا بێت، وە بێگومان کوڕەکانیشم دانیان پیا ناوە بەوێنەی ئەو دانپیانانەی من.**

٧٢٠٤- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا سَيَّارٌ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: بَايَعْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، فَلَقَّنَنِي: فِيمَا اسْتَطَعْتُ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ[٣].

**٧٢٠٤-جەریری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پەیمانم بە پێغەمبەردا ﷺ لەسەر بیستن و فەرمان بەرداری، ئینجا پێی وتم بڵێ: (لەوەدا لە توانامدا بێت، وە دڵسۆزی بۆ هەموو مسوڵمانێك).**

٧٢٠٥- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ: لَمَّا بَايَعَ النَّاسُ عَبْدَ الْمَلِكِ كَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ عَبْدِ الْمَلِكِ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ إِنِّي أُقِرُّ بِالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ لِعَبْدِ اللَّهِ عَبْدِ الْمَلِكِ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى سُنَّةِ اللَّهِ وَسُنَّةِ رَسُولِهِ فِيمَا اسْتَطَعْتُ، وَإِنَّ بَنِيَّ قَدْ أَقَرُّوا بِذَلِكَ[٤].

---

(١) عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانی کوڕی حەکەمی ئومەوی لەو کاتەی بەیعەتی پێدەدرا وەک خەلەیفەی مسوڵمانان. إرشاد الساري:١٦٥/١٥.

(٢) بەیعەت نامەیەکی نووسی بەناوی خۆی و کوڕکانیەوە بەیعەتیدا عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان وەک خەلەیفەی مسوڵمانان. إرشاد الساري:١٦٥/١٥.

(٣) بڕوانە: ٥٧.

(٤) بڕوانە: ٧٢٠٣.

**٧٢٠٥-عەبدوڵڵای کوڕی دینار دەڵێ: ئەو کاتەی مسوڵمانان پەیمانیاندا بە عەبدولمەلیك.**

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر نووسی: بۆ بەندەی خوا عەبدولمەلیك پێشەوای ئیمانداران، من دان دەنێم بەبیستن و گوێڕایەڵی بۆبەندەی خوا عەبدولمەلیك وەك: (أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ)، لەسەر سوننەتی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوندەی لە توانامان‌دا بێت، وە بێگومان کوڕەکانیشم دانیان پیا ناوە بەوێنەی ئەو دانپیانانەی من.**

٧٢٠٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا حَاتِمٌ، عَنْ يَزِيدَ قَالَ: قُلْتُ لِسَلَمَةَ: عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعْتُمُ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ الحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ: عَلَى المَوْتِ(١).

**٧٢٠٦- حاتیم لەیەزیدەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: بەسەلەمم وت: لە ڕۆژی حودەیبییەدا لەسەر چ شتێك پەیمانتاندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: لەسەر مردن.**

٧٢٠٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ أَسْمَاءَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ حُمَيْدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَخْبَرَهُ. أَنَّ الرَّهْطَ الَّذِينَ وَلاَّهُمْ عُمَرُ اجْتَمَعُوا فَتَشَاوَرُوا، قَالَ لَهُمْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: لَسْتُ بِالَّذِي أُنَافِسُكُمْ عَلَى هَذَا الأَمْرِ، وَلَكِنَّكُمْ إِنْ شِئْتُمُ اخْتَرْتُ لَكُمْ مِنْكُمْ. فَجَعَلُوا ذَلِكَ إِلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَلَمَّا وَلَّوْا عَبْدَ الرَّحْمَنِ أَمْرَهُمْ فَمَالَ النَّاسُ عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ، حَتَّى مَا أَرَى أَحَدًا مِنَ النَّاسِ يَتْبَعُ أُولَئِكَ الرَّهْطَ وَلاَ يَطَأُ عَقِبَهُ، وَمَالَ النَّاسُ عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ يُشَاوِرُونَهُ تِلْكَ اللَّيَالِيَ، حَتَّى إِذَا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الَّتِي أَصْبَحْنَا مِنْهَا، فَبَايَعْنَا عُثْمَانَ. قَالَ الْمِسْوَرُ: طَرَقَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بَعْدَ هَجْعٍ مِنَ اللَّيْلِ،

---

(١) بروانە: ٢٩٦٠.

فَضَرَبَ الْبَابَ حَتَّى اسْتَيْقَظْتُ فَقَالَ: أَرَاكَ نَائِمًا، فَوَاللَّهِ مَا اكْتَحَلْتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ بِكَبِيرِ نَوْمٍ، انْطَلِقْ فَادْعُ الزُّبَيْرَ وَسَعْدًا. فَدَعَوْتُهُمَا لَهُ، فَشَاوَرَهُمَا، ثُمَّ دَعَانِي فَقَالَ: ادْعُ لِي عَلِيًّا. فَدَعَوْتُهُ فَنَاجَاهُ حَتَّى ابْهَارَّ اللَّيْلُ، ثُمَّ قَامَ عَلِيٌّ مِنْ عِنْدِهِ وَهْوَ عَلَى طَمَعٍ، وَقَدْ كَانَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ يَخْشَى مِنْ عَلِيٍّ شَيْئًا، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي عُثْمَانَ، فَدَعَوْتُهُ، فَنَاجَاهُ حَتَّى فَرَّقَ بَيْنَهُمَا الْمُؤَذِّنُ بِالصُّبْحِ، فَلَمَّا صَلَّى لِلنَّاسِ الصُّبْحَ وَاجْتَمَعَ أُولَئِكَ الرَّهْطُ عِنْدَ الْمِنْبَرِ، فَأَرْسَلَ إِلَى مَنْ كَانَ حَاضِرًا مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ، وَأَرْسَلَ إِلَى أُمَرَاءِ الأَجْنَادِ -وَكَانُوا وَافَوْا تِلْكَ الحَجَّةَ مَعَ عُمَرَ- فَلَمَّا اجْتَمَعُوا تَشَهَّدَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، يَا عَلِيُّ، إِنِّي قَدْ نَظَرْتُ فِي أَمْرِ النَّاسِ فَلَمْ أَرَهُمْ يَعْدِلُونَ بِعُثْمَانَ، فَلاَ تَجْعَلَنَّ عَلَى نَفْسِكَ سَبِيلاً. فَقَالَ: أُبَايِعُكَ عَلَى سُنَّةِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْخَلِيفَتَيْنِ مِنْ بَعْدِهِ. فَبَايَعَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، وَبَايَعَهُ النَّاسُ الْمُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ وَأُمَرَاءُ الأَجْنَادِ وَالْمُسْلِمُونَ[(١)].

**٧٢٠٧-زوهری دەگێڕێتەوە کە حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان بۆی گێڕایەوە کە میسوەری کوڕی مەخرەمە بۆی گێڕایەوە کە ئەو چەند کەسەی عومەر ﷺ دایانان[(٢)] کۆبوونەوە و ڕاوێژیان کرد و عەبدوڕەحمان ﷺ پێی وتن: من ئەو کەسە نابم لەم کارەدا لەگەڵ ئێوە مل ملانێ بکەم. بەڵام ئەگەر پێتان باش بێت لە ناوتاندا کەسێکتان دیاری دەکەم، ئیتر ئەوانیش ئەو کارەیان بەعەبدوڕەحمان سپارد، ئینجا کاتێ کارەکەیان بەعەبدوڕەحمان سپارد، خەڵکەکە هەموو ڕۆشتن بۆ لای عەبدوڕەحمان هەتا کەسم نەدەبینی شوێن ئەو چەند کەسە[(٣)] بکەوێ و لە دوایانەوە نەدەڕۆشتن بەڕێگادا، هەموو خەڵکەکە ڕۆشتن بۆ لای عەبدوڕەحمان و ئەو چەند شەوە ڕاوێژیان لەگەڵ دەکرد. هەتا گەیشتینە ئەو شەوە کە بەیانی ڕۆژمان کردەوە بەیعەتماندا بەعوسمان، میسوەر دەڵێ: دوای ڕۆشتنی بەشێك لە شەو عەبدوڕەحمان هات بۆ لام (ئەوەندە) لە دەرگایدا تا**

(١) بڕوانە: ١٣٩٢.

(٢) کۆببنەوەلە نێوان خۆیاندا کەسێکیان بە جێنشین دیاری کەن وهەڵبژێرن.

(٣) کە عومەر دیاری کردبوون لە ناویاندا کەسێک بکەنە جێنشین.

**خەبەرم بوویەوە، وتی: وابزانم خەوتووی، دەی سوێند بەخوا ئەم شەو کەمێك نەبێ خەو نەچووەتە چاوم[١]، بڕۆ زوبەیر و سەعد بانگ بکە، منیش بانگم کردن و ڕاوێژی بەهەردووکیان کرد، لە پاشان بانگی کردم و وتی: عەلیم بۆ بانگ کە، ئەویشم بۆ بانگ کرد بەچپە و سرتە تا نیوەشەو قسەی لەگەڵدا کرد، لە پاشان عەلی لای ئەو هەستا و ئەو بەهیوا و ئومێد[٢] بوو، لە ڕاستیدا عەبدوڕەحمان لە لایەن عەلییەوە لە شتێك دەترسا[٣]، پاشان وتی عوسمانم بۆ بانگ بکە، ئەویشم بانگ کرد بەچپە قسەی لەگەڵدا کرد، هەتا بانگبێژی بەیانی لە یەکتری جیا کردنەوە، ئینجا کاتێ خەڵکی نوێژی بەیانیان کرد[٤] و ئەو چەند کەس[٥] لای دوانگەکەدا کۆبوونەوە، وە (عەبدوڕەحمان) ناردی بەشوێن ئەوانەی ئامادەبوون (لە مەدینە) لە کۆچەران و ئەنصارییەکان، هەروەها ناردی بەشوێن فەرماندە سەربازییەکاندا کە هەموویان لەو ساڵەدا لەگەڵ عومەردا ﵁ هاتبوون بۆ حەج، ئینجا کاتێ هەموویان کۆبوونەوە عەبدوڕەحمان شایەتومانی هێنا، پاشان وتی: جا پاش ئەمە، ئەی عەلی من سەرنجی کاروباری خەڵکم داوە، وە نەمدی کەس بە هاوشانی عوسمان بزانن، بەهیچ جۆرێ شتێك لە دەروونتدا پەیدا نەبێت [٦]، ئینجا (عەبدوڕەحمان) وتی: پەیمانم پێ دایت لەسەر فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی و ﷺ دوو جێنشینەکەی پاش ئەو، ئەوسا عەبدوڕەحمان پەیمانیان پێدا و خەڵکەکەش پەیمانیان پێدا، کۆچەران و یاری دەدەران و فەرماندە سەربازییەکان و گشت مسوڵمانان.**

---

(١) لە ڕیوایەتی کەریمە و ئەبی زەڕ و حەمموی و کوشمیهەنیی بەم جۆرەیە: (هذه الثلاث) واتە: ئەم سێ شەوە کەمێک نەبێ نەخەوتووم. فتح الباري: ٢٤٣/١٦، إرشاد الساري: ١٦٨/١٥.

(٢) عەبدوڕەحمان بیکات بە جێنشین.

(٣) کە ئەگەر بەیعەت بە کەسێکی تر جگە لەو بدرێت گوێڕایەڵ نەبێت.

(٤) لە هەندێ گێڕانەوەدا ئاوەهایە: ئینجا کاتێ پێشنوێژی بەیانیان کرد بۆ خەڵکەکە.

(٥) کە بڕیارە یەکێکیان ببێتە جێنشین.

(٦) لەبەر هەڵبژاردن و دیاریکردنی عوسمان ﵁.

## ٤٤- بابُ مَنْ بَايَعَ مَرَّتَيْنِ

٧٢٠٨- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ قَالَ: بَايَعْنَا النَّبِيَّ ﷺ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَقَالَ لِي: «يَا سَلَمَةُ أَلاَ تُبَايِعُ؟». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ قَدْ بَايَعْتُ فِي الأَوَّلِ. قَالَ: "وَفِي الثَّانِي"[١].

## ٤٤- باسی ئەو کەسەی دووجار پەیمانی داوە

**٧٢٠٨-یەزیدی کوڕی ئەبی عوبەید لە سەلەمەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە ژێر درەختەکەدا پەیمانمدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا فەرمووی پێم: ((ئەی سەلەمە ئایا پەیمان نادەیت؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدڵنیاییەوە بێگومان لەجار یەکەمدا پەیمانمدا، فەرمووی: ((لەمەی دووەمیشدا پەیمان بدە)).**

## ٤٥- بابُ بَيْعَةِ الأَعْرَابِ

٧٢٠٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَأَصَابَهُ وَعْكٌ، فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي. فَأَبَى، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي. فَأَبَى، فَخَرَجَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا وَيَنْصَعُ طِيبُهَا»[٢].

## ٤٥- باسی پەیمان دانی عەرەبە دەشتەکیەکان

**٧٢٠٩- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە عەرەبیەکی دەشتەکی پەیمانیدا بە پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەر ئیسلام، ئینجا تووشی تا و لەرزێك**

(١) بڕوانە: ٢٩٦٠.

(٢) بڕوانە: ١٨٨٣.

بوو، وتی: پەیمانەکەم هەڵوەشێنەوە، ئەویش ڕازی نەبوو، لە پاشان هاتە دەرەوە، وتی: پەیمانەکەم هەڵوەشێنەوە ئەویش ڕازی نەبوو، ئیتر (عەرەبە دەشتەکیەکە) هاتە دەرەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((مەدینە وەك كورەی ئاسنگەر وایە، ناپوختەکانی دەر دەکات چاکەکانیشی پوخت دەکاتەوە)).

## ٤٦- بابُ بَيْعَةِ الصَّغِيرِ

٧٢١٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ -هُوَ ابْنُ أَبِي أَيُّوبَ- قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو عَقِيلٍ زُهْرَةُ بْنُ مَعْبَدٍ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ هِشَامٍ، وَكَانَ قَدْ أَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ وَذَهَبَتْ بِهِ أُمُّهُ زَيْنَبُ ابْنَةُ حُمَيْدٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَايِعْهُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هُوَ صَغِيرٌ» فَمَسَحَ رَأْسَهُ وَدَعَا لَهُ، وَكَانَ يُضَحِّي بِالشَّاةِ الْوَاحِدَةِ عَنْ جَمِيعِ أَهْلِهِ[1].

## ٤٦- باسی (حوکمی) پەیماندانی منداڵ [2]

٧٢١٠- زوهرەی کوڕی مەعبەد لە باپیریەوە عەبدوڵڵای کوڕی هیشام کە بێگومان (بەمنداڵی) بەخزمەتی پێغەمبەر ﷺ گەشتووە، وە دایکی کە زەینەبی کچی حومەیدە بردوویەتی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا پەیمانی لێ وەرگرە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (ئەو منداڵە)، ئەنجا دەستی هێناوە بەسەریدا و دوعای خێری بۆ کردوە، وە عەبدوڵڵای کوڕی هیشام یەك مەڕی دەکردە قوربانی بۆ هەموو خێزانەکەی.

---

(١) بڕوانە: ٢٥٠١.

(٢) واتە: تەمەنی ئەوەندە نەبێت پەیمانی لێ وەرگیرێت وەک منداڵ و مێرد منداڵ.

## ٤٧- بابُ مَنْ بَايَعَ ثُمَّ اسْتَقَالَ البَيْعَةَ

٧٢١١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ المُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ. أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الإِسْلاَمِ فَأَصَابَ الأَعْرَابِيَّ وَعْكٌ بِالْمَدِينَةِ، فَأَتَى الأَعْرَابِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقِلْنِي بَيْعَتِي فَأَبَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي. فَأَبَى، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي فَأَبَى، فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا المَدِينَةُ كَالْكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا وَيَنْصَعُ طِيبُهَا»[1].

## ٤٧- باسی كەسێک پەیمان بدات پاشان پەیمانەكە هەڵبوەشێنێتەوە

**٧٢١١- جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە كە عەرەبیەكی دەشتەكی پەیمانیدا بە پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەر ئیسلام، ئینجا عەرەبە دەشتەكیەكە لە مەدینە تووشی تا و لەرزێك بوو، عەرەبیە دەشتەكیەكە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانەكەم هەڵوەشێنەوە، ئەویش ڕازی نەبوو، لە پاشان هاتەوە بۆ خزمەتی وتی: پەیمانەكەم هەڵوەشێنەوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕازی نەبوو، لە پاشان هاتەوە بۆ خزمەتی وتی: پەیمانەكەم هەڵوەشێنەوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕازی نەبوو، ئیتر عەرەبە دەشتەكیەكە (لە مەدینە) ڕۆشتە دەرەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((مەدینە وەك كورەی ئاسنگەر وایە، ناپوختەكانی دەر دەكات چاكەكانیشی پوخت دەكاتەوە)).**

---

(١) بڕوانە: ١٨٨٣.

## ٤٨- بابُ مَنْ بَايَعَ رَجُلاً لاَ يُبَايِعُهُ إِلاَّ لِلدُّنْيَا

٧٢١٢- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِالطَّرِيقِ يَمْنَعُ مِنْهُ ابْنَ السَّبِيلِ، وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لاَ يُبَايِعُهُ إِلاَّ لِدُنْيَاهُ، إِنْ أَعْطَاهُ مَا يُرِيدُ وَفَى لَهُ، وَإِلاَّ لَمْ يَفِ لَهُ، وَرَجُلٌ يُبَايِعُ رَجُلاً بِسِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ فَحَلَفَ بِاللَّهِ لَقَدْ أُعْطِيَ بِهَا كَذَا وَكَذَا فَصَدَّقَهُ، فَأَخَذَهَا، وَلَمْ يُعْطَ بِهَا»[1].

## ٤٨- باسی کەسێک پەیمان بدات بەپیاوێک [2] تەنها لەبەر دنیا پەیمانی پێ بدات

**٧٢١٢ - ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سێ جۆر کەس خوا لە ڕۆژی دواییدا سەیریان ناکات و پاکیان ناکاتەوە، وە سزای سەختیان بۆ هەیە: پیاوێك لەسەر ئاوێك بێت لەرێگایەك دایە لە پێویستی خۆی زیاتر بێت رێگری رێبواری لێ بکات (بیخواتەوە)، پیاوێکیش بەیعەت بدات بە پێشەوایەك تەنها لەبەر قازانجی دونیایی بەیعەتی پێ بدات، جا ئەگەر ئەوەی دەیەوێ پێشەوا پێی بدات پەیمانەکەی لەگەڵ دەباتە سەر، وە ئەگەر نا پەیمانەکەی لەگەڵ ناباتە سەر، پیاوێکیش پاش عەسر کاڵاکەی بفرۆشێت بە پیاوێك و سوێند بخوات بەخوا کە بەڕاستی ئەوەندەو ئەوەندەی پێداوە، کڕیارەکەش باوەڕی پێ بکات وکاڵاکە ببات، لە کاتێکدا ئەو نرخەی پێ نەداوە)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٥٨.

(٢) وەک پێشەواو ئیمام.

## ٤٩- بَابُ بَيْعَةِ النِّسَاءِ

رَوَاهُ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

٧٢١٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي أَبُو إِدْرِيسَ الْخَوْلاَنِيُّ أَنَّهُ سَمِعَ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ يَقُولُ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ فِي مَجْلِسٍ-: «تُبَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ، وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلاَ تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ فِي الدُّنْيَا فَهْوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَسَتَرَهُ اللَّهُ فَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ، إِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ، وَإِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ». فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِكَ[2].

## ٤٩- باسی پەیماندانی ئافرەتان

**فەرموودەی ئەم باسە ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە[3].**

**٧٢١٣- عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە کۆڕ و دانیشتنێکدا بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێمان: ((پەیمانم پێ بدەن کە هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی خوا و دزی نەکەن و داوێن پیسی نەکەن و منداڵەکانتان نەکوژن و بوهتان نەکەن و هەڵنەبەستن لە نێوان دەست و پێتاندا، سەرپێچی (من و کاربەدەستانتان) نەکەن لە چاکەدا، جا هەر کەسێکتان پەیمانەکەی بردە سەر ئەوە پاداشتی لای خوایە، وە هەر کەسێکتان هەندێك لەو تاوانانەی کرد و لە دونیادا تۆڵەی لێ سەنرایەوە گوناهەکەی سڕاوەتەوە، هەر کەسێکیش هەندێك لەو تاوانانەی کرد و پاشان خوا بۆی پۆشی، ئەوە حەواڵەی لای خوا**

(١) بڕوانە: ٩٧٩.

(٢) بڕوانە: ١٨.

(٣) لە صەحیحی بوخاریدا بە ژمارە: ٩٧٩ هێناویەتی.

**دەكرێ، ئەگەر ویستی تۆڵەی لێ دەسێنێ، ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ))، ئێمەش پەیمانمان پێدا لەسەر ئەو خاڵانە.**

٧٢١٤- حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُبَايِعُ النِّسَاءَ بِالْكَلاَمِ بِهَذِهِ الآيَةِ ﴿ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴿١٢﴾ ﴾ الممتحنة. قَالَتْ: وَمَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَدَ امْرَأَةٍ إِلاَّ امْرَأَةً يَمْلِكُهَا[1].

**٧٢١٤- عوروە لە عائیشەوە ﵂ دەیگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەوتە پەیمانی لە ژنان وەردەگرت بەئەم ئایەتە: (كە هیچ شتێك نەكەنە هاوبەشی خوا) (عائیشە ﵂) دەڵێ: وە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بەر دەستی هیچ ئافرەتێك نەكەوتووە، مەگەر ئافرەتێك خێزانی خۆی بوو بێت.**

٧٢١٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حَفْصَةَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: بَايَعْنَا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَرَأَ عَلَيَّنا[2]: ﴿ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴿١٢﴾ ﴾ الممتحنة. وَنَهَانَا عَنِ النِّيَاحَةِ، فَقَبَضَتِ امْرَأَةٌ مِنَّا يَدَهَا فَقَالَتْ: فُلاَنَةُ أَسْعَدَتْنِي وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَجْزِيَهَا فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا، فَذَهَبَتْ ثُمَّ رَجَعَتْ، فَمَا وَفَتِ امْرَأَةٌ إِلاَّ أُمُّ سُلَيْمٍ، وَأُمُّ الْعَلاَءِ، وَابْنَةُ أَبِي سَبْرَةَ امْرَأَةُ مُعَاذٍ. أَوِ ابْنَةُ أَبِي سَبْرَةَ وَامْرَأَةُ مُعَاذٍ[3].

**٧٢١٥- ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: پەیمانماندا بە پێغەمبەر ﷺ ئەویش ئەم ئایەتەی بەسەرماندا خوێندەوە: (كە هیچ شتێك بە هاوبەشی خوا دانەنێن)، وە شیوەن و شەپۆڕی قەدەغە كرد لێمان، جا ئافرەتێك[4] دەستی كێشایە دواوە (لە**

---

(١) بڕوانە: ٢٧١٣.

(٢) لە ریوایەتێکی تردا بە (عَلَيَّ) هاتووە.

(٣) بڕوانە: ١٣٠٦.

(٤) كە ئوممو عەتییە بوو.

پەیمان دان) وتی: فلاَن ژن لەگەڵمدا شیوەنی گێڕاوە (ماف لەسەرمە)، دەمەوێ مافەکەی بدەمەوە[1] پێغەمبەریش ﷺ هیچی نەفەرموو، ژنەکەش ڕۆشت و (شیوەنی لەگەڵ ژنەکە کرد)، پاشان گەڕایەوە (بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پەیمانی لەگەڵدا بەست)، ئینجا هیچ ئافرەتێك پەیمانەکەی نەبردە سەر جگە لە ئوممو سولەیم و ئوممو لعەلا و کچی ئیبنو ئەبی سەبرەی خێزانی موعاز، یان کچی ئەبی سەبرە و خێزانی موعاز.

## ٥٠- بابُ مَنْ نَكَثَ بَيْعَةً

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَـٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ ﴾ الفتح.

٧٢١٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعْتُ جَابِرًا قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: بَايِعْنِي عَلَى الإِسْلاَمِ. فَبَايَعَهُ عَلَى الإِسْلاَمِ، ثُمَّ جَاءَ الغَدَ مَحْمُومًا فَقَالَ: أَقِلْنِي. فَأَبَى، فَلَمَّا وَلَّى قَالَ: «الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا، وَيَنْصَعُ طِيبُهَا»[2].

## ٥٠- باسی ئەو کەسەی پەیمانەکە هەڵوەشێنێتەوە

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بەڕاستی ئەو کەسانەی پەیمان دەدەن بەتۆ (ئەی موحەممەد ﷺ)، بێگومان ئەوانە پەیمان بەخوا دەدەن دەستی خوا لەسەر دەستی ئەوانەوەیە، جا هەر کەس پەیمانەکەی شکاند ئەوە بێگومان ئەو پەیمان شکاندنە (زیانی) بۆخۆیەتی، هەر کەسیش وەفا بکات بەو پەیمانەی کە داوێتی بەخوا، ئەوە لە مەولا خوا پاداشتی گەورەی دەداتێ).

---

(١) واتە: منیش دەڕۆم لەگەڵ ئەودا شیوەنی بۆ دەگێرم.

(٢) بڕوانە: ١٨٨٣.

**٧٢١٦- موحەممەدی کوڕی مونکەدیر دەڵێ: له جابیرم ﷺ بیست وتی: عەرەبیەکی دەشتەکی هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی پەیمانم لێ وەرگرە لەسەر ئیسلام، پێغەمبەری خواش ﷺ پەیمانی لێ وەرگرت لەسەر ئیسلام، پاشان سبەینێ هاتەوە تا و لەرزی بوو، وتی: پەیمانەکەم هەڵوەشێنەوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕازی نەبوو، جا کاتێ پشتی هەڵکرد و ڕۆشت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مەدینە وەك کورەی ئاسنگەر وایە، ناپوختەکانی دەر دەکات چاکەکانیشی پوخت دەکاتەوە)).**

## ٥١- بَابُ الاسْتِخْلَافِ

٧٢١٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ يَحْيَى، أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلَالٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، سَمِعْتُ القَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: وَارَأْسَاهْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ذَاكِ لَوْ كَانَ وَأَنَا حَيٌّ فَأَسْتَغْفِرُ لَكِ وَأَدْعُو لَكِ». فَقَالَتْ عَائِشَةُ: وَاثُكْلِيَاهْ، وَاللَّهِ إِنِّي لَأَظُنُّكَ تُحِبُّ مَوْتِي، وَلَوْ كَانَ ذَاكَ لَظَلِلْتَ آخِرَ يَوْمِكَ مُعَرِّسًا بِبَعْضِ أَزْوَاجِكَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «بَلْ أَنَا وَارَأْسَاهْ لَقَدْ هَمَمْتُ -أَوْ أَرَدْتُ- أَنْ أُرْسِلَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَابْنِهِ فَأَعْهَدَ أَنْ يَقُولَ الْقَائِلُونَ أَوْ يَتَمَنَّى الْمُتَمَنُّونَ، ثُمَّ قُلْتُ "يَأْبَى اللَّهُ وَيَدْفَعُ الْمُؤْمِنُونَ" أَوْ: يَدْفَعُ اللَّهُ وَيَأْبَى الْمُؤْمِنُونَ"[١].

## ٥١- باسی دیاری کردنی جێنشین[٢]

**٧٢١٧- قاسیمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: عائیشە ﷺ وتی: وای سەرم پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ئەوە ببوایە[٣] منیش زیندوو بوومایە داوای**

(١) بڕوانە: ٥٦٦٦.

(٢) واتە: جێنشین کەسێک دیاری بکات ببێتە جێنشین دوا مردنی، یان جێنشین چەند کەسێک دیاری بکات تا لە نێوان خۆیاندا یەکێکیان بە جێنشین هەڵبژێرن. إرشاد الساري:١٧٨/١٥.

(٣) ئەگەر بمردیتایە.

**لێبوردنم بۆ دەكردی بۆشت دەپاڕامەوە لە خوا))، عائیشەش ﷺ وتی: وای دایك ڕۆڵەڕۆم بۆ بكات، وەڵڵاهی من وا گومانت پێ دەبەم مردنی منت پێ خۆشە، ئەگەر من بمرم، لە كۆتایی ڕۆژەكەتدا سەرجێی لەگەڵ یەكێك لە ژنەكانتدا دەكەیت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (( (واز لەوە بێنە)، بەڵكو من وای سەرم سوێند بەخوا هات بەخەیاڵمدا - یان ویستم - بنێرم بەشوێن ئەبو بەكر و كوڕەكەیدا تاوسێت (ی بۆ بكەم[١]))، نەوەك كەسانێك بڵێن[٢]، یان كەسانێكی ئاوات خوازن ئاوات بخوازن[٣] لە پاشان وتم: خوا (بەغەیری ئەبو بەكر) ڕازی نابێ، باوەڕدارانیش (جگە لەو) ڕەد دەكەنەوە))، یان ((خوا (جگە لەو) ڕەددەكاتەوە و باوەڕدارانیش (بەغەیری ئەبو بەكر) ڕازی نابن)).**

٧٢١٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قِيلَ لِعُمَرَ: أَلاَ تَسْتَخْلِفُ؟ قَالَ: إِنْ أَسْتَخْلِفْ فَقَدِ اسْتَخْلَفَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي أَبُو بَكْرٍ، وَإِنْ أَتْرُكْ فَقَدْ تَرَكَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَثْنَوْا عَلَيْهِ، فَقَالَ: رَاغِبٌ رَاهِبٌ، وَدِدْتُ أَنِّي نَجَوْتُ مِنْهَا كَفَافًا لاَ لِي وَلاَ عَلَيَّ، لاَ أَتَحَمَّلُهَا حَيًّا وَمَيِّتًا.

**٧٢١٨- هیشامی كوڕی عوروە لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بە عومەر وترا: بۆچی جێنشینێك دانانێیت؟ (عومەر ﷺ) وتی: ئەگەر جێنشین دانێم ئەوە بێگومان ئەو كەسەی لەمن چاكترە جێنشینی داناوە كە ئەبو بەكرە ﷺ، وە ئەگەر داینەنێم ئەوە بێگومان ئەو كەسەی لە من چاكترە داینەناوە كە پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئینجا**

(١) لە پاش مردنم ئەو جێنشینم بێت.
(٢) جێنشینی بۆ فڵانە كەس یا بۆ من.
(٣) جێنشینی بۆ ئەوان بێت.

**وەسف و سەنایان کرد، (عومەریش) وتی: ئومێدەوارە و ترسیشی هەیە[١]، ئاواتە خوازم من سەر بەسەر ڕزگارم ببێت[٢] نەچاکەی بۆم بێ نەزیانی بۆم هەبێت، لە ئەستۆی ناگرم[٣] نەبەزیندوویی نە بە مردوویی.**

٧٢١٩- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ خُطْبَةَ عُمَرَ الآخِرَةَ حِينَ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَذَلِكَ الغَدُ مِنْ يَوْمٍ تُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ، فَتَشَهَّدَ وَأَبُو بَكْرٍ صَامِتٌ لاَ يَتَكَلَّمُ قَالَ: كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَعِيشَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى يَدْبُرَنَا -يُرِيدُ بِذَلِكَ أَنْ يَكُونَ آخِرَهُمْ- فَإِنْ يَكُ مُحَمَّدٌ ﷺ قَدْ مَاتَ، فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَدْ جَعَلَ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ نُورًا تَهْتَدُونَ بِهِ بِمَا هَدَى اللَّهُ مُحَمَّدًاﷺ وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ صَاحِبُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَانِي اثْنَيْنِ، فَإِنَّهُ أَوْلَى الْمُسْلِمِينَ بِأُمُورِكُمْ، فَقُومُوا فَبَايِعُوهُ. وَكَانَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ قَدْ بَايَعُوهُ قَبْلَ ذَلِكَ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ، وَكَانَتْ بَيْعَةُ العَامَّةِ عَلَى المِنْبَرِ.قَالَ الزُّهْرِيُّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: سَمِعْتُ عُمَرَ يَقُولُ لأَبِي بَكْرٍ يَوْمَئِذٍ: اصْعَدِ الْمِنْبَرَ. فَلَمْ يَزَلْ بِهِ حَتَّى صَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَبَايَعَهُ النَّاسُ عَامَّةً[٤].

**٧٢١٩- زوهری دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بۆی گێڕامەوە کە گوێبیستی وتاری دووهەمی[٥] عومەر ﷺ بووە،کاتێ لەسەر دووانگە دانیشت، ئەوەش ڕۆژی پاش ئەو ڕۆژە بوو کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، ئینجا شایەتوومانی هێنا و ئەبو بەکریش تووڕە بوو قسەی نەدەکرد، وتی: من ئومێدم وابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بژی تا بکەوێتە پاش ئێمە- مەبەستی بەو وتەیە ئەوە بوو پاش هەموویان وەفات بکات-**

(١) واتە عومەر ئومێدی بە پاداشتی خوا هەیە لە سزاشی دەترسێت، بەچەند مانای تریش ماناکراوە.
(٢) لە جێنشینی.
(٣) باری جێنشینی لە پاش خۆم کەسێکی بۆ دیاری کەم.
(٤) بڕوانە: ٧٢٦٩.
(٥) لە وتاری یەکەمیدا وتی: موحەممەد ﷺ نەمردووە، ئەم وتارەی وەک عوزرهێنانەوە بوو بۆ وتارەکەی یەکەمی.

جا ئەگەر موحەممەد ﷺ بەدڵنیاییەوە وەفاتی کردوە، ئەوە بەڕاستی خوای بەرز و بڵند لە نێو ئێوەدا ڕووناکییەکی داناوە پێی ڕێنموون بین، کە خوا موحەممەدی ﷺ پێ ڕێنموون کردوە، وە بێگومان ئەبو بەکری هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ و دووەمی دووانەکەیە[1] لە ڕاستیدا ئەبو بەکر ﷺ لە هەموو مسوڵمانان لە پێشترە بۆ (بەڕێوەبردنی) کار و بارتان، بۆیە هەستن و بەیعەتی پێ بدەن، کۆمەڵێکیان پێش ئەوە لە ساباتەکەی بەنی ساعیدەوە بەیعەتیان پێ دابوو، بەڵام بەیعەتی گشتی مسوڵمانان لەسەر دووانگەکەدا بوو.

زوهری دەڵێ: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ:لە عومەرم ﷺ بیست لەو ڕۆژەدا بە ئەبو بەکری ﷺ وت: بڕۆرە سەر دووانگەکە، بەردەوام پێی دەوت هەتا ڕۆشتە سەر دووانگەکە، ئیتر هەموو کەس بەیعەتیان پێدا.

٧٢٢٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ امْرَأَةٌ فَكَلَّمَتْهُ فِي شَيْءٍ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ جِئْتُ وَلَمْ أَجِدْكَ؟ كَأَنَّهَا تُرِيدُ المَوْتَ. قَالَ: «إِنْ لَمْ تَجِدِينِي فَأْتِي أَبَا بَكْرٍ»[2].

٧٢٢٠- موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی شتێك قسەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد، جا فەرمانی پێکرد کە جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ لای، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێم بڵێ ئەگەر هاتم تۆم دەست نەکەوت و نەبوویت؟ وەکو ئەوەی مەبەستی وەفاتی بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر منت نەدیت و نەبووم ئەوە وەرە بۆ لای ئەبو بەکر)).

---

(١) کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بوو لە غاری سەوردا لە کاتی کۆچکردنیان بۆ مەدینە .

(٢) بڕوانە: ٣٦٥٩.

٧٢٢١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنِي قَيْسُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﷺ قَالَ لِوَفْدِ بُزَاخَةَ: تَتْبَعُونَ أَذْنَابَ الإِبِلِ حَتَّى يُرِيَ اللَّهُ خَلِيفَةَ نَبِيِّهِ ﷺ وَالْمُهَاجِرِينَ أَمْرًا يَعْذِرُونَكُمْ بِهِ.

**٧٢٢١- تاریقی کوڕی شیهاب لە ئەبو بەکرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی بەنوێنەرانی بوزاخە [١]، (بڕۆن) شوێن وشترەکان کەون (و بیان لەوەڕێنن)، هەتا خوا بڕیارێك نیشانی جێنشینی پێغەمبەرەکەیی ﷺ و کۆچەران دەدات ببێتە عوزر و بەهانە بۆتان.**

## بابٌ

٧٢٢٢- ٧٢٢٣- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ، سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: "يَكُونُ اثْنَا عَشَرَ أَمِيرًا" فَقَالَ كَلِمَةً لَمْ أَسْمَعْهَا، فَقَالَ أَبِي: إِنَّهُ قَالَ: "كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ".

## باسێک

**٧٢٢٢- ٧٢٢٣- عەبدولمەلیك دەڵێ:لە جابیری کوڕی سەمورەم ﷺ بیست وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((دوازدە ئەمیر و لێپرسراو پەیدا دەبن)) ئینجا وشەیەکی فەرموو گوێم لێی نەبوو، جا باوکم وتی: بێگومان فەرمووی: ((هەمویان لە قورەیشن)).**

---

(١) بوزاخە: کۆمەڵێک بوون پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام، پاشان پەشیمان بوونەوە و نوێنەریان نارد بۆ لای ئەبو بەکر و عوزریان هێنایەوە، ئەبو بەکریش حەزی کرد بڕیار نەدات دەربارەیان تا ڕاوێژ نەکات لە بارەیانەوە. بڕوانە: إرشاد الساري:١٥/١٨٢.

## ٥٢- بَابُ إِخْرَاجِ الخُصُومِ وَأَهْلِ الرِّيَبِ مِنَ البُيُوتِ بَعْدَ المَعْرِفَةِ

وَقَدْ أَخْرَجَ عُمَرُ ﷺ أُخْتَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ حِينَ نَاحَتْ.

٧٢٢٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ يُحْتَطَبُ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيَؤُمَّ النَّاسَ، ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُكُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَرْقًا سَمِينًا أَوْ مَرْمَاتَيْنِ حَسَنَتَيْنِ لَشَهِدَ العِشَاءَ»[1].

## ٥٢- باسی دەرکردنی داوا چییەکان و خەڵکی گوماناوی و تۆمەتبار لە ماڵەکان دوای زانین (و ئاشکرا بوونیان)

بێگومان عومەر ﷺ خوشکی ئەبو بەکری لە ماڵ دەکرد کاتێ شین و شەپۆڕی کرد[2].

٧٢٢٤- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، بەڕاستی نیازم بوو کە فەرمان بدەم هەندێ دار ببڕدرێ و کۆبکرێتەوە، پاشان فەرمان بکەم بانگ بۆ نوێژ بدرێ، پاشان فەرمان بدەم بە پیاوێ پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات، ئینجا بڕۆم بۆ سەر کەسانێك (کە نایەن بۆ نوێژی جەماعەت) خانووەکانیان بسوتێنم بەسەریاندا، وە سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر کەسێکیان بیزانیایە (ئەگەر بێت بۆ نوێژی جەماعەت)، گرتکێکی گۆشتنی یا دوو تیری جوان و چاکی دەست دەکەوێ، ئەوە ئامادەی نوێژی عیشا دەبوو)).

---

(١) بڕوانە: ٦٤٤.

(٢) کاتێ ئەبو بەکر ﷺ مردبوو.

## ٥٣- بابٌ: هَلْ لِلإِمَامِ أَنْ يَمْنَعَ المُجْرِمِينَ وَأَهْلَ الْمَعْصِيَةِ مِنَ الكَلَامِ مَعَهُ وَالزِّيَارَةِ وَنَحْوِهِ؟

٧٢٢٥- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ -وَكَانَ قَائِدَ كَعْبٍ مِنْ بَنِيهِ حِينَ عَمِيَ- قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: لَمَّا تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ -فَذَكَرَ حَدِيثَهُ- وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُسْلِمِينَ عَنْ كَلَامِنَا، فَلَبِثْنَا عَلَى ذَلِكَ خَمْسِينَ لَيْلَةً، وَآذَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِتَوْبَةِ اللَّهِ عَلَيْنَا[١].

## ٥٣- باسێک: ئایا بۆ پێشەوا دروستە نەهێڵێت گوناهباران و خەڵکی سەرپێچی کەر (خەڵک) قسەی لەگەڵدا بکەن و سەردانی بکەن و شتی بەو جۆرە؟

**٧٢٢٥- عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك-کە ئەو لە ناو کوڕەکانیدا چاوساغی کەعب بوو کاتێ کوێر بوو بوو- دەڵێ: لە کەعبی کوڕی مالیکم ﷺ بیست وتی: کاتێ لە غەزای تەبووکدا لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێما، ئینجا فەرموودەکەی بە (درێژی) گێرایەوە و وتی: وە پێغەمبەری خوا ﷺ مسوڵمانانی قەدەغەکرد لە قسەکردن لەگەڵ ئێمەدا، ئینجا پەنجا شەو بەو حاڵەوە ماینەوە، وە (ئینجا) پێغەمبەری خوا ﷺ گیراکردنی پەشیمانی خوا بۆ ئێمەی ڕاگەیاند[٢].**

---

(١) بڕوانە: ٢٧٥٧.

(٢) بەناو مسوڵماناناداکاتێ قورئان دابەزی بە لێخۆشبونی خوا لێیان.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٩٤- كِتَابُ التَّمَنِّي

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٩٤- پەڕاوی ئاوات خواستن

## ١- بابُ ما جاءَ في التَّمَنِّي ومَنْ تَمَنَّى الشَّهَادَةَ

٧٢٢٦- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَسَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلاَ أَنَّ رِجَالاً يَكْرَهُونَ أَنْ يَتَخَلَّفُوا بَعْدِي وَلاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُهُمْ مَا تَخَلَّفْتُ، لَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ»[١].

## ١- باسی ئەوەی لە بارەی ئاوات خواستنەوە هاتووە، وە ئەوەی ئاواتی شەهید بوون بخوازێت

**٧٢٢٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە لەبەر ئەوە نەبوایە کە پیاوانێك لە باوەڕداران پێیان خۆش نەبوو کەبەجێ دەمێنن و لەگەڵم نایەن، وولاخ نییە پێیان بدەم سواری بن، (لە هیچ غەزایەك) دوا نەدەکەوتم، ئاواتە خوازبووم لە ڕێی خوادا بکوژرێم، پاشان زیندوو بکرێمەوە پاشان بکوژرێمەوە، پاشان زیندوو بکرێمەوە پاشان بکوژرێمەوە، پاشان زیندوو بکرێمەوە پاشان بکوژرێمەوە)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٦.

٧٢٢٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ وَدِدْتُ أَنِّي لأُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ». فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَقُولُهُنَّ ثَلاَثًا أَشْهَدُ بِاللَّهِ[1].

**٧٢٢٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئاواتە خوازبووم لە ڕێی خوادا بجەنگێم ئینجا بکوژرێم، پاشان زیندوو بکرێمەوە، پاشان بکوژرێمەوە، پاشان زیندوو بکرێمەوە، پاشان بکوژرێمەوە، پاشان زیندوو بکرێمەوە، پاشان بکوژرێمەوە))، ئینجا ئەبو هورەیرە ﷺ ئەو وتانەی سێ جار سێ جار دەوتەوە خودا بە شایەت بێت.**

## ٢- باب تَمَنِّي الخَيْرِ

وَقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَوْ كَانَ لِي أُحُدٌ ذَهَبًا»

٧٢٢٨- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَوْ كَانَ عِنْدِي أُحُدٌ ذَهَبًا لأَحْبَبْتُ أَنْ لاَ يَأْتِيَ ثَلاَثٌ وَعِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ، لَيْسَ شَيْءٌ أُرْصِدُهُ فِي دَيْنٍ عَلَيَّ أَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهُ»[2].

## ٢- باسی ئاوات خواستنی چاکە

**وە ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((ئەگەر کێوی ئوحود هی من بوایە و ئاڵتوون بوایە))**

**٧٢٢٨- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((ئەگەر (کێوی) ئوحود هی من بێت و ئاڵتوون بێت، بەڕاستی پێم خۆش بوو**

(١) بڕوانە: ٣٦.

(٢) بڕوانە: ٢٣٨٩.

سێ ڕۆژ بەسەرمدا تێنەپەڕێ و دینارێکم لا مابێ، کەسم دەست کەوێ وەری گرێت - شتێکی نەبێ داینێم بۆ قەرزێك لەسەرم بێت (بیدەمەوە)) ).

## ٣- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ»

٧٢٢٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا سُقْتُ الْهَدْيَ، وَلَحَلَلْتُ مَعَ النَّاسِ حِينَ حَلُّوا»[1].

## ٣- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((ئەگەر ئەوەی لەکاری من ڕابورد ئێستام بووایە[2]))

**٧٢٢٩- عوروە دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ئەم کارەی ئێستام لە ڕابردوودا بزانیایە ئاژەڵی هەدیەم نەدەهێنا، وە لەگەڵ خەڵکەکەدا کەی ئیحرامیان شکاند منیش دەمشکاند)).**

٧٢٣٠- حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ، عَنْ حَبِيبٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَبَّيْنَا بِالْحَجِّ وَقَدِمْنَا مَكَّةَ لأَرْبَعٍ خَلَوْنَ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ نَطُوفَ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالمَرْوَةِ، وَأَنْ نَجْعَلَهَا عُمْرَةً وَلْنَحِلَّ إِلاَّ مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ مَعَ أَحَدٍ مِنَّا هَدْيٌ غَيْرَ النَّبِيِّ ﷺ وَطَلْحَةَ، وَجَاءَ عَلِيٌّ مِنَ اليَمَنِ مَعَهُ الهَدْيُ فَقَالَ: أَهْلَلْتُ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: نَنْطَلِقُ إِلَى مِنًى وَذَكَرُ أَحَدِنَا يَقْطُرُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ، وَلَوْلاَ أَنَّ مَعِي

(١) بڕوانە: ٢٩٤.

(٢) یان: ئەگەر ئەوسام ئێستام بوایە.

الهَدْيَ لَحَلَلْتُ». قَالَ: وَلَقِيَهُ سُرَاقَةُ وَهْوَ يَرْمِي جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَنَا هَذِهِ خَاصَّةً؟ قَالَ: «لاَ بَلْ لأَبَدٍ». قَالَ: وَكَانَتْ عَائِشَةُ قَدِمَتْ مَكَّةَ وَهْيَ حَائِضٌ، فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تَنْسُكَ المَنَاسِكَ كُلَّهَا، غَيْرَ أَنَّهَا لاَ تَطُوفُ وَلاَ تُصَلِّي حَتَّى تَطْهُرَ، فَلَمَّا نَزَلُوا البَطْحَاءَ قَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَنْطَلِقُونَ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ وَأَنْطَلِقُ بِحَجَّةٍ؟ قَالَ: ثُمَّ أَمَرَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ أَنْ يَنْطَلِقَ مَعَهَا إِلَى التَّنْعِيمِ، فَاعْتَمَرَتْ عُمْرَةً فِي ذِي الحَجَّةِ بَعْدَ أَيَّامِ الحَجِّ[١].

**٧٢٣٠- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بووین بە حەج نێتمان هێنا (و ئیحرامامان بەست)، چوار ڕۆژ لەمانگی زی لحیجە ڕۆشتبوو گەشتینە مەککە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین کە تەواف کابە وصەفا و مەڕوە بکەین، وە حەجەکەمان بکەین بە عومرە و ئیحرام بشکێنین، جگەلە کەسێك ئاژەڵی هەدی پێیە، دەڵێ: وە هیچ کام لە ئێمە هەدی پێنە بوو جگەلە پێغەمبەر ﷺ و تەڵحە ﷺ، عەلیش ﷺ لە یەمەنەوە هات و ئاژەڵی هەدی پێبوو وتی: ئیحرامم بەستووە و نیەتم هێناوە بەو نییەتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی، جا هاوەڵان وتیان: چۆن بڕۆین بۆ مینا و زەکەری کەسێکمان ئاوی[٢] لێدەتکێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوەی لە کاری من ڕابورد ئێستام بووایە، هەدیم نەدەهێنا و ئەگەر ئاژەڵی هەدیم پێ نەبووایە ئیحرامم دەشکاند))، (جابیر) دەڵێ: سوراقەی پێگەشت لە کاتێکدا ڕەجمی عەقەبەی[٣] دەکرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەمە[٤] هەر**

---

(١) بڕوانە: ١٥٥٧.

(٢) مەبەستی لە ئاوی شەهوەت و تۆی پیاوە کە بەهۆی نێوان کەمی سەرجێییان لەگەڵ ژنەکانیان وا دەڵێن.

(٣) لە کوردەواریدا پێی دەڵێن: شەیتانی گەورە .

(٤) گۆڕینی حەج بەعومرە بۆ کەسێک هەدی پێ نەبێت .

تایبەتە بەئێمەوە؟ فەرمووی: ((نەخێر، بەڵكو بۆ هەمیشەییە))، جابیر دەڵێ: وە عائیشە گەشتبوویە مەككە لە بێنوێژیدا بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكرد ئەركەكانی حەج هەمووی جێ بەجێ بكات، تەنها تەواف و نوێژ نەكات هەتا پاك دەبێتەوە، ئینجا كاتێ لە بەتحا لایاندا عائیشە وتی: ئایا ئێوە دەڕۆنەوە بە (ئەنجامدانی) حەج و عومرەیەكەوە منیش بەحەجێكەوە بەتەنها؟ جابیر دەڵێ پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بەعەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبو بەكری صدیق كە لەگەڵ عائیشە بڕوات بۆ تەنعیم[1] (لەوێ ئیحرام ببەستێ بەعومرەوە)، ئەوسا عائیشە (ڕەزای خوای لێ بیت) عومرەیەكی كرد لە مانگی زی لحیجەدا پاش ڕۆژانی حەج.

## ٤- بابُ قوْلِ النبي ﷺ: "ليْتَ كَذَا وَكَذَا"

٧٢٣١- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَد، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ، حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: أَرِقَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَقَالَ: «لَيْتَ رَجُلاً صَالِحًا مِنْ أَصْحَابِي يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ». إِذْ سَمِعْنَا صَوْتَ السِّلاحِ، فقَالَ: «مَنْ ذَا». قِيلَ: سَعْدٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، جِئْتُ لأَحْرُسُكَ. فَنَامَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى سَمِعْنَا غَطِيطَهُ.

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَقَالَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها: قَالَ بِلاَلٌ رضي الله عنه:

أَلاَ لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً... بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ

فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ[2].

---

(١) شوێنێكە لە دەرەوەی مەككە ئێستا، پێی دەڵێن: مزگەوتی عائیشە رضي الله عنها.

(٢) بڕوانە: ٢٨٨٥.

## ٤- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ (خۆزگە ئەوە و ئەوە ببوایە)

٧٢٣١- عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەوێك خەوی لێ نەدەكەوت، ئینجا فەرمووی: ((خۆزگە ئەم شەو پیاوێكی چاك لە هاوەڵانم ئێشكی بگرتایە بۆ پارێزگاریم)) لەوكاتەدا گوێمان لە دەنگێكی چەك بوو فەرمووی: ((ئەوە كێیە؟)) وترا: سەعدە ئەی پێغەمبەری خوا هاتووم ئێشكی تۆ بگرم، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت هەتا گوێمان لە پرخە پرخی بوو.

-ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: وە عائیشە ﵂ دەڵێ: بیلال ﵁ وتی: ئای كاشكی بمزانیایە لە شوێنێكدا شەو ڕۆژ دەكەمەوە..... كە دەورم زوڕناتك و گیای جەلیل بێت، عائیشە دەڵێ: منیش ئەوەم بە پێغەمبەر ﷺ گەیاند.

## ٥- بابُ تَمَنِّي الْقُرْآنِ وَالْعِلْمِ

٧٢٣٢- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "لا تَحَاسُدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَهْوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ يَقُولُ: لَوْ أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ لَفَعَلْتُ مثلما يَفْعَلُ".

حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ بِهَذَا[1].

## ٥- باسی ئاوات خواستنی (شارەزایی لە) قورئان و زانست

٧٢٣٢- ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((حەسوودی بردن بەیەكتری لە دوو شتدا نەبێ نابێت: پیاوێك خوا شارەزایی قورئانی

(١) بڕوانە: ٥٠٢٦.

پێدابێت جا ئەو كەسە لە كاتەكانی شەو و ڕۆژدا دەوری بكاتەوە، (ئەو كەسەش) بڵێ: كاشكی وێنەی ئەوەی بەو بەخشراوە بە منیش ببەخشرایە، منیش هاوشێوەی ئەوم دەكرد كە ئەو دەیكات)).

(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) قوتەیبە بۆی گێڕاینەوە وتی: جەریر ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە[1].

## ٦- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ التَّمَنِّي

وقوله: ﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ ﴿٣٢﴾ ﴾ الآية. النساء.

٧٢٣٣- حَدَّثَنَا حَسَنُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ أَنَسٌ ﷺ: لَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ تَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ». لَتَمَنَّيْتُ[2].

## ٦- باسی ئەوەی بەناپەسەند دادەنرێ لە ئاوات خواستن

(وە ئاوات مەخوازن بۆ ئەو پلەیەی كە خوا باوی هەندێكتانی داوە بەسەر هەندێكی ترتاندا، بۆ پیاوان بەش هەیە لەوەی بەدەستی ئەهێنن، وە بۆ ئافرەتیش بەش هەیە لەوەی بەدەستی ئەهێنن، وە داوا لە خوا بكەن لە بەهەرە و بەخشیشی خۆی، بەڕاستی خوا بەهەموو شتێك زانایە).

٧٢٣٣- ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئاواتی مردن مەخوازن... )) ئاواتم (بەمردن) دەخواست.

---

(١) بەهەمان ڕشتەی پێشوو گێردراوەتەوە .

(٢) بڕوانە: ٥٦٧١.

٧٢٣٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنِ ابْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسٍ قَالَ: أَتَيْنَا خَبَّابَ بْنَ الأَرَتِّ نَعُودُهُ وَقَدِ اكْتَوَى سَبْعًا، فَقَالَ: لَوْلاَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِهِ[1].

**٧٢٣٤- ئیبنو ئەبو خالید لە قەیسەوە گێڕایەوە و وتی: ڕۆشتین بۆلای خەببابی کوڕی ئەرەت نەخۆش بوو، سەردانیمان کرد، کە بێگومان حەوت جار (سکی) خۆی داخ کردبوو، ئینجا وتی: لەبەر ئەوە نەبوایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لێمان داوای مردن بکەین، داوای مردنم دەکرد.**

٧٢٣٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ -اسْمُهُ سَعْدُ بْنُ عُبَيْدٍ مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَزْهَرَ- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَتَمَنَّى أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ، إِمَّا مُحْسِنًا فَلَعَلَّهُ يَزْدَادُ، وَإِمَّا مُسِيئًا فَلَعَلَّهُ يَسْتَعْتِبُ»[2].

**٧٢٣٥- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((با کەستان ئاواتی مردن نەخوازێت، یان چاکەکارە ئەوە لەوانەیە چاکەی زیاتر بکات، یا خراپەکارە ئەوە لەوانەیە بگەڕێتەوە (لە خراپەکاری)) ).**

## ٧- باب قَوْلِ الرَّجُلِ: لَوْلاَ اللَّهُ مَا اهْتَدَيْنَا

٧٢٣٦- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَنْقُلُ مَعَنَا التُّرَابَ يَوْمَ الأَحْزَابِ، وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ وَارَى التُّرَابُ بَيَاضَ بَطْنِهِ يَقُولُ: «لَوْلاَ أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا، وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا، فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا، إِنَّ الأُلَى -وَرُبَّمَا قَالَ: الْمَلاَ- قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا، إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا أَبَيْنَا" يَرْفَعُ بِهَا صَوْتَهُ[3].

---

(١) بڕوانە: ٥٦٧٢.

(٢) بڕوانە: ٣٩٠.

(٣) بڕوانە: ٢٨٣٦.

## ٧- باسى ئەم فەرموودەى پێغەمبەر ﷺ[1] ((ئەگەر خوا نەبوایە ئێمە ڕێنموون نەدەبووین))

**٧٢٣٦- ئەبو ئیسحاق لە بەڕائی کوڕی عازیبەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە ڕۆژی غەزای ئەحزابدا پێغەمبەر ﷺ گڵى (خەندەقەکەى) دەگواستەوە، سوێند بەخوا دیم گڵەکە سپیایی سکی داپۆشیبوو، دەیفەرموو: ((خوایە گەر تۆ نەبوویتایە ڕێنموون نەدەبووین و زەکاتمان نەدەدا و نوێژمان نەدەکرد، دەی کەواتە ئارامی و دڵنیایی دابارێنە بەسەرماندا، بێگومان ئەوانە-هەندێ جار دەیوت:) ئەو گەورە (بێ دین)انە بەدڵنیاییەوە دەستدرێژی دەکەنە سەرمان، ئەگەر ئەوانە بیانەوێ فیتنە و ئاشووب بنێنەوە ئێمە ڕێگە نادەین و ناهێڵین))، پێغەمبەر ﷺ دەنگی بەرز دەکردەوە بە بڕگەی کۆتایی سروودەکە.**

## ٨- بابُ كَرَاهِيَةِ التَّمَنِّي لِقَاءَ الْعَدُوِّ

وَرَوَاهُ الأَعْرَجُ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

**٧٢٣٧-** حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ، وَكَانَ كَاتِبًا لَهُ- قَالَ: كَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى فَقَرَأْتُهُ، فَإِذَا فِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، وَسَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ»[3].

---

(١) لە هەندێ گێڕانەوەى بوخاريدا بەم جۆرەیە: باسی وتەی پیاوێک .

(٢) بڕوانە: ٣٠٢٦.

(٣) بڕوانە: ٢٨١٨.

## ٨- باسی ناپەسەندە ئاوات خواستنی گەشتن بە دووژمن [١]

-فەرموودەی ئەم باسە ئەعرەج گێڕاویەتیەوە لە ئەبی هورەیرەوە ﷺ ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ [٢].

٧٢٣٧- سالیمی ئەبو نەزر- کە کۆیلەی ئازادکراوی عومەری کوڕی عوبەیدوڵلا بوو کە نووسەری عومەریش بوو- دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ نامەیەکی نووسی بۆ عومەر منیش خوێندمەوە، بینیم تێیدا (نووسیبووی): بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئاواتی گەشتن و بەرەنگاربوونەوەی دوژمن مەخوازن و داوای سەلامەتی و بێوەیی لە خوا بکەن)).

## ٩- بابُ مَا يَجُوزُ مِنَ اللَّوْ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً ﴿٨٠﴾ ﴾ هود

٧٢٣٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: ذَكَرَ ابْنُ عَبَّاسٍ المُتَلاَعِنَيْنِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ شَدَّادٍ: أَهِيَ الَّتِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كُنْتُ رَاجِمًا امْرَأَةً مِنْ غَيْرِ بَيِّنَةٍ؟». قَالَ: لاَ، تِلْكَ امْرَأَةٌ أَعْلَنَتْ [٣].

## ٩- باسی ئەوەی دروستە لە (وتنی) خۆزگە [٤].

وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (خۆزگە لە بەرانبەری ئێوەدا هێزێکم هەبوایە).

٧٢٣٨- قاسیمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ باسی ژن و پیاوە نەفرین کەرەکەی کرد، عەبدوڵلای کوڕی شەددادیش وتی: ئەو ئافرەتە ئەوەیە

(١) بۆ جەنگ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵی.
(٢) لە صەحیحی بوخاریدا بە ژمارە: ٣٠٢٦.
(٣) بڕوانە: ٥٣١٠.
(٤) (لو) واتە: خۆزگە، مەبەستی بوخاری ئەوەیە کە بەکارهێنانی (لو) بەرەهایی ناپەسەند نییە، بەڵکو هەندێ جار دروستە. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٩٩/١٥.

**كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ژنێكم بە بێ شایەتی بەردباران بكردایە؟)) ئیبنو عەبباس وتی: نەخێر ئەوە[1] ئافرەتێك بوو كاری خراپەی بەئاشكرا دەكرد[2]، (بەڵام شایەتی نەبوو لەسەری).**

٧٢٣٩- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو: حَدَّثَنَا عَطَاءٌ قَالَ: أَعْتَمَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْعِشَاءِ، فَخَرَجَ عُمَرُ فَقَالَ: الصَّلاَةَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَقَدَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ. فَخَرَجَ وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ يَقُولُ: «لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي -أَوْ على النَّاسِ، وَقَالَ سُفْيَانُ أَيْضًا: عَلَى أُمَّتِي- لأَمَرْتُهُمْ بِالصَّلاَةِ هَذِهِ السَّاعَةَ».

**٧٢٣٩- عەمر دەڵێ:عەتا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی عیشای دواخست تا دونیا تاریك بوو، ئینجا عومەر ﷺ هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرە بۆ نوێژ ژن و منداڵەكان خەوتن، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە (لە ماڵ بۆ مزگەوت) و سەری ئاوی لێ دەتكا و دەیفەرموو: ((ئەگەر لەسەر ئوممەتم قورس و گران نەبووایە)) یان: لەسەر خەڵك. سوفیان هەروەها دەڵێ: (فەرمووی) لەسەر ئوممەتم- بێگومان فەرمانم پێ دەكردن (بەنوێژكردن) ئا لەم كاتەدا)).**

٧٢٣٩ /م- قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَخَّرَ النَّبِيُّ ﷺ هَذِهِ الصَّلاَةَ فَجَاءَ عُمَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَقَدَ النِّسَاءُ وَالْوِلْدَانُ. فَخَرَجَ وَهْوَ يَمْسَحُ الْمَاءَ عَنْ شِقِّهِ يَقُولُ: «إِنَّهُ لَلْوَقْتُ، لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي». وَقَالَ عَمْرٌو: حَدَّثَنَا عَطَاءٌ. لَيْسَ فِيهِ ابْنُ عَبَّاسٍ، أَمَّا عَمْرٌو فَقَالَ: رَأْسُهُ يَقْطُرُ. وَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: يَمْسَحُ الْمَاءَ عَنْ شِقِّهِ. وَقَالَ عَمْرٌو: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي". وَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: إِنَّهُ لَلْوَقْتُ، لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي.

---

(١) كە پێغەمبەر ﷺ وای پێ فەرمووە.

(٢) نەخۆی دانی دەنا بەخراپەكەیدا نەشایەتیش لەسەر ی هەبوو، بەڵام دەنگ و باسی خراپی هەبوو.

وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٧٢٣٩- ئیبنو جورەیج دەگێڕێتەوە لە عەتاوە ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەم نوێژە (ی عیشا)ی دواخست، ئەوسا عومەر هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ژن و منداڵان خەوتن، ئینجا پێغەمبەریش ﷺ هاتە دەرەوە (لە ماڵ بۆ مزگەوت)، ئاوەکەی بەلا تەنیشتەوە دەسڕی و دەیفەرموو: ((ئا ئەمە کاتەکەیەتی [2] ئەگەر لەسەر ئوممەتم قورس و گران نەبووایە)).**

**عەمر دەڵێ: عەتابۆی گێڕاینەوە لە ڕشتەکەدا ئیبنو عەبباسی تێدا نییە، بەڵام عەمر دەڵێ:سەری ئاوی لێ دەتکا، ئیبنو جورەیج دەڵێ ئاوەکەی لە تەنیشتی دەسڕی، عەمر دەڵێ: ((ئەگەر لەسەر ئوممەتم قورس و گران نەبووایە))، هەر ئیبنو جورەیج دەڵێ: ((ئەمە کاتەکەیەتی ئەگەر لەسەر ئوممەتم قورس نەبووایە)) [3].**

**-ئیبراهیمی کوڕی مونزیر دەڵێ: مەعن بۆی گێڕاینەوە وتی: موحەممەد کوڕی موسلیم لە عەمرەوە لە عەتاوە گێڕایەوە ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە**

٧٢٤٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ»[4].

---

(١) بڕوانە: ٥٧١.

(٢) واتە: نوێژی عیشا.

(٣) کە عەمر دەڵێ تا کۆتایی ئەوە بەهەر ڕشتە و ڕێگایەک فەرموودەکەی پێ هاتووە ئەو جۆرانەی تیایە، واتە: بەچەند شێواز گێڕدراوەتەوە.

(٤) بڕوانە: ٨٨٧.

**٧٢٤٠-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر ناڕەحەت نەبوایە لەسەر ئوممەتم، بێگومان فەرمانم پێدەكردن بە سیواك كردن)).**

٧٢٤١- حَدَّثَنَا عَيَّاشُ بْنُ الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: وَاصَلَ النَّبِيُّ ﷺ آخِرَ الشَّهْرِ، وَوَاصَلَ أُنَاسٌ مِنَ النَّاسِ، فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: "لَوْ مُدَّ بِيَ الشَّهْرُ لَوَاصَلْتُ وِصَالاً يَدَعُ الْمُتَعَمِّقُونَ تَعَمُّقَهُمْ، إِنِّي لَسْتُ مِثْلَكُمْ، إِنِّي أَظَلُّ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ». تَابَعَهُ سُلَيْمَانُ بْنُ مُغِيرَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٧٢٤١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە كۆتای مانگ (ی ڕەمەزاندا) چەند ڕۆژێك لەسەر یەك بەڕۆژوو بوو[2]، چەند كەسێكیش لە خەڵكەكە چەند ڕۆژ بەسەریەكەوە بەڕۆژوو بوون، ئینجا ئەو باسە گەشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: ((ئەگەر مانگەكەم بۆ درێژ ببوایەتەوە ئەوەندە لەسەر یەك بەڕۆژوو دەبووم، ئەوانەی ڕۆ چوون وازیان لە ڕۆ چوونەكەیان بهێنایە، من وەك ئێوە نیم، من چەند كات دەمێنمەوە پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم پێ دەدات)).**
**-سولەیمانی كوڕی موغیرە لە سابیتەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە ئەنەسەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی حومەید دەكات.**

٧٢٤٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْوِصَالِ. قَالُوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ. قَالَ: «أَيُّكُمْ مِثْلِي؟، إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ».

---

(١) بروانە: ١٩٦١.
(٢) واتە: ڕۆژووی نەدەشكاند بەردەوام بەڕۆژوو بوو، ئەو چەند ڕۆژ و شەوە بەڕۆژوو بەسەر یەكەوە.

فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا، وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلاَلَ، فَقَالَ: «لَوْ تَأَخَّرَ لَزِدْتُكُمْ». كَالْمُنَكِّلِ لَهُمْ[1].

**٧٢٤٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە شەو دانە دەم ڕۆژ لە ڕۆژووگرتندا، عەرزیان کرد: چونکە بەڕاستی تۆ خۆت شەو دەخەیتە سەر ڕۆژ؟! فەرمووی: ((کامتان وەك منن؟ لە ڕاستیدا من شەوم بەسەردا دێت پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم دەداتێ))، جا کە ملیان نەدا وازبێنن، پێغەمبەر ﷺ بەرۆژێ ویصالی پێکردن ڕۆژێکی تریشی پێکردن، پاشان مانگیان بینی (و بوو بەجەژن)، ئەوسا فەرمووی: ((ئەگەر (بینینی مانگ) دوا کەوتایە ڕۆژووی پەیوەستم زیاتر پێدەگرتن))، وەك سزا بۆیان.**

**٧٢٤٣-** حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، حَدَّثَنَا أَشْعَثُ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الجَدْرِ أَمِنَ الْبَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قُلْتُ: فَمَا لَهُمْ لَمْ يُدْخِلُوهُ فِي الْبَيْتِ؟ قَالَ: «إِنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمُ النَّفَقَةُ». قُلْتُ: فَمَا شَأْنُ بَابِهِ مُرْتَفِعًا؟ قَالَ: «فَعَلَ ذَاكِ قَوْمُكِ؛ لِيُدْخِلُوا مَنْ شَاءُوا، وَيَمْنَعُوا مَنْ شَاءُوا، لَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِالْجَاهِلِيَّةِ فَأَخَافُ أَنْ تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ أَنْ أُدْخِلَ الْجَدْرَ فِي الْبَيْتِ، وَأَنْ أُلْصِقَ بَابَهُ فِي الأَرْضِ»[2].

**٧٢٤٣- عائیشە ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی ئەو دیوارە کە (پێی دەڵێن حیجری ئیسماعیل) ئایا بەشێکە لە بەیت و کەعبە؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، وتم: ئەی لەبەر چی نەیان خستۆتەوە سەر بەیت؟ فەرمووی: ((بێگومان گەلەکەی تۆ (قورەیش) دەستیان کورت بوو (کاتێ کەعبەیان دروست**

(١) بڕوانە: ١٩٦٥.
(٢) بڕوانە: ١٢٦.

**کردەوە)) )، وتم: ئەی بۆچی دەرگای بەیت بەرزە؟ فەرمووی: ((بۆیە گەلەکەت وایان کردوە تا هەر کەسیان ویست بیبەنە ژوورەوەی کەعبە، هەر کەسیشیان ویست نەیبەنە ژوورەوە، وە ئەگەر گەلەکەت تازە مسوڵمان نەبوونایە چونکە دەترسم لە دڵیانەوە پێی ناڕازی بن کە حیجری ئیسماعیل بخەمە ناو بەیت و دەرگاکەشی بلکێنم بە زەوییەوە)).**

٧٢٤٤- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْلاَ الهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الأَنْصَارِ، وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا وَسَلَكَتِ الأَنْصَارُ - وَادِيًا أَوْ شِعْبًا لَسَلَكْتُ وَادِيَ الأَنْصَارِ أَوْ شِعْبَ الأَنْصَارِ»(١).

**٧٢٤٤- ئەعرەج لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەرکۆچ کردن نەبوایە منیش کەسێك دەبووم لە ئەنصاریەکان، وە ئەگەر خەڵك بە شیوێکدا بڕۆن ئەنصاریەکانیش بەشیوێك یان دۆڵێکدا بڕۆن، منیش بەو شیووە یان دۆڵەی ئەنصاریەکاندا دەڕۆم)).**

٧٢٤٥- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَوْلاَ الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الأَنْصَارِ، وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا أَوْ شِعْبًا، لَسَلَكْتُ وَادِيَ الأَنْصَارِ وَشِعْبَهَا». تَابَعَهُ أَبُو التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الشِّعْبِ(٢).

**٧٢٤٥- عەبدوڵڵای کوڕی زەید ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((ئەگەر کۆچ کردن نەبوایە بێگومان منیش کەسێك دەبووم لە**

---

(١) بڕوانە: ٣٧٧٩.

(٢) بڕوانە: ٤٣٣٠.

**ئەنصاریەکان، وە ئەگەر خەڵك بەشیوێك یان دۆڵێکدا بڕۆن، من بەو شیوە یان دۆڵەی ئەنصاریەکاندا دەڕۆم)).**

**ئەبو تەییاح ئەم فەرموودە لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕاوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەببادی کوڕی تەمیم دەکات لە وشەی** (الشعب)**دا**[1].

(١) کە دەفەرمووی: (أو شعباً).

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٩٥- كِتَابُ أَخْبَارِ الآحَادِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩٥- پەڕاوی فەرموودە ئاحادەکان (١)

## ١- بابُ مَا جَاءَ فِي إِجَازَةِ خَبَرِ الوَاحِدِ الصَّدُوقِ فِي الأَذَانِ وَالصَّلَاةِ وَالصَّوْمِ وَالْفَرَائِضِ وَالأَحْكَامِ

وَقَوْلُ اللَّهِ تعالى: ﴿ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ التوبة، وَيُسَمَّى الرَّجُلُ طَائِفَةً، لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ ﴿٩﴾ ﴾ الحجرات، فَلَوِ اقْتَتَلَ رَجُلَانِ دَخَلَا فِي مَعْنَى الآيَةِ. وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ ﴿٦﴾ ﴾ الحجرات. وَكَيْفَ بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ أُمَرَاءَهُ وَاحِدًا بَعْدَ وَاحِدٍ؟، فَإِنْ سَهَا أَحَدٌ مِنْهُمْ رُدَّ إِلَى السُّنَّةِ.

---

(١) فەرموودە لە ڕووی ژمارەی ئەو کەسانەی لە ڕشتەی فەرموودەکەدان دوو بەشە: یەکەم ئەگەر ژمارەی کەسەکان زۆر بوون بەجۆرێ لە ڕووی عەقڵەوە نەگونجێ لەسەر درۆ ڕێبکەون، وەئەو ژمارە زۆرەش لە هەموو سەردەم چینەکاندا هەبن، ئەوە پێی دەوترێ: فەرموودەی موتەواتیر. دووهەم: بەڵام ئەگەر ژمارەکەیان لە ڕشتەی فەرموودەکەدا ئەوەندە زۆر نەبوو بگاتە ژمارەی موتەواتیر، ئەو پێی دەوترێت: فەرموودەی ئاحاد.

# ١- باسی ئەوەی کە هاتووە دەربارەی ئەوەی کە دروستە کار بە فەرموودەی یەک کەسی ڕاستگۆ و باوەڕ پێکراو بکرێت لە بانگ و نوێژ و ڕۆژوو میرات و هەموو حوکمەکان

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دەبا لە هەموو كۆمەڵێكیان چەند كەسێ بڕۆن بۆ ئەوەی لە ئاینەكەیان تێ بگەن و شارەزابن، وە بۆ ئەوەی هۆزەكەیان (شارەزا بكەن و) بترسێنن كاتی گەڕانەوە (لە جیهاد) بۆ لایان، بۆ ئەوەی ئەوان (شارەزا ببن و) بێدار ببنەوە).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) پیاوێك پێی دەوترێت (طَائِفَةٌ)، بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەگەر دوو كۆمەڵ لە ئیمانداران دژبەیەكتر جەنگیان كرد)، جائەگەر دوو پیاو ببێت بە شەڕیان مانای ئایەتە دەیانگرێتەوە و دەچنە ناو مانای ئایەتەكەوە.**

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەگەر گوناهكارێ هەواڵێكی گرنگی هێنا بۆتان ئەو لێی بكۆڵنەوە (تا ڕوون ببێتەوە) ).**

**(ئەگەر فەرموودەی یەك كەس وەرنەگیرێ)، چۆن پێغەمبەر ﷺ لێپرسراوەكانی دەنارد (بۆشوێنەكان) یەك بەدوای یەكدا؟ ئەگەر یەكێكیان شتێكی لەبیربچێت دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر سوننەت.**

٧٢٤٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ حَدَّثَنَا مَالِكٌ قَالَ: أَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ وَنَحْنُ شَبَبَةٌ مُتَقَارِبُونَ، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَفِيقًا، فَلَمَّا ظَنَّ أَنَّا قَدِ اشْتَهَيْنَا أَهْلَنَا -أَوْ قَدِ اشْتَقْنَا- سَأَلَنَا عَمَّنْ تَرَكْنَا بَعْدَنَا، فَأَخْبَرْنَاهُ، قَالَ: «ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ، فَأَقِيمُوا فِيهِمْ، وَعَلِّمُوهُمْ، وَمُرُوهُمْ -وَذَكَرَ أَشْيَاءَ

أَحْفَظُهَا أَوْ لاَ أَحْفَظُهَا- وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ»[1].

**٧٢٤٦- ماليك ﷺ دەڵێ: ئێمە چەند گەنجێكی هاوتەمەن بووین ڕۆشتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ جا بیست شەو و ڕۆژ لە خزمەتیدا ماینەوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بەبەزەیی و میهرەبان بوو، ئینجا كەزانی ئێمە ئارەزووی خاو خێزانمان دەكەین- یان زۆر تاسەیان دەكەین- پرسیاری لێ كردین كە هاتووین كێمان لە دوا خۆمان بەجێهێشتووە، ئێمەش پێمان ووت، فەرمووی: ((بگەڕێنەوە بۆ لای خاو خێزانتان و لە لایان بمێننەوە و شارەزایان بكەن و فەرمانیان پێ بدەن (بەوەی پێویستە))، - (ماليك دەڵێ:) وە پێغەمبەر ﷺ شتانێكی فەرموو لە بیرم بێ یا لە بیرم نەمابێ- نوێژ بكەن بەو شێوەی من دەبینن نوێژ دەكەم، ئینجا كە نوێژ بوو با یەكێكتان بانگتان بۆ بدات و ئەوەتان گەورەترە پێشنوێژیتان بۆ بكات)).**

**٧٢٤٧-** حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَمْنَعَنَّ أَحَدَكُمْ أَذَانُ بِلاَلٍ مِنْ سَحُورِهِ، فَإِنَّهُ يُؤَذِّنُ - أَوْ قَالَ: يُنَادِي - لِيَرْجِعَ قَائِمَكُمْ وَيُنَبِّهَ نَائِمَكُمْ، وَلَيْسَ الْفَجْرُ أَنْ يَقُولَ هَكَذَا -وَجَمَعَ يَحْيَى كَفَّيْهِ- حَتَّى يَقُولَ هَكَذَا». وَمَدَّ يَحْيَى إِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَتَيْنِ[2].

**٧٢٤٧- ئەبو عوسمان لە عەبدوڵلای كوڕی مەسعوودەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بانگدانی بیلال ڕێگری كەستان نەكات لە خواردنی پارشێووی، چونكە بێگومان ئەو بانگ دەدات- یان وتی: بانگ دەڵێ- تا شەو نوێژگەرتان بگەڕێتەوە (سەرخەوێ بشكێنێ)، وە تا خەوتووتان**

(١) بڕوانە: ٦٢٨.

(٢) بڕوانە: ٦٢١.

**بێداربکاتەوە، نەك بۆ ئەوەبێ سپێدە بووە، کە ئاوەها بڵێ-یەحیا پەنجەکانی هەردوو دەستی قوچاند- هەتا بڵێ ئاوەها))، وەیەحیا هەردوو پەنجەی شایەتومانی درێژ کرد.**

٧٢٤٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ بِلاَلاً يُنَادِي بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ»[١].

**٧٢٤٨- عەبدوڵڵای کوڕی دینار دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ﷺ بیست لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((بێگومان بیلال (ڕەمەزانان) لە شەودا بانگ دەدات، کەواتە بخۆن و بخۆنەوە هەتا عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتوم بانگ دەدات)).**

٧٢٤٩- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقِيلَ: أَزِيدَ فِي الصَّلاَةِ؟ قَالَ: «وَمَا ذَاكَ؟». قَالُوا: صَلَّيْتَ خَمْسًا. فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَ مَا سَلَّمَ[٢].

**٧٢٤٩- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی بۆ کردین نوێژی نیوەڕۆ پێنج ڕکاتی کرد، پێی وترا: ئایا نوێژ لێی زیاد کراوە؟ فەرمووی: ((چی بووە؟)) وتیان: پێنج ڕکات نوێژت کرد، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ (وەك دانیشتنی تەحیاتی دانیشت) دوو سوژدەی (هەڵەی)، برد پاش ئەوەی سەلامی دایەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٦١٧.

(٢) بڕوانە: ٤٠١.

٧٢٥٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ انْصَرَفَ مِنِ اثْنَتَيْنِ، فَقَالَ لَهُ ذُو الْيَدَيْنِ: أَقَصُرَتِ الصَّلاَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَمْ نَسِيتَ؟ فَقَالَ: «أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟». فَقَالَ النَّاسُ: نَعَمْ. فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ، ثُمَّ سَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ، ثُمَّ رَفَعَ[1].

**٧٢٥٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕكاتی دووەمدا نوێژەكەی كۆتایی پێ هێنا، بۆیە پیاوە دەست درێژەكە پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژ كورت بۆتەوە یان لەبیرت چوو؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەرێ دەست درێژەكە ڕاست دەكات؟)) خەڵكەكەش وتیان: بەڵێ، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و دوو ڕكاتی تر نوێژی كرد پاشان سەلامی دایەوە، ئینجا ئەڵڵاهو ئەكبەری كرد، پاشان سوژدەی برد بەوێنەی سوژدەكانی تری یا درێژتر، پاشان بەرز بوویەوە، پاشان ئەڵڵاهو ئەكبەری كرد، ئینجا سوژدەی برد بەوێنەی سوژدە بردنی، پاشان بەرز بوویەوە (لە سوژدەكەی).**

٧٢٥١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: بَيْنَا النَّاسُ بِقُبَاءٍ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ إِذْ جَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ قُرْآنٌ، وَقَدْ أُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الكَعْبَةَ، فَاسْتَقْبِلُوهَا. وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّأْمِ، فَاسْتَدَارُوا إِلَى الكَعْبَةِ[2].

**٧٢٥١-عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە كاتێكدا خەڵكی لە نوێژی بەیانیدا بوون لە (مزگەوتی) قوبا، لەو كاتەدا كەسێك هات بۆ لایان وتی: بێگومان ئەم**

---

(١) بڕوانە: ٤٨٢.

(٢) بڕوانە: ٤٠٣.

**شەو پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بۆ دابەزێنراوە، وە بێگومان فەرمانی پێکراوە کە ڕوو بکاتە کەعبەی پیرۆز،کەواتە ئێوەش ڕووی تێبکەن، لەو کاتەدا ئەوان ڕوویان لە شام بوو (کە قودسی لێیە) ئەنجا سوڕانەوە ڕوو بەکەعبە.**

٧٢٥٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ صَلَّى نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ، -أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا-، وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ﴿١٤٤﴾ ﴾ البقرة، فَوُجِّهَ نَحْوَ الْكَعْبَةِ، وَصَلَّى مَعَهُ رَجُلٌ الْعَصْرَ، ثُمَّ خَرَجَ فَمَرَّ عَلَى قَوْمٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ هُوَ يَشْهَدُ أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَأَنَّهُ قَدْ وُجِّهَ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَانْحَرَفُوا وَهُمْ رُكُوعٌ فِي صَلاَةِ الْعَصْرِ[1].

**٧٢٥٢- بەڕا ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە شانزدە - یان حەڤدە مانگ- ڕوو بە بەیتولمەقدیس نوێژی کرد، وە پێغەمبەر ﷺ حەزی دەکرد ڕوو بکاتە کەعبە، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند (بێگومان ئێمە گەڕانی ڕووخسارت ڕوو بە ئاسمان دەبینین، دەی سوێند بێت ڕووت دەکەینە ڕووگەیەك کە پەسەندت بێ و ڕازی بیت پێی)، ئیتر ڕووی پێ کرایە کەعبە (لە نوێژکردندا)، وە پیاوێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی عەسری کرد، پاشان ڕۆشتە دەرەوە (لە مزگەوت) و تێپەڕی بەلای کۆمەڵێك لە ئەنصاردا و وتی: ئەو شایەتی ئەدات کە بێگومان خۆی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی کردوە، کە بەدڵنیاییەوە ڕووی پێ کرایە کەعبە، ئیتر خەڵکەکەش سوڕانەوە (ڕوویان کردە کەعبە)، لە کاتێکدا لە کوڕنوشدابوون لە نوێژی عەسردا.**

---

(١) بڕوانە: ٤٠.

٧٢٥٣- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَسْقِي أَبَا طَلْحَةَ الأَنْصَارِيَّ، وَأَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ، وَأُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ شَرَابًا مِنْ فَضِيخٍ -وَهُوَ تَمْرٌ- فَجَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ: إِنَّ الخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ. فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: يَا أَنَسُ قُمْ إِلَى هَذِهِ الْجِرَارِ فَاكْسِرْهَا، قَالَ أَنَسٌ: فَقُمْتُ إِلَى مِهْرَاسٍ لَنَا فَضَرَبْتُهَا بِأَسْفَلِهِ حَتَّى انْكَسَرَتْ[1].

**٧٢٥٣- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: من ئارەقم دەگێڕا بۆ ئەبو تەڵحەی ئەنصاری و ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەڕاح و ئوبەیی كوڕی كەعب ﷺ عارەقەكە دروست كرابوو لە فەریكە خورما - وە (فَضِيخ): خورمایە- جا كەسێك هات بۆ لایان وتی: بێگومان بەدڵنیاییەوە ئارەق حەرام كرا، ئەبو تەڵحەش وتی: ئەنەس هەستە و بڕۆ ئەو كوپانە بشكێنە، ئەنەس دەڵێ: منیش هەستام بەردە دنگێكمان هەبوو هێنام، كێشام بە خوارووی كوپەكاندا هەتا هەموویان شكان.**

٧٢٥٤- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ صِلَةَ، عَنْ حُذَيْفَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لأَهْلِ نَجْرَانَ: «لأَبْعَثَنَّ إِلَيْكُمْ رَجُلاً أَمِينًا حَقَّ أَمِينٍ». فَاسْتَشْرَفَ لَهَا أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ،فَبَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ[2].

**٧٢٥٤- حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ بەخەڵكی نەجرانی فەرموو: ((بێگومان دڵنیابن پیاوێكی ئەمیندار و بەڕاستی ئەمیندار بێ دەنێرم بۆتان))، بۆیە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خۆیان بۆ قیت كردەوە (تا ئەو گەورەییەیان دەست كەوێ)، ئەنجا ئەبو عوبەیدەی نارد (بۆیان).**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٦٢.

(٢) بڕوانە: ٣٧٤٥.

٧٢٥٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِينٌ، وَأَمِينُ هَذِهِ الأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ»[1].

**٧٢٥٥- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەموو ئوممەتێك ئەمینداریێکی هەیە، وە ئەمینداری ئەم ئوممەتەش ئەبو عوبەیدەیە)).**

٧٢٥٦- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عُمَرَ - ﷺ - قَالَ: وَكَانَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِذَا غَابَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَشَهِدْتُهُ أَتَيْتُهُ بِمَا يَكُونُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَإِذَا غِبْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَشَهِدَ أَتَانِي بِمَا يَكُونُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[2].

**٧٢٥٦-ئیبنو عەبباس لە عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: پیاوێکی ئەنصاری هەبوو کاتێ لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دا ئامادە نەبووایە، من ئامادە بوومایە هەر شتێك لای پێغەمبەری خوا ﷺ ببوایە من بۆم دەبردەوە[3]، وە ئەگەر من ئامادە نەبوومایە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، وە ئەو ئامادە ببوایە، هەرشتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ ببوایە دەیهێنایەوە بۆ من)).**

٧٢٥٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ جَيْشًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلاً، فَأَوْقَدَ نَارًا وَقَالَ: ادْخُلُوهَا. فَأَرَادُوا أَنْ يَدْخُلُوهَا، وَقَالَ آخَرُونَ: إِنَّمَا فَرَرْنَا مِنْهَا، فَذَكَرُوا

---

(١) بڕوانە: ٣٧٤٤.

(٢) بڕوانە: ٨٩.

(٣) واتە: هەر باس و فەرموودە و حوکمێک یا هەر شتێکی تری پێغەمبەر ﷺ ببوایە، من ئێوارە دەگەڕامەوە و دەڕۆشتم بۆم دەگێڕایەوە.

لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ لِلَّذِينَ أَرَادُوا أَنْ يَدْخُلُوهَا: «لَوْ دَخَلُوهَا لَمْ يَزَالُوا فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ». وَقَالَ لِلآخَرِينَ: «لاَ طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةٍ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ»[1].

**٧٢٥٧-ئەبو عەبدوڕەحمان لە عەلییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ لەشكرێكی نارد و پیاوێكی كردە سەركردەیان، ئینجا ئاگرێكی كردەوە و وتی (بەو كەسانەی لەگەڵیدا بوون:) بڕۆنە ناویەوە، هەندێكیان ویستیان بڕۆنە ناویەوە، ئەوانی كەیان وتیان: لە ڕاستیدا ئێمە لەم ئاگرە ڕامان كردوە، (كە گەڕانەوە) باسەكەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی بەو كەسانەی ویستیان بڕۆنە ئاگرەكەوە: ((ئەگەر بڕۆشتنایەتە ناویەوە بەردەوام تیایدا دەبوون تا ڕۆژی قیامەت))، وە بەوانی تری فەرموو: ((لە تاواندا گوێڕایەڵی نییە، بێگومان گوێڕایەڵی لە چاكە دایە)).**

٧٢٥٨- ٧٢٥٩- حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ وَزَيْدَ بْنَ خَالِدٍ أَخْبَرَاهُ أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ[2].

**٧٢٥٨- ٧٢٥٩- عوبەیدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە كە ئەبو هوڕەیرە و زەیدی كوڕی خالیدەوە ﷺ هەردووكیان بۆیان گێڕاوەتەوە كە دوو پیاو كێشە و ناكۆكی نێوانیان بردە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ.**

٧٢٦٠- وَحَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ قَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَعْرَابِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اقْضِ لِي بِكِتَابِ اللَّهِ. فَقَامَ خَصْمُهُ فَقَالَ: صَدَقَ يَا رَسُولَ اللَّهِ،

---

(١) بڕوانە: ٤٣٤٠.

(٢) بڕوانە: ٢٣١٤، ٢٣١٥.

اقْضِ لَهُ بِكِتَابِ اللَّهِ، وَأْذَنْ لِي. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «قُلْ». فَقَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا -وَالْعَسِيفُ الأَجِيرُ- فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، فَأَخْبَرُونِي أَنَّ عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةٍ مِنَ الْغَنَمِ وَوَلِيدَةٍ، ثُمَّ سَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ، فَأَخْبَرُونِي أَنَّ عَلَى امْرَأَتِهِ الرَّجْمَ، وَأَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ. فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ، أَمَّا الوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ فَرُدُّوهَا، وَأَمَّا ابْنُكَ فَعَلَيْهِ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَأَمَّا أَنْتَ يَا أُنَيْسُ -لِرَجُلٍ مِنْ أَسْلَمَ- فَاغْدُ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا». فَغَدَا عَلَيْهَا أُنَيْسٌ، فَاعْتَرَفَتْ فَرَجَمَهَا[١].

**٧٢٦٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، کە پیاوێك لە عەرەبە دەشتەکیەکان هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەکتێبەکەی خوا بڕیارم بۆ بدە، ئینجا ڕکابەرەکەی هەستا و وتی: ڕاست دەکات ئەی پێغەمبەری خوا بەکتێبەکەی خوا بڕیاری بۆ بدە، وە مۆڵەتی من بدە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((قسە بکە))، ئەویش وتی: لە ڕاستیدا کوڕەکەی من کرێکار بووە لای ئەم پیاوە - (الْعَسِيفُ) واتە: کرێکار، ڕەنجبەر- ئینجا زینای کردوە لەگەڵ خێزانەکەیدا، جا بەمنیان وت: کوڕەکەم بەردبارانکردنی لەسەرە، منیش سەد سەر مەڕ و کەنیزەکێك بریتیمدا بەو (پیاوە) تا کوڕەکەم ڕەجم نەکرێ، پاشان پرسیارم لە زانایان کرد و پێیان وتم: بێگومان ژنەکەی ئەو بەردبارانکردنی لەسەرە، وە کوڕەکەی من تەنها سەد شەلاق و یەك ساڵ دوور خستنەوەی لەسەرە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە بەدڵنیاییەوە بەکتێبەکەی خوا بڕیاردەدەم لە نێوانتاندا، جا کەنیزەك و سەد مەڕەکان ئەوە بیگێڕنەوە (بۆ تۆ)، وە کوڕەکەشت سەد شەلاق و یەك ساڵ دوور خستنەوەی لەسەرە، جا تۆش**

(١) بڕوانە: ٢٣١٥.

**ئەنەیس- بەپیاوێکی فەرموو لە هۆزی ئەسلەم بوو- سەر لە بەیانی بڕۆ بۆ لای ژنی ئەم پیاوە، ئەگەر دانی بە زیناکەیدا نا، ئەوە بەردبارانی بکە))، ئونەیسیش بەیانیەکەی ڕۆشت بۆلای ئافرەتەکە و دانی بە زیناکەی دانا و بەردبارانی کرد.**

## ٢- بَابٌ: بَعْثِ الزُّبَيْرَ طَلِيعَةً وَحْدَهُ

٧٢٦١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: نَدَبَ النَّبِيُّ ﷺالنَّاسَ يَوْمَ الخَنْدَقِ، فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ، فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، فَقَالَ: «لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيٌّ، وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ». قَالَ سُفْيَانُ: حَفِظْتُهُ مِنِ ابْنِ الْمُنْكَدِرِ. وَقَالَ لَهُ أَيُّوبُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، حَدِّثْهُمْ عَنْ جَابِرٍ، فَإِنَّ القَوْمَ يُعْجِبُهُمْ أَنْ تُحَدِّثَهُمْ عَنْ جَابِرٍ. فَقَالَ فِي ذَلِكَ المَجْلِسِ: سَمِعْتُ جَابِرًا فَتَابَعَ بَيْنَ أَحَادِيثَ سَمِعْتُ جَابِرًا، قُلْتُ لِسُفْيَانَ: فَإِنَّ الثَّوْرِيَّ يَقُولُ: يَوْمَ قُرَيْظَةَ فَقَالَ: كَذَا حَفِظْتُهُ كَمَا أَنَّكَ جَالِسٌ يَوْمَ الخَنْدَقِ. قَالَ سُفْيَانُ: هُوَ يَوْمٌ وَاحِدٌ. وَتَبَسَّمَ سُفْيَانُ[1].

## ٢- باسێک: پێغەمبەر ﷺ زوبەیری بەتەنها نارد لە دیدەوانی لەشکردا

**٧٢٦١- سوفیان دەڵێ: ئیبنولمونکەدیر بۆی گێڕاینەوە وتی: لە جابیری کوڕی عەبدوڵلام ﷺ بیست وتی: لە ڕۆژی غەزای خەندەقدا پێغەمبەر ﷺ داوای لە خەڵك (هاوەڵان) کرد هەواڵی (دوژمنی) بۆ بێنن، زوبەیر ئامادەیی دەربڕی، پاشان داوای لێ کردن هەواڵی (دوژمنی) بۆ بێنن، جا زوبەیر ئامادەیی دەربڕی، پاشان داوای لێ کردن هەواڵی (دوژمنی) بۆ بێنن، جا زوبەیر ئامادەیی دەربڕی،**

(١) بڕوانە: ٢٨٤٦.

ئینجا فەرمووی: ((هەموو پێغەمبەرێك یاریدەدەر و پشتیوانی تایبەتی هەیە، وە پشتیوان و یاریدەدەری تایبەتی منیش زوبەیرە)).

سوفیان دەڵێ:ئەم فەرموودەیەم (وەرگرتووە و) لەبەرم کردوە لە ئیبنو لمونکەدیرەوە، وە ئەیوب بە ئیبنو لمونکەدیری وت: ئەی ئەبو بەکر[1] لە جابیرەوە ﷺ فەرموودەکەیان بۆ بگێڕەرەوە، چونکە ئەوخەڵکە پێیان خۆشە فەرموودەکەیان لە جابیرەوە بۆ بگێڕێتەوە، جا (ئیبنو لمونکەدیر) لەو کۆڕەدا وتی: لە جابیرم بیست جا بەشوێن یەکدا لە نێوان فەرموودەکان دا دەیوت: لە جابیرم بیستووە.

(عەلی کوڕی مەدینی دەڵێ) وتم: بە سوفیان (ی کوڕی عویەینە) بێگومان سەوری دەڵێ: ڕۆژی غەزای قورەیزە (لە جیاتی غەزای خەندەق)، سوفیان وتی: من ئاوەها بیستوومە ڕۆژی خەندەق- وەك چۆن تۆ ئێستا دانیشتووی- سوفیان وتی: هەر یەك ڕۆژە[2] و سوفیان زەردەخەنەیەکی کرد.

## ٣- بابُ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ ﴿٥٣﴾﴾ الأحزاب

فَإِذَا أَذِنَ لَهُ وَاحِدٌ جَازَ.

٧٢٦٢- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي مُوسَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ حَائِطًا وَأَمَرَنِي بِحِفْظِ البَابِ، فَجَاءَ رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ، فَقَالَ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ». فَإِذَا أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ جَاءَ عُمَرُ فَقَالَ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ». ثُمَّ جَاءَ عُثْمَانُ فَقَالَ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ»[3].

---

(١) نازناوی ئیبنو لمونکەدیرە.

(٢) واتە: خەندەق یان قورەیزە.

(٣) بڕوانە: ٣٦٧٤.

## ٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (مەڕۆنە ژوورەوە بۆ ماڵەكانی پێغەمبەر ﷺ مەگەر ڕێگەتان پێ بدرێ)

**ئینجا ئەگەر یەك كەس مۆڵەتی دا دروستە (بڕواتە ژوورەوە).**

**٧٢٦٢- ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە باخێكەوە و فەرمانی پێكردم كە پارێزگاری لە دەرگای باخەكە بكەم، جا پیاوێك هات داوای مۆڵەتی (چونە ژوورەوەی) كرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((مۆڵەتی بدە و موژدەی بەهەشتی بەرێ))، جا بینیم ئەبو بەكر بوو، پاشان عومەر هات فەرمووی: ((مۆڵەتی بدە و موژدەی بەهەشتی بەرێ))، پاشان عوسمان هات فەرمووی: ((مۆڵەتی بدە و موژدەی بەهەشتی بەرێ)).**

٧٢٦٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلَالٍ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ، عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: جِئْتُ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَشْرُبَةٍ[1] لَهُ، وَغُلَامٌ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَسْوَدُ عَلَى رَأْسِ الدَّرَجَةِ، فَقُلْتُ: قُلْ: هَذَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَأَذِنَ لِي[2].

**٧٢٦٣- عوبەیدی كوڕی حونەین لە ئیبنو عەبباسی بیست ئەویش لە عومەری ﷺ بیست وتی: ڕۆشتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بینیم پێغەمبەر ﷺ ئەوەتا لە ژوورێكی خۆیدا و غوڵامێكی ڕەش پێستی پێغەمبەریش ﷺ لەسەر قادرمەكان دانیشتووە، منیش وتم پێی: بڵێ ئەوە عومەری كوڕی خەتتابە (مۆڵەت ئەخوازێ بێتە ژورەوە)، ئینجا مۆڵەتی دام.**

(١) (مَشْرُبَة) ئیبنو لئەسیر دەڵێ واتە: ژوور یان هۆدە. (النهاية في غريب الحديث والأثر لإبن الأثير:٨٥٢/١).
(٢) بڕوانە: ٨٩.

## ٤- بابُ مَا كَانَ يَبْعَثُ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ الأُمَرَاءِ وَالرُّسُلِ وَاحِدًا بَعْدَ وَاحِدٍ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ دِحْيَةَ الكَلْبِيَّ بِكِتَابِهِ إِلَى عَظِيمِ بُصْرَى، أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى قَيْصَرَ[1].

## ٤- باسی ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ دەینارد لە لێپرسراوان و نێردراوان یەک لە دوای یەک

**-ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دیحیەی كەلبی بەنامەیەكی خۆیدا نارد بۆلای گەورەی بوصرا، كە ئەویش بیدات بە قەیسەر.**

٧٢٦٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ بِكِتَابِهِ إِلَى كِسْرَى، فَأَمَرَهُ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ الْبَحْرَيْنِ، يَدْفَعُهُ عَظِيمُ الْبَحْرَيْنِ إِلَى كِسْرَى، فَلَمَّا قَرَأَهُ كِسْرَى مَزَّقَهُ، فَحَسِبْتُ أَنَّ ابْنَ الْمُسَيَّبِ قَالَ: فَدَعَا عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُمَزَّقُوا كُلَّ مُمَزَّقٍ[2].

**٧٢٦٤-عوبەیدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عوتبە دەگێڕێتەوە كە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس رضي الله عنهما بۆی گێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەكی خۆی نارد بۆكیسرا (بە عەبدوڵڵای كوڕی حوزافەدا)، وە فەرمانی پێكرد كە بیدات بە سەرۆكی وڵاتی بەحرەین[3]، سەرۆكی بەحرەینیش بیدات بە كیسرا، ئینجا كاتێ كیسرا نامەكەی خوێندەوە دڕاندی، جا وابزانم كە ئیبنو لموسەییەب وتی: پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای لێ كردن كە تەفر و تونا بكرێن بەخراپترین شێوە.**

---

(١) بڕوانە: ٧.

(٢) بڕوانە: ٦٤.

(٣) كە ناوی مونزیری كوڕی ساوا بوو.

٧٢٦٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ، حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ الأَكْوَعِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ مِنْ أَسْلَمَ: «أَذِّنْ فِي قَوْمِكَ -أَوْ فِي النَّاسِ- يَوْمَ عَاشُورَاءَ أَنَّ مَنْ أَكَلَ فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ أَكَلَ فَلْيَصُمْ»[١].

**٧٢٦٥-سەلەمی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بەپیاوێك لە هۆزی ئەسلەم: ((کە جاڕ بدە بە ناو هۆزەکەتدا- یان بە ناو خەڵکیدا- لە ڕۆژی عاشورادا، کە هەر کەسێك خواردنی خواردووە با ئەو بەشەی لە ڕۆژەکەی ماوە بەڕۆژوو بێت، هەر کەسیش هیچی نەخواردووە با بەڕۆژوو بێت)).**

## ٥- بابُ وَصَاةِ النَّبِيِّ ﷺ وُفُودَ الْعَرَبِ أَنْ يُبَلِّغُوا مَنْ وَرَاءَهُمْ

قَالَهُ مَالِكُ بْنُ الحُوَيْرِثِ ﷺ.

٧٢٦٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الجَعْدِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ. وَحَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا النَّضْرُ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يُقْعِدُنِي عَلَى سَرِيرِهِ فَقَالَ: إِنَّ وَفْدَ عَبْدِ الْقَيْسِ لَمَّا أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنِ الْوَفْدُ؟». قَالُوا: رَبِيعَةُ. قَالَ: «مَرْحَبًا بِالْوَفْدِ وَالْقَوْمِ، غَيْرَ خَزَايَا وَلاَ نَدَامَى». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ كُفَّارَ مُضَرَ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ نَدْخُلُ بِهِ الجَنَّةَ، وَنُخْبِرُ بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا. فَسَأَلُوا عَنِ الأَشْرِبَةِ، فَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، وَأَمَرَهُمْ بِأَرْبَعٍ: أَمَرَهُمْ بِالإِيمَانِ بِاللَّهِ، قَالَ: «هَلْ تَدْرُونَ مَا الإِيمَانُ بِاللَّهِ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامُ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ - وَأَظُنُّ فِيهِ - صِيَامُ رَمَضَانَ، وَتُؤْتُوا مِنَ الْمَغَانِمِ الْخُمُسَ». وَنَهَاهُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ، وَالنَّقِيرِ، وَرُبَّمَا قَالَ: الْمُقَيَّرِ. قَالَ: «احْفَظُوهُنَّ، وَأَبْلِغُوهُنَّ مَنْ وَرَاءَكُمْ»[٢].

---

(١) بڕوانە: ١٩٢٤.
(٢) بڕوانە: ٥٣.

## ٥- باسی ئامۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێنەرانی عەرەب (ئەوە بیستویانە) بیگەینن بەوانەی دەرۆنەوە بۆ لایان

مالیکی کوڕی حووەیریس ﷺ ئەمەی وتووە[1].

٧٢٦٦- ئەبو جەمرە دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ لەسەر تەختی شوێن نووستنەکەی خۆی داینیشاندم و وتی: بەڕاستی کاتێك نوێنەری خێڵی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەم نوێنەرانە کێن؟)) وتیان: ڕەبیعەین[2]، فەرمووی: ((بەخێربێن نوێنەران و خێڵەکە (بەهاتنتان) ڕوو زەرد و ڕیسوا و پەشیمان نابن))، عەرزیان کرد: پێغەمبەری خوا بێگومان لە نێوان ئێمە و جەنابتدا کافرانی هۆزی موزەڕ هەیە، بۆیە فەرمانمان پێ بکە بە کارێك بەهۆیەوە بچینە بەهەشتەوە، تا بیگەیەنین بە هۆزەکەمان، ئینجا دەربارەی خواردنەوەکان پرسیاریان لێ کرد، جا چوار شتی لێ قەدەغەکردن و فەرمانی پێ کردن بەچوار شت، فەرمانی پێ کردن بەباوەڕهێنان بەخوا، فەرمووی: ((دەزانن باوەڕ بوون بەخوا چییە؟)) وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ((شایەتی دانە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوای تاك و تەنها، کە هیچ هاوبەشێکی نییە، وە شایەتی دانە کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، نوێژ کردن و زەکات دان - وابزانم ئەمەشی تێدابوو- ڕۆژوو گرتنی ڕەمەزان و لە دەستکەوتی جەنگیش پێنج یەکی بدەن (بەدەوڵەتی ئیسلامیی)) )، وە قەدەغەی (ئەم شتانەی) لێ کردن[3]: کولەکەی هەڵکۆڵراو، کوپە (کە لە قوڕ و موو دروست دەکرا)، کوپەی قیر

---

(١) مەبەست ئەوەیە لەسەر باسەکەدا وتراوە: ئامۆژگاری....هتد.

(٢) چونکە خێڵی عەبدولقەیس بەشێکن لە هۆزی ڕەبیعە.

(٣) کە خواردنەوەیان تێ دەکردن چ ئاو بێت یان سرکە یان دۆشاو. وە هۆی قەدەغە کردنی ئەو چوارە شتە کە شلەمەنییان تێ دەکرێ، لەبەر ئەوەیە سرکە و دۆشاو تێیاندا زوو دەبێتە عارەق.

و زەفت تێهەڵسواو، دەفری هەڵکوڵراو لە بنکی دار خورما و هەندێ جار دەڵێ: کوپەی قار[1] تێهەڵسواو. وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمانەی وتم لە بەری بکەن و (کە گەڕانەوە) بیگەیەنن بەهۆزەکەتان)).

## ٦- بابُ خَبَرِ المَرْأَةِ الوَاحِدَةِ

٧٢٦٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ تَوْبَةَ العَنْبَرِيِّ قَالَ: قَالَ لِي الشَّعْبِيُّ، أَرَأَيْتَ حَدِيثَ الحَسَنِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ؟ وَقَاعَدْتُ ابْنَ عُمَرَ قَرِيبًا مِنْ سَنَتَيْنِ أَوْ سَنَةٍ وَنِصْفٍ فَلَمْ أَسْمَعْهُ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ غَيْرَ هَذَا قَالَ: كَانَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فِيهِمْ سَعْدٌ فَذَهَبُوا يَأْكُلُونَ مِنْ لَحْمٍ، فَنَادَتْهُمُ امْرَأَةٌ مِنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ: إِنَّهُ لَحْمُ ضَبٍّ فَأَمْسَكُوا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوا -أَوِ اطْعَمُوا- فَإِنَّهُ حَلاَلٌ -أَوْ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ. شَكَّ فِيهِ- وَلَكِنَّهُ لَيْسَ مِنْ طَعَامِي»[2].

## ٦- باسی وتەی ئافرەتێک بەتەنها [3]

٧٢٦٧-تەوبەی عەنبەریی دەڵێ: شەعبی پێی وتم: هەواڵم پێ بدە دەربارەی فەرموودەی حەسەن[4].

لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە؟ (دەڵێ:) دوو ساڵ یا ساڵ و نیوێك لەگەڵ ئیبنو عومەردا دانیشتووم، لێم نەبیستووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودە بگێڕێتەوە جگە لەم فەرموودەیە: وتی: خەڵکانێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەبوون سەعدیان تیا بوو ڕۆشتن لە گۆشتێك بخۆن (لەماڵێکی پێغەمبەر ﷺ)،

(١) قار ڕووەکێکە کە وشک بوو دەسوتێنرێ و کەشتی پێ چەور دەکەن و تێهەڵئەسون. .
(٢) بڕوانە: ١٩٤٤.
(٣) ئایا کاری پێ دەکرێت یان نا؟.
(٤) مەبەستی حەسەنی بەصرییە.

ئینجا ژنێك كه یەكێك بوو له هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ بانگی كردن: ئەوە گۆشتی بزنه مژەیه، ئیتر هەموویان دەستیان گرتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بخۆن-یان بیخۆن-چونكه دڵنیابن حەڵاڵه- یان فەرمووی:هیچ زیانی نییه و قەیناكا- (تەوبەی عەنبەری) تیایدا گومانی هەبوو- بەڵام لەمەم نەخواردووە له خۆراكی من نەبووە)).



# ٩٦- كِتَابُ الاعْتِصَامِ بِالكِتَابِ وَالسُّنَّةِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩٦- پەڕاوی پابەندی بە قورئان و سوننەتەوە(١)

٧٢٦٨- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مِسْعَرٍ وَغَيْرِهِ، عَنْ قَيْسِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ اليَهُودِ لِعُمَرَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، لَوْ أَنَّ عَلَيْنَا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة، لاَتَّخَذْنَا ذَلِكَ اليَوْمَ عِيدًا. فَقَالَ عُمَرُ: إِنِّي لأَعْلَمُ أَيَّ يَوْمٍ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ، نَزَلَتْ يَوْمَ عَرَفَةَ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ. سَمِعَ سُفْيَانُ مِنْ مِسْعَرٍ، وَمِسْعَرٌ قَيْسًا، وَقَيْسٌ طَارِقًا(٢).

**٧٢٦٨- تاریقی کوڕی شیهاب دەڵێ: پیاوێکی جوولەکە بە عومەری کوڕی خەتتابی ﷺ وت: ئەی گەورەی باوەڕداران، بێگومان ئەگەر ئەم ئایەتە:** ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة(٣)، **بۆ ئێمە دابەزیایە بەدڵنیاییەوە ئەو ڕۆژەمان دەکرد بە جەژن، عومەریش ﷺ وتی: بێگومان دەزانم چ ڕۆژێك ئەو ئایەتە دابەزیوە، ڕۆژی عەرەفە لە ڕۆژی هەینیدا دابەزی.**

---

(١) یان دەست گرتن بە قورئان و سوننەتەوە.

(٢) بڕوانە: ٤٥.

(٣) واتە: ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو و کامڵ کردوە بۆتان، وە چاکە و بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەتاندا و ڕازی بووم کە ئیسلام ئایینتان بێت.

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) سوفیان ئەم فەرموودەی لە میسعەرەوە بیستووە، میسعەریش لە قەیسی بیستووە، قەیسیش لە تاریقی بیستووە.**

**٧٢٦٩-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ الْغَدَ حِينَ بَايَعَ الْمُسْلِمُونَ أَبَا بَكْرٍ، وَاسْتَوَى عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَشَهَّدَ قَبْلَ أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَاخْتَارَ اللَّهُ لِرَسُولِهِ ﷺ الذي عِنْدَهُ عَلَى الذي عِنْدَكُمْ، وَهَذَا الكِتَابُ الذِي هَدَى اللَّهُ بِهِ رَسُولَكُمْ فَخُذُوا بِهِ تَهْتَدُوا، وَإِنَّمَا هَدَى اللَّهُ بِهِ رَسُولَهُ[1].

**٧٢٦٩- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە كە گوێی لە عومەر ﷺ بوو ڕۆژی پاش ئەو ڕۆژەی مسوڵمانان بەیعەتیاندا بە ئەبو بەكر ﷺ، وە ڕۆشتە سەر دوانگەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتومانی هێنا پێش ئەبو بەكر وتی: ئەمە و پاشان، ئینجا خوا ئەوەی لای خۆیەتی هەڵیبژارد بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ بەسەر ئەوەدا لای ئێوەیە، وە ئەوە قورئانە كە خوا پێغەمبەرەكەتانی ﷺ پێ ڕێنموونی كرد، كەواتە دەستی پێوە بگرن، ڕێنموون دەبن، بێگومان خوا بەو قورئانە پێغەمبەرەكەی ﷺ ڕێنموونی كرد.**

**٧٢٧٠-** حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ضَمَّنِي إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ وَقَالَ: «اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الكِتَابَ»[2].

**٧٢٧٠- عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باوەشی پیا كردم (گوشیمی بە سینگیەوە) فەرمووی: ((خوایە! شارەزا و تێگەشتووی بكە لە قورئان)).**

(١) بڕوانە: ٧٢١٩.
(٢) بڕوانە: ٧٥.

**٧٢٧١-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ: سَمِعْتُ عَوْفًا، أَنَّ أَبَا الْمِنْهَالِ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا بَرْزَةَ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يُغْنِيكُمْ -أَوْ نَعَشَكُمْ[1]- بِالإِسْلاَمِ وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ[2].

**٧٢٧١- ئەبولمینهال دەڵێ: لە ئەبو بەرزەی بیست وتی: بێگومان خوا بە ئیسلام و بە موحەممەد ﷺ دەوڵەمەند و بێ نیازی کردن -یان بەرزی کردنەوە و هەڵیساندنەوە-.**

**٧٢٧٢-** حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ كَتَبَ إِلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ يُبَايِعُهُ: وَأُقِرُّ بذلَكَ بِالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ عَلَى سُنَّةِ اللهِ وَسُنَّةِ رَسُولِهِ فِيمَا اسْتَطَعْتُ[3].

**٧٢٧٢- عەبدوڵڵای کوڕی دینار دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما نووسی بۆ عەبدولەلیکی کوڕی مەروان پەیمانی پێیدا[4]: وە من دان دەنێم بەوەدا (پێشەوای باوەڕدارانی) بە بیستن و گوێڕایەڵی لەسەر سوننەتی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوەندەی لە تواناماندا بێت.**

## ١- بابُ قَوْلِه ﷺ:- «بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ»

**٧٢٧٣-** حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَبَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الأَرْضِ، فَوُضِعَتْ فِي يَدِي». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقَدْ ذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنْتُمْ تَلْغَثُونَهَا أَوْ تَرْغَثُونَهَا، أَوْ كَلِمَةً تُشْبِهُهَا[5].

---

(١) (نَعَشَكُمْ) واتە: بەرزی کردنەوە و باڵا دەستی کردن، یان هەڵیساندنەوە لە دوای تێشکان، یان دامەزراو ڕاوەستاوی کردن کاتێ جێگیر نەبوون.

(٢) بڕوانە: ٧١١٢.

(٣) بڕوانە: ٧٢٠٣.

(٤) بەنامە پەیماندانی خۆیی و کوڕەکانی نووسی بۆ عەبدولمەلیک.

(٥) بڕوانە: ٢٩٧٧.

## ١- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((من بە وتە کورتە پڕ ماناکانەوە نێردراوم))

**٧٢٧٣- سەعیدی کوڕی موسەییەب لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بە پێغەمبەرێتی نێردراوم بە وتەی کورتی پڕ ماناوە[1]، وە بەترس و بیمی بەتین سەرخراوم، جا لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەودا خۆم بینی کلیلی گەنجینەکانی زەویم پێدرا و خرایە ناو دەستم))، ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: جا بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و ڕۆشت، ئێوەش هەر چۆن بۆتان ڕێك کەوێت دەیخۆن یان دەوڵەمەند و ژیان خۆش بوون پێی[2]، یان وشەیەکی لەو جۆرە.**

**٧٢٧٤-** حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ أُومِنَ -أَوْ آمَنَ- عَلَيْهِ البَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الذِي أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنِّي أَكْثَرُهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[3].

**٧٢٧٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هیچ پێغەمبەرێك نەبووە لە پێغەمبەران ﷺ مەگەر وێنەی ئەو (موعجیزانەی) پێدراوە کە خەڵك بەهۆیەوە متمانەیان کرد -یان باوەڕیان هێنا- بەڵام بێگومان ئەو (موعجیزەی) بەمن دراوە نیگایەکە خوا سروشی کردوە بۆم (کە قورئانە)، بۆیە ئومێد دەکەم لە ڕۆژی دواییدا لە هەموویان شوێنکەوتووم زیاتر بێت)).**

---

(١) بریتی لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ.

(٢) (تَلْغَثُونَهَا) و ( تَرْغَثُونَهَا) ئەم دوو وشە: (تَلْغَثُونَهَا) بریتی لەگەمی تێکەڵاو لەگەڵ جۆ مەبەست لێی لە فەرموودەکەدا: ئێوە ئەو گەنجینانە دەخۆن هەرچۆنێک بۆتان ڕێکەوێ. ( تَرْغَثُونَهَا) ماناکەی ئەوەیە بەچکەی گیاندارێک شیری دایکی بخوات، وە لە فەرموودەکەدا مبەست پێی خۆشگوزەرانی و ژیان خۆشیە.

(٣) بڕوانە: ١٥٢.

## ٢- بابُ الاقْتِدَاءِ بِسُنَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الفرقان

قَالَ: أَئِمَّةً نَقْتَدِى بِمَنْ قَبْلَنَا، وَيَقْتَدِي بِنَا مَنْ بَعْدَنَا. وَقَالَ ابْنُ عَوْنٍ: ثَلاَثٌ أُحِبُّهُنَّ لِنَفْسِي وَلإِخْوَانِي: هَذِهِ السُّنَّةُ أَنْ يَتَعَلَّمُوهَا وَيَسْأَلُوا عَنْهَا، وَالْقُرْآنُ أَنْ يَتَفَهَّمُوهُ وَيَسْأَلُوا عَنْهُ، وَيَدَعُوا النَّاسَ إِلاَّ مِنْ خَيْرٍ.

## ٢- باسی پەیڕەوی کردن و شوێن کەوتنی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند (وە بمانکە بە پێشەوای پارێزکاران و لەخوا ترسان).**

**(موجاهید) وتی: بمانکە بەپێشەوایانێك پەیڕەوی بکەین بەوانەی لە پێشمانەوە بوون، ئەوانەش لە دوا ئێمەوەن پەیڕەوی لە ئێمە بکەن.**

**ئیبنو عەون دەڵێ: سێ شتم بۆ خۆم و بۆ برایانم پێ خۆشە: ئەم سوننەتەی پێغەمبەرە ﷺ کە فێری ببن و پرسیار بکەن لە بارەیەوە، وە قورئان کە لێی تێبگەن و پرسیار بکەن لە بارەیەوە، وە واز لە خەڵکی بێنن مەگەر لە چاکەدا.**

٧٢٧٥- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَبَّاسٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ وَاصِلٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: جَلَسْتُ إِلَى شَيْبَةَ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ، قَالَ: جَلَسَ إِلَيَّ عُمَرُ فِي مَجْلِسِكَ هَذَا فَقَالَ: هَمَمْتُ أَنْ لاَ أَدَعَ فِيهَا صَفْرَاءَ وَلاَ بَيْضَاءَ إِلاَّ قَسَمْتُهَا بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ. قُلْتُ: مَا أَنْتَ بِفَاعِلٍ. قَالَ: لِمَ؟ قُلْتُ: لَمْ يَفْعَلْهُ صَاحِبَاكَ قَالَ هُمَا الْمَرْآنِ يُقْتَدَى بِهِمَا[1].

---

(١) بڕوانە: ١٥٩٤.

**٧٢٧٥- ئەبو وائیل وتی: لە ئەم مزگەوتە (کەعبە)دا لەگەڵ شەیبە دانیشتبووم وتی: لەم شوێنەدا تۆ دانیشتوی عومەر ﷺ دانیشتبوو وتی: بیرمکردەوە و هات بەخەیاڵمدا هەرچی زەرد و سپی هەیە (واتە: ئاڵتوون و زیوو) لە کەعبەدا لێی نەگەڕێم هەموو دابەش بکەم بەسەر مسوڵماناندا، منیش وتم: تۆ ئەوە ناکەیت. وتی: لەبەر چی؟ وتم: هەردوو هاوڕێکەت (پێغەمبەر و ئەبو بەکر) نەیانکردوە، وتی: هەردووکیان ئەو دوو پیاوەن پەیڕەویان لێوە دەکرێت.**

**٧٢٧٦-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَأَلْتُ الأَعْمَشَ، فَقَالَ عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ: سَمِعْتُ حُذَيْفَةَ يَقُولُ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَّ الأَمَانَةَ نَزَلَتْ مِنَ السَّمَاءِ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ، وَنَزَلَ الْقُرْآنُ فَقَرَءُوا الْقُرْآنَ وَعَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ»[1].

**٧٢٧٦- سوفیان دەڵێ: پرسیارم لە ئەعمەش کرد، ئەویش وتی لە زەیدی کوڕی وەهبەوە گێڕایەوە وتی: لە حوزەیفەم بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتی فەرموو بۆمان: ((بێگومان سپاردە لە ئاسمانەوە دابەزییە ناخی دڵی پیاوان (ی باوەڕ دار)ەوە، قورئانیش دابەزی و قورئانیان خوێندەوە، وە لە سوننەتیش شارەزا بوون)).**

**٧٢٧٧-** حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، سَمِعْتُ مُرَّةَ الْهَمْدَانِيَّ يَقُولُ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: إِنَّ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَإِنَّ مَا تُوعَدُونَ لآتٍ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ[2].

---

(١) بڕوانە: ٦٤٩٧.

(٢) بڕوانە: ٦٠٩٨.

**٧٢٧٧- مورەی هەمەدانیی دەڵێ: عەبدوڵلا ﷺ وتی: بێگومان چاكترین وتە قورئانەكەی خوایە، وە چاكترین ڕێباز و ڕێنوێن، ڕێباز و ڕێنوێنی موحەمەدە ﷺ. وە خراپترینی كاروبارەكان داهێنراوەكانن، وە بێگومان هەر بەڵێنێكتان پێ دەدرێ هەر دێت و ئێوە هەرگیز لە دەست خوا دەرناچن و قوتار نابن).**

٧٢٧٨- ٧٢٧٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ»[1].

**٧٢٧٨- ٧٢٧٩- ئەبو هوڕەیرە و زەیدی كوڕی خالید وتیان: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین فەرمووی: ((سوێند بەخوا لە نێوانتاندا بەقورئانی خوا دادوەری دەكەم)).**

٧٢٨٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، حَدَّثَنَا هِلاَلُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنْ عَطَاءِ ابْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ إِلاَّ مَنْ أَبَى». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَنْ يَأْبَى؟ قَالَ: «مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبَى».

**٧٢٨٠- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەموو ئوممەتم دەچنە بەهەشتەوە مەگەر كەسێك خۆی نەیەوێ))، عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خوا كێ نایەوێ؟ فەرمووی: ((هەر كەس گوێرایەڵیم بكات دەچێتە بەهەشتەوە، هەر كەسیش سەرپێچیم بكات ئەوە بێگومان نایەوێ (بچێتە بەهەشتەوە)) ).**

٧٢٨١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبَادَةَ، أَخْبَرَنَا يَزِيدُ، حَدَّثَنَا سَلِيمُ بْنُ حَيَّانَ -وَأَثْنَى عَلَيْهِ- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مِينَاءَ، حَدَّثَنَا -أَوْ سَمِعْتُ- جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: جَاءَتْ مَلاَئِكَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ

---

(١) بروانە: ٢٣١٤، ٢٣١٥.

وَهْوَ نَائِمٌ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّهُ نَائِمٌ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّ العَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ. فَقَالُوا: إِنَّ لِصَاحِبِكُمْ هَذَا مَثَلاً، فَاضْرِبُوا لَهُ مَثَلاً. فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّهُ نَائِمٌ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّ الْعَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ. فَقَالُوا: مَثَلُهُ كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى دَارًا، وَجَعَلَ فِيهَا مَأْدُبَةً وَبَعَثَ دَاعِيًا، فَمَنْ أَجَابَ الدَّاعِيَ دَخَلَ الدَّارَ وَأَكَلَ مِنَ الْمَأْدُبَةِ، وَمَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّاعِيَ لَمْ يَدْخُلِ الدَّارَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنَ الْمَأْدُبَةِ. فَقَالُوا: أَوِّلُوهَا لَهُ يَفْقَهْهَا فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّهُ نَائِمٌ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّ الْعَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ. فَقَالُوا: فَالدَّارُ الجَنَّةُ، وَالدَّاعِي مُحَمَّدٌ ﷺ، فَمَنْ أَطَاعَ مُحَمَّدًا ﷺ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَى مُحَمَّدًا ﷺ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمُحَمَّدٌ ﷺ فَرْقٌ بَيْنَ النَّاسِ.

تَابَعَهُ قُتَيْبَةُ عَنْ لَيْثٍ عَنْ خَالِدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلَالٍ، عَنْ جَابِرٍ خَرَجَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ.

**٧٢٨١- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: چەند فریشتەیەك هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە خەوتبوو، جا هەندێکیان وتیان: بێگومان ئەو خەوتووە، هەندێگیشیان وتیان: بەڕاستی چاوی دەخەوێ و دڵی بێدارە، ئینجا وتیان: ئەو هاوڕێیەتان نموونەیەکی هەیە، دەی ئێوەش وێنەی بۆ بێننەوە. فریشتەیەکیان وتی: بە دڵنیاییەوە خەوتووە، یەکێکی تریان وتی: بەڕاستی چاوی دەخەوێ و دڵی بێدارە، ئەوسا وتیان: نموونەی وەك کەسێك وایە خانوویەکی دروست کردبێت، سفرە و خوانێکی تیا دانابێت و کەسێکی ناردبێ بۆ داوەتکردن، جا هەر کەس بەدەم بانگ کەرەکەوە هاتبێت ڕۆشتۆتە ناو خانووەکە و لە سفرە و خوانەکەی خواردووە، هەر کەسێکیش بەدەم بانگ کەرەکەوە نەهاتبێت نەڕۆشتووەتە ناو خانووەکە و لە سفرە و خوانەکەی نەخواردووە، ئینجا وتیان: ئەمەی بۆ لێك بدەنەوە خۆی لێی تێدەگات، فریشتەیەکیان وتی: بێگومان خەوتووە، فریشتەیەکیشیان وتی: بەڕاستی چاوی دەخەوێ و دڵی بێدارە، جا وتیان: خانووەکە بەهەشتە، بانگکەرەکەش**

**موحەممەدە ﷺ، ئینجا هەر کەس گوێڕایەڵی موحەممەد ﷺ بکات، ئەوە بەڕاستی فەرمانبەرداری خوای کردوە، هەر کەسیش نا فەرمانی موحەممەد ﷺ بکات، ئەوە بەڕاستی نا فەرمانی خوای کردوە، موحوممەدیش ﷺ خەڵکی لە یەکتری جیا کردۆتەوە.**

**قوتەیبە لە لەیسەوە گێڕاویەتیەوە لە خالیدەوە لە سەعیدی کوڕی هیلالەوە ئەویش لە جابیرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە بۆ ناومان. بەم گێڕانەوەیە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی موحوممەد کوڕی عوبباد دەکات.**

**٧٢٨٢-** حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: يَا مَعْشَرَ الْقُرَّاءِ، اسْتَقِيمُوا، فَقَدْ سُبِقْتُمْ [١] سَبْقًا بَعِيدًا، فَإِنْ أَخَذْتُمْ يَمِينًا وَشِمَالاً، لَقَدْ ضَلَلْتُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا.

**٧٢٨٢- هەممام لە حوزەیفەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: ئەی کۆمەڵی شارەزایانی قورئان (و سوننەت) ڕێگەی ڕاست بگرن، چونکە بەڕاستی ئێوە پێشکەوتوون[٢] بەپێشکەوتنێکی ئاشکرا، جا ئەگەر لای ڕاست و چەپی (ڕێگەی ڕاست بگرن) بێگومان گومڕا دەبن، بە گومڕابوونێکی دوور لە ڕاستی.**

**٧٢٨٣-** حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى قَوْمًا فَقَالَ: يَا قَوْمِ، إِنِّي رَأَيْتُ الْجَيْشَ بِعَيْنَيَّ، وَإِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ، فَالنَّجَاءَ. فَأَطَاعَهُ طَائِفَةٌ مِنْ قَوْمِهِ فَأَدْلَجُوا،

---

(١) ئەم وشەیە (سُبِقْتُمْ) لە ڕیوایەتی ئەبی زەڕدا بە (سَبَقْتُمْ) گێڕاویەتیەوە، ئیبنو حەجەر لە فتح الباریدا دەڵێ: (وهو المعتمد) واتە: ئەوەیان ڕاسترە و پشتی پێدەبەسترێ، بۆیە ئێمەش بە (سَبَقْتُمْ) مانامان کردوە. فتح الباری:١٣/٣٢٠.

(٢) بە جۆرێکی کەش مانا دەکرێت ئەگەر (سُبِقتُم) بێت واتە: ئێوە دواکەوتوون کەسانی تر لێتان پێشکەوتوون، ئەگەر شوێن ڕاستە ڕێ نەکەون.

فَانْطَلَقُوا عَلَى مَهَلِهِمْ فَنَجَوْا، وَكَذَّبَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ فَأَصْبَحُوا مَكَانَهُمْ، فَصَبَّحَهُمُ الْجَيْشُ، فَأَهْلَكَهُمْ وَاجْتَاحَهُمْ، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ أَطَاعَنِي، فَاتَّبَعَ مَا جِئْتُ بِهِ، وَمَثَلُ مَنْ عَصَانِي وَكَذَّبَ بِمَا جِئْتُ بِهِ مِنَ الحَقِّ»[1].

**٧٢٨٣- ئەبو موسا ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((بێگومان نموونەی من و ئەو پەیامە خودای منی پێ ناردووە، وەك پیاوێك وایە چووەتە لای گەلێك و پێی وتوون: من بەهەردوو چاوی خۆم لەشکرەکەم بینی و بەڕاستی من هاوار بەدەمی ڕووت و قوتم[2]، کەواتە فریای خۆتان کەون، ئینجا کۆمەڵێك لە گەلەکەی گوێڕایەڵی بکەن و لە سەرەتای شەوە و بکەونە ڕێ و بەلەسەرخۆیی و هێواش و ڕزگاریان ببێ، کۆمەڵێکی تریان باوەڕی پێ نەکەن و تا بەیانی لە جێگای خۆیان بمێننەوە، لەگەڵ بەیانیدا لەشەکرەکە بدات بەسەریاندا لە ناویان ببات و لە بنیان بێنێت، کەواتە ئەوە نموونەی ئەو کەسەیە گوێڕایەڵی من دەکات، ئینجا شوێن ئەو ئاینە دەکەوێ کە من هێناومە، وە نموومەی ئەو کەسەیە کە سەرپێچی من دەکات و باوەڕی نەهێناوە بەو هەقەی من هێناومە)).**

٧٢٨٤- ٧٢٨٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ العَرَبِ، قَالَ عُمَرُ لأَبِي بَكْرٍ: كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَمَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلاَّ بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ»؟!. فَقَالَ: وَاللَّهِ لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عِقَالاً كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

(١) بڕوانە: ٦٤٨٢.
(٢) مانای (النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ) وتەیەکی عەرەبی لە کاتی ترسی کوت و پڕدا بەکاری دێنن.

لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ. فَقَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ رَأَيْتُ اللَّهَ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الحَقُّ. قَالَ ابْنُ بُكَيْرٍ وَعَبْدُ اللَّهِ، عَنِ اللَّيْثِ: عَنَاقًا. وَهْوَ أَصَحُّ[1].

**٧٢٨٤- ٧٢٨٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، لە دوای ئەو ئەبو بەکر ﷺ کرایە جێنشین، ئەوەی پاشگەزبوویەوە لە عەرەبەکان پاشگەز بوویەوە، عومەر ﷺ وتی بە ئەبو بەکر: چۆن لەگەڵ خەڵکدا دەجەنگی، کە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فەرمانم پێ کراوە لە دژی خەڵك بجەنگم هەتا دەڵێن:** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، **جا هەرکەس بڵێ:** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) **بەهەق و مافی خۆی نەبێت ماڵ و خوێنیان لە لایەن منەوە پارێزراوە، لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە))، ئەبو بەکریش وتی: سوێند بەخوا دەجەنگم لە دژی ئەو کەسەی جیاوازی بکات لە نێوان نوێژ و زەکاتدا، چونکە بەڕاستی زەکات مافی ماڵ و سامانە، وە سوێند بە خوا ئەگەر گیسکێکم نەدەنێ کە کاتی خۆی دەیاندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر نەدانی لە دژیان دەجەنگم، عومەر ﷺ وتی: سا سوێند بەخوا ئەم کارە تەنها ئەوە بوو بینیم خوا دڵی ئەبو بەکری گوشاد کردوە بۆی، ئیتر منیش زانیم کە ئەو بڕیارە هەق و ڕاستە.**

**-ئیبنو بوکەیر و عەبدوڵلا لە لەیسەوە گێڕاویانەتەوە بە** (عَنَاقًا)[2] **گێڕاویەتیەوە ئەوەش ڕاسترە.**

٧٢٨٦- حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ عُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنِ بْنِ حُذَيْفَةَ بْنِ بَدْرٍ فَنَزَلَ عَلَى ابْنِ أَخِيهِ الْحُرِّ بْنِ قَيْسِ بْنِ حِصْنٍ، وَكَانَ مِنَ النَّفَرِ الَّذِينَ يُدْنِيهِمْ عُمَرُ، -وَكَانَ الْقُرَّاءُ أَصْحَابَ مَجْلِسِ عُمَرَ وَمُشَاوَرَتِهِ كُهُولاً كَانُوا أَوْ شُبَّانًا -فَقَالَ

---

(١) بڕوانە: ١٣٩٩، ١٤٠٠.

(٢) عناقاً: واتە: گیسکێک بێت ساڵێکی تەواو نەکردبێت، بەڵام (عقالاً): واتە: یان ئەو پەتەی وشتری پێ دەبەستیەوە.

عُيَيْنَةُ لِابْنِ أَخِيهِ: يَا ابْنَ أَخِي، هَلْ لَكَ وَجْهٌ عِنْدَ هَذَا الأَمِيرِ فَتَسْتَأْذِنَ لِي عَلَيْهِ؟ قَالَ: سَأَسْتَأْذِنُ لَكَ عَلَيْهِ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَاسْتَأْذَنَ لِعُيَيْنَةَ، فَلَمَّا دَخَلَ قَالَ: يَا ابْنَ الخَطَّابِ، وَاللَّهِ مَا تُعْطِينَا الجَزْلَ، وَمَا تَحْكُمُ بَيْنَنَا بِالْعَدْلِ. فَغَضِبَ عُمَرُ حَتَّى هَمَّ بِأَنْ يَقَعَ بِهِ، فَقَالَ الحُرُّ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ لِنَبِيِّهِ ﷺ: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾ الأعراف، وَإِنَّ هَذَا مِنَ الجَاهِلِينَ. فَوَاللَّهِ مَا جَاوَزَهَا عُمَرُ حِينَ تَلَاهَا عَلَيْهِ، وَكَانَ وَقَّافًا عِنْدَ كِتَابِ اللَّهِ[1].

**٧٢٨٦- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: عویەینەی کوڕی حیصنی کوڕی حوزەیفەی کوڕی بەدر هات (بۆ مەدینە) و لە ماڵی حوڕی کوڕی کوڕی قەیسی کوڕی حیصنی برازای دابەزی و لایدا، ئەو (حوڕ)یش لەو کەسانە بوو عومەر ﷺ نزیکی دەکردەوە لە خۆی- وە قورئان خوێنەکان هاوڕێی کۆڕ و دانیشتنەکانی عومەر و ڕاوێژکاری بوون، بەتەمەن بوونایە یان گەنج و لاو بوونایە- جا عویەینە بە برازاکەی وت: ئەی برازای خۆم تۆ لای ئەم پێشەوایە کەسایەتیەکت هەیە بۆیە مۆڵەتێکم بۆ وەردەگری بڕۆمە لای؟ حوڕیش وتی: دڵنیابە مۆڵەتێکت بۆ وەردەگرم بڕۆیتە لای، ئیبنو عەبباس دەڵێ: حوڕ مۆڵەتی بۆ عویەینە وەرگرت، جا کاتێ ڕۆیشتە ژوورەوە وتی: ئەی کوڕی خەتتاب، سوێند بەخوا ماڵ و سامانی زۆرمان پێ نادەیت و بەدادگەری لە نێوانماندا بڕیار نادەیت، عومەریش توڕە بوو هەتا ویستی لێی بدات، جا حوڕیش وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران بێگومان خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمووە: (دەست بگرە بە لێبوردەییەوە، فەرمانیش بدە بە چاکە و چاکەکردن ڕوو وەرگێڕە لە نەزانان و نەفامان)، وە بەڕاستی ئەم کابرایە لە نەزان و نەفامەکانە،**

---

(١) بڕوانە: ٤٦٤٢.

**جا سوێند بەخوا کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە عومەر لێی تێنەپەڕی، چونکە عومەر هەمیشە لە ئاست قورئانەکەی خوادا زۆر ڕاوەستاو بوو.**

٧٢٨٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، عَنْ أَسْمَاءَ ابْنَةِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ أَنَّهَا قَالَتْ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ حِينَ خَسَفَتِ الشَّمْسُ، وَالنَّاسُ قِيَامٌ وَهْيَ قَائِمَةٌ تُصَلِّي فَقُلْتُ: مَا لِلنَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ بِيَدِهَا نَحْوَ السَّمَاءِ فَقَالَتْ: سُبْحَانَ اللَّهِ! فَقُلْتُ: آيَةٌ؟. قَالَتْ بِرَأْسِهَا أَنْ نَعَمْ. فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ لَمْ أَرَهُ إِلاَّ وَقَدْ رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي، حَتَّى الجَنَّةَ وَالنَّارَ، وَأُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي الْقُبُورِ قَرِيبًا مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ، فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ -أَوِ الْمُسْلِمُ، لاَ أَدْرِي أَيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ- فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ، فَأَجَبْنَا وَآمَنَّا. فَيُقَالُ: نَمْ صَالِحًا، عَلِمْنَا أَنَّكَ مُوقِنٌ. وَأَمَّا الْمُنَافِقُ -أَوِ الْمُرْتَابُ، لاَ أَدْرِي أَيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ- فَيَقُولُ: لاَ أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ»[(١)].

**٧٢٨٧- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێ: ڕۆشتم بۆ لای عائیشەی ﵄ خێزانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ خۆر گیرا بوو، خەڵکی بەپێوە وەستاوون (نوێژ یان دەکرد)، هەروەها عائیشە بەپێوە وەستا بوو نوێژی دەکرد، منیش وتم: ئەو خەڵکە چیانە؟ عائیشە بەدەستی ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد و وتی: (سبحان الله) وتم نیشانەیەکە؟ وتی: بە ئاماژەی سەری وتی: بەڵێ، جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بوویەوە سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد، پاشان فەرمووی: ((ئەوەی کەمن پێشتر نەمدیبوو بێگومان هەموویم بینی ئا لەم شوێنەی تێیدا وەستاوم، هەتا بەهەشت و دۆزەخیش، نیگام بۆ کراوە بەدڵنیاییەوە ئێوە لە ناو گۆڕەکاندا تاقی دەکرێنەوە بە نزیك لە تاقیکردنەوەی دەججال، جا باوەڕدار-**

---

(١) بڕوانە: ٨٦.

یان مسوڵمان (فاتیمە دەڵێ: ) نازانم ئەسما کامیانی ووت - ئەویش: دەڵێ موحەممەد ئاییبنی ڕۆشن و ڕێنموونی بۆ هێناوین ئێمەش وەڵاممان دایەوە و باوەڕمان پێ هێنا، جا پێی دەوترێت بخەوە بەخۆشی بەڕاستی ئێمە دەمانزانی تۆ باوەڕی پتەوت هەیە، بەڵام دوو ڕوو- یان دوو دڵ بێت (فاتیمە دەڵێ:) نازانم ئەسما کامیانی وت- ئەوە دەڵێ: نازانم، گوێم لێ دەبوو خەڵك شتێکیان دەوت منیش دەمووت)).

٧٢٨٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «دَعُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِسُؤَالِهِمْ وَاخْتِلاَفِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ».

٧٢٨٨-ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لێم گەڕێن هەتا من لێتان گەڕام[1]، بێگومان ئەوانەی لە پێش ئێوەدا بوون بەهۆی پرسیار کردن (ی زۆریان) و جیاوازیان لەسەر پێغەمبەرانیان ﷺ لەناو چوون، بۆیە ئەگەر شتێکم قەدەغە کرد لێتان ئەوە لێی دوور بکەونەوە و توخنی مەکەون، وە ئەگەر فەرمانم پێکردن بەهەرشتێك ئەنجامی بدەن، ئەوەندەی دەتوانن و پێتان دەکرێ)).

## ٣- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنْ كَثْرَةِ السُّؤَالِ وَتَكَلُّفِ مَا لاَ يَعْنِيهِ

وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ﴿١٠١﴾ ﴾ المائدة

(١) هیچ فەرمانێکم پێتان نەکردوە هیچم لێتان قەدەغە نەکرد، زۆر شتم لەگەڵ مەڵێن، وە بەدوایدا مەڕۆن نەوەک وەک جووەکانتان بەسەردا بێت لە باسی مانگاکەدا.

**٧٢٨٩-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ المُقْرِئُ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَعْظَمَ الْمُسْلِمِينَ جُرْمًا مَنْ سَأَلَ عَنْ شَيْءٍ لَمْ يُحَرَّمْ، فَحُرِّمَ مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ».

## ٣- باسی ئەوەی کە ناپەسەندە لە زۆر پرسیار کردن، هەروەها ناپەسەندە لە ئەستۆ گرتنی کارێک کە پەیوەندی بەو کەسەوە نییە

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (پرسیار مەکەن لە شتانێك ئەگەر ئاشکرا بکرێت بۆتان ناخۆش و خراپ دەبێت بۆتان).**

**٧٢٨٩- عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی گەورەترین تاوانی مسوڵمانان هی کەسێکە پرسیاری کردبێت دەربارەی شتێك نەکراوە، بەڵام حەرام کرا لەبەر پرسیار کردنەکەی ئەو)).**

**٧٢٩٠-** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا عَفَّانُ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، سَمِعْتُ أَبَا النَّضْرِ يُحَدِّثُ عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اتَّخَذَ حُجْرَةً فِي المَسْجِدِ مِنْ حَصِيرٍ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِيهَا لَيَالِيَ، حَتَّى اجْتَمَعَ إِلَيْهِ نَاسٌ، ثُمَّ فَقَدُوا صَوْتَهُ لَيْلَةً فَظَنُّوا أَنَّهُ قَدْ نَامَ، فَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَتَنَحْنَحُ لِيَخْرُجَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: «مَا زَالَ بِكُمُ الذِي رَأَيْتُ مِنْ صَنِيعِكُمْ، حَتَّى خَشِيتُ أَنْ يُكْتَبَ عَلَيْكُمْ، وَلَوْ كُتِبَ عَلَيْكُمْ مَا قُمْتُمْ بِهِ، فَصَلُّوا أَيُّهَا النَّاسُ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ أَفْضَلَ صَلاَةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ، إِلاَّ الصَّلاَةَ الْمَكْتُوبَةَ»[1].

**٧٢٩٠- زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا ژوورێکی لە حەسیر بۆ خۆی دروست کرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ چەند**

---

(١) بڕوانە: ٧٣١.

**شەوێك تێیدا نوێژی کرد، هەتا چەند کەسێکی لەگەڵی کۆبونەوە (و نوێژیان دەکرد لەگەڵیدا)[١]، لە پاشان شەوێك گوێیان لە دەنگی پێغەمبەر ﷺ نەبوو، گومان وابوو خەوتووە، بۆیە هەندێکیان دەکۆکین[٢] بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بێتە دەرەوە لە ماڵ بۆ لایان، ئەویش فەرمووی: ((ئەوەی بەردەوام بوون لە سەری لە کارەکەتان[٣]، من دەمبینی (بۆیە نەهاتم) هەتا دەترسام فەرز ببێت لە سەرتان، وە ئەگەر فەرز ببوایە لە سەرتان پێی هەڵنەدەسان و نەتان دەکرد، کەوابوو ئەی خەڵکینە لە ماڵەکانتاندا نوێژ بکەن، چونکە بەڕاستی گەورەترینی نوێژی مسوڵمانان ئەوەیە لە ماڵەکەی خۆیدا بێت جگە لە نوێژی فەرز[٤]))).**

**٧٢٩١-** حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَشْيَاءَ كَرِهَهَا، فَلَمَّا أَكْثَرُوا عَلَيْهِ الْمَسْأَلَةَ غَضِبَ وَقَالَ: «سَلُونِي». فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَبِي؟ قَالَ: «أَبُوكَ حُذَافَةُ». ثُمَّ قَامَ آخَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَبِي؟ فَقَالَ: «أَبُوكَ سَالِمٌ مَوْلَى شَيْبَةَ». فَلَمَّا رَأَى عُمَرُ مَا بِوَجْهِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الغَضَبِ قَالَ: إِنَّا نَتُوبُ إِلَى اللَّهِ ﷻ[٥].

**٧٢٩١- ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پرسیاری شتانێکی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا کەپێی ناخۆش بوو، جاکە پرسیاری زۆری لێکرا تووڕە بوو، وە فەرمووی: ((پرسیارم لێ بکەن))، جا پیاوێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکی من کێیە؟ فەرمووی ((باوکت حوزافەیە))، پاشان پیاوێکی تر هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکی من کێیە؟ فەرمووی:**

---

(١) ئەوان لە مزگەوتدا بوون پێغەبەریش ﷺ لە ناو ئەو ژوورەدا بوو بەحەسیر دەور درابوو.

(٢) یان دەیوت ئح ئح.

(٣) کە نوێژکردنی تەراویح بووتێوە دەتان کرد.

(٤) کە لەمزگەوتدا پاداشتی زۆر گەورەترە.

(٥) بڕوانە: ٩٢.

((باوکت سالیمە، کە بەندەی ئازاد کراوی شەیبەیە))، ئەنجا کە عومەر تورەیی لە دەم و چاوی پێغەمبەردا ﷺ بینی، وتی: ئێمە لای خوا ﷻ تەوبە دەکەین و پەشیمانین (لەوەی کە تۆمان تووڕە کرد).

٧٢٩٢- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ، عَنْ وَرَّادٍ -كَاتِبِ الْمُغِيرَةِ- قَالَ: كَتَبَ مُعَاوِيَةُ إِلَى الْمُغِيرَةِ: اكْتُبْ إِلَيَّ مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.فَكَتَبَ إِلَيْهِ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ». وَكَتَبَ إِلَيْهِ: إِنَّهُ كَانَ يَنْهَى عَنْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةِ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةِ الْمَالِ، وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقُوقِ الأُمَّهَاتِ، وَوَأْدِ الْبَنَاتِ وَمَنْعٍ وَهَاتِ[1].

**٧٢٩٢- عەبدولمەلیك لە وەڕادەوە -کە نووسەری موغیرە بوو ﷺ- گێڕایەوە و وتی: موعاویە نووسیبووی بۆی موغیرە: ئەوەی لە پێغەمبەری خوات ﷺ بیستووە بۆم بنووسە. موغیرەش بۆی نووسی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە دوای هەموو نوێژێکی فەرز دەیفەرموو:** ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ)) **واتە: هیچ بەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خوا تەنهایە و هاوەڵی نییە، هەموو دەسەڵات و ستایشی هەر بۆ ئەوە و ئەو خوایە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، خوایە ئەوەی تۆ بیبەخشی ڕێگری بۆ نییە، ئەوەش تۆ ڕێگری بیت کەس ناتوانێ بیدات، دەوڵەمەندی و دارایی هیچ سوودێکی نییە، دەوڵەمەندی تەنها لای تۆیە.**

(١) بڕوانە: ٨٤٤.

**وە (موغیرە) بۆی نووسی کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە وتی وتی و زۆر پرسیار کردن و بەفیڕۆدانی ماڵ، وە ڕێگری کردوە لە سەرپێچی دایکان و زیندەبەچاڵ کردنی کیژۆڵەکان و دەست قوچاوی و هەڵپەکردن.**

٧٢٩٣- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ فَقَالَ: نُهِينَا عَنِ التَّكَلُّفِ.

**٧٢٩٣-سابیت لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتی: ئێمە لە خزمەتی عومەردا بووین ﷺ وتی: ڕێگریمان لێ کرا لە کردنی کارێك بەزۆر لە خۆکردن[1].**

٧٢٩٤- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَحَدَّثَنِي مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ حِينَ زَاغَتِ الشَّمْسُ فَصَلَّى الظُّهْرَ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَذَكَرَ السَّاعَةَ، وَذَكَرَ أَنَّ بَيْنَ يَدَيْهَا أُمُورًا عِظَامًا، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَسْأَلَ عَنْ شَيْءٍ فَلْيَسْأَلْ عَنْهُ، فَوَاللَّهِ لاَ تَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ أَخْبَرْتُكُمْ بِهِ، مَا دُمْتُ فِي مَقَامِي هَذَا». قَالَ أَنَسٌ: فَأَكْثَرَ النَّاسُ البُكَاءَ، وَأَكْثَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَقُولَ: «سَلُونِي». فَقَالَ أَنَسٌ: فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ فَقَالَ: أَيْنَ مَدْخَلِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «النَّارُ». فَقَامَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُذَافَةَ فَقَالَ: مَنْ أَبِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَبُوكَ حُذَافَةُ». قَالَ: ثُمَّ أَكْثَرَ أَنْ يَقُولَ: «سَلُونِي سَلُونِي». فَبَرَكَ عُمَرُ عَلَى رُكْبَتَيْهِ فَقَالَ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ رَسُولاً. قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَالَ عُمَرُ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ عُرِضَتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ آنِفًا فِي عُرْضِ هَذَا الحَائِطِ وَأَنَا أُصَلِّي، فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ فِي الخَيْرِ وَالشَّرِّ»[2].

---

(١) (التَّكَلُّفِ) واتە: خۆگۆڕین وساختەکردن لەبارەی ڕەفتارو هەموو کارێکی ترەوە، وە ئەنجامدانی کارێک بەگران ونارەحەتی.

(٢) بڕوانە: ٩٣.

٧٢٩٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا لە ماڵ هاتە دەرەوە (بۆ مزگەوت) و نوێژی نیوەڕۆی کرد، کاتێ سەلامی دایەوە لەسەر دوانگەکە وەستا و جا باسی قیامەتی کرد و فەرمووی: پێش هاتنی قیامەت چەند ڕووداوی گەورە هەیە، پاشان فەرمووی: ((هەر کەسێك حەز دەکات پرسیار بکات دەربارەی شتێك با پرسیار کات لە بارەیەوە، جا سوێند بەخوا پرسیاری هەر شتێکم لێ بکەن هەواڵتان دەدەمێ لە بارەیەوە هەتا لەم شوێنەدابم کە تیایدا وەستاوم))، ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئیتر خەڵکەکە زۆر گریان، پێغەمبەری خواش ﷺ زۆر دەیفەرموو: ((پرسیارم لێ بکەن))، ئەنەس دەڵێ: ئینجا پیاوێك هەستا چووە لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من شوێنم کوێیە (لە قیامەتدا)؟ فەرمووی: ((دۆزەخە)) ئینجا عەبدوڵلای کوڕی حوزافە هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکی من کێیە؟فەرمووی: ((باوکت حوزافەیە))، ئەنەس دەڵێ: پاشان زۆر دەیفەرموو: ((پرسیارم لێ بکەن، پرسیارم لێ بکەن))، ئینجا عومەر ﷺ لەسەر ئەژنۆکانی دانیشت وتی: ڕازین بەوەی خودا پەروەردگارمان بێت و ئیسلام ئاینمان بێت و موحوممەد ﷺ پێغەمبەر ﷺ مان بێت، ئەنەس دەڵێ: کاتێ عومەر ئەم قسەی کرد پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو، لە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە بێگومان و بەدڵنیاییەوە کەمێ پێش ئێستە دۆزەخ و بەهەشتم نیشان درا لە لای ئەو دیوارەوە، لە کاتێکدا نوێژم دەکرد، ڕۆژی وەك ئەمڕۆم نەدی لە چاکە و خراپەدا)).

٧٢٩٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، أَخْبَرَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنِي مُوسَى بْنُ أَنَسٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا نَبِيَّ اللهِ، مَنْ أَبِي؟ قَالَ: «أَبُوكَ فُلاَنٌ». وَنَزَلَتْ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ ﴾ الآيَةَ. المائدة[1].

**٧٢٩٥- موسای کوڕی ئەنەس دەڵێ: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ بیست وتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکی من کێیە؟ فەرمووی: ((باوکت فڵانە کەسە))، ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پرسیار مەکەن لە شتانێك)، تا کۆتایی ئایەتەکە.**

٧٢٩٦- حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، حَدَّثَنَا وَرْقَاءُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لَنْ يَبْرَحَ النَّاسُ يَتَسَاءَلُونَ حَتَّى يَقُولُوا: هَذَا اللهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ، فَمَنْ خَلَقَ اللهَ؟».

**٧٢٩٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەردەوام خەڵکی پرسیار لە یەکتری دەکەن هەتا (دەگەنە ئەوەی) دەڵێن: ئەوە خوایە و دروستکەری هەموو شتێکە، ئەی کێ خوای دروست کردوە)).**

٧٢٩٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ مَيْمُونٍ، حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَرْثٍ بِالْمَدِينَةِ، وَهْوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى عَسِيبٍ، فَمَرَّ بِنَفَرٍ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ: بَعْضُهُمْ سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ تَسْأَلُوهُ لاَ يُسْمِعْكُمْ مَا تَكْرَهُونَ. فَقَامُوا إِلَيْهِ فَقَالُوا: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، حَدِّثْنَا عَنِ الرُّوحِ. فَقَامَ سَاعَةً يَنْظُرُ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ، فَتَأَخَّرْتُ عَنْهُ حَتَّى صَعِدَ الْوَحْيُ، ثُمَّ قَالَ: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي ﴾ الإسراء[2].

---

(١) بڕوانە: ٩٣.

(٢) بڕوانە: ١٢٥.

**٧٢٩٧- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: من لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە کێڵگەیەکی مەدینەدا بووم، پێغەمبەر ﷺ خۆی دەدا بە سەر پەلی دارخورمایەکدا [1]، ئینجا تێپەڕی بەلای چەند کەسێکی جوولەکەدا و کەسێکیان وتی: پرسیاری لێ بکەن دەربارەی ڕۆح؟ کەسێکی تریان وتی: پرسیاری لێ مەکەن نەوەك وتەیەکی لێ ببیستن پێتان ناخۆش بێت، جا هەستان چون بۆ لای وتیان: ئەی ئەبو لقاسم باسی ڕۆحمان بۆ بکە؟ پێغەمبەریش ﷺ ماوەیەك وەستا چاوەڕوانی دەکرد، ئیتر زانیم بەدڵنیاییەوە کە نیگای بۆ دەکرێ، منیش لێی دوورکەوتمەوە هەتا نیگاکە سەرکەوت و کۆتایی هات، پاشان فەرمووی: (وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح، تۆش بڵێ: ڕۆح لە کار و باری تایبەت بە پەروەردگارمە).**

## ٤- بابُ الاقْتِدَاءِ بِأفْعَالِ النَّبِيِّ ﷺ

٧٢٩٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: اتَّخَذَ النَّبِيُّ ﷺ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي اتَّخَذْتُ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ». فَنَبَذَهُ وَقَالَ «إِنِّي لَنْ أَلْبَسَهُ أَبَدًا» فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ [2].

## ٤- باسی پەیڕەوی کردنی پێغەمبەر ﷺ لە کردارەکانیدا

**٧٢٩٨- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەموستیلەیەکی لە ئاڵتوون دروست کرد، ئیتر خەڵکەکەش ئەموستیلەی ئاڵتوونیان دروست کرد، فەرمووی:**

---

(١) (وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى عَسِيبٍ) واتە: خۆی دەدا بەسەر پەلی دار خورمایەکدا. ئێمە بەو شێوە مانامان کردوە، لە ئەلمونجید بەکوردی دا دەڵێ: (تَوَكَّأَ على عصاهُ) خۆی بەسەر داردەستەکەیدا و پشتی پێبەست/ گیانی بە دار دەستەکەی بوو. ( ئەلمونجید بەکوردی:٥٦٣/٥). وە لە (معجم الوسيط:٧١١)ـدا دەڵێ: (تَوَكَّأَ على الشَّيءِ: إعتَمَدَ، وتَحَمَّلَ عليهِ) واتە: پشتی پێبەست و خۆیدا بەسەریدا.

(٢) بڕوانە: ٥٨٦٥.

((من ئەموستیلەیەکم لە ئاڵتوون دروست کردبوو))، ئینجا فڕێیدا و فەرمووی: ((دڵنیابن من هەرگیز لە دەستی ناکەم))، ئەوسا خەڵکەکەش ئەموستیلەکەیان فڕێدا.

## ٥- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ التَّعَمُّقِ وَالتَّنَازُعِ فِي العِلْمِ وَالْغُلُوِّ فِي الدِّينِ وَالْبِدَعِ

لِقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ ﴿١٧١﴾ ﴾ النساء.

٧٢٩٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تُوَاصِلُوا». قَالُوا: إِنَّكَ تُوَاصِلُ. قَالَ: «إِنِّي لَسْتُ مِثْلَكُمْ، إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي». فَلَمْ يَنْتَهُوا عَنِ الوِصَالِ، قَالَ: فَوَاصَلَ بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَيْنِ -أَوْ لَيْلَتَيْنِ- ثُمَّ رَأَوُا الْهِلاَلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ تَأَخَّرَ الهِلاَلُ لَزِدْتُكُمْ». كَالْمُنَكِّلِ لَهُمْ[١].

## ٥- باسی ئەوەی ناپەسەندە لە قوڵبوونەوە و توندی[٢] و دەمەقاڵێ لە زانستدا و زیادەڕۆی و ڕۆچوون لە ئاین و شتی داهێنراودا

بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (ئەی خاوەن پەڕاوە ئاسمانییەکان زیادەڕەوی مەکەن لە ئاینەکەتاندا، وە لە بارەی خواوە جگە لە ڕاستی هیچی تر مەڵێن).

٧٢٩٩-ئەبو سەلەمە دەگێڕێتەوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((زیاد لە ڕۆژێك بەسەریەکەوە بەڕۆژوو مەبن))، عەرزیان کرد: تۆ

(١) بڕوانە: ١٩٦٥.
(٢) توندو ڕەقی لەکارێکداکە لەسنووری خۆی تێپەڕێت.

خۆت زیاد لە ڕۆژێك بەسەریەكەوە بەڕۆژوو دەبیت. فەرمووی: ((من وەك ئێوە نیم، دڵنیابن من شەوم بەسەردا دێت پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم دەداتێ))، بەڵام هاوەڵان هەر وازیان نەهێنا لە شەو خستنە سەر ڕۆژ لە ڕۆژووگرتندا، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ بە دوو ڕۆژ ویصالی پێكردن - یان دوو شەو- پاشان مانگیان بینی (و بوو بە جەژن)، ئەوسا فەرمووی: ((ئەگەر (بینینی مانگ) دواكەوتایە ڕۆژووی پەیوەستم زیاتر پێدەگرتن))، وەك سزا بۆیان كە هەر وازیان نەدەهێنا.

٧٣٠٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ التَّيْمِيُّ، حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: خَطَبَنَا عَلِيٌّ ﷺ عَلَى مِنْبَرٍ مِنْ آجُرٍّ، وَعَلَيْهِ سَيْفٌ فِيهِ صَحِيفَةٌ مُعَلَّقَةٌ فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا عِنْدَنَا مِنْ كِتَابٍ يُقْرَأُ إِلاَّ كِتَابُ اللَّهِ، وَمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ. فَنَشَرَهَا فَإِذَا فِيهَا أَسْنَانُ الإِبِلِ وَإِذَا فِيهَا: «الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مِنْ عَيْرٍ إِلَى كَذَا، فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً». وَإِذَا فِيهِ: «ذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ، فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِمًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً». وَإِذَا فِيهَا: «مَنْ وَالَى قَوْمًا بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً»[١].

٧٣٠٠- ئەعمەش دەڵێ: ئیبراهیمی تەیمی بۆی گێڕاینەوە وتی: باوكم بۆی گێڕاینەوە وتی: عەلی ﷺ وتاری بۆ داین لەسەر دوانگەیەك لە خشتی سورۆكراو بوو، شمشێرێكی پێبوو پەڕەیەك لە كێلانەكەیدا بوو وتی: سوێند بە خوا هیچ كتێبێكمان لا نییە بخوێنرێتەوە جگە لە قورئانەكەی خوا و ئەوەی لەم پەڕەدایە[٢]، ئینجا پەڕەیەكەی بڵاوكردەوە (و خوێنرایەوە) بینیمان تەمەنی

---

(١) بڕوانە: ١١١.
(٢) ئەو پەڕەیە كە چەند فەرموودەیەكی تیا نوسرابوو ئەو فەرموودەی سەرەوە یەكێك بوو لە فەرموودەكان.

**وشترانی (لە خوێندا دراوی) تێدایە، هەروەها: ((مەدینە ڕێزدار و قەدەغەیە [١] لە نێوانی عەیر بۆ ئەوێ (سەور)، ئینجا هەر کەسێ خراپەیەکی تێدا بکات ئەوە نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت، خوا پەشیمان بوونەوە و فیدیەی [٢] لێ وەرناگرێ)) تێدایە، وە ئەمەشی تێدایە: ((پەنادانی مسوڵمانان یەکە [٣] نزمترین کەسیان (دەتوانێ) پێی هەڵدەستێت، جا هەر مسوڵمانێ (پەنادان و پەیمانی) مسوڵمانێك هەڵبوەشێنێتەوە، ئەوە نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت، خوا پەشیمانی و فیدیەی لێ وەرناگرێ))، وە تێیدا بوو((وە هەر کەسێ خۆی بکاتە پشتیوانی کەسانێ بەبێ مۆڵەتی گەورە و هۆزەکەی خۆی، ئەوە نەفرەتی خوا و فریشتەکان و گشت خەڵکی لەسەر بێت، خوا پەشیمانی و فیدیەی لێ وەرناگرێ)).**

٧٣٠١- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ - رَضِيَ الله عنها - صَنَعَ النَّبِيُّ ﷺ شَيْئًا تَرَخَّصَ وَتَنَزَّهَ عَنْهُ قَوْمٌ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَحَمِدَ اللَّهَ ثُمَّ قَالَ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَتَنَزَّهُونَ عَنِ الشَّيْءِ أَصْنَعُهُ فَوَاللَّهِ إِنِّي أَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً» [٤].

**٧٣٠١- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شتێکی کرد ڕێگەی بەکردنی دا کە پێشتر ڕێگە پێنەدراو بوو، بەڵام کەسانێك خۆیان لێ بەدوور گرت، ئینجا ئەوە بە پێغەمبەر ﷺ گەشتەوە، جا سوپاسی خوای کرد و لە پاشان فەرمووی: ((ئەوە کەسانێك چیانە خۆیان بە دوور دەگرن لە شتێك کە من دەیکەم، دەی سوێند بە خوا بێگومان من لەوان زاناترم بە خوا، وە لە هەموویان زیاتر لە خوا دەترسم)).**

---

(١) جەنگ و ئاژاوە تێدا یاساغ و قەدەغەیە.
(٢) هەندێ لە زانایان (صرف و عدل) یان بە فەرز و سوننەت مانا کردوە.
(٣) واتە جیاوازی نییە لە پەنادان هەر مسوڵمانێ پەنای کافرێک بدات دروستە و هەموویان پێوەی پابەندن.
(٤) بڕوانە: ٦١٠١.

٧٣٠٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنْ نَافِعِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: كَادَ الخَيِّرَانِ أَنْ يَهْلِكَا أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، لَمَّا قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَفْدُ بَنِي تَمِيمٍ، أَشَارَ أَحَدُهُمَا بِالأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ الحَنْظَلِيِّ أَخِي بَنِي مُجَاشِعٍ، وَأَشَارَ الآخَرُ بِغَيْرِهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ لِعُمَرَ: إِنَّمَا أَرَدْتَ خِلاَفِي. فَقَالَ عُمَرُ: مَا أَرَدْتُ خِلاَفَكَ. فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَنَزَلَتْ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ ﴿٢﴾ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾ الحجرات.

قَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: قَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: فَكَانَ عُمَرُ بَعْدُ -وَلَمْ يَذْكُرْ ذَلِكَ عَنْ أَبِيهِ، يَعْنِي: أَبَا بَكْرٍ- إِذَا حَدَّثَ النَّبِيَّ ﷺ بِحَدِيثٍ حَدَّثَهُ كَأَخِي السِّرَارِ، لَمْ يُسْمِعْهُ حَتَّى يَسْتَفْهِمَهُ[1].

**٧٣٠٢- ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: دوو پیاوە چاکەکە ئەبو بەکر و عومەر ﷺ نزیك بوو تیاچن، کاتێ نوێنەرانی بەنی تەمیم هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، یەکێکیان[2] پێشنیاری ئەقرەعی کوڕی حابیسی حەنزەلی برای بەنی موجاشیعی کرد (بیکاتە بەرپرسیان)، ئەوەی کەشیان[3] پێشنیاری کەسێکی تری کرد (پێغەمبەر ﷺ بیکاتە ئەمیریان)، ئینجا ئەبو بەکر بە عومەری وت: تۆ هەر پێچەوانەی منت ویست، عومەریش وتی: پێچەوانەی تۆم مەبەست نەبووە، جا هەردووکیان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەنگیان بەرز بوویەوە، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتەی دابەزی: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە دەنگتان بەرز مەکەنەوە)، تا ئەم فەرمایشتەی خوا (پاداشتیان-گەورەیە)، ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: ئیبنو زوبەیر وتی: جا عومەر پاش (دابەزینی ئەو ئایەتە) - ئیبنو زوبەیر ئەمەی لە باوکیەوە (مەبەستی باوکی دایکێتی) واتە: ئەبو بەکر ﷺ نەگێڕایەوە- ئەگەر قسەیەکی بۆ پێغەمبەر ﷺ بکردایە وەك کەسێك بەچپە و سرتە قسە بکات**

---

(١) بڕوانە: ٤٣٦٧.

(٢) کە عومەری کوڕی خەتتاب بوو ﷺ.

(٣) کە ئەبو بەکرە ﷺ.

(قسەی دەكرد، گوێی لێ نەدەبوو هەتا پێغەمبەر ﷺ داوای دەكرد (دەنگ بەرز بكاتەوە)، تا گوێی لێ بێت.

٧٣٠٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي مَرَضِهِ: "مُرُوا أَبَا بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ". قَالَتْ عَائِشَةُ: قُلْتُ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ الْبُكَاءِ، فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ. فَقَالَ: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ». فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ لِحَفْصَةَ: قُولِي: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ الْبُكَاءِ، فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ. فَفَعَلَتْ حَفْصَةُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّكُنَّ لأَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ». قَالَتْ حَفْصَةُ لِعَائِشَةَ: مَا كُنْتُ لأُصِيبَ مِنْكِ خَيْرًا[1].

**٧٣٠٣- عوروە لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەی دایكی ئیماندارانەوە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشی (وەفاتیدا) فەرمووی: ((فەرمان بكەن بە ئەبو بەكر پێشنوێژی بكات بۆ خەڵكی))، عائیشە وتی: منیش وتم: بەڕاستی ئەبو بەكر ئەگەر لەشوێنی تۆ بوەستێ (بۆ پێشنوێژی) لەبەر گریان نوێژگەرەكان دەنگی نابیستن، بۆیە فەرمان بكە بە عومەر با پێشنوێژی بكات (بۆ خەڵكی)، ئینجا فەرمووی: ((فەرمان بكەن بە ئەبو بەكر پێشنوێژی بكات بۆ خەڵكی))، وە عائیشە دەڵێ: منیش بە حەفصەم وت: تۆش (بە پێغەمبەر ﷺ) بڵێ بەڕاستی ئەبو بەكر ئەگەر لە شوێنی تۆدا بوەستێ لەبەر گریان خەڵك گوێیان لە دەنگی نابێ، جا بۆیە فەرمان بكە بە عومەر پێشنوێژی بكات بۆ خەڵكی، حەفصەش ﵂ پێی وت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی ئێوە وەك ئافرەتانی سەردەمیی یوسف وان، فەرمان بدەن بە ئەبو**

(١) بڕوانە: ١٩٨.

بەکر با پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی))، حەفصەش بە عائیشەی وت: من لە تۆوە تووشی هیچ خێر و چاکەیەك نەبووم.

٧٣٠٤- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: جَاءَ عُوَيْمِرٌ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً فَيَقْتُلُهُ، أَتَقْتُلُونَهُ بِهِ؟ سَلْ لِي يَا عَاصِمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ. فَسَأَلَهُ، فَكَرِهَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَسَائِلَ وَعَابَ، فَرَجَعَ عَاصِمٌ فَأَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَرِهَ المَسَائِلَ، فَقَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ لآتِيَنَّ النَّبِيَّ ﷺ. فَجَاءَ وَقَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى الْقُرْآنَ خَلْفَ عَاصِمٍ، فَقَالَ لَهُ: «قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ فِيكُمْ قُرْآنًا». فَدَعَا بِهِمَا فَتَقَدَّمَا فَتَلاَعَنَا، ثُمَّ قَالَ عُوَيْمِرٌ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا. فَفَارَقَهَا وَلَمْ يَأْمُرْهُ النَّبِيُّ ﷺ بِفِرَاقِهَا، فَجَرَتِ السُّنَّةُ فِي الْمُتَلاَعِنَيْنِ، وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «انْظُرُوهَا فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَحْمَرَ قَصِيراً مِثْلَ وَحَرَةٍ فَلاَ أُرَاهُ إِلاَّ قَدْ كَذَبَ، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَسْحَمَ أَعْيَنَ ذَا أَلْيَتَيْنِ فَلاَ أَحْسِبُ إِلاَّ قَدْ صَدَقَ عَلَيْهَا». فَجَاءَتْ بِهِ عَلَى الأَمْرِ المَكْرُوهِ[1].

٧٣٠٤- زوهری لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: عوەیمیر هات بۆ لای عاصیمی کوڕی عەدیی و وتی: پێم بڵێ ئەگەر پیاوێك لەگەڵ ژنەکەی خۆیدا پیاوێکی بینی و بیکوژێ، ئایا ئێوە لە خوێنی ئەودا دەیکوژنەوە؟ ئەی عاصیم پرسیارم بۆ بکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش پرسیاری لێ کرد، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەو جۆرە پرسیارانەی پێ ناخۆش بوو بەعەیبیشی دانا. ئەوسا عاصیم ﷺ گەڕایەوە (بۆ لای عوەیمیر) و بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو پرسیارانەی پێ ناخۆش بوو، عوەیمیریش وتی: سوێند بە خوا دەچم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا هات و هاوکات خوای بەرز و بڵند پاش (گەڕانەوەی) عاصیم قورئانی دابەزاندبوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:

---

(١) بڕوانە: ٤٢٣.

**(بێگومان خوا لەبارەی تۆوە قورئانی دابەزاند)، ئینجا هەردووکیان (ژن وپیاوەکە)ی بانگ کردن و هاتنە پێشەوە و نەفرین کردنیان ئەنجامدا، پاشان عوومیمر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوهتانم بۆ کردوە ئەگەر بیگرمە لای خۆم،ئیتر تەڵاقیدا لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ نەکردبوو بەجیابوونەوە لێی، ئیتر ئەوە بوو بە سوننەت بۆ هەموو ژن و پیاوێکی نەفرینکەر، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سەرنج بدەن جا ئەگەر ژنەکە ئەو منداڵەی بوو سورێکی کورتە باڵا بوو وەکو شەوگەرد وابوو، ئەوە وا دەزانم بەدڵنیاییەوە (عومیمر) درۆی کردوە، بەڵام ئەگەر منداڵەکەی بوو چاوەکانی ڕەش بوون و دوو سمتی گەورەی هەبوو، ئەوە وادەزانم بێگومان ڕاستی کردوە لەوەی پێی وتووە))، ئینجا ژنەکە منداڵەکەی بوو لەسەر شێوە ناپەسەندەکە بوو[1].**

٧٣٠٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَالِكُ بْنُ أَوْسٍ النَّصْرِيُّ، وَكَانَ مُحَمَّدُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ذَكَرَ لِي ذِكْرًا مِنْ ذَلِكَ، فَدَخَلْتُ عَلَى مَالِكٍ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: انْطَلَقْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى عُمَرَ، أَتَاهُ حَاجِبُهُ يَرْفَا فَقَالَ: هَلْ لَكَ فِي عُثْمَانَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ وَالزُّبَيْرِ وَسَعْدٍ يَسْتَأْذِنُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَدَخَلُوا فَسَلَّمُوا وَجَلَسُوا، فَقَالَ: هَلْ لَكَ فِي عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ؟ فَأَذِنَ لَهُمَا، قَالَ العَبَّاسُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، اقْضِ بَيْنِي وَبَيْنَ الظَّالِمِ. اسْتَبَّا، فَقَالَ الرَّهْطُ عُثْمَانُ وَأَصْحَابُهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، اقْضِ بَيْنَهُمَا وَأَرِحْ أَحَدَهُمَا مِنَ الآخَرِ. فَقَالَ: اتَّئِدُوا أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ». يُرِيدُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَفْسَهُ؟ قَالَ الرَّهْطُ: قَدْ قَالَ ذَلِكَ. فَأَقْبَلَ عُمَرُ عَلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمَانِ

---

(١) سەرنج: واتە: لە مولاعەنەدا ئەگەر ئافرەتەکە سوێندی خوارد، ئەوە مێردەکەی دەیڵێ دەربارەی درۆ دەکات ئافرەتەکە بەردباران ناکرێت، با لە دوا ئەوەی ئافرەتەکە منداڵەکەی بوو ڕاستی قسەی مێردەکەشی بسەلمێنێ، چونکە قورئان بەو سوێند خواردنە ئافرەتەکە بێ تاوان لە قەڵەم دەدات.

أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ ذَلِكَ؟ قَالاَ نَعَمْ. قَالَ عُمَرُ: فَإِنِّي مُحَدِّثُكُمْ عَنْ هَذَا الأَمْرِ: إِنَّ اللَّهَ كَانَ خَصَّ رَسُولَهُ ﷺ فِي هَذَا الْمَالِ بِشَيْءٍ لَمْ يُعْطِهِ أَحَدًا غَيْرَهُ، فَإِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ ﴿٦﴾ ﴾ الحشر، الآيَةَ. فَكَانَتْ هَذِهِ خَالِصَةً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ وَاللَّهِ مَا احْتَازَهَا دُونَكُمْ وَلاَ اسْتَأْثَرَ بِهَا عَلَيْكُمْ، وَقَدْ أَعْطَاكُمُوهَا وَبَثَّهَا فِيكُمْ، حَتَّى بَقِيَ مِنْهَا هَذَا الْمَالُ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَتِهِمْ مِنْ هَذَا الْمَالِ، ثُمَّ يَأْخُذُ مَا بَقِيَ فَيَجْعَلُهُ مَجْعَلَ مَالِ اللَّهِ، فَعَمِلَ النَّبِيُّ ﷺ بِذَلِكَ حَيَاتَهُ، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُونَ ذَلِكَ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ. ثُمَّ قَالَ لِعَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ: أَنْشُدُكُمَا اللَّهَ هَلْ تَعْلَمَانِ ذَلِكَ؟ قَالاَ: نَعَمْ. ثُمَّ تَوَفَّى اللَّهُ نَبِيَّهُ ﷺ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَقَبَضَهَا أَبُو بَكْرٍ فَعَمِلَ فِيهَا بِمَا عَمِلَ فِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَنْتُمَا حِينَئِذٍ -وَأَقْبَلَ عَلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ- تَزْعُمَانِ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ فِيهَا كَذَا، وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنَّهُ فِيهَا صَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ، ثُمَّ تَوَفَّى اللَّهُ أَبَا بَكْرٍ، فَقُلْتُ: أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْر، فَقَبَضْتُهَا سَنَتَيْنِ أَعْمَلُ فِيهَا بِمَا عَمِلَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ جِئْتُمَانِي وَكَلِمَتُكُمَا عَلَى كَلِمَةٍ وَاحِدَةٍ وَأَمْرُكُمَا جَمِيعٌ، جِئْتَنِي تَسْأَلُنِي نَصِيبَكَ مِنِ ابْنِ أَخِيكَ، وَأَتَانِي هَذَا يَسْأَلُنِي نَصِيبَ امْرَأَتِهِ مِنْ أَبِيهَا، فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتُمَا دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا عَلَى أَنَّ عَلَيْكُمَا عَهْدَ اللَّهِ وَمِيثَاقَهُ، تَعْمَلاَنِ فِيهَا بِمَا عَمِلَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَبِمَا عَمِلَ فِيهَا أَبُو بَكْرٍ، وَبِمَا عَمِلْتُ فِيهَا مُنْذُ وَلِيتُهَا، وَإِلاَّ فَلاَ تُكَلِّمَانِي فِيهَا. فَقُلْتُمَا: ادْفَعْهَا إِلَيْنَا بِذَلِكَ. فَدَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا بِذَلِكَ، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ دَفَعْتُهَا إِلَيْهِمَا بِذَلِكَ؟ قَالَ الرَّهْطُ: نَعَمْ. فَأَقْبَلَ عَلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا بِذَلِكَ؟ قَالاَ: نَعَمْ. قَالَ: أَفَتَلْتَمِسَانِ مِنِّي قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ؟ فَوَالَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ لاَ أَقْضِي فِيهَا قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، فَإِنْ عَجَزْتُمَا عَنْهَا فَادْفَعَاهَا إِلَيَّ، فَأَنَا أَكْفِيكُمَاهَا[1].

---

(١) بروانە: ٢٩٠٤.

٧٣٠٥- ئیبنو شیهاب دەڵێ: مالیکی کوڕی ئەوسی نەصری بۆی گێڕامەوە، وە موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم باسێکی ئەو فەرموودەی بۆ کردم، منیش ڕۆشتم هەتا چوومە ژوورەوە بۆ لای مالیك و پرسیارم لێ کرد، مالیکیش وتی: ڕۆشتم هەتا برۆمە ژوورەوە بۆلای عومەر، (کاتێ من دانیشتبوم) دەرگاوانەکەی کە ناوی یەرفا بوو هات بۆ لای و وتی: عوسمان و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص ﷺ داوای مۆڵەتت لێ دەکەن ڕێگەیان دەدەیت؟ عومەر وتی: بەڵێ (بابێنە ژوورەوە)، ئەنجا هاتنە ژوورەوە سەلامیان کرد و دانیشتن، جا یەرفا وتی: عەلی و عەبباس ﷺ (داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوە دەکەن) ڕێگەیان دەدەیت؟ جا مۆڵەتی هەردووکیانیدا، عەبباس وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران لە نێوان من و ئەم ستەمکارەدا بڕیار بدە، هەردووکیان جنێویاندا بەیەکتری، کۆمەڵەکەش کە عوسمان و هاوڕێکانی بوون وتیان: ئەی پێشەوای باوەڕداران بڕیار بدە لە نێوانیاندا لە دەستی یەکتری ڕزگاریان بکە، عومەریش وتی: لەسەرخۆبن بەدەنگی بەرز داواتان لێ دەکەم بە خودا کە بەفەرمانی ئەو زەوی و ئاسمان ڕاوەستاوە، ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئێمە میراتمان لێ ناگیرێ ئەوەی لێمان بەجێما خێرە[1]؟)) پێغەمبەری خوا بەم فەرموودە خۆی مەبەستە؟ کۆمەڵەکە وتیان: بەڵێ ئەوەی فەرمووە، ئەوسا عومەر ڕووی کردە عەلی و عەبباس ﷺ وتی: داواتان لێ دەکەم بەخوا ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە؟ هەردووکیان وتیان: بەڵێ فەرموویەتی، عومەر وتی: جا بەڕاستی من دەربارەی ئەو کارە قسەتان بۆ دەکەم، بەڕاستی خوا هەندێ لەم دەستکەوتەی تایبەت کردوە بە پێغەمبەرەوە ﷺ بەکەسی تری نەداوە، بێگومان خوا دەفەرمووی:

---

(١) بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان خەرج دەکرێ.

(ئەو (دەستکەوتانەی) کە خوا سەندیەوە بۆ پێغەمبەرەکەی لە ماڵی (بەنی نەزیر) ئێوە بۆ بەدەست هێنانی هیچ ئەسپ و وشترێکتان تاو نەداوە، بەڵکو خوا پێغەمبەرانی زاڵ دەکات بەسەر هەر کەسێکدا کە بیەوێت، وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەڵاتە)، دەی ئەمە تایبەت بوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان سوێند بەخوا کۆی نەکردۆتەوە بۆ خۆی بە تەنها و ئێوەی لێ بێبەش بکات، وە تایبەتی نەکردوە بەخۆی جگەلە ئێوە، بێگومان داویتی بەئێوەش و دابەشی کردوە بەسەرتاندا، هەتا ئائەم سامانەی لێ ماوەتەوە، وە پێغەمبەری خوا خەرجی و بژێوی ساڵێکی خاو خێزانی لەم ماڵ و سامانە بوو، پاشان ئەوەشی دەمایەوە بەماڵ و سامانی خوای دادەنا (لە بەرژەوەندی گشتیدا خەرجی دەکرد)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەم جۆرەی دەکرد تا لەژیاندابوو، سوێندتان دەدەم بەخوا ئەمە دەزانن؟ وتیان: بەڵێ (دەیزانین)، پاشان بە عەلی و عەبباسی وت: سوێندتان دەدەم بەخوا ئێوەش هەردووکتان ئەمە دەزانن؟ هەردووکیان وتیان: بەڵێ، عومەر وتی: پاشان خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ بردەوە بۆ لای خۆی، جا ئەبو بەکر وتی: من میراتگری پێغەمبەری خوام ﷺ، ئیتر ئەبو بەکر ئەو ماڵی (فەیئەی) وەرگرت و بەو جۆرەی لێ کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دەکرد (لە ژیانیدا)، وە هەردووکتان لەو کات و ڕۆژگارەدا- ڕووی کردە عەلی و عەبباس- بە قسەی خۆتان دەتانوت ئەبو بەکر ئەوی تێدایە[1]، وە خواش دەزانێ بەڕاستی ئەبو بەکر دەربارەی ئەو سامانە ڕاستگۆ و سەر ڕاستانە شوێنکەوتەی هەق بوو، پاشان خوا ئەبو بەکری بردەوە، منیش وتم من میراتگری پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکرم و ماوەی دوو ساڵ ئەو ماڵە (فەیئەم) وەرگرت و بەو جۆرەم لێ کرد کە هەریەك لە پێغەمبەری خوا ﷺ و

---

(١) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەبو بەکر ﷺ غەدر دەکات لێیان.

ئەبو بەکر کردیان، پاشان هەردووکتان هاتوون بۆ لام قسەم لەگەڵدا دەکەن، وە قسەی هەردووتان یەکە، کارەکەشتان پێکەوەیە، تۆش (عەبباس) هاتووی داوای بەشەکەتم لێ دەکەیت کە لە برازاکەت دەتکەوێ، ئەمەش (عەلی) هاتووە بۆلام داوای بەشی هاوسەرەکەی دەکات کە لە باوکی دەیکەوێ، منیش ئەو کات وتم ئەگەر دەتانەوێ دەیدەم بەهەردووکتان بەمەرجێ پەیمان و بەڵێن بدەن بەخوا کە هەردووکتان لەم ماڵی (فەیئەدا) بەو شێوە لێ بکەن پێغەمبەری خوا ﷺ پێی کردوە، وە ئەبو بەکر پێی کردوە، وە من پێم کردوە لەو کاتەوەی بەدەستمەوە بوو، ئەگەر نا ئەوە قسەم لەگەڵدا مەکەن لە بارەیەوە، ئێوەش وتان: بەوشێوە بیدە پێمان، منیش بەو شێوەی دامەوە پێتان، جا سوێندتان دەدەم بەخوا (عوسمان و هاوڕێکانی) ئایا داومە بەو دووانە بەو شێوەیە؟ کۆمەڵەکەش هەموو وتیان: بەڵێ، پاشان ڕووی کردە عەلی وعەبباس و وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا ئایا بەوجۆرە دام پێتان؟ هەردووکیان وتیان: بەڵێ، عومەر وتی: دەی جگەلە ئەمە بڕیارێکی ترتان لە من دەوێ؟ جا سوێند بەو خودایەی کە ئاسمان و زەوی بەفەرمانی ئەو ڕاوەستاوە هیچ بڕیارێکی تیا نادەم جگە لەمە، هەتا قیامەت بەرپا دەبێت و هەڵدەسێت، جا ئەگەر هەردووکتان نەتان توانی بەو شێوەی وتم جێبەجێی بکەن (و دەبێتە کێشەتان)، ئەوسا هەردووکتان بیگێڕنەوە بۆ لای خۆم بێگومان من لە جیاتی هەردووکتان ئەو کارە دەکەم.

## ٦- بابُ إثمِ مَنْ آوَى مُحْدِثًا

رَوَاهُ عَلِيٌّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[(١)].

٧٣٠٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: أَحَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ، مَا بَيْنَ كَذَا إِلَى كَذَا، لاَ يُقْطَعُ شَجَرُهَا، مَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ.

قَالَ عَاصِمٌ: فَأَخْبَرَنِي مُوسَى بْنُ أَنَسٍ أَنَّهُ قَالَ: أَوْ آوَى مُحْدِثًا[(٢)].

## ٦- باسی تاوانی ئەو کەسەی پەنای بیدعەچییەکی دابێت

**فەرموودەی ئەم باسە عەلی ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

**٧٣٠٦- عاصیم دەڵێ: بە ئەنەسم وت: ﷺ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ (شاری) مەدینەی یاساغ کرد[(٣)]؟ وتی: بەڵێ ((لە نێوان ئەوێ بۆ ئەوێ درەختێ نابڕدرێت، هەر کەسێك شتێکی تیا دابهێنێت ئەو نەفرینی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێ بێت))، عاصیم دەڵێ: جا موسای کوڕی ئەنەس بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((یان پەنای بیدعەچییەك بدات)).**

## ٧- بابُ مَا يُذْكَرُ مِنْ ذَمِّ الرَّأْيِ وَتَكَلُّفِ الْقِيَاسِ

وقوله تعالى: ﴿ وَلَا تَقْفُ ﴿٣٦﴾ ﴾: لا تَقل ﴿ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴿٣٦﴾ ﴾ الإسراء

٧٣٠٧- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ تَلِيدٍ، حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ شُرَيْحٍ وَغَيْرُهُ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ، عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: حَجَّ عَلَيْنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ

---

(١) بڕوانە: ١٨٧٠.

(٢) بڕوانە: ١٨٦٧.

(٣) کە جەنگی تێدا نەکرێت و درەختی نەبڕدرێت و گیای هەڵنەکێشرێت.

النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْزِعُ الْعِلْمَ بَعْدَ أَنْ أَعْطَاهُمُوهُ انْتِزَاعًا، وَلَكِنْ يَنْتَزِعُهُ مِنْهُمْ مَعَ قَبْضِ الْعُلَمَاءِ بِعِلْمِهِمْ، فَيَبْقَى نَاسٌ جُهَّالٌ يُسْتَفْتَوْنَ فَيُفْتُونَ بِرَأْيِهِمْ، فَيُضِلُّونَ وَيَضِلُّونَ». فَحَدَّثْتُ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ إِنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو حَجَّ بَعْدُ فَقَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي، انْطَلِقْ إِلَى عَبْدِ اللهِ فَاسْتَثْبِتْ لِي مِنْهُ الذِي حَدَّثْتَنِي عَنْهُ. فَجِئْتُهُ فَسَأَلْتُهُ، فَحَدَّثَنِي بِهِ كَنَحْوِ مَا حَدَّثَنِي، فَأَتَيْتُ عَائِشَةَ فَأَخْبَرْتُهَا، فَعَجِبَتْ فَقَالَتْ: وَاللهِ لَقَدْ حَفِظَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو[1].

## ٧- باسی ئەوەی دەوترێت لەسەرزەنشت کردنی ڕا و بۆچوون[2] و بەراوردکردنی بەزۆر و نابەجێ

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە شوێن شتێك مەکەوە کە دەربارەی زانیاریت نییە).**

**٧٣٠٧- ئەبو ئەسوەد لە عوروەوە دەگێڕێتەوە وتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ بەلاماندا تێپەڕی بۆ حەج دەڕۆشت، جا گوێم لێ بوو دەیوت: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو ((بێگومان دوای ئەوەی زانستی پێ بەخشین بەدەرهێنان دەری ناهێنێ لە سینەیان (و لێتان بسەنێتەوە)، بەڵکو زانستەکە لە ناویاندا ناهێڵێ لەگەڵ گیان کێشانی زانایاندا بەزانستەکەیانەوە، ئینجا کەسانێکی نەزان دەمێننەوە، داوای فەتوایان لێ دەکرێ ئەوانیش فەتوا دەدەن بەڕا و بۆچوونی خۆیان، ئەوسا خەڵکی گومڕا دەکەن و خۆشیان گومڕا دەبن))، (عوروە دەڵێ:) جا ئەم فەرموودەیەم بۆ عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، پاشان عەبدوڵڵای کوڕی عەمر دوای ئەوە حەجی کرد، عائیشەش ﵂ وتی: خوشکەزای**

---

(١) بڕوانە: ١٠٠.

(٢) کە هیچ بەڵگە و پشتیوانیەکی لە قورئان وسوونەتەوە نەبێت، دەربارەی فەتوادان.

خۆم[١] برۆ بۆ لای عەبدوڵلا ﷺ لەوەوە دڵنیام بکە لە ڕاستی ئەو فەرموودەی تۆ لەوەوە بۆت گێڕامەوە، (عوروە دەڵێ:) منیش ڕۆشتم و پرسیارم لێ کرد، عەبدوڵلاش بۆی گێڕامەوە وەك ئەوەی پێشتر بۆی گێڕامەوە، ئینجا هاتمەوە بۆ لای عائیشە ﵂ بۆم گێڕایەوە، عائیشەش ﵂ سەری سوڕما و وتی: سوێند بەخوا بەڕاستی عەبدوڵلای کوڕی عەمر چاکی لەبەر کردوە[٢].

٧٣٠٨- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا أَبُو حَمْزَةَ، سَمِعْتُ الأَعْمَشَ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا وَائِلٍ: هَلْ شَهِدْتَ صِفِّينَ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَسَمِعْتُ سَهْلَ بْنَ حُنَيْفٍ يَقُولُ ح.
وَحَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ سَهْلُ بْنُ حُنَيْفٍ يَا أَيُّهَا النَّاسُ، اتَّهِمُوا رَأْيَكُمْ عَلَى دِينِكُمْ، لَقَدْ رَأَيْتُنِي يَوْمَ أَبِي جَنْدَلٍ، وَلَوْ أَسْتَطِيعُ أَنْ أَرُدَّ أَمْرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَرَدَدْتُهُ، وَمَا وَضَعْنَا سُيُوفَنَا عَلَى عَوَاتِقِنَا إِلَى أَمْرٍ يُفْظِعُنَا إِلاَّ أَسْهَلْنَ بِنَا إِلَى أَمْرٍ نَعْرِفُهُ غَيْرَ هَذَا الأَمْرِ. قَالَ: وَقَالَ أَبُو وَائِلٍ: شَهِدْتُ صِفِّينَ، وَبِئْسَتْ صِفُّونَ[٣].

٧٣٠٨- ئەعمەش دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو وائیل کرد:ئایا ئامادەی جەنگی صیففین بوویت؟ وتی: بەڵێ: جا لە سەهلی کوڕی حونەیفم بیست دەیوت: (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) وە موسای کوڕی ئیسماعیل بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەبو عەوانە بۆی گێڕاینەوە لەئەعمەشەوە لە ئەبی وائیلەوە وتی: لە سەهلی کوڕی حونەیف وتی: ئەی خەڵکینە بەڕاستی سەبارەت بە ئایینەکەتان گومان لە ڕا و بۆچوونەکانتان بکەن، سوێند بەخوا بەراستی ئەو ڕۆژەی ئەبو جەندەل (هات لە

(١) مەبەست پێی عوروەیە کە خوشکەزای عائیشەیە ﵂.
(٢) مەبەستی لەبەرکردنی فەرموودەکەیە.
(٣) بڕوانە: ٣١٨١.

کاتی ڕێکەوتنی حودەیبیەدا)، خوم دی لەو کاتەدا ئەگەر بمتوانیایە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەدکەمەوە ڕەدم دەکردەوە[1]، وە شمشێرەکانم لە سەر شانمان بۆ کار و فەرمانێ کە ناڕەحەت و ناهەموار بوو بەلامانەوە دانەناوە، مەگەر کارەکەمان بۆ ئاسان بوو زانیومانە (چیە و چۆنە)، تەنها لەم کارەمان نەبێ (جەنگی نێوان مسوڵمانان)، ئەعمەش وتی: ئەبو وائیل وتی: ئامادەی جەنگی صیففین بووم، ئای صیفون چەند جەنگێکی خراپ بوو.

## ٨- بَابُ مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُسْأَلُ مِمَّا لَمْ يُنْزَلْ عَلَيْهِ الوَحْيُ فَيَقُولُ: «لَا أَدْرِي» أَوْ لَمْ يُجِبْ حَتَّى يُنْزَلَ عَلَيْهِ الوَحْيُ، وَلَمْ يَقُلْ بِرَأْيٍ وَلَا بِقِيَاسٍ لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ (١٠٥)﴾ النساء.

وَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الرُّوحِ، فَسَكَتَ حَتَّى نَزَلَتِ الآيَةُ[2].

## ٨- باسی ئەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ دەکرا لەوانەی نیگای بۆ دانەدەبەزی دەیفەرموو: ((نازانم)) یان وەڵامی نەدەدایەوە، هەتا نیگای بۆ دادەبەزی و نەبەڕاوبۆچوونی خۆی نەبەبەراورد کردن قسەی تیا نەدەکرد، بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: ((بڕیار بدەی بەو بڕیارەی کە خوا نیشانی داویت))

-ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری ڕۆحی لێ کرا، بێدەنگ بوو هەتا (ئایەتەکە) دابەزی.

---

(١) جەنگم دەکرد لە دژی قورەیش.

(٢) بڕوانە: ١٢٥.

٧٣٠٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ الْمُنْكَدِرِ يَقُولُ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: مَرِضْتُ فَجَاءَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي وَأَبُو بَكْرٍ وَهُمَا مَاشِيَانِ، فَأَتَانِي وَقَدْ أُغْمِيَ عَلَيَّ، فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ صَبَّ وَضُوءَهُ عَلَيَّ، فَأَفَقْتُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ - وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: فَقُلْتُ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ - كَيْفَ أَقْضِي فِي مَالِي؟ كَيْفَ أَصْنَعُ فِي مَالِي؟ قَالَ: فَمَا أَجَابَنِي بِشَيْءٍ حَتَّى نَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ[1].

**٧٣٠٩- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: نەخۆش کەوتم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر ﷺ هاتن بۆ لام سەردانیان کردم، هەردووکیان بە پیادە هاتن، جا کە هاتن من لەهۆش خۆم چوو بوومەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت و پاشان ئاوی دەست نوێژەکەی ڕشت بەسەرمدا، منیش هۆشم کردەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ - هەندێ جار سوفیان دەڵێ: منیش وتم: پێغەمبەری خوا- چۆن بڕیار بدەم لە سامانەکەمدا؟ چۆن بکەم دەربارەی ماڵ و سامانەکەم؟ وتی: پێغەمبەر ﷺ هیچ وەڵامی نەدامەوە هەتا ئایەتی میرات دابەزی.**

## ٩- بابُ تَعْلِيمِ النَّبِيِّ ﷺ أُمَّتَهُ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، مِمَّا عَلَّمَهُ اللَّهُ، لَيْسَ بِرَأْيٍ وَلَا تَمْثِيلٍ

٧٣١٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْأَصْبَهَانِيِّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ ذَكْوَانَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَهَبَ الرِّجَالُ بِحَدِيثِكَ، فَاجْعَلْ لَنَا مِنْ نَفْسِكَ يَوْمًا نَأْتِيكَ فِيهِ تُعَلِّمُنَا مِمَّا عَلَّمَكَ اللَّهُ. فَقَالَ: «اجْتَمِعْنَ فِي يَوْمِ كَذَا وَكَذَا فِي مَكَانِ كَذَا وَكَذَا». فَاجْتَمَعْنَ، فَأَتَاهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَعَلَّمَهُنَّ مِمَّا

---

(١) بڕوانە: ١٩٤.

عَلَّمَهُ اللَّهُ ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تُقَدِّمُ بَيْنَ يَدَيْهَا مِنْ وَلَدِهَا ثَلاَثَةً إِلاَّ كَانَ لَهَا حِجَابًا مِنَ النَّارِ». فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اثْنَيْنِ؟ قَالَ: فَأَعَادَتْهَا مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: «وَاثْنَيْنِ وَاثْنَيْنِ وَاثْنَيْنِ»(١).

## ٩- باسی فێرکردنی پێغەمبەرﷺبۆ ئوممەتەکەی لە پیاوان و ژنان لەوەی خوافێری کردبوو نەک ڕاو و بۆچوون و بەراوردکاری(٢)

**٧٣١٠- ئەبو سەعید دەڵێ: ئافرەتێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوان هەموو فەرموودەکانی تۆیان بردووە بۆخۆیان، کەواتە تۆش لە لایەن خۆتەوە ڕۆژێکمان بۆ دابنێ بێینە خزمەتت لەوەی خوا فێری کردوویت فێرمان بکە، ئەویش فەرمووی: لەو ڕۆژە و لەو ڕۆژەدا کۆببنەوە لەو شوێنە و لەو شوێنەدا، ئافرەتەکانیش کۆبوونەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕۆشت بۆ لایان لەو زانستەی خوا فێری کردبوو فێری کردن، لە پاشان فەرمووی: ((هیچ ژنێك نییە لە پێش خۆیەوە سێ منداڵی بنێرێت (بۆقیامەت)، ئیللا دەبنە بەربەست بۆی لە ئاگری دۆزەخ))، جا ژنێکیان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووانیش، وتی دوو جار قسەکەی وتەوە، لە پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بەڵێ) ((دووانیش دووانیش دووانیش)).**

(١) بروانە: ١٠١.
(٢) لە لایەن خۆیەوە بەڵکو ئەوەی فێر دەکردن کەخوای گەورە فێری کردوە.

## ١٠- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الحَقِّ يُقَاتِلُونَ» وَهُمْ أَهْلُ العِلْمِ.

٧٣١١- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ، عَنِ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ حَتَّى يَأْتِيَهُمْ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ ظَاهِرُونَ»[١].

## ١٠- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((بەردەوام کۆمەڵێ لە ئوممەتم زاڵ و سەرکەوتوون لە سەر هەق دەجەنگێن)) وە ئەوانەش زانایانن.

**٧٣١١-موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((بەردەوام کۆمەڵێ لە ئوممەتم زاڵ و سەرکەوتوون، هەتا فەرمانی خوا دێت (بەهاتنی قیامەت)، ئەوان هەر سەرکەوت و زاڵن (بەسەر دوژمنانیاندا ) )).**

٧٣١٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي حُمَيْدٌ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ يَخْطُبُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ وَيُعْطِي اللَّهُ، وَلَنْ يَزَالَ أَمْرُ هَذِهِ الأُمَّةِ مُسْتَقِيمًا حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، أَوْ: حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ»[٢].

**٧٣١٢- حومەید دەڵێ: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ وتاری دەدا وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەو کەسەی خوا مەبەستی خێری بۆی بوێ چاك لە ئایین شارەزای دەکات، وە دڵنیابن من تەنها دابەشکەرم (لە نێوانتاندا)، خواش (شارەزای) دەبەخشێ، وە بەردەوام کاروباری ئەم ئوممەتی ئیسلامە دامەزرا و بەردەوام دەبێت تا قیامەت بەرپا دەبێت، یان تا فەرمانی خوا دێت)).**

(١) بروانە: ٣٦٤٠.
(٢) بروانە: ٧١.

## ١١- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ أَوْ يَلْبِسَكُمْ ﴾ الأنعام

٧٣١٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ عَمْرٌو: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَمَّا نَزَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: ﴿ قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ (٦٥) ﴾ الأنعام، قَالَ: «أَعُوذُ بِوَجْهِكَ». ﴿ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ (٦٥) ﴾ الأنعام، قَالَ: «أَعُوذُ بِوَجْهِكَ». فَلَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ (٦٥) ﴾ الأنعام، قَالَ: «هَاتَانِ أَهْوَنُ" أَوْ "أَيْسَرُ»[١].

## ١١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (یان بتانکات بەچەند دەستە و تاقمێکەوە)

**٧٣١٣- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ (بڵێ: هەر ئەو خوایە بە توانا و دەسەڵاتدارە کە سزایەکتان بۆ بنێرێت لە سەرووتانەوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((پەنا دەگرم بە زاتی تۆ (ئەی خودا)) ). (یان لە ژێر پێتانەوە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پەنا دەگرم بە زاتی تۆ (ئەی خودا)) )، جا کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: (یان سەرتان لێ بشێوێنێ و بتان کات بەچەند دەستە و تاقمێکەوە و هەندێکتان بەهەندێکی ترتان سزا و ئازار بدات)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەم دووانەیان سووکترە)) یان ((ئاسانترە)).**

(١) بڕوانە: ٤٦٢٨.

## ١٢- بابُ مَنْ شَبَّهَ أَصْلاً مَعْلُومًا بِأَصْلٍ مُبَيَّنٍ قَدْ بَيَّنَ اللَّهُ حُكْمَهُمَا، لِيُفْهِمَ السَّائِلَ

٧٣١٤- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ، بْنُ الفَرَجِ حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَمًا أَسْوَدَ، وَإِنِّي أَنْكَرْتُهُ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «فَمَا أَلْوَانُهَا؟». قَالَ: حُمْرٌ. قَالَ: «هَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ؟». قَالَ: إِنَّ فِيهَا لَوُرْقًا. قَالَ: «فَأَنَّى تُرَى ذَلِكَ جَاءَهَا؟». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عِرْقٌ نَزَعَهَا. قَالَ: «وَلَعَلَّ هَذَا عِرْقٌ نَزَعَهُ». وَلَمْ يُرَخِّصْ لَهُ فِي الاِنْتِفَاءِ مِنْهُ[1].

## ١٢- باسی کەسێک شتێکی زانراو بچوێنێت لە شتێکی ڕوون کراوە کە خوا حوکمەکەی ڕوون کردۆتەوە بۆ ئەوەی پرسیارەکەر تێ بگات

**٧٣١٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: بێگومان ژنەکەم کوڕێکی ڕەشی بووە، وە من دانی پێدانانێم لە من بێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((ئایا وشترت هەیە؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((ڕەنگیان چۆنە؟)) وتی: سوورن، فەرمووی: ((ئایا ڕەنگ خۆڵەمێشیان تیایە؟)) وتی: بێگومان ڕەنگ خۆڵەمیشیان تێدایە، فەرمووی: ((دەی بە ڕای تۆ ئەو (ڕەنگە خۆڵەمێشییە) لە کوێوە بۆیان هاتووە؟)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوانەیە ڕەگێ لە ڕەگەزیان شێوەی وابێ، فەرمووی: ((دەی ئەو کوڕەی تۆش لەوانەیە ڕەگێ بێ لە باوانیەوە هاتبێ))، وە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی پێ نەدا خۆی بەری بکات لە منداڵەکە.**

---

(١) بڕوانە: ٥٣٠٥.

٧٣١٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ أُمِّي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ، فَمَاتَتْ قَبْلَ أَنْ تَحُجَّ، أَفَأَحُجَّ عَنْهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ حُجِّي عَنْهَا، أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ أَكُنْتِ قَاضِيَتَهُ؟». قَالَتْ: نَعَمْ. فَقَالَ: «فَاقْضُوا الذِي لَهُ، فَإِنَّ اللهَ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ»[1].

**٧٣١٥- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: دایکم نەزری کرد کە حەج بکات، بەڵام مرد پێش ئەوەی حەج بکات، ئایا من لە بری ئەو حەجەکەی بۆ بکەم؟ فەرمووی: ((بەڵێ، لە جیاتی ئەو حەجی بۆ بکە، پێم بڵێ ئەگەر دایکت قەرزێکی لەسەر بوایە تۆ بۆت ئەدایەوە؟)) ئافرەتەکە وتی: بەڵێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دەی ئەوەی قەرزی خوایە بیدەنەوە، چونکە بێگومان مافی خوا لە پێشترە بدرێتەوە)).**

## ١٣- بابُ مَا جَاءَ فِي اجْتِهَادِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى

**لِقَوْلِه:** ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٤٥﴾ **المائدة**

وَمَدَحَ النَّبِيُّ ﷺ صَاحِبَ الحِكْمَةِ حِينَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا، لاَ يَتَكَلَّفُ مِنْ قِبَلِهِ، وَمُشَاوَرَةِ الْخُلَفَاءِ وَسُؤَالِهِمْ أَهْلَ العِلْمِ.

## ١٣- باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کۆشش کردن (ی قازییەکان) بۆ گەشتن بەو حوکمە خوای بەرز و بڵند دایبەزاندووەتە خوارەوە، بەبەڵگەی ئەم

(١) بڕوانە: ١٨٥٢.

# فەرمایشتە خوای گەورە: (وە هەر کەسێک حوکم نەکات بەوەی کە خوا ناردویەتیە خوارەوە، ئەوا هەر ئەو کەسانە ستەمکاری تەواون)

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ ستایشی خاوەن دانایی و زانستی کردوە کاتێ حوکمی پێ دەکات و فێری خەڵکی دەکات و لە لایەن خۆیەوە زۆر لە خۆی ناکات[١]، وە ئەوەی دەربارەی ڕاوێژی جێنشینەکان و پرسیارکردنیان لە زانایان هاتووە.**

٧٣١٦- حَدَّثَنَا شِهَابُ بْنُ عَبَّادٍ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَسُلِّطَ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الحَقِّ، وَآخَرُ آتَاهُ اللَّهُ حِكْمَةً فَهْوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا»[٢].

**٧٣١٦- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئاوات و خۆزگە پێ خواستنی گەورە لە دوو شتدایە: بە پیاوێك خوا سەروەت و سامانی پێ بەخشیبێ و توانای پێ دابێ لە پێناوی هەق و ڕاستیدا تەفر و تونای بکات (بیبەخشێ)، وە بەپیاوێکی تر کە خوا دانایی و شارەزای پێدابێ، (کە لە نێوان خەڵکیدا) حوکمی پێ بکات و فێری خەڵکانی دیکەشی بکات)).**

٧٣١٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: سَأَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ عَنْ إِمْلاَصِ الْمَرْأَةِ -هِيَ الَّتِي يُضْرَبُ بَطْنُهَا فَتُلْقِي جَنِينًا- فَقَالَ: أَيُّكُمْ سَمِعَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ فِيهِ شَيْئًا؟ فَقُلْتُ: أَنَا. فَقَالَ: مَا هُوَ؟ قُلْتُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «فِيهِ غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ». فَقَالَ: لاَ تَبْرَحْ حَتَّى تَجِيئَنِي بِالْمَخْرَجِ فِيمَا قُلْتَ[٣].

---

(١) کە حوکمی شتێک نەزانێ هەر لە خۆیەوە بڕیارێک بدات بەبێ هیچ بەڵگە و پاڵپشتێک.
(٢) بڕوانە: ٧٣.
(٣) بڕوانە: ٦٩٠٥.

**٧٣١٧- موغیرەی كوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ دەربارەی بەر پێفڕێ دانی ژن پرسیاری كرد-كە بریتییە لەوەی ژن لە سكی بدرێ و منداڵەكەی (بەمردوویی) فڕێ بدات- عومەر وتی: كامتان لەو بارەیەوە شتێكی لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە؟ منیش وتم: من، ئەویش وتی: كامەیە؟ وتم: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((غوڕەیەكی تێدایە [1] كە كۆیلەیەك یان كەنیزەكێكە))، عومەریش ﷺ وتی: ئێرە بەجێ ناهێڵی هەتا (شایەتێكم) بۆ نەهێنی ڕزگارت بكات دەربارەی ئەو قسەی كردت.**

٧٣١٨ - فَخَرَجْتُ فَوَجَدْتُ مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ فَجِئْتُ بِهِ، فَشَهِدَ مَعِي أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «فِيهِ غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ». تَابَعَهُ ابْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنِ المُغِيرَةِ[2].

**٧٣١٨- (موغیرە دەڵێ:) منیش ڕۆشتم و موحەمەدی كوڕی مەسلەمەم دۆزییەوە و هێنام بۆ لای، ئەویش لەگەڵ مندا شایەتی دا كە ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((غوڕەیەكی تێدایە: كۆیلەیەك یان كەنیزەكێكە)).**

## ١٤- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَتَتْبَعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ»

٧٣١٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ المَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَأْخُذَ أُمَّتِي بِأَخْذِ الْقُرُونِ قَبْلَهَا، شِبْرًا بِشِبْرٍ وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ». فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَفَارِسَ وَالرُّومِ؟ فَقَالَ: «وَمَنِ النَّاسُ إِلاَّ أُولَئِكَ؟!».

---

(١) واتە:لەبەر پێفڕێدانەكەدا.

(٢) بڕوانە: ٦٩٠٦.

## ١٤- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (بێگومان شوێنی ڕێگە و ڕێبازی ئەوانەی لە پێش ئێوە بوون دەکەون)

**٧٣١٩-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((قیامەت بەرپانابێت، هەتا ئوممەتم چاو لە گەلانی پێش خۆی بکات بست بەبست و گەز بەگەز)) جا وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێی فارس و ڕۆمەکانت مەبەستە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خەڵك كێیە جگەلە ئەوان؟)).**

٧٣٢٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ، حَدَّثَنَا أَبُو عُمَرَ الصَّنْعَانِيُّ -مِنَ اليَمَنِ- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَتَتْبَعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ شِبْرًا شِبْرًا وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا جُحْرَ ضَبٍّ تَبِعْتُمُوهُمْ». قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: «فَمَنْ؟!»[١].

**٧٣٢٠-ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((سوێند بەخوا بەڕاستی ئێوە شوێن ڕێباز و بەرنامەی ئەوانە دەکەون، لە پێش ئێوەدا بوون بست بەبست و گەز بە گەز، هەتا ئەگەر ئەوانە بچنە کونی مارمێلکەیەکەوە[٢] ئێوەش شوێنیان دەکەون))، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە جوولەکە و گاوورەکانن؟ فەرمووی: ((ئەی کێن جگەلە ئەوان)).**

---

(١) بروانە: ٣٤٥٦.

(٢) وشەی (ضَبّ) لە زمانی عەرەبیدا بە مارمێلكە دەوترێت، هەروەها بە بزنمژەش دەوترێت، بەڵام لە فەرموودەکەدا مەبەستی شوێنکەوتنی گاور و جولەکە و بێ باوەڕانە لە هەموو شتێکدا، هەتا ئەگەر بڕۆنە کونی مارمێلکەیەکەوە بە شوێنیاندا دەڕۆن.

## ١٥- بابُ إِثْمِ مَنْ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ أَوْ سَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً

لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم ﴿٢٥﴾﴾ النحل، الآيَةَ.

٧٣٢١- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْسَ مِنْ نَفْسٍ تُقْتَلُ ظُلْمًا إِلاَّ كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْهَا -وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: مِنْ دَمِهَا- لأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ أَوَّلاً»[١].

## ١٥- باسی تاوانی ئەو کەسەی بانگەواز بکات بۆ گومڕایی، یان ڕێبازێکی خراپ دابنێت

**٧٣٢١- عەبدوللا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هیچ کەسێك بە ستەم ناکوژرێت مەگەر بەشێك لە خوێن و تاوانەکەی لە گەردنی کوڕی یەکەمی[٢] ئادەم دایە، چونکە بەڕاستی ئەو کوڕە یەکەم کەس بوو کوشتنی داهێنا)).**

## ١٦- باب مَا ذَكَرَ النَّبِيُّ ﷺ وَحَضَّ عَلَى اتِّفَاقِ أَهْلِ العِلْمِ وَمَا أَجْمَعَ عَلَيْهِ الْحَرَمَانِ مَكَّةُ وَالْمَدِينَةُ، وَمَا كَانَ بِهَا مِنْ مَشَاهِدِ النَّبِيِّ ﷺ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ وَمُصَلَّى النَّبِيِّ ﷺ وَالْمِنْبَرِ وَالْقَبْرِ.

٧٣٢٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ السَّلَمِيِّ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَأَصَابَ الأَعْرَابِيَّ وَعْكٌ بِالْمَدِينَةِ، فَجَاءَ الأَعْرَابِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَقِلْنِي بَيْعَتِي. فَأَبَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ جَاءَهُ

(١) بروانه: ٣٣٣٥.

(٢) قابیل کە هابیلی برای کوشت.

فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي. فَأَبَى، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي. فَأَبَى فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا المَدِينَةُ كَالْكِيرِ، تَنْفِي خَبَثَهَا، وَيَنْصَعُ طِيبُهَا»[١].

## ١٦- باسی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ باسی كردوە و هانی داوە لەسەر یەك دەنگی زانایان، وە ئەوەی كە (زانایانی) مەككە و مەدینە لەسەری كۆ دەنگن، وە ئەو دیمەن و شوێنەوارانەی پێغەمبەر ﷺ و كۆچەران و یاریدەدەرەكان كە تێیدایە[٢]، هەروەها شوێنی نوێژكردنی[٣] پێغەمبەر ﷺ دوانگە و گۆڕەكەی

**٧٣٢٢- جابیری كوڕی عەبدوڵڵای سەلەمیی رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە كە عەرەبیەكی دەشتەكی پەیمانی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا لەسەر ئیسلام، ئینجا عەرەبە دەشتەكیەكە لە مەدینە تووشی تا و لەرزێك بوو، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانەكەم هەڵوەشێنەوە، ئەویش ڕازی نەبوو، لە پاشان هاتەوە بۆ خزمەتی و وتی: پەیمانەكەم هەڵوەشێنەوە، ئەویش ڕازی نەبوو، ئیتر عەرەبە دەشتەكیەكە ڕۆشتە دەرەوە (لە مەدینە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((مەدینە وەك كورەی ئاسنگەر وایە، ناپوختەكانی دەر دەكات و چاكەكانیشی پوخت دەكاتەوە)).**

٧٣٢٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كُنْتُ أُقْرِئُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ

---

(١) بڕوانە: ١٨٨٣.

(٢) واتە:لە مەدینە، لە گێڕانەوەكەیدا دەڵێ:لە هەردووكیان:مەككە و مەدینە.

(٣) دەگونجێ مەبەست (و مصلى النبي ﷺ) نوێژگەری جەژنەكان بێت. بەڵام نەوەی سەرەوە ڕاسترە.

عَوْفٍ، فَلَمَّا كَانَ آخِرَ حَجَّةٍ حَجَّهَا عُمَرُ فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بِمِنًى لَوْ شَهِدْتَ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَتَاهُ رَجُلٌ قَالَ: إِنَّ فُلاَنًا يَقُولُ: لَوْ مَاتَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ لَبَايَعْنَا فُلاَنًا. فَقَالَ عُمَرُ: لأَقُومَنَّ الْعَشِيَّةَ فَأُحَذِّرَ هَؤُلاَءِ الرَّهْطَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ أَنْ يَغْصِبُوهُمْ. قُلْتُ: لاَ تَفْعَلْ، فَإِنَّ الْمَوْسِمَ يَجْمَعُ رَعَاعَ النَّاسِ يَغْلِبُونَ عَلَى مَجْلِسِكَ، فَأَخَافُ أَنْ لاَ يُنْزِلُوهَا عَلَى وَجْهِهَا فَيُطِيرُ بِهَا كُلُّ مُطِيرٍ، فَأَمْهِلْ حَتَّى تَقْدَمَ الْمَدِينَةَ دَارَ الْهِجْرَةِ وَدَارَ السُّنَّةِ، فَتَخْلُصَ بِأَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ فَيَحْفَظُوا مَقَالَتَكَ، وَيُنَزِّلُوهَا عَلَى وَجْهِهَا. فَقَالَ: وَاللَّهِ لأَقُومَنَّ بِهِ فِي أَوَّلِ مَقَامٍ أَقُومُهُ بِالْمَدِينَةِ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ بَعَثَ مُحَمَّدًا ﷺ بِالْحَقِّ وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، فَكَانَ فِيمَا أُنْزِلَ آيَةُ الرَّجْمِ[1].

**٧٣٢٣- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: من قورئانم فێری عەبدوڕەحمانی کوڕی عوف دەکرد ﷺ، جا کاتێ کۆتاهەمین حەجدا بوو کە عومەر ﷺ حەجی کرد، عەبدوڕەحمان لە مینا وتی: خۆزگە پێشەوای باوەڕدارانت بدیایە پیاوێك هاتبوو بۆ لای وتی: فلانە کەس دەڵێ: ئەگەر پێشەوای باوەڕداران بمرێت بەدڵنیاییەوە بەیعەت دەدەین بە فلانە کەس، عومەریش وتی: سوێند بە خوا عیشا لە ناو خەڵکەکەدا هەڵدەسمەوە و ئاگاداریان دەکەمەوە لەو کەسانەی کە دەیانەوێ کاروباری ئەوان بەزۆر داگیر بکەن[2]، (عەبدوڕەحمان دەڵێ: ) وتم: ئەی پێشەوای باوەڕداران ئەو کارە مەکە، چونکە بەڕاستی لە کاتی حەجدا نەفام و نەزانەکانی تیا کۆدەبنەوە زاڵ دەبن بەسەر کۆڕ و مەجلیسەکەتدا، بۆیە دەترسم وتارەکەت وەکو خۆی باس نەکەن و بەهەموو لایەکدا بڵاوی بکەنەوە، بۆیە پەلە مەکە هەتا دەچیتەوە بۆ مەدینە، کە وڵاتی کۆچ و سوننەتە، ئەوسا دەگەیت بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆچەران و یاریدەدەران وتارەکەت لەبەر**

(١) بڕوانە: ٢٤٦٢.

(٢) واتە:خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

**دەکەن وەك خۆشی دەیگەیەنن، عومەریش وتی: سوێند بەخوا هەر گەیشتمە جێ بەو کارە هەڵدەستم لە مەدینە.**

**ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: ئینجا گەڕاینەوە بۆمەدینە عومەر وتی: بێگومان خوا موحەممەدی بە ڕاست و حەق ناردووە و کتێبی (قورئانی) بۆ دابەزاندووە، جا لەو ئایەتانەی دابەزێنراوە ئایەتی بەردباران کردن (ی زیناکار)ـە.**

٧٣٢٤- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْب، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي هُرَيْرَةَ وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ مُمَشَّقَانِ مِنْ كَتَّانٍ، فَتَمَخَّطَ فَقَالَ: بَخْ بَخْ، أَبُو هُرَيْرَةَ يَتَمَخَّطُ فِي الكَتَّانِ، لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي لأَخِرُّ فِيمَا بَيْنَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى حُجْرَةِ عَائِشَةَ مَغْشِيًّا عَلَيَّ، فَيَجِيءُ الْجَائِي فَيَضَعُ رِجْلَهُ عَلَى عُنُقِي، وَيُرَى أَنِّي مَجْنُونٌ، وَمَا بِي مِنْ جُنُونٍ، مَا بِي إِلاَّ الجُوعُ.

**٧٣٢٤-موحەمەد (ی کوڕی سیرین) دەڵێ: ئێمە لای ئەبو هوڕەیرە ﷺ بووین دوو پۆشاکی کەتانی ڕەنگ کراو بەقوڕە سوورەی لەبەردابوو، مشی کرد و وتی: وتی بەهبەه ئەبو هوڕەیرە بەپۆشاکی کەتانەوە مش بکات، سوێند بەخوا خۆم دیوە کە لە نێوان دوانگەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ تا هۆدەکەی عائیشە ﷺ دەکەوتم و بێهۆش دەبووم، کەسێك دەهات پێی دەنا بەسەر مل و گەردنمدا، وادەزانرا من شێتم، شێت نەبووم تەنها برسیم بوو.**

٧٣٢٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَشَهِدْتَ العِيدَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ وَلَوْلاَ مَنْزِلَتِي مِنْهُ مَا شَهِدْتُهُ مِنَ الصِّغَرِ، فَأَتَى الْعَلَمَ الذِي عِنْدَ دَارِ كَثِيرِ بْنِ الصَّلْتِ فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ، وَلَمْ يَذْكُرْ أَذَانًا وَلاَ إِقَامَةً، ثُمَّ أَمَرَ بِالصَّدَقَةِ فَجَعَلَ النِّسَاءُ يُشِرْنَ إِلَى آذَانِهِنَّ وَحُلُوقِهِنَّ، فَأَمَرَ بِلاَلاً فَأَتَاهُنَّ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ[1].

---

(١) بڕوانە: ٩٨.

**٧٣٢٥- عەبدوڕەحمانی کوڕی عابیس دەڵێ: پرسیار کرا لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ ئامادەی نوێژی جەژن بوویت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ؟ وتی: بەڵێ: وە ئەگەر لەبەر نزیکیم لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەبووایە ئامادە نەدەبووم لەبەر بچووکی و منداڵی، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ ئەو نوێژگەی لای ماڵی کەسیری کوڕی صەلت بوو نوێژی کرد، پاشان وتاریدا، وە باسی بانگ و قامەتی نەکرد، پاشان فەرمانی پێ کردن بە ماڵ بەخشین، جا ئافرەتان دەستیان دەبرد بۆ (گوارەی) گوێیان (ملوانکەکەی) مل و گەردنیان، بۆیە فەرمانی بە بیلال کرد (بڕوات بۆ لایان)، بیلالیش ڕۆشت بۆ لایان (بەخشینەکانی لێ وەرگرتن)، پاشان گەڕایەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ.**

**٧٣٢٦-** حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَأْتِي قُبَاءً مَاشِيًا وَرَاكِبًا[1].

**٧٣٢٥-عەبدوڵڵای کوڕی دینار لە ئیبو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ بەپیادە و بە سواریش دەڕۆشت بۆ (مزگەوتی) قوبا.**

**٧٣٢٧-** حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ: ادْفِنِّي مَعَ صَوَاحِبِي وَلاَ تَدْفِنِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْبَيْتِ، فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ أُزَكَّى[2].

**٧٣٢٧- هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﷺ کە وتی بە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ: من لەگەڵ ئافرەتانی هاوڕێمدا[3] بنێژە، وە لەگەڵ**

---

(١) بڕوانە: ١١٩١.

(٢) بڕوانە: ١٣٩١.

(٣) لە کاتێکدا شیاوی ئەو کارە نین لە ئاستیدا نین.

**پێغەمبەردا لە هۆدەیەکدا ﷺ مەمنێژە، چونکە بەڕاستی حەزم لە وەسف و ستایش کردنم نییە.**

**٧٣٢٨** - وَعَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ أَرْسَلَ إِلَى عَائِشَةَ: ائْذَنِي لِي أَنْ أُدْفَنَ مَعَ صَاحِبَيَّ فَقَالَتْ: إِي وَاللَّهِ. قَالَ: وَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا أَرْسَلَ إِلَيْهَا مِنَ الصَّحَابَةِ قَالَتْ: لاَ وَاللَّهِ لاَ أُوثِرُهُمْ بِأَحَدٍ أَبَدًا.

**٧٣٢٨-هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە عومەر ﷺ ناردی بۆ لای عائیشە ﷺ ڕێگەم بدە کە لەگەڵ دوو هاوڕێکەمدا [١] بنێژرێم، عائیشەش وتی: بەڵێ وەڵڵا [٢]، (عوروە دەڵێ): ئەگەر پیاوێکی لە هاوەڵان پێشتر بناردایە بۆ لای (کە لەوێدا بنێژرێت)، عائیشە دەیوت: نەوەڵڵا کەسیان پێش ناخەم بەسەر خۆمدا.**

**٧٣٢٩**- حَدَّثَنَا أَيُّوبُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بِلاَلٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ فَيَأْتِي الْعَوَالِيَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ. وَزَادَ اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ وَبُعْدُ العَوَالِي أَرْبَعَةُ أَمْيَالٍ أَوْ ثَلاَثَةٌ[٣].

**٧٣٢٩-ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری دەکرد، ئینجا دەڕۆشت بۆ عەوالی هێشتا خۆر بەرز بوو.**

**-لەیس لە یونسەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و ئەم زیادەی لەگەڵ هێناوە: دووری عەوالی لە مەدینەوە چوار یان سێ میلە.**

---

(١) واتە پێغەمبەر و ﷺ ئەبو بەکر ﷺ.

(٢) وەک لە کوردیدا دەوترێت بەرێ وەڵلا.

(٣) بڕوانە: ٥٤٨.

٧٣٣٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ، حَدَّثَنَا الْقَاسِمُ بْنُ مَالِكٍ، عَنِ الجُعَيْدِ، سَمِعْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ يَقُولُ: كَانَ الصَّاعُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ مُدًّا وَثُلُثًا بِمُدِّكُمُ اليَوْمَ، وَقَدْ زِيدَ فِيهِ[1].

**٧٣٣٠-جوعەید دەڵێ: لە سائیبی کوڕی یەزیدم ﷺ بیست دەیوت: مەن لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ مشتێك و سێ یەكی مشتێك بوو بەمشتی ئەمڕۆتان، وە بێگومان مەن لێی زیاد كرا (لە سەردەمی عومەردا).**

٧٣٣١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مِكْيَالِهِمْ، وَبَارِكْ لَهُمْ فِي صَاعِهِمْ وَمُدِّهِمْ» يَعْنِي: أَهْلَ المَدِينَةِ[2].

**٧٣٣١-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ گێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوایە بەرەكەت بخەیتە پێوانەیانەوە، وە بەرەكەت بخەیتە مەن و مشتیانەوە))، مەبەستی خەڵكی مەدینەیە.**

٧٣٣٢- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ، حَدَّثَنَا أَبُو ضَمْرَةَ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ اليَهُودَ جَاءُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِرَجُلٍ وَامْرَأَةٍ زَنَيَا، فَأَمَرَ بِهِمَا فَرُجِمَا قَرِيبًا مِنْ حَيْثُ تُوضَعُ الْجَنَائِزُ عِنْدَ المَسْجِدِ[3].

**٧٣٣٢- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: كە جولەكەكان پیاو و ژنێكیان هێنا بۆلای پێغەمبەر ﷺ كە زینایان كردبوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی كرد (بە بەردباران كردنیان)، جا لە نزیكی ئەو شوێنەی مردووی تێدا دادەنرا (بۆ نوێژكردن) لە پاڵ مزگەوتدا بەرد باران كران.**

(١) بڕوانە: ١٨٥٩.

(٢) بڕوانە: ٢١٣٠.

(٣) بڕوانە: ١٣٢٩.

٧٣٣٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَمْرٍو -مَوْلَى الْمُطَّلِبِ- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَلَعَ لَهُ أُحُدٌ فَقَالَ: «هَذَا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ، اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ، وَإِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا». تَابَعَهُ سَهْلٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي أُحُدٍ[1].

**٧٣٣٣-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کێوی ئوحودی لێوە دەرکەوت و بینی و فەرمووی: ((ئەوە کێوێکە ئێمەی خۆش دەوێ ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ، خودایە ئیبراهیم ﷺ مەککەی ڕێزدار و یاساغ کردوە، بێگومان منیش لەم سەر بۆ ئەو سەری مەدینە ڕێزدار و یاساغ دەکەم)).**

**-سەهل ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەنەسی کوڕی مالیك دەکات لەم بەشەیدا: ((ئوحود کێوێکە ئێمەی خۆش دەوێ ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ)).**

٧٣٣٤- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ، حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ، أَنَّهُ كَانَ بَيْنَ جِدَارِ الْمَسْجِدِ مِمَّا يَلِي الْقِبْلَةَ وَبَيْنَ الْمِنْبَرِ مَمَرُّ الشَّاةِ[2].

**٧٣٣٤-ئەبو حازیم لە سەهلەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: نێوانی دیواری مزگەوت لە ڕووی قیبلەوە و نێوان دوانگەکە ئەوەندە دەبوو مەڕێکی پیا بڕوات.**

٧٣٣٥- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ خُبَيْبِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الجَنَّةِ، وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي»[3].

---

(١) بڕوانە: ٣٧١.

(٢) بڕوانە: ٤٩٦.

(٣) بڕوانە: ١١٩٦.

**٧٣٣٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوەی لە نێوان ماڵی من و دوانگەکەم دایە باغێکە لە باغەکانی بەهەشت، وە دوانگەکەم لەسەر حەوزەکەمە)).**

٧٣٣٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَابَقَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ الخَيْلِ، فَأُرْسِلَتِ الَّتِي ضُمِّرَتْ مِنْهَا وَأَمَدُهَا إِلَى الحَفْيَاءِ إِلَى ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ، وَالَّتِي لَمْ تُضَمَّرْ أَمَدُهَا ثَنِيَّةُ الوَدَاعِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ كَانَ فِيمَنْ سَابَقَ.

**٧٣٣٦- نافیع لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشبڕکێیەکی سازدا لە نێوان ئەسپەکاندا، ئینجا ئەو ئەسپانەیان لەڕ کرابوون[1] (بۆ پێشبڕکێ) بەرەڵاکران، ماوەکەیان لە حەیفائەوە بۆ (ثَنِيَّةُ الوَدَاعِ) بوو، وە ئەو ئەسپانەشیان لەڕ نەکرابوون (پێشبڕکێیان پێ کرا)، ماوەکەیان (ثَنِيَّةُ الوَدَاعِ )ـەوە تا مزگەوتی بەنی زورەیق بوو.**

**(نافیع دەڵێ): وە بێگومان عەبدوڵڵا لەو کەسانە بوو کە بەشداری ئەو پێشبڕکێیەی کرد.**

٧٣٣٦ /م- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ح[2].

**٧٣٣٦-قوتەیبە بۆی گێڕاینەوە لە لەیسەوە لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە[3].**

٧٣٣٧ - وَحَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا عِيسَى وَابْنُ إِدْرِيسَ وَابْنُ أَبِي غَنِيَّةَ، عَنْ أَبِي حَيَّانَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ عَلَى مِنْبَرِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

---

(١) ئەو جۆرە ئەسپانە دەبەسرێنەوە و ئاو و ئاڵفی زۆریان پێ دەدرێت تا قەڵەو دەبن، پاشان ئاو ئاڵفیان کەمدەکرێتەوە بۆ ماوەیەک غارغارێنیان پێ دەکرێ تا لاواز بن و گۆشتەکەیان بتەو ببێ و بەهێز بن بۆ پێشبڕکێ.

(٢) بڕوانە: ٤٢٠.

(٣) پاڵپشتە بۆ گێڕانەوەکەی جووەیرییە لە نافیعەوە.

**٧٣٣٧-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە عومەرم ﷺ بیست لەسەر دوانگەی پێغەمبەر ﷺ بوو.**

٧٣٣٨- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ، سَمِعَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ: خَطَبَنَا عَلَى مِنْبَرِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٧٣٣٨- زوهری دەڵێ: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ بۆی گێڕامەوە کە گوێی لە عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بوو وتاری داوە لەسەر دوانگەکەی پێغەمبەر ﷺ.**

٧٣٣٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ حَسَّانَ، أَنَّ هِشَامَ بْنَ عُرْوَةَ حَدَّثَهُ عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ يُوضَعُ لِي وَلِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ هَذَا الْمِرْكَنُ فَنَشْرَعُ فِيهِ جَمِيعًا(٢).

**٧٣٣٩-هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﷺ وتی: ئەم تەشتە(٣) دادەنرا بۆ من و پێغەمبەر ﷺ جا هەردووکمان بە مشت ئاومان لێ دەردەهێنا (بۆ خۆ شۆرین).**

٧٣٤٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبَّادُ، بْنُ عَبَّادٍ حَدَّثَنَا عَاصِمٌ الأَحْوَلُ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: حَالَفَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ الأَنْصَارِ وَقُرَيْشٍ فِي دَارِي التِي بِالْمَدِينَةِ(٤).

**٧٣٤٠- عاصیمی ئەحوەل لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ لە نێوان ئەنصاریەکان و قورەیشدا پەیمانی بەست لەو ماڵەی مندا کە لە مەدینە بوو.**

---

(١) بڕوانە: ٤٦١٩.
(٢) بڕوانە: ٢٥٠.
(٣) تەشتی جل شتن و شتی لەو جۆرە.
(٤) بڕوانە: ٢٢٩٤.

٧٣٤١ - وَقَنَتَ شَهْرًا يَدْعُو على أَحْيَاءٍ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ[١].

**٧٣٤١- وە پێغەمبەر ﷺ یەك مانگ قونوتی خوێند دووعای دەكرد لە چەند تیرەیەكی بەنی سولەیم.**

٧٣٤٢- حَدَّثَنِي أَبُو كُرَيْبٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا بُرَيْدٌ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَلَقِيَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ فَقَالَ لِي: انْطَلِقْ إِلَى الْمَنْزِلِ، فَأَسْقِيَكَ فِي قَدَحٍ شَرِبَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَتُصَلِّي فِي مَسْجِدٍ صَلَّى فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ. فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَسَقَانِي سَوِيقًا، وَأَطْعَمَنِي تَمْرًا، وَصَلَّيْتُ فِي مَسْجِدِهِ[٢].

**٧٣٤٢- ئەبو بوردە دەڵێ: ڕۆشتم بۆ مەدینە و عەبدوڵڵای كوڕی سەلامم پێ گەیشت ﷺ پێی وتم: بابڕۆین بۆ ماڵەوە ئاوت پێ بدەم لە جامێكدا كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی تیادا خواردۆتەوە، وە نوێژ بكەیت لەو جێگەدا كە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی تیا كردوە، منیش لەگەڵی دا ڕۆشتم، ئینجا شۆربای ساوەری پێدام خواردمەوە و خورمای دامێ خواردم و نوێژم كرد لە شوێن نوێژەكەی پێغەمبەردا ﷺ.**

٧٣٤٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، حَدَّثَنِي عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ عُمَرَ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: حَدَّثَنِي النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: «أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتٍ مِنْ رَبِّي - وَهْوَ بِالْعَقِيقِ - أَنْ صَلِّ فِي هَذَا الْوَادِي الْمُبَارَكِ، وَقُلْ: عُمْرَةٌ وَحَجَّةٌ». وَقَالَ هَارُونُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: حَدَّثَنَا عَلِيٌّ: "عُمْرَةٌ فِي حَجَّةٍ"[٣].

**٧٣٤٣- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە كە عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ بۆی باسكردم و فەرمووی: ((ئەم شەو لە لایەن پەروەردگارمەوە**

---

(١) بڕوانە: ١٠٠١.

(٢) بڕوانە: ٣٨١٤.

(٣) بڕوانە: ١٥٣٤.

**نێرراوێك هاتە لام- لە كاتێكدا پێغەمبەر ﷺ لە شیوی عەقیقەدا بوو- (فەرمووی[1]:) لەم شیوە پیرۆزەدا نوێژ بكە، وە بڵێ: ئیحرامی عومرە و حەجم پێكەوە دابەست)).**

**هاروونی كوڕی ئیسماعیل وتی: عەلی (كوڕی موبارەك) بۆی گێڕاینەوە (و لە گێڕانەوەكەیدا) ((عومرەیەكە لە ناو حەجێكدا[2])).**

٧٣٤٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ: وَقَّتَ النَّبِيُّ ﷺ قَرْنًا لأَهْلِ نَجْدٍ، وَالْجُحْفَةَ لأَهْلِ الشَّأْمِ، وَذَا الحُلَيْفَةِ لأَهْلِ المَدِينَةِ. قَالَ: سَمِعْتُ هَذَا مِنَ النَّبِيِّ ﷺ وَبَلَغَنِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «وَلأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمُ». وَذُكِرَ العِرَاقُ فَقَالَ: لَمْ يَكُنْ عِرَاقٌ يَوْمَئِذٍ[3].

**٧٣٤٤- عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەڕنی دیاریكرد بەجێگای ئیحرام بەستن بۆ خەڵكی نەجد، جوحفەشی دیاریكرد بۆ خەڵكی شام، زەلحولەیفەشی دیاری كرد بۆ خەڵكی مەدینە، (ئیبنو عومەر) وتی: خۆم ئەمەم لە پێغەمبەر ﷺ بیست، وە پێم گەشتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( یەلەملەم (جێگای ئیحرام بەستنە) بۆ خەڵكی یەمەن ))، وە باسی عێراقیش كراو جا (ئیبنو عومەر) وتی: لەو ڕۆژگارەدا خەڵكی عێراق مسوڵمان نەبوون.**

٧٣٤٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ المُبَارَكِ، حَدَّثَنَا الْفُضَيْلُ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ: حَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ أُرِيَ وَهُوَ فِي مُعَرَّسِهِ بِذِي الحُلَيْفَةِ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّكَ بِبَطْحَاءَ مُبَارَكَةٍ[4].

---

(١) جیبریل بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو.

(٢) واتە: عومرەكە هاوكات بێت لەگەڵ حەجەكەدا لە هەمان ساڵدا بێت.

(٣) بڕوانە: ١٣٣.

(٤) بڕوانە: ٤٨٣.

٧٣٤٥- موسای کوڕی عوقبه دەڵێ: سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای لە باوکیەوە بۆی گێڕامەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە: ((کە ئەو (پێغەمبەر ﷺ) لە کاتێکدا شەو مابوویەوە لە زولحولەیفە لە خەویدا پێی وترا: تۆ ئەوەتای لە ناو شیوێکی زیخەڵاناوی پیرۆزدا)).

## ١٧- بابُ قَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ آل عمران

٧٣٤٦- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَالَ: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ» فِي الأَخِيرَةِ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ العَنْ فُلاَنًا وَفُلاَنًا». فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ آل عمران[١].

## ١٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (ئەی موحەممەد ﷺ دەربارەی ئەو کارە[٢] هیچ شتێک بەدەست تۆ نییە)

٧٣٤٦- سالیم لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست لە نوێژی بەیانیدا کەسەری بەرزکردەوە لە کڕنوش دەیفەرموو: ((خودای پەروەردگارمان گشت سوپاس هەر بۆ تۆیە)) لە ڕکاتی کۆتاییدا، پاشان فەرمووی: ((خودایە نەفرین بکە لە فلان و فلان))، بە هۆیەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ((ئەی موحەممەد ﷺ) هیچ شتێك لەو کارەدا بە دەست تۆ نییە، ج خوا تەوبەیان لێ وەرگرێ یان سزایان بدات ،چونکە بە ڕاستی ئەوان ستەمکارن).

---

(١) بڕوانە: ٤٠٦٩.

(٢) هەڵهاتووەکانی جەنگی ئوحوود.

## ١٨- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ۝٥٤﴾ الكهف

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ ۞ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۝٤٦﴾ العنكبوت.

٧٣٤٧- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ح. حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ، أَخْبَرَنَا عَتَّابُ بْنُ بَشِيرٍ، عَنْ إِسْحَاقَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ أَنَّ حُسَيْنَ بْنَ عَلِيٍّ ﵄ أَخْبَرَهُ أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَرَقَهُ وَفَاطِمَةَ ﵂ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ لَهُمْ: «أَلَا تُصَلُّونَ؟». فَقَالَ عَلِيٌّ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللَّهِ، فَإِذَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَنَا بَعَثَنَا، فَانْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَالَ لَهُ ذَلِكَ، وَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيْهِ شَيْئًا، ثُمَّ سَمِعَهُ وَهُوَ مُدْبِرٌ يَضْرِبُ فَخِذَهُ وَهُوَ يَقُولُ: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ۝٥٤﴾ الكهف.

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ يُقَالُ: مَا أَتَاكَ لَيْلاً فَهْوَ طَارِقٌ. وَيُقَالُ: الطَّارِقُ النَّجْمُ، وَالثَّاقِبُ: الْمُضِيءُ، يُقَالُ: أَثْقِبْ نَارَكَ لِلْمُوقِدِ[1].

## ١٨- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند: (ئادەمی لە هەموو شتێ زیاتر دەمەقاڵێ و موجادەلە دەکات)

**وەئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دەمەقاڵێ و موجادەلە مەکەن لەگەڵ خاوەن کتێبە ئاسمانییەکاندا، مەگەر بەجوانترین شێوە).**

**٧٣٤٧- عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێ هات بۆلای ئەو و فاتیمە ﵂ی کچی پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی پێیان: ((ئەوە نوێژ ناکەن؟!)) عەلیش وتی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، بێگومان گیانمان بەدەستی خوایە، جا ئەگەر ویستی خەبەرمان کاتەوە خەبەرمان**

(١) بڕوانە: ١١٢٧.

دەكاتەوە، ئینجا كاتێ ئەوەی پێوت پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە و هیچ وەڵامێكی نەدایەوە، پاشان كە پشتی هەڵكرد و ڕۆشت گوێم لێ بوو دەیدا بە ڕانیدا و دەیفەرموو: ((بەڕاستی ئادەمیزاد لە هەموو شتێ زیاتر موجادەلە و دەمە دەمێ دەكات)).

ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: دەوترێت: ئەوەی بە شەودا هات بۆ لات ئەوە (طَارِقٌ)ـە، وە دەوترێت:

(الطَّارِقُ) ئەستێرەیە، وە (الثَّاقِبُ): ڕووناك كەرەوەیە، وە دەوترێت: بەو كەسەی ئاگر دەكاتەوە ئاگرەكەت بكەرەوە چونكە ڕووناك كەرەوەیە.

٧٣٤٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «انْطَلِقُوا إِلَى يَهُودَ». فَخَرَجْنَا مَعَهُ حَتَّى جِئْنَا بَيْتَ الْمِدْرَاسِ فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَنَادَاهُمْ فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ يَهُودَ، أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا». فَقَالُوا: بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ. قَالَ: فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ذَلِكَ أُرِيدُ، أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا». فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ. فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ذَلِكَ أُرِيدُ». ثُمَّ قَالَهَا الثَّالِثَةَ فَقَالَ: «اعْلَمُوا أَنَّمَا الأَرْضُ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ، وَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُجْلِيَكُمْ مِنْ هَذِهِ الأَرْضِ، فَمَنْ وَجَدَ مِنْكُمْ بِمَالِهِ شَيْئًا فَلْيَبِعْهُ، وَإِلاَّ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا الأَرْضُ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ»[1].

٧٣٤٨-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە كاتێكدا ئێمە لەمزگەوتدا بووین پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە (بۆ ناومان) و فەرمووی: ((دەرچن بڕۆن بۆ سەر جووەكان))، ئێمەش لەگەڵیدا دەرچووین هەتا ڕۆشتینە ئەوماڵەی تەوراتی تیا دەخوێنرا، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هەستا و بانگی كردن و فەرمووی: ((ئەی پێڕی جووەكان مسوڵمان بن بێوەی و سەلامەت دەبن ))، ئەوانیش وتیان: ئەبو لقاسیم

(١) بڕوانە: ٣١٦٧.

**پەیامەکەت گەیاند، دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێیان: ((منیش ئەوەم مەبەست بوو مسوڵمان بن بێوەی و سەلامەت دەبن))، ئینجا وتیان: ئەبو لقاسیم پەیامەکەت گەیاند، دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێیان: ((منیش ئەوەم مەبەست بوو)).**

**پاشان وتەکەی سێ بارە کردەوە و فەرمووی: ((چاك بزانن کە بێگومان ئەم زەویە موڵکی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، وە بەڕاستی من دەمەوێ لەم خاك و زەویە دەرتان بکەم، جا هەر کەسێکتان موڵك و ماڵێکی هەیە با بیفرۆشێت، ئەگەرنا چاك بزانن زەوی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی)).**

## ١٩- بابُ قَوْلِ الله تَعَالَى: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة وَمَا أمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِلُزُومِ الجَمَاعَةِ، وَهُمْ أهْلُ العِلْمِ

٧٣٤٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُجَاءُ بِنُوحٍ يَوْمَ القِيَامَةِ فَيُقَالُ لَهُ: هَلْ بَلَّغْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ يَا رَبِّ. فَتُسْأَلُ أُمَّتُهُ: هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: مَا جَاءَنَا مِنْ نَذِيرٍ. فَيَقُولُ: مَنْ شُهُودُكَ؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ وَأُمَّتُهُ. فَيُجَاءُ بِكُمْ فَتَشْهَدُونَ». ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة، قَالَ: عَدْلاً ﴿ لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة، الآية. وَعَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَوْنٍ حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

(١) بڕوانە: ٣٣٣٩.

## ١٩- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە هەروەها ئێوەمان کردوە بەگەلێکی میانڕەو (ی هەڵبژاردە))، وە باسی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە بەپابەندبوون و شوێن کەوتنی کۆمەڵی مسوڵمانانەوە، کە بریتین لەزانایان

٧٣٤٩- ئەبو سەعیدی خودری ﷛ وتی: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە ڕۆژی دواییدا نووح ﵇ دەهێنرێت و پێی دەوترێت: ئایا پەیامەکەت ڕاگەیاند (بە گەلەکەت؟) نووحیش دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، ئینجا پرسیار لە گەلەکەی دەکرێت: ئایا پێی ڕاگەیاندن؟ گەلەکەشی دەڵێن: هیچ ئاگادار کەرەوەیەکمان بۆ نەهاتووە، جا خوا دەفەرمووێ (بە نووح:) شایەتەکانت کێن (کە پەیامت پێ ڕاگەیاندوون؟) نوحیش دەڵێ: موحەممەد و ئوممەتەکەی (شایەتیم بۆ دەدەن)، ئینجا دەهێنرێن و شایەتی دەدەن، پاشان پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (هەروەها ئێوەمان کرد بە گەلێکی میانەڕەو) (وَسطاً): میانەڕەو، هەڵبژاردە، (تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکەوە پیغەمبەریش ﷺ شایەت بێت بەسەر ئێوەوە).

-جەعفەری کوڕی عەون دەڵێ: ئەعمەش بۆی گێڕاینەوە لە ئەبی سالیمەوە ئەویش لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەم ڕشتە فەرموودەکە دەگێڕێتەوە.

## ٢٠- بابٌ: إِذَا اجْتَهَدَ العَامِلُ أَوِ الحَاكِمُ فَأَخْطَأَ خِلاَفَ الرَّسُولِ مِنْ غَيْرِ عِلْمٍ، فَحُكْمُهُ مَرْدُودٌ لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا، فَهُوَ رَدٌّ»[1].

٧٣٥٠- ٧٣٥١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ أَخِيهِ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بِلاَلٍ، عَنْ عَبْدِ الْمَجِيدِ بْنِ سُهَيْلِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ يُحَدِّثُ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ وَأَبَا هُرَيْرَةَ حَدَّثَاهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ أَخَا بَنِي عَدِيٍّ الأَنْصَارِيَّ وَاسْتَعْمَلَهُ عَلَى خَيْبَرَ، فَقَدِمَ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا؟». قَالَ: لاَ، وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا لَنَشْتَرِى الصَّاعَ بِالصَّاعَيْنِ مِنَ الجَمْعِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَفْعَلُوا، وَلَكِنْ مِثْلاً بِمِثْلٍ، أَوْ بِيعُوا هَذَا وَاشْتَرُوا بِثَمَنِهِ مِنْ هَذَا وَكَذَلِكَ المِيزَانُ»[2].

## ٢٠- باسێک: ئەگەر کارمەند (ی زەکات کۆکەرەوە) یان دادوەر هەوڵیدا و خۆی ماندوو کرد (بۆ دۆزینەوەی حوکمی خوا) و هەڵەی کرد و پێچەوانەی پێغەمبەری ﷺ کرد بەنەزانی، ئەوە حوکمەکەی وەرناگیرێت، بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ: هەر کەس کارێک بکات کە فەرمان و بڕیاری ئێمەی لەسەر نەبێت، ئەوە دەدرێتەوە بەسەری خاوەنەکەیدا

٧٣٥٠- ٧٣٥١- سەعیدی کوڕی موسەییەب دەڵێ: ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هورەیرە ﷺ هەردووکیان بۆیان گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بەنی

---

(١) بڕوانە: ٢٦٩٧.

(٢) بڕوانە: ٢٢٠١، ٢٢٠٢.

عەدیی ئەنصاری[١] نارد و كردەیە سەركاری خەیبەر، ئەنجا پیاوەكە خورمای جەنیبی [٢] هێنایە خزمەتی، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ((ئایا هەموو خورمای خەیبەر ئا وەهایە؟)) وتی: نەخێر، وەڵڵاهی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بێگومان ئێمە مەنێ (لەم خورمایە) بە دوو مەن خورمای خراپ ئەكڕین، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((وا مەكەن بابە قەدەر یەك بن (لە گۆڕینەوەدا)، یان ئەمە (خورما خراپەكە) بفرۆشن بە پارەكەی لەم خورما چاكەی پێ بكڕە، هەروها كێشانەش (دەبێ وەك یەك بن)) ).

## ٢١- بابُ أَجْرِ الحَاكِمِ إِذَا اجْتَهَدَ فَأَصَابَ أَوْ أَخْطَأَ

٧٣٥٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنَا حَيْوَةُ، حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الهَادِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي قَيْسٍ مَوْلَى عَمْرِو بْنِ العَاصِ عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ».

٧٣٥٢م- قَالَ: فَحَدَّثْتُ بِهَذَا الحَدِيثِ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ فَقَالَ: هَكَذَا حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

وَقَالَ عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ المُطَّلِبِ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ.

## ٢١- باسی پاداشتی قازی ئەگەر هەوڵیدا پێكای یان هەڵەی كرد و نەیپێكا

٧٣٥٢-عەمری كوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((ئەگەر دادوەر بڕیاریدا و كۆششی تەواوی كرد پاشان ڕاستی پێكا[٣]، ئەوا دوو

---

(١) سودای كوڕی غوزییە (فتح الباري:٥/٥٠٤)
(٢) جۆرێكە لە خورما كە چاكترین جۆری خورمای خەیبەرە.
(٣) حوكم و بڕیاری خوای پێكاوە.

پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر بڕیاریدا و کۆششی کرد پاشان هەڵەی کرد و ڕاستی نەپێکا، ئەوا پاداشتێکی هەیە)).

٧٣٥٢م- (یەزیدی کوڕی عەبدوڵلا) وتی: ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ ئەبو بەکری کوڕی عەمری کوڕی حەزم، ئەویش وتی: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ ئاوەها بۆی گێڕامەوە.

-عەبدولعەزیزی کوڕی موتتەلیب لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبی بەکرەوە گێڕایەوە ئەویش لە ئەبی سەلەمەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ وێنەی فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوە.

## ٢٢- بابُ الْحُجَّةِ عَلَى مَنْ قَالَ: إِنَّ أَحْكَامَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ ظَاهِرَةً. وَمَا كَانَ يَغِيبُ بَعْضُهُمْ مِنْ مَشَاهِدِ النَّبِيِّ ﷺ وَأُمُورِ الإِسْلَامِ

٧٣٥٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، حَدَّثَنِي عَطَاءٌ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: اسْتَأْذَنَ أَبُو مُوسَى على عُمَرَ، فَكَأَنَّهُ وَجَدَهُ مَشْغُولاً فَرَجَعَ، فَقَالَ عُمَرُ: أَلَمْ أَسْمَعْ صَوْتَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ؟ ائْذَنُوا لَهُ. فَدُعِيَ لَهُ فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ؟ فَقَالَ: إِنَّا كُنَّا نُؤْمَرُ بِهَذَا. قَالَ: فَأْتِنِي على هَذَا بِبَيِّنَةٍ أَوْ لأَفْعَلَنَّ بِكَ. فَانْطَلَقَ إِلَى مَجْلِسٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالُوا: لاَ يَشْهَدُ إِلاَّ أَصَاغِرُنَا. فَقَامَ: أَبُو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ فَقَالَ قَدْ كُنَّا نُؤْمَرُ بِهَذَا. فَقَالَ عُمَرُ: خَفِيَ عَلَيَّ هَذَا مِنْ أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ! أَلْهَانِي الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٠٦٢.

## ٢٢- باسی بەڵگە لەسەر ئەو کەسەی دەڵێ:لە ڕاستیدا بڕیارەکانی پێغەمبەرﷺئاشکرا بوون (بۆ هاوەڵان). وە باسی ئەوەی هەندێکیان ئامادەی ڕووداوەکانی پێغەمبەر ﷺو کاروباری ئیسلام نەدەبوون

**٧٣٥٣-عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەیر دەڵێ: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی لە عومەر ﷺ خواست، (ئەبو موسا) وایزانی عومەر سەرقاڵە، بۆیە گەڕایەوە، عومەریش وتی: ئایا ئەوە دەنگی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس نەبوو گوێم لێی بوو؟ ڕێگەی بدەن بێتە ژوورەوە، جا بۆی بانگ کرا، عومەر وتی: چی وای لێکردی بگەڕێیتەوە؟ ئەبو موسا وتی: بەڕاستی ئێمە بەو جۆرە فەرمانمان پێکراوە[١] عومەر وتی: دەبێ لەسەر ئەمە شایەتم بۆ بێنی، یان سوێند بەخوا وات لێ دەکەم، ئەویش ڕۆشت بۆ ناو کۆڕی ئەنصارییەکان و وتیان: دەبێت منداڵترینمان شایەتی بدات بۆی، ئینجا ئەبو سەعیدی خودری هەستا و وتی: سوێند بە خوا ئێمە بەو جۆرە فەرمانمان پێدەکرا، عومەریش وتی: ئەوە لە فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە من شاراوە بوو، کڕین و فرۆشتن لە بازاڕەکاندا[٢] منی سەرقاڵ و بێ ئاگا کرد.**

٧٣٥٤- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ: حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ أَنَّهُ سَمِعَهُ مِنَ الأَعْرَجِ يَقُولُ: أَخْبَرَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ قَالَ: إِنَّكُمْ تَزْعُمُونَ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ يُكْثِرُ الْحَدِيثَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَاللَّهُ الْمَوْعِدُ، إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مِسْكِينًا أَلْزَمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى مِلْءِ بَطْنِي، وَكَانَ الْمُهَاجِرُونَ

(١) لە فەرموودەدا هاتووە مۆڵەت وەرگرن سێ جارە ئەگەر مۆڵەت درای، ئەگەر نا بگەڕێرەوە (متفق عليه).
(٢) (الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ) بۆیە وا دەڵێ چونکە جاران لە بازاڕەکاندا بەو شێوەیە بووە کە مامەڵەیەک تەواو بووە چەپڵەیان لێداوە، یان کڕیار و فرۆشیار دەستیان خستۆتە ناو دەستی یەکتری.

يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ، وَكَانَتِ الأَنْصَارُ يَشْغَلُهُمُ الْقِيَامُ عَلَى أَمْوَالِهِمْ، فَشَهِدْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ وَقَالَ: «مَنْ يَبْسُطْ رِدَاءَهُ حَتَّى أَقْضِيَ مَقَالَتِي ثُمَّ يَقْبِضْهُ، فَلَنْ يَنْسَى شَيْئًا سَمِعَهُ مِنِّي». فَبَسَطْتُ بُرْدَةً كَانَتْ عَلَيَّ، فَوَالَّذِي بَعَثَهُ بِالْحَقِّ مَا نَسِيتُ شَيْئًا سَمِعْتُهُ مِنْهُ[1].

**٧٣٥٤- ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: بێگومان ئێوە دەڵێن ئەبو هورەیرە فەرموودەی زۆر دەگێڕێتەوە بەناوی پێغەمبەری خواوە ﷺ، ژوانگەمان لای خوایە (لە قیامەتدا)، بێگومان من کەسێکی هەژار بووم، هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم بە نانە سکی، بەڵام کۆچەریەکان کڕین و فرۆشتن لە بازاڕدا سەرقاڵی دەکردن، ئەنصارییەکانیش کارکردنیان لە زەوی و باغەکانیاندا سەرقاڵی دەکردن، وە من ڕۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەی خوادا ﷺ ئامادە بووم فەرمووی: ((هەر کەسێك کراسەکەی ڕاخات تا لەم وتارەم دەبمەوە پاشان کۆی بکاتەوە و هەڵیگرێت، ئەوە هەرگیز هەر فەرموودەیەکی منی بیستبێت لە بیری ناچێتەوە))، منیش کراسێکم لەبەردا بوو ڕام خست، جاسوێند بەو خوایەی ئەوی بە هەق ناردووە، ئیتر هەر فەرموودەیەکم لێ بیستبێت لە بیر نەچۆتەوە.**

## ٢٣- بابُ مَنْ رَأَى تَرْكَ النَّكِيرِ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ حُجَّةً لاَ مِنْ غَيْرِ الرَّسُولِ

٧٣٥٥- حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ حُمَيْدٍ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُعَاذٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ المُنْكَدِرِ قَالَ: رَأَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَحْلِفُ بِاللَّهِ أَنَّ ابْنَ الصَّائِدِ الدَّجَّالُ، قُلْتُ: تَحْلِفُ بِاللَّهِ؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ عُمَرَ يَحْلِفُ عَلَى ذَلِكَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمْ يُنْكِرْهُ النَّبِيُّ ﷺ.

---

(١) بڕوانە: ١١٨.

## ٢٣- باسی ئەو کەسەی ڕای وایە نکۆڵی نەکردنی پێغەمبەر ﷺ (لە کارێ) بەڵگەیە (لەسەر ڕەوایەتی ئەو کارە)، بەڵام نکۆڵی جگەلە پێغەمبەر ﷺوا نییە

٧٣٥٥-موحەممەدی کوڕی مونکەدیر دەڵێ: جابیری کوڕی عەبدوڵڵام بینی رضي الله عنهما سوێندی دەخوارد بەخوا کە ئیبنو صائید [1] دەججالە، وتم: سوێند دەخۆی بەخوا؟ وتی: من خۆم لە عومەرم رضي الله عنه بیست لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ سوێندی لەسەری دەخوارد و پێغەمبەریش ﷺ نکۆڵی لێ نەدەکرد.

## ٢٤- بَابُ الأَحْكَامِ الَّتِي تُعْرَفُ بِالدَّلاَئِلِ، وَكَيْفَ مَعْنَى الدِّلاَلَةِ وَتَفْسِيرِهَا؟

وَقَدْ أَخْبَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَمْرَ الخَيْلِ وَغَيْرِهَا، ثُمَّ سُئِلَ عَنِ الحُمُرِ فَدَلَّهُمْ عَلَى قَوْلِهِ: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ ﴾ الزلزلة. وَسُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الضَّبِّ فَقَالَ: «لاَ آكُلُهُ وَلاَ أُحَرِّمُهُ». وَأُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ النَّبِيِّ ﷺ الضَّبُّ، فَاسْتَدَلَّ ابْنُ عَبَّاسٍ بِأَنَّهُ لَيْسَ بِحَرَامٍ.

## ٢٤- باسی ئەو ئەحکامانەی بەبەڵگەکان دەناسرێن، وە چۆن بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە و ڕوون دەکرێتەوە؟

-بێگومان پێغەمبەر ﷺ باسی ئەسپ و ماین و وڵاخی تریشی کردوە، لە پاشان پرسیاری گوێدرێژی لێ کرا، ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵندی نیشان دان و پێی وتن: (ئینجا هەر کەسێك بەئەندازەی هەرە وردیلەیەك چاکەی کردبێ

---

(١) لە هەندێ گێڕانەوەی بوخاریدا بە: (إبن الصيّاد) هاتووە.

**دەیبینێتەوە)[1]، وە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی بزن مژە، ئەویش فەرمووی: ((خۆم نایخۆم (خواردنیشی) ناکەم))، وە لەسەر سفرە و خوانی پێغەمبەر ﷺ بزن مژە خوراوە، ئیبنو عەبباس ﷺ بەبەڵگە هێناویەتیەوە کە (خواردنی) حەرام نییە.**

٧٣٥٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الخَيْلُ لِثَلاَثَةٍ: لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ، فَأَمَّا الذِي لَهُ أَجْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَأَطَالَ فِي مَرْجٍ - أَوْ رَوْضَةٍ- فَمَا أَصَابَتْ فِي طِيَلِهَا ذَلِكَ المَرْجِ وَالرَّوْضَةِ كَانَ لَهُ حَسَنَاتٍ، وَلَوْ أَنَّهَا قَطَعَتْ طِيَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ كَانَتْ آثَارُهَا وَأَرْوَاثُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ، وَلَوْ أَنَّهَا مَرَّتْ بِنَهَرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلَمْ يُرِدْ أَنْ يَسْقِيَ بِهِ كَانَ ذَلِكَ حَسَنَاتٍ لَهُ، وَهِيَ لِذَلِكَ الرَّجُلِ أَجْرٌ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا تَغَنِّيًا وَتَعَفُّفًا وَلَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّهِ فِي رِقَابِهَا وَلاَ ظُهُورِهَا، فَهْيَ لَهُ سِتْرٌ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا فَخْرًا وَرِيَاءً، فَهِيَ عَلَى ذَلِكَ وِزْرٌ». وَسُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الحُمُرِ، قَالَ: مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيَّ فِيهَا إِلاَّ هَذِهِ الآيَةَ الْفَاذَّةَ الْجَامِعَةَ ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾ الزلزلة[2].

**٧٣٥٦-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەسپ بۆ سێ کەسە، بۆ پیاوێك پاداشتە، بۆ پیاوێکیش داپۆشەر (ی کەموکوڕییەکان)ە، بۆ پیاوێکیش تاوان و گوناهە، جا ئەوەیان بۆی پاداشتە ئەوە پیاوێکە ئەسپەکە دابەسێت بۆ غەزا و خەبات لە ڕێی خوادا، ئەنجا پەتی**

(١) لە فەرموودەی دواتردا بە ژمارە: ٧٣٥٦ زیاتر ئەمەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.
(٢) بڕوانە: ٢٣٧١.

**بۆ درێژ دەكات لە لەوەڕگا - یان سەوزایی و مێرگێكدا - جا لەو پەت بۆ درێژ كردنەدا چەند بلەوەڕێ لەو لەوەڕگا و مێرگ و سەوزاییەدا، ئەوە هەمووی بۆی دەبێتە چاكە و پاداشت، خۆ ئەگەر پەتەكەی بۆی درێژ كراوە بیبچڕێنێت وسەرێك یا دوو سەر غار بكات، ئەوە شوێن سمەكانی و تەرس و میزەكەی دەبێتە چاكە بۆی، وە ئەگەر بەلای ڕووبارێكدا بڕوات و لێی بخواتەوە خاوەنەكەشی نەیویستبێت ئاوی بدات، ئەوە ئەو ئاو خواردنەوەش چاكەیە بۆی دەنوسرێت، كەواتە بۆ ئەو پیاوە پاداشتە، پیاوێكیش ئەسپەكە دابەستێت تا لە خەڵك بێ نیاز بێت و چاوی لە دەستی خەڵك نەبێت، پاشان مافی خوایشی لە بیر بێت تێیدا لە زەكات لێ دانیان و سوار بوونیان بۆ خەبات، جا بۆ ئەو كەسە داپۆشەری (كەم و كوڕییە)، پیاوێكیش دایبەستووە بەمەستی شانازی و ڕووپامایی (ناو مسوڵمانان)، ئەوە بۆ ئەو تاوان و گوناهە)).**

**وە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرا دەربارەی گوێدرێژ فەرمووی: ((دەربارەی گوێدرێژ خوا هیچی بۆ دانەبەزاندوم جگە لەم ئایەتە گشتگیرە كەم وێنەیە: (ئەنجا هەر كەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك چاكە بكات دەیبینێتەوە، وە هەر كەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك خراپە بكات دەیبینێتەوە).**

**٧٣٥٧**- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مَنْصُورِ بْنِ صَفِيَّةَ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ -هُوَ ابْنُ عُقْبَةَ- حَدَّثَنَا الفُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ النُّمَيْرِيُّ البَصْرِيُّ، حَدَّثَنَا مَنْصُورُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنُ شَيْبَةَ، حَدَّثَتْنِي أُمِّي، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الحَيْضِ كَيْفَ تَغْتَسِلُ مِنْهُ؟ قَالَ: «تَأْخُذِينَ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَوَضَّئِينَ بِهَا». قَالَتْ: كَيْفَ أَتَوَضَّأُ بِهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَوَضَّئِي». قَالَتْ:

كَيْفَ أَتَوَضَّأُ بِهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَوَضَّئِينَ بِهَا». قَالَتْ عَائِشَةُ: فَعَرَفْتُ الذِي يُرِيدُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَذَبْتُهَا إِلَيَّ فَعَلَّمْتُهَا[1].

**٧٣٥٧- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) یەحیا بۆی گێڕاینەوە وتی: ئیبنو عویەینە بۆی گێڕاینەوە لە مەنصوری کوڕی صەفییەوە لە دایکیەوە گێڕایەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ گێڕایەوە: کە ئافرەتێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد.**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ: ) موحەممەد- کە کوڕی عوقبەیە- بۆی گێڕاینەوە وتی: فەزڵی کوڕی سولەیمانی نومەیری بەصری بۆی گێڕاینەوە وتی: مەنصوری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی شەیبە بۆی گێڕاینەوە وتی: دایکم بۆ گێڕامەوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بی): کە ئافرەتێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی حەیز چۆن خۆی بشوات لە حەیز (پاکبوویەوە)؟ فەرمووی: ((پارچە لۆکەیەکی میسکاوی بێنە و خۆتی پێ پاك بکەرەوە))، ئافرەتەکە وتی: چۆن خۆمی پێ پاك بکەمەوە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خۆت پاك بکەرەوە)) ئافرەتەکە وتی: چۆن خۆمی پێ پاك بکەمەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:خۆتی پێ پاك بکەرەوە))، عائیشە ﵂ دەڵێ: من زانیم پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی چیە و ڕامکێشای لای خۆم و فێرم کرد.**

٧٣٥٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ أُمَّ حُفَيْدٍ بِنْتَ الحَارِثِ بْنِ حَزْنٍ أَهْدَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ سَمْنًا وَأَقِطًا وَأَضُبًّا، فَدَعَا بِهِنَّ النَّبِيُّ ﷺ فَأُكِلْنَ عَلَى مَائِدَتِهِ، فَتَرَكَهُنَّ النَّبِيُّ ﷺ كَالْمُتَقَذِّرِ لَهُ، وَلَوْ كُنَّ حَرَامًا مَا أُكِلْنَ عَلَى مَائِدَتِهِ، وَلاَ أَمَرَ بِأَكْلِهِنَّ[2].

---

(١) بڕوانە: ٣١٤.

(٢) بڕوانە: ٢٥٧٥.

**٧٣٥٨- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئوممو حوفەیدی کچی حاریسی کوڕی حەزن ڕۆن و کەشك و چەند بزن مژەیەکی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەوانە (ڕۆن و کەشك بزن مژەکان) دەعوەتی (خەڵکانێکی) کرد، جا بزن مژەکان لەسەر سفرەی پێغەمبەر ﷺ خوران، بەڵام پێغەمبەر ﷺ خۆی نەیخوارد وەك بێزی لێ بکاتەوە، خۆ ئەگەر ئەو بزن مژانە حەرام بوونایە لەسەر سفرەی پێغەمبەر ﷺ نەدەخوران و فەرمانی نەدەکرد بە خواردنیان [١].**

٧٣٥٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلاً فَلْيَعْتَزِلْنَا -أَوْ لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا-، وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ». وَإِنَّهُ أُتِيَ بِبَدْرٍ -قَالَ ابْنُ وَهْبٍ: يَعْنِي طَبَقًا- فِيهِ خَضِرَاتٌ مِنْ بُقُولٍ، فَوَجَدَ لَهَا رِيحًا فَسَأَلَ عَنْهَا - أُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنَ الْبُقُولِ، فَقَالَ: "قَرِّبُوهَا" فَقَرَّبُوهَا إِلَى بَعْضِ أَصْحَابِهِ كَانَ مَعَهُ، فَلَمَّا رَآهُ كَرِهَ أَكْلَهَا قَالَ: «كُلْ، فَإِنِّي أُنَاجِي مَنْ لاَ تُنَاجِي». وَقَالَ ابْنُ عُفَيْرٍ، عَنِ ابْنِ وَهْبٍ: بِقِدْرٍ فِيهِ خَضِرَاتٌ. وَلَمْ يَذْكُرِ اللَّيْثُ وَأَبُو صَفْوَانَ عَنْ يُونُسَ قِصَّةَ القِدْرِ، فَلاَ أَدْرِي هُوَ مِنْ قَوْلِ الزُّهْرِيِّ أَوْ فِي الحَدِيثِ[٢].

**٧٣٥٩-جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس سیر یان پیاز بخوات بادوور کەوێتەوە لێمان - یان با دوور بکەوێتەوە لە مزگەوتەکەمان - وە با لە ماڵی خۆی دانیشێت))، وە سینیەك هێنرا-ئیبنو وەهب وتی: (بَدْرٍ) واتە: سینییەك- کە سەوزەواتی تیا بوو ئەوانەی ناوکیان هەیە، جا پێغەمبەر ﷺ هەستی کرد بۆنیان ناخۆشە، پێی وترا چ سەوزەواتێك**

---

(١) لە ڕیوایەتێکی تری ئەم فەرموودەدا کە بە ژمارە: ٢٥٧٥ لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە دەڵێ: (فَأُكِلَ) واتە: بزن مژەکان، بۆیە ئاوا مانامان کردوە.
(٢) بڕوانە: ٨٥٤.

**لەو سینییە دایە، فەرمووی: ((نزیکی کەنەوە))، ئەوانیش نزیکیان کردەوە لە یەکێك لە هاوەڵانی کە لە خزمەتیدا بوو (بیخوات)، جا کە پێغەمبەر ﷺ بینی حەزی لە خواردنی نەبوو، وە فەرمووی: (بەو هاوەڵەی دەیخوارد): ((بیخۆ، چونکە بێگومان من لە گەڵ کەسێکدا چپە دەکەم تۆ چپەی لەگەڵدا ناکەیت[1])). ئیبنو عوفەیر لە ئیبنو وەهبەوە گێڕاویەتیەوە: مەنجەڵێك[2] سەوزەواتی تیا بوو.**

**-هیچ کام لە لەیس و صەفوان لە یونسەوە: باسی مەنجەڵیان نەکردوە (لە گێڕاوەیاندا بۆ ئەم فەرموودە)، بۆیە نازانم ئەو باسە مەنجەڵ یان سینیە وتەی زوهریە یان لە فەرموودەکەدا هەیە.**

٧٣٦٠- حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا أَبِي وَعَمِّي قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبِي عَنْ أَبِيهِ، أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ جُبَيْرٍ، أَنَّ أَبَاهُ جُبَيْرَ بْنَ مُطْعِمٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَكَلَّمَتْهُ فِي شَيْءٍ، فَأَمَرَهَا بِأَمْرٍ، فَقَالَتْ: أَرَأَيْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ لَمْ أَجِدْكَ؟ قَالَ: «إِنْ لَمْ تَجِدِينِي فَأْتِي أَبَا بَكْرٍ». زَادَ الْحُمَيْدِيُّ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ: كَأَنَّهَا تَعْنِي المَوْتَ[3].

**٧٣٦٠- موحەممەدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە کە باوکی کە جوبەیری کوڕی موتعیمە ﷺ بۆی گێڕایەوە کە ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، دەربارەی شتێك قسەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەرمانێکی پێکرد، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێم بڵێ ئەگەر هاتم تۆم دەست نەکەوت و نەبوویت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر منت نەدیت و نەبووم ئەوە وەرە بۆ لای ئەبو بەکر)).**

---

(١) مەبەست پێی جیبریلە علیه السلام کە نیگای بۆ دێنێت. (فتح الباري:١٦/٤١٠).
(٢) لە جیاتی (بدر) (طَبَق)ـی هێناوە و گێڕاوەتەوە، کە بەمانای سینی یان لەگەن دێت.
(٣) بڕوانە: ٣٦٥٩.

-حومەیدی لە ئیبراهیمی کوڕی سەعدەوە گێڕایەوە: ئەمەی زیاد کردوە (لە گێڕانەوەکەی خۆیدا) دەڵێ: مەبەستی ئافرەتەکە مردنە[1].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## ٢٥- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لاَ تَسْأَلُوا أَهْلَ الكِتَابِ عَنْ شَيْءٍ»

٧٣٦١ - وَقَالَ أَبُو اليَمَانِ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، سَمِعَ مُعَاوِيَةَ يُحَدِّثُ رَهْطًا مِنْ قُرَيْشٍ بِالْمَدِينَةِ، وَذَكَرَ كَعْبَ الأَحْبَارِ فَقَالَ: إِنْ كَانَ مِنْ أَصْدَقِ هَؤُلاَءِ المُحَدِّثِينَ الَّذِينَ يُحَدِّثُونَ عَنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، وَإِنْ كُنَّا مَعَ ذَلِكَ لَنَبْلُو عَلَيْهِ الْكَذِبَ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٥- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((پرسیاری هیچ شتێک لە خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان مەکەن))

٧٣٦١- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئەبو لیەمان وتی: شوعەیب بۆی گێڕاینەوە، لە زوهریەوە وتی: حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان بۆی گێڕامەوە کە لە موعاوییەی بیست لە مەدینە قسەی بۆ کۆمەڵێ لە قوڕەیشیەکان دەکرد، باسی کەعبی ئەحباری کرد و وتی: بێگومان ئەو لە ڕاسگۆترینی ئا ئەوانەیە کە بەسەرهات و داستان لە خاوەنی کتێبە ئاسمانییەکانەوە دەگێڕنەوە، لەگەڵ ئەوەش دا ئێمە هەندێ جار تاقی دەکەینەوە هەڵە دەکات.

---

(١) واتە: مردنی پێغەمبەر ﷺ کە وتی ئەگەر هاتمەوە و تۆ لەوێ نەبووی.

**٧٣٦٢**- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَقْرَءُونَ التَّوْرَاةَ بِالْعِبْرَانِيَّةِ وَيُفَسِّرُونَهَا بِالْعَرَبِيَّةِ لأَهْلِ الإِسْلاَمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ، وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ وَقُولُوا: ﴿ءَامَنَّا بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ ﴿٤٦﴾﴾» الآيَةَ. العنكبوت[١].

**٧٣٦٢- ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێشتر نامەدارەکان (جووەکان) تەوراتیان بەعیبری[٢] دەخوێندەوە و بەعەرەبی ڕاڤەیان دەکرد بۆ مسوڵمانان، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((باوەڕ بەنامەدارەکان مەکەن و بەدرۆشیان مەخەنەوە[٣] (بەڵکو) بڵێن: ((ئەی مسوڵمانینە) بڕوامان هێناوە بەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆ ئێمە و (بەوەش) نێردراوەتە خوارەوە بۆ ئێوە))، تا کۆتایی ئایەتەکە.**

**٧٣٦٣**- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، أَخْبَرَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَيْفَ تَسْأَلُونَ أَهْلَ الْكِتَابِ عَنْ شَيْءٍ وَكِتَابُكُمُ الذِي أُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَحْدَثُ، تَقْرَءُونَهُ مَحْضًا لَمْ يُشَبْ، وَقَدْ حَدَّثَكُمْ أَنَّ أَهْلَ الكِتَابِ بَدَّلُوا كِتَابَ اللَّهِ وَغَيَّرُوهُ، وَكَتَبُوا بِأَيْدِيهِمُ الكِتَابَ وَقَالُوا: ﴿هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴿٧٩﴾﴾ البقرة. أَلاَ يَنْهَاكُمْ مَا جَاءَكُمْ مِنَ الْعِلْمِ عَنْ مَسْأَلَتِهِمْ؟ لاَ وَاللَّهِ مَا رَأَيْنَا مِنْهُمْ رَجُلاً يَسْأَلُكُمْ عَنِ الذِي أُنْزِلَ عَلَيْكُمْ[٤].

---

(١) بروانە: ٤٤٨٥.
(٢) کە زمانی جووەکانە.
(٣) بە ناڕاستیان مەزانن یا بە درۆزنیان دامەنێن.
(٤) بڕوانە: ٢٦٨٥.

٧٣٦٣- عوبەیدوڵڵا لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: (مسوڵمانان) ئێوە چۆن پرسیاری شتێك لە خاوەن کتێبەکان دەکەن، لە کاتێکدا ئەو کتێبەی دابەزێنراوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێترین (کتێبی خودایە)، ئێوە دەیخوێننەوە بە پوختی هیچی تێکەڵ نەکراوە، وە بێگومان خوای گەورە باسی کردوە بۆتان کە نامەدارەکان کتێبەکەی خوایان گۆڕیوە و دەستکاریان کردوە، وە بەدەستی خۆیان کتێبەکەیان نووسیوە و وتوویانە: (ئەمە لە لایەن خواوە هاتووە بۆ ئەوەی بەنرخێکی کەم بیفرۆشن)، دەی ئایا ئەو زانست و زانیارییەی کە بۆتان هاتووە ڕێگریتان لێ ناکات لە پرسیارکردنتان لێیان، ناوەڵڵاهی یەك پیاومان لێ نەدیوون هەرگیز پرسیار لە ئێوە بکات دەربارەی ئەو کتێبەی بۆ ئێوە دابەزێنراوە.

## ٢٦- باب كَرَاهِيَةِ الخِلَافِ

٧٣٦٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سَلَّامِ بْنِ أَبِي مُطِيعٍ، عَنْ أَبِي عِمْرَانَ الجَوْنِيِّ، عَنْ جُنْدَبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ قُلُوبُكُمْ، فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ»[1].

## ٢٦- باسی ناپەسەند خراپی ڕاجیایی[2]

٧٣٦٤- جوندەبی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قورئان بخوێنن ئەوەندەی دڵتان (لەسەری) ڕێك و کۆك بێت، بەڵام ئەگەر ناکۆك بوون ئەوە هەستن (و دەستی) لێ هەڵگرن)).

(١) بڕوانە: ٥٠٦٠.

(٢) لە حوکمە شەرعیەکاندا، یان ماناکەی گشتی ترە.

٧٣٦٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا أَبُو عِمْرَانَ الجَوْنِيُّ، عَنْ جُنْدَبِ، بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ عَلَيْهِ قُلُوبُكُمْ، فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ». وَقَالَ يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ هَارُونَ الأَعْوَرِ، حَدَّثَنَا أَبُو عِمْرَانَ، عَنْ جُنْدَبٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ(١).

**٧٣٦٥- ئەبو عیمرانی جونیی لە جودەبی کوڕی عەبدوڵڵاوە گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((قورئان بخوێنن ئەوەندەی دڵتان (لەسەری) ڕێك و كۆك بێت، بەڵام ئەگەر ناكۆك بوون ئەوە هەستن (و دەستی) لێ هەڵگرن)). ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ:یەزیدی کوڕی هاروون لە هاروونی ئەعوەرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەبو عیمران بۆی گێڕاینەوە لە جوندەبەوە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (٢).**

٧٣٦٦- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا حُضِرَ النَّبِيُّ ﷺقَالَ: وَفِي البَيْتِ رِجَالٌ فِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ- قَالَ: «هَلُمَّ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ». قَالَ عُمَرُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ غَلَبَهُ الوَجَعُ وَعِنْدَكُمُ الْقُرْآنُ، فَحَسْبُنَا كِتَابُ اللَّهِ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ البَيْتِ وَاخْتَصَمُوا، فَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ: قَرِّبُوا يَكْتُبْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كِتَابًا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ. وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ مَا قَالَ عُمَرُ، فَلَمَّا أَكْثَرُوا اللَّغَطَ وَالاخْتِلاَفَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قُومُوا عَنِّي». قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقُولُ: إِنَّ الرَّزِيَّةَ كُلَّ الرَّزِيَّةِ مَا حَالَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبَيْنَ أَنْ يَكْتُبَ لَهُمْ ذَلِكَ الكِتَابَ مِنِ اخْتِلاَفِهِمْ وَلَغَطِهِمْ(٣).

---

(١) بڕوانە: ٥٠٦٠.

(٢) ئەم ڕشتەیە ڕشتەیەکی موعەلقە واتە پەیوەست نییە، تەنها بۆ ئەوەی هێناوە کە ئەم ڕشتەیەش هەیە.

(٣) بڕوانە: ١١٤.

**٧٣٦٦- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: لەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ لە سەرەمەرگدا بوو، دەڵێ: چەند پیاوێك لە ماڵدابوون عومەری کوڕی خەتتابیشیان تێدابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وەرن بانامەیەکتان بۆ بنووسم لە دوای ئەو نامەیە گومڕا و سەرگەردان نەبن))، عومەر وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ئازار زۆری بۆ هێناوە و ئێوەش قورئانتان هەیە (و لەبەر دەستتان دایە) قورئانەکەی خوامان بەسە، وە ئەو کەسانەی لە ماڵدابوون ناکۆك و جیاواز بوون و مشتومڕیان بوو، هەیان بوو دەیوت: نزیك بنەوە (لێی) تا پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکتان بۆ بنوسێت لە پاش ئەو گومڕا و لاڕێ نەبن، هەشیان بوو ئەو قسەی دەکرد کە عومەری کردبووی، ئەنجا کە دەنگە دەنگ و ناکۆکی زۆریان کرد لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ فەرمووی: ((هەستن لە لام))، عوبەیدوڵلا دەڵێ: ئەنجا ئیبنو عەبباس ﷺ دەیوت: کارەساتی هەرە گەورە ئەوەبوو کە بوویە ڕێگر لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەی ئەو نامەیەیان بۆ بنووسێت بەهۆی ناکۆکی و دەنگە دەنگیانەوە.**

## ٢٧- بابٌ: نَهْيِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى التَّحْرِيمِ إِلاَّ مَا تُعْرَفُ إِبَاحَتُهُ وَكَذَلِكَ أَمْرُهُ نَحْوَ قَوْلِهِ حِينَ أَحَلُّوا: «أَصِيبُوا مِنَ النِّسَاءِ».

قَالَ جَابِرٌ: وَلَمْ يَعْزِمْ عَلَيْهِمْ، وَلَكِنْ أَحَلَّهُنَّ لَهُمْ[1]. وَقَالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ: نُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الجَنَازَةِ، وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا.

(١) بڕوانە: ٧٣٦٧.

## ٢٧- باسێک: ڕێگری کردنی پێغەمبەر ﷺ[1] بۆ حەرامەیەتیە جگە لەوە بزانرێت حەڵاڵە، هەروەها فەرمانیشی[2] وەکو ئەم فەرمایشتەی کاتێ ئیحرامیان شکاند: ((سەرجێی بکەن لەگەڵ ژنەکانتان)) (نابێ سەرپێچی بکرێت)

-جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەپێداگری پێی نەوتن، بەڵکو بۆی حەڵاڵ کردن.
-ئوممو عەتییە ﷺ وتی: ڕێگریمان لێ کرا لە شوێن کەوتنی تەرم بەڵام بە جەخت کردن نەبوو لەسەرمان.

٧٣٦٧- حَدَّثَنَا المَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ عَطَاءٌ: قَالَ جَابِرٌ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ فِي أُنَاسٍ مَعَهُ قَالَ: أَهْلَلْنَا أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الحَجِّ خَالِصًا لَيْسَ مَعَهُ عُمْرَةٌ -قَالَ عَطَاءٌ: قَالَ جَابِرٌ:- فَقَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ صُبْحَ رَابِعَةٍ مَضَتْ مِنْ ذِي الحِجَّةِ، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ نَحِلَّ وَقَالَ: «أَحِلُّوا وَأَصِيبُوا مِنَ النِّسَاءِ». قَالَ عَطَاءٌ: قَالَ جَابِرٌ: وَلَمْ يَعْزِمْ عَلَيْهِمْ وَلَكِنْ أَحَلَّهُنَّ لَهُمْ، فَبَلَغَهُ أَنَّا نَقُولُ: لَمَّا لَمْ يَكُنْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ إِلاَّ خَمْسٌ أَمَرَنَا أَنْ نَحِلَّ إِلَى نِسَائِنَا، فَنَأْتِي عَرَفَةَ تَقْطُرُ مَذَاكِيرُنَا المَذْيَ قَالَ: وَيَقُولُ جَابِرٌ بِيَدِهِ هَكَذَا، وَحَرَّكَهَا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «قَدْ عَلِمْتُمْ أَنِّي أَتْقَاكُمْ لِلَّهِ وَأَصْدَقُكُمْ وَأَبَرُّكُمْ، وَلَوْلاَ هَدْيِي لَحَلَلْتُ كَمَا تَحِلُّونَ فَحِلُّوا، فَلَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ». فَحَلَلْنَا وَسَمِعْنَا وَأَطَعْنَا[3].

(١) لە ،هەر شتێک گوفتار یا کردار بێت.
(٢) بۆ حەرامیەتیە.
(٣) بڕوانە: ١٥٥٧.

**٧٣٦٧- عەتا دەڵێ:لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵام ﷺ بیست چەند کەسێکی لەگەڵدا بوو وتی: ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامان تەنها بەحەج بەست، عومرەی لەگەڵ نەبوو.**

**عەتا دەڵێ: جابیر وتی: جا پێغەمبەر ﷺ ئەو بەیانیەی کە چوار ڕۆژ لە مانگی زی لحیجە تێپەڕی بوو گەشتە مەککە، جا کاتێ گەشتین پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین کە ئیحرامەکەمان بشکێنین و فەرمووی: ((ئیحرام بشکێنن و لەگەڵ هاوسەرەکەتان دروست ببن)).**

**عەتا دەڵێ: جابیر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ جەختی نەکردەوە لەسەریان [1]، بەڵکو حەڵاڵی کرد بۆیان، ئینجا بە پێغەمبەر ﷺ گەشتەوە کە ئێمە قسە دەکەین: چونکە لە نێوان ئێمە و چوون بۆ عەرەفە پێنج ڕۆژ مابوو، فەرمانی پێکردین کە حەڵاڵ بین و سەرجێی بکەین لەگەڵ خێزانەکانمان، ئەنجا بڕۆین بۆ عەرەفە زەکەرمان ئاوی ئارەزووی لێ دەتکێ-عەتا دەڵێ: جابیر بەدەستی ئاوەهای کرد و[2] جوڵاندی، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و فەرمووی: (بێگومان چاك دەزانن من لە هەمووتان زیاتر لە خوا دەترسم وە ڕاستگۆترین و چاکەکار ترینتانم، وە ئەگەر ئاژەڵی هەدیم پێ نەبوایە منیش ئیحرامم دەشکاند، وەك ئێوە کەشکاندوتانە، ئینجا ئەوەی لە کاری من ڕابوورد ئێستا بوایە هەدیم نەدەهێنا))، ئەوسا ئێمەش ئیحراممان شکاند و گوێڕایەڵ و فەرمان بەردار بووین.**

---

(١) مەبەست سەرجێی کردن لەگەڵ ژنەکانیان.

(٢) بەدەستی ڕوونی کردەوە کە زەکەری چۆن ئاوی لێ دەتکێ.

٧٣٦٨- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنِ الحُسَيْنِ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ المُزَنِيُّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلُّوا قَبْلَ صَلاَةِ المَغْرِبِ". -قَالَ فِي الثَّالِثَةِ- "لِمَنْ شَاءَ". كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً[1].

**٧٣٦٨-عەبدوڵڵای موزەنی ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوەکە فەرموویەتی: ((پێش نوێژی مەغریب نوێژ (ی سوننەت) بکەن))، لە جاری سێیەمدا فەرمووی: (( بۆ کەسێ ویستی (سوننەت بکات)) )، لە ترسی ئەوەی نەوەك خەڵك بیکەنە سوننەتێك (و بەردەوام بن لەسەری).**

## ٢٨- بابُ قَوْلِ اللهِ تعالى:

﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾ الشورى. ﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران.

وَأَنَّ المُشَاوَرَةَ قَبْلَ العَزْمِ وَالتَّبَيُّنِ، لِقَوْلِهِ تعالى: ﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران

فَإِذَا عَزَمَ الرَّسُولُ ﷺ لَمْ يَكُنْ لِبَشَرٍ التَّقَدُّمُ عَلَى اللهِ وَرَسُولِهِ، وَشَاوَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَصْحَابَهُ يَوْمَ أُحُدٍ فِي الْمُقَامِ وَالْخُرُوجِ، فَرَأَوْا لَهُ الخُرُوجَ، فَلَمَّا لَبِسَ لأْمَتَهُ وَعَزَمَ قَالُوا له: أَقِمْ. فَلَمْ يَمِلْ إِلَيْهِمْ بَعْدَ العَزْمِ وَقَالَ: «لاَ يَنْبَغِي لِنَبِيٍّ إذا لَبِسَ لأْمَتَهُ فَيَضَعُهَا حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ». وَشَاوَرَ عَلِيًّا وَأُسَامَةَ ﷺ فِيمَا رَمَى به أَهْلُ الإِفْكِ عَائِشَةَ ﷺ فَسَمِعَ مِنْهُمَا، حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ فَجَلَدَ الرَّامِينَ، وَلَمْ يَلْتَفِتْ إِلَى تَنَازُعِهِمْ وَلَكِنْ حَكَمَ بِمَا أَمَرَهُ اللَّهُ. وَكَانَتِ الأَئِمَّةُ بَعْدَ رسول اللَّهِ ﷺ يَسْتَشِيرُونَ الأُمَنَاءَ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ فِي الأُمُورِ المُبَاحَةِ لِيَأْخُذُوا بِأَسْهَلِهَا، فَإِذَا وَضَحَ الكِتَابُ أَوِ السُّنَّةُ لَمْ يَتَعَدَّوْهُ إِلَى غَيْرِهِ اقْتِدَاءً بِالنَّبِيِّ ﷺ، وَرَأَى أَبُو بَكْرٍ ﷺ قِتَالَ مَنْ مَنَعَ الزَّكَاةَ فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: كَيْفَ تُقَاتِلُ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى

---

(١) بڕوانە: ١١٨٣.

يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَإِذَا قَالُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا وحسابهم عَلَى الله؟!. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: وَاللَّهِ لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ مَا جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ تَابَعَهُ بَعْدُ عُمَرُ[1]. فَلَمْ يَلْتَفِتْ أَبُو بَكْرٍ ﷺ إِلَى مَشُورَةٍ إِذْ كَانَ عِنْدَهُ حُكْمُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الَّذِينَ فَرَّقُوا بَيْنَ الصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ وَأَرَادُوا تَبْدِيلَ الدِّينِ وَأَحْكَامِهِ. قَالَ ﷺ: «مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»[2]. وَكَانَ الْقُرَّاءُ أَصْحَابَ مَشُورَةِ عُمَرَ ﷺ كُهُولاً كَانُوا أَوْ شُبَّانًا، وَكَانَ وَقَّافًا عِنْدَ كِتَابِ اللهِ[3].

## ٢٨- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە کاروباری نێوانیان بە پرس و مەشورەتە)، (وە (ئەی موحەممەد ﷺ) ڕاوێژیان پێ بکە لە کاروباردا)

## وە بێگومان ڕاوێژکردن پێش بڕیاردان و ڕوون بوونەوەیە بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (جا کاتێ (دوای ڕاوێژکردن) بڕیارتدا ئەوە پشت بە خوابەستە)، جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا هیچ کەسێک بۆی نییە لە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ پێش کەوێت[4].

**-وە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا ڕاوێژی بەهاوەڵان کرد دەربارەی مانەوە و چوونە دەرەوە (لە مەدینە)، هاوەڵانیش ڕایان لەسەر چوونە دەرەوە بوو، جا کاتێ زرێکەی پۆشی و بڕیاریدا، وتیان لەناوشار بمێنەرەوە و دانیشە،**

---

(١) بڕوانە: ١٣٩٩.

(٢) بڕوانە: ٣٠١٧.

(٣) بڕوانە: ٤٦٤٢.

(٤) واتە: لەسەر بڕیاری خوا و پێغەمبەر ﷺ ڕەخنە و قسەی هەبێت.

بەڵام ئەو نەڕۆشتە سەر ڕاکەیان پاش بڕیاردان و فەرمووی: ((شیاو و گونجاو نییە بۆ هیچ پێغەمبەرێك زرێکەی لەبەر بکات دایکەنێت و لایبات، هەتا خوا بڕیار نەدات (لە نێوان ئەو دوژمنەکانیدا)) ).

-وە (پێغەمبەر ﷺ) ڕاوێژی بە عەلی و ئوسامە رضي الله عنهما کرد، دەربارەی ئەو بوهتانەی بوهتان چییەکان هەڵیان بەست بۆ عائیشە رضي الله عنها ڕا و بۆچونی هەردووکیانی بیست، تا قورئان دابەزی (لەو بارەیەوە) و شەلاقیدا لە بوهتان چییەکان، وە گوێی نەدا بەجیاوازی و ڕاجیاییان، بەڵکو بەو شێوەی خوا فەرمانی پێکرد بڕیاریدا.

وە پێشەوایان لە پاش پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژیان دەکرد بەوانەی جێی متمانەن لە زانایان لە کار و بارە حەڵاڵ و دروستەکاندا تاکار بکەن بەئاسانترینیان، جا کاتێ قورئان یان سوننەت حوکمی بابەتێکی ڕوون بکردایەتەوە لێی تێنەدەپەڕین بۆ شتێکی تر، وە شوێن پێی پێغەمبەریان ﷺ هەڵدەگرت.

-وە ئەبو بەکر رضي الله عنه ڕای جەنگ کردنی هەبوو لە دژی ئەوانەی زەکات نادەن، عومەر رضي الله عنه وتی: (بە ئەبو بەکر): چۆن دەجەنگی لە گەڵیان، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فەرمانم پێ کراوە لە دژی خەڵك بجەنگم هەتا دەڵێن: (لَاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ). جا ئەگەر وتیان: (لَاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بە هەق و مافی خۆی نەبێت خوێن وماڵیان لە منەوە پارێزراوە لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە؟))، ئەبو بەکریش وتی: سوێند بەخوا دەجەنگم لە دژی ئەو کەسەی جیاوازی بکات لە نێوان ئەوەی پێغەمبەری خوا پێکەوەی بەستون، لە پاشان عومەر رضي الله عنه دواتر شوێن ڕاکەی ئەبو بەکر رضي الله عنه کەوت، بۆیە ئەبو بەکر رضي الله عنه گوێی نەدا بە ڕاوێژەکەی عومەر رضي الله عنه، چونکە بڕیاری پێغەمبەری ﷺ لابوو دەربارەی ئەو کەسانەی جیاوازی دەکەن لە نێوان نوێژ و زەکاتدا، وە ویستیان ئاینی ئیسلام و

بڕیارەکانی بگۆڕن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس پاشگەز بۆوە لە ئاینەکەی بیکوژن)).

-وە قورئان خوێنان کەسانی ڕاوێژ پێکردنی عومەر ؓ بوون بەتەمەن بوونایە یان گەنج و لاو، وە عومەر ؓ لە ئاست قورئانەکەی خوای بەرز و بڵندا چاك ڕادەوەستا و بە موو لێی لانەدەدا.

٧٣٦٩- حَدَّثَنَا الأُوَيْسِيُّ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنِي عُرْوَةُ وَابْنُ الْمُسَيَّبِ وَعَلْقَمَةُ بْنُ وَقَّاصٍ، وَعُبَيْدُ اللهِ، عَنْ عَائِشَةَ ؓ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ- قَالَتْ: وَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَأُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ حِينَ اسْتَلْبَثَ الوَحْيُ يَسْأَلُهُمَا، وَهْوَ يَسْتَشِيرُهُمَا فِي فِرَاقِ أَهْلِهِ، فَأَمَّا أُسَامَةُ فَأَشَارَ بِالَّذِى يَعْلَمُ مِنْ بَرَاءَةِ أَهْلِهِ، وَأَمَّا عَلِيٌّ فَقَالَ: لَمْ يُضَيِّقِ اللهُ عَلَيْكَ، وَالنِّسَاءُ سِوَاهَا كَثِيرٌ، وَسَلِ الْجَارِيَةَ تَصْدُقْكَ. فَقَالَ: «هَلْ رَأَيْتِ مِنْ شَيْءٍ يَرِيبُكِ؟». قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ أَمْرًا أَكْثَرَ مِنْ أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ، تَنَامُ عَنْ عَجِينِ أَهْلِهَا، فَتَأْتِي الدَّاجِنُ فَتَأْكُلُهُ. فَقَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ، مَنْ يَعْذِرُنِي مِنْ رَجُلٍ بَلَغَنِي أَذَاهُ فِي أَهْلِي؟ وَاللهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي إِلاَّ خَيْرًا». فَذَكَرَ بَرَاءَةَ عَائِشَةَ. وَقَالَ أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ[١].

٧٣٦٩- ئیبنو شیهاب دەڵێ: هەریەك لە عوروە و ئیبنو موسەییەب و عەلقەمەی کوڕی وەققاص و عوبەیدوڵڵا لە عائیشەوە ؓ بۆیان گێڕامەوە، کاتێ بوهتانچیەکان بوهتانیان بۆ کرد، عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دابەزینی نیگا دوا کەوت و بۆ ماوەیەك دانەبەزی، عەلی کوڕی ئەبو تالیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی ؓ بانگ کرد و پرسیاری لە هەردووکیان کرد، وە ڕاوێژی پێ کردن دەربارەی جیابوونەوە لە (عائیشەی) خێزانی ؓ، جا ئوسامە

(١) بڕوانە: ٢٥٩٣.

ڕای ئەوە بوو کە دەیزانی لە پاکی و بێ تاوانی خێزانی، بەڵام عەلی وتی: خوا دەرفەتی پێداویت ئافرەتیش زۆرە جگە لەو، پرسیاریش لە کەنزەکەکە بکە ڕاستیت پێ دەڵێ، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((ئایا شتێکت بینیوە گومانت لا دروست کات؟)) کەنزەکەکەش وتی: من شتێکم لێ نەدیوە بەعەیبی بگرم لێی، تەنها ئەوە نەبێت کچێکی منداڵکار بوو بەسەر هەویری (نانکردنی) ماڵەوەیانەوە خەوی لێ دەکەوت، ئەوسا ئەو ئاژەڵەی لە ماڵەوەبوو دەهات و هەویرەکەی دەخوارد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەستا ڕۆشتە سەر دوانگە و فەرمووی: ((ئەی پێڕی مسوڵمانان، کێ یارمەتیم دەدا و پشتیوانم دەکات بچم بەگژی پیاوێکدا ئەزێت و ئازاری بەخاو خێزانم گەیاندووە؟ سوێند بەخوا من لە خێزانم چاکە نەبێ لێم نەدیوە))، ئینجا باسی پاکێتی عائیشەی کرد.

-وە ئەبو ئوسامە لە هیشامەوە ئەو فەرموودەی گێڕاوەتەوە[1].

٧٣٧٠- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي زَكَرِيَّاءَ الغَسَّانِيُّ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَ النَّاسَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ: «مَا تُشِيرُونَ عَلَيَّ فِي قَوْمٍ يَسُبُّونَ أَهْلِي مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِمْ مِنْ سُوءٍ قَطُّ؟». وَعَنْ عُرْوَةَ قَالَ: لَمَّا أُخْبِرَتْ عَائِشَةُ بِالأَمْرِ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أَنْطَلِقَ إِلَى أَهْلِي؟. فَأَذِنَ لَهَا وَأَرْسَلَ مَعَهَا الغُلاَمَ. وَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهَذَا، سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ[2].

٧٣٧٠- هیشام لە عوروەوە گێڕاویەتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریدا بۆخەڵکی: جا سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد

(١) مەبەستی فەرموودەکە دواتر کە بە ژمارە: ٧٣٧٠ یە.

(٢) بڕوانە: ٢٥٩٣.

و فەرمووی: ((پێشنیارتان چییە بۆ من دەربارەی کەسانێك جنێو دەدەن بەخێزانم، کە من هەرگیز خراپەم لێ نەدیون)).

وە عوروە دەڵێ: کاتێ هەواڵی ئەو بابەتە درا بەعائیشە ﵂ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتم پێ دەدەیت کە بڕۆم بۆ لای کەسوکارم[1]؟ پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتیدا غوڵامەکەی لەگەڵدا نارد، پیاوێکی ئەنصاری وتی: پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە، بۆ ئێمە نییە کە قسە بکەین لەو بابەتە. پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە، ئەمە بوهتانێکی گەورەیە (هەڵبەستراوە).

---

(١) مەبەستی ماڵی باوک و دایکی بوو.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٩٧- كِتَابُ التَّوحِيدِ وَالرَّدِّ عَلَى الْجَهْمِيَّةِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٩٧- پەڕاوی یەکتاپەرستی [١]

## ١- بَابُ مَا جَاءَ فِي دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ أُمَّتَهُ إِلَى تَوْحِيدِ اللَّهِ تَعَالَى

٧٣٧١- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَيْفِيٍّ، عَنْ أَبِي مَعْبَدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى اليَمَنِ[٢].

## ١- باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بانگ کردنی ئوممەتەکەی بۆ یەکتاپەرستی خوای گەورە و بەرز و بڵند

**٧٣٧١- ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ موعازی ﵁ نارد بۆ یەمەن.**

٧٣٧٢ - وَحَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أُمَيَّةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ صَيْفِيٍّ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا مَعْبَدٍ -مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ- يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ لَمَّا بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ مُعَاذًا نَحْوَ الْيَمَنِ قَالَ لَهُ: «إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَى أَنْ يُوَحِّدُوا اللَّهَ تَعَالَى، فَإِذَا عَرَفُوا ذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فَإِذَا صَلُّوا فَأَخْبِرْهُمْ

---

(١) ئەم زاراوانەش بەمانای (التوحيد) بەکاردێن: یەک خوا ناسی، خوا بەیەک گرتن.

(٢) بڕوانە: ١٣٩٥.

أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكَاةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ غَنِيِّهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فَقِيرِهِمْ، فَإِذَا أَقَرُّوا بِذَلِكَ فَخُذْ مِنْهُمْ، وَتَوَقَّ كَرَائِمَ أَمْوَالِ النَّاسِ»[1].

**٧٣٧٢- ئەبو مەعبەد- بەندەی ئازادكراوی عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس ﷺ - دەڵێ: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسم ﷺ بیست دەیوت: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ موعازی ﷺ نارد بۆ یەمەن فەرمووی پێی: ((بێگومان تۆ دەڕۆیت بۆ ناو گەلێك كە خاوەنی كتێبی ئاسمانین، جا با یەكەم شتێ كە بانگیان دەكەیت بۆی ئەوە بێت كە خوای بەرز و بڵند بەیەك بگرن و بیپەرستن، جا ئەگەر ئەوەیان زانی (خوایان ناسی)، ئەوسا پێیان بڵێ كە بێگومان خوا لە شەو و ڕۆژێكیاندا پێنج نوێژی لەسەر فەرز كردوون، ئینجا كە نوێژیان كرد، ئەوە پێیان بڵێ بێگومان خوا زەكاتی لە ماڵ و سامانەكانیاندا فەرز كردوە، لە دەوڵەمەندەكان وەردەگیرێت و دەدرێتەوە بە هەژارەكانیان، ئەنجا ئەگەر دانیان بەوە دانا ئەوە لێیان وەربگرە، بەڵام خۆت بپارێزە لە وەرگرتنی ماڵە هەرە چاكەكانی خەڵك)).**

٧٣٧٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ وَالأَشْعَثِ بْنِ سُلَيْمٍ سَمِعَا الأَسْوَدَ بْنَ هِلاَلٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا مُعَاذُ، أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى العِبَادِ؟». قَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، أَتَدْرِي مَا حَقُّهُمْ عَلَيْهِ؟». قَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ»[2].

**٧٣٧٣-ئەسوەدی كوڕی هیلال لە موعازەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی موعاز ئایا دەزانی ماڧ خوا چییە بەسەر بەندەكانیەوە؟)) وتی: خوا و پێغەمبەرەكەی زاناترن، فەرمووی: ((ئەوەیە كە بیپەرستن و هیچ**

(١) بڕوانە: ١٣٩٥.

(٢) بڕوانە: ٢٨٥٦.

**شتێك نەكەنە هاوبەشی، ئەی دەزانی مافی ئەوان لەسەر خوا چییە؟)) وتی: خوا و پێغەمبەرەكەی زاناترن، فەرمووی: ((ئەوەیە كە سزایان نەدات )).**

٧٣٧٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ أَنَّ رَجُلاً سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ الإخلاص. يُرَدِّدُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَ لَهُ ذَلِكَ -وَكَأَنَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا- فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ».
زَادَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَخْبَرَنِي أَخِي قَتَادَةُ بْنُ النُّعْمَانِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٧٣٧٤- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە كە پیاوێك گوێی لە پیاوێكی تر بوو ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ی دەخوێند و دووبارەی دەكردەوە، ئینجا كە ڕۆژ بوویەوە پیاوەكە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەو (ڕووداو)ەی بۆ گێڕایەوە - وەك بڵێی پیاوەكە ئەوەی بەكەم دەزانی- بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، بێگومان ئەو سوڕەتە بە هاوتای سێیەكی قورئانە)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئیسماعیلی كوڕی جەعفەر زیادەیەكی هێناوە (لەم ڕشتەیەدا)، لە مالیكەوە گێڕاویەتیەوە لە عەبدوڕەحمانەوە لە باوكیەوە لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە دەڵێ: برام قەتادەی كوڕی نوعمان بۆی گێڕامەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

(١) بڕوانە: ٥٠١٣.

٧٣٧٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ حَدَّثَنَا عَمْرٌو، عَنِ ابْنِ أَبِي هِلاَلٍ، أَنَّ أَبَا الرِّجَالِ مُحَمَّدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ حَدَّثَهُ عَنْ أُمِّهِ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ - وَكَانَتْ فِي حَجْرِ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ، وَكَانَ يَقْرَأُ لأَصْحَابِهِ فِي صَلاَتِهِ فَيَخْتِمُ بِـ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ الإخلاص. فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «سَلُوهُ لأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ؟». فَسَأَلُوهُ، فَقَالَ: لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ»

**٧٣٧٥- ئەبو ڕیجال موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمان گێڕایەوە لە دایکیەوە کە عەمرەی کچی عەبدوڕەحمانە -کە لە ماڵی عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو- لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بەسەرکردەی کۆمەڵێ چەکدار نارد (بۆ شوێنێك)، ئەو پیاوە پێش نوێژی بۆ هاوڕێکانی دەکرد و قورئانی دەخوێند و کۆتایی قورئانی بەخوێندنی ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ دەهێنا، ئینجا کاتێ گەڕانەوە ئەو کارەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((پرسیاری لێ بکەن لەبەرچی وای کردوە؟)) ئەوانیش پرسیاریان لێ کرد، ئەویش وتی: چونکە ئەو سوڕەتە سیفەتی خوای بەبەزەییە، منیش پێم خۆشە کە ئەو سوڕەتە بخوێنم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (هەواڵی بدەنێ بێگومان خواش ئەوی خۆش دەوێ).**

## ٢- بابُ قَوْلِ اللّٰهِ ﷻ: ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء

٧٣٧٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ وَأَبِي ظَبْيَانَ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «لاَ يَرْحَمُ اللّٰهُ مَنْ لاَ يَرْحَمُ النَّاسَ»[1].

## ٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (نزا و هاوار لە خوا بکەن، یان هاوار لە ڕەحمان بکەن (یەکسانە) بەهەر کامیان نزاو هاوار بکەن، چونکە هەر بۆ خوایە هەموو ناوە هەرە جوانەکان)

**٧٣٧٦-جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا بەزەیی بەکەسێکدا نایەتەوە کە بەزەیی بەخەڵکدا نەیەتەوە)).**

٧٣٧٧- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ جَاءَهُ رَسُولُ إِحْدَى بَنَاتِهِ يَدْعُوهُ إِلَى ابْنِهَا فِي المَوْتِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْجِعْ فَأَخْبِرْهَا أَنَّ لِلّٰهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فَمُرْهَا فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ». فَأَعَادَتِ الرَّسُولَ أَنَّهَا أَقْسَمَتْ لَتَأْتِيَنَّهَا، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ وَقَامَ مَعَهُ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، فَدُفِعَ الصَّبِيُّ إِلَيْهِ وَنَفْسُهُ تَقَعْقَعُ كَأَنَّهَا فِي شَنٍّ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ ما هذا؟ قَالَ: «هَذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللّٰهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللّٰهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٦٠١٣.

(٢) بڕوانە: ١٢٨٤.

**٧٣٧٧- ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین، کاتێ نێردراوی کچێکی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ داوای لێ دەکرد کە کوڕەکەی لە سەرەمەرگ دایە بڕوات بۆلای، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بگەڕێرەوە و پێی بڵێ بێگومان ئەوەی دەیباتەوە و ئەوەی دەیدات هەر هی خودایە، وە هەموو شتێکیش لای خوا بۆماوەیەکی دیاری کراوە، جا فەرمانی پێ بکە با ئارام بگرێ و با چاوەڕوانی پاداشتی لای خوا بێت))، ئەنجا کچەکەی نێردراوەکەی ناردەوە (بۆ لای پێغەمبەر ﷺ) وتی: سوێندی خواردوە کە دەبێ بڕوات بۆماڵیان، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هەستا و سەعدی کوڕی عوبادە و موعازی کوڕی جەبەل لەگەڵیدا هەستان (و ڕۆشتن بۆ ماڵیان)، ئەنجا منداڵەکە درایە پێغەمبەر ﷺ بەناڕەحەت هەناسەی دەدا، دەتوت لە ناو مەشکە دایە، بۆیە چاوەکانی پێغەمبەر ﷺ فرمێسکیان پیا هاتە خوار، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چییە؟ ئەویش فەرمووی: ((ئەمە بەزەییە کە خوا لە دڵی بەندەکانیدا دروستی کردوە، وە بێگومان خوای گەورە لە ناو بەندەکانیدا ڕەحم بەوانەیان دەکات کە بەزەیین)).**

## ٣- بَابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ۝٥٨ ﴾ الذاريات

٧٣٧٨- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «مَا أَحَدٌ أَصْبَرُ عَلَى أَذًى سَمِعَهُ مِنَ اللَّهِ، يَدَّعُونَ لَهُ الوَلَدَ، ثُمَّ يُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٦٠٩٩.

## ٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (من ڕۆزی دەری خاوەن دەسەڵاتی زۆر بەهێزم[1])

٧٣٧٨- ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هیچ کەسێك نییە لە خوای گەورە ئارامگرتر بێت لەسەر وتەیەکی ناشرین بیستبێتی، خەڵکی منداڵ بۆ خوا بڕیار دەدەن، دوا ئەوەش خوا لەش ساغ و بێوەیان دەکات و ڕۆزیشیان دەدات)).

## ٤- بابُ قَوْلِه تَعَالَى: ﴿ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ ﴾ الجن، وَ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴿٣٤﴾ ﴾ لقمان، وَ﴿ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ﴿١٦٦﴾ ﴾ النساء، ﴿ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ﴿١١﴾ ﴾ فاطر، ﴿ ۞ إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴿٤٧﴾ ﴾ فصلت. قَالَ يَحْيَى: الظَّاهِرُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا، وَالْبَاطِنُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا.

## ٤- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (هەر خوایە زانا بەنهێنییەکان، وە کەس ئاگادار ناکات بەسەر نهێنی خۆیدا)

وە (بەڕاستی تەنها لای خوایە زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی)، وە (ئەو قورئانەی ناردوویەتیە خوارەوە بەزانینی خۆی)، وە (وە هیچ مێینەیەك (ئافرەت) دووگیان نابێت و سکەکەی دانانێت مەگەر بە ئاگاداری خوا)، وە (زانینی (هاتنی) ڕۆژی دوایی تەنها بۆ لای خوا دەگەڕێنرێتەوە).

---

(١) ئەو شێوە خوێندنەوە خوێندنەوەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودە ﷺ، ئەوانی تر بەم شێوە خوێندویانەتەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ ﴾ الذاريات. ڕیوایەتی هەر یەک لە ئەبی زەڕ و کەریمە و سەمعانی بەم جۆرەیە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ ﴾ الذاريات.

**-یەحیا (ی كوڕی زیاد)**[١] **دەڵێ:** (الظَّاهِرُ): **خوا زانیاری بەسەر هەموو شتێكدا هەیە كە دیارە** (الْبَاطِنُ): **خوا زانیاری بەهەموو شتێكی پەنهان و شاراوەدا هەیە**[٢].

٧٣٧٩- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ، حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَفَاتِيحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ اللَّهُ، لاَ يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى يَأْتِي الْمَطَرُ أَحَدٌ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ اللَّهُ»[٣].

**٧٣٧٩- عەبدوڵلای كوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی: ((كلیلی نەزانراوەكان پێنجن جگە لە خوا كەس نایانزانێ، كەس نازانێ ئەوەی لە منداڵدان دایە چییە جگەلە خوا، وە كەس نازانێ سبەی چی دەبێ و ڕوودەدات جگە لە خوا، وە كەس نازانێ كەی باران دەبارێ جگە لە خوا، وە كەس نازانێ لە چ زەوییەكدا دەمرێت جگە لە خوا، وە كەس نازانێ كەی قیامەت بەرپا دەبێت و ڕوو دەدات خوا نەبێت)).**

٧٣٨٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: مَنْ حَدَّثَكَ أَنَّ مُحَمَّدًا ﷺ رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ كَذَبَ، وَهْوَ يَقُولُ ﴿ لَا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ الأنعام. وَمَنْ حَدَّثَكَ أَنَّهُ يَعْلَمُ الْغَيْبَ فَقَدْ كَذَبَ، وَهْوَ يَقُولُ: لاَ يَعْلَمُ الْغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ[٤].

---

(١) كە ناسراوە بە فەررا خاوەنی كتێبی (معانی القران): (الظَّاهِر) خوا زانیاری بەسەر هەموو شتێكدا هەیە، كە دیارە (الْبَاطِنُ) خوا زانیاری بەهەموو شتێكی پەنهان و شاراوەدا هەیە. بڕوانە: إرشاد الساري:٣٣٩/١٥.

(٢) واتە:خوا زانایە بەدەر و ناوەوەی هەموو شتەكان لە بوونەوەراندا..

(٣) بڕوانە: ١٠٣٩.

(٤) بڕوانە: ٣٢٣٤.

**٧٣٨٠-مەسروق لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: هەر کەسێك بۆی گێڕایتەوە کە موحەممەد پەروەردگاری بینیوە ئەوە بێگومان درۆ دەکات، خوا خۆی دەفەرمووێ: (چاوەکان پەی پێ نابەن و ناتوانن ببینن)، وە هەر کەس بۆی گێڕایتەوە کە ئەو (موحەممەد ﷺ) غەیب و پەنهان دەزانێ ئەوە بێگومان درۆ دەکات، خوا بۆ خۆی دەفەرموێ: (جگە لە خوا کەس غەیب و پەنهان نازانێ).**

## ٥- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ﴿٢٣﴾﴾ الحشر

٧٣٨١- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا مُغِيرَةُ، حَدَّثَنَا شَقِيقُ بْنُ سَلَمَةَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: كُنَّا نُصَلِّي خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَقُولُ: السَّلاَمُ عَلَى اللَّهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلاَمُ، وَلَكِنْ قُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»[1].

## ٥- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ساغ و بێ عەیب و دڵنیاکەرە)

**٧٣٨١- عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێ: ئێمە لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان دەکرد و (لە تەحیاتدا) دەمانووت سەلام لەسەر خوابێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا خۆی سەلامە، بەڵکو بڵێن:** التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ**)). واتە: موڵك و مانەوە و گەورەیی هەر بۆ خودایە، نوێژەکان ووتەی جوان و شیرین (تایبەتی خودایە)، سڵاو و بەزەیی فەڕ**

---

(١) بڕوانە: ٨٣١.

و بەرەکەتی خودات لەسەربێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سڵاو لەسەر ئێمە و لەسەر هەموو بەندە چاکەکانی خوای گەورە بێت، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خودا، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خودایە ﷺ.

## ٦- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ۝٢ ﴾ الناس

فِيهِ ابْنُ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

٧٣٨٢- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَقْبِضُ اللَّهُ الأَرْضَ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ؟». وَقَالَ شُعَيْبٌ وَالزُّبَيْدِيُّ وَابْنُ مُسَافِرٍ وَإِسْحَاقُ بْنُ يَحْيَى، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ[٢].

## ٦- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (پادشای خەڵکی)

-فەرموودەی ئەم باسە ئیبنو عومەر ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە[٣].

٧٣٨٢- ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((خوا لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو زەوی دەخاتە چنگێوە و ئاسمانیش بەدەستی ڕاستی دەپێچێتەوە، لە پاشان دەفەرموێ: منم پادشا، کوان پادشاکانی سەرزەوی؟)).

---

(١) بڕوانە: ٤٧١٢.

(٢) بڕوانە: ٤٨١٢.

(٣) بوخاری گێڕاویەتیەوە بە ژمارە: ٧٤١٢، (الظَّاهِر)، خوا زانیاری بەسەر هەموو شتێکدا هەیە کە دیارە، (الْبَاطِنُ) خوا زانیاری بەهەموو شتێکی پەنهان و شاراوەدا هەیە.

-شوعەیب و زوبەیدی و ئیسحاقی کوڕی یەحیا لە زوهریەوە دەیگێڕنەوە، ئەویش لە ئەبی سەلەمەوە. وێنەی فەرموودەکەی پێشوو دەگێڕێتەوە.

## ٧- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝٤﴾ إبراهيم

﴿سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ۝١٨٠﴾ الصافات، ﴿وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ ۝٨﴾ المنافقون. وَمَنْ حَلَفَ بِعِزَّةِ اللهِ وَصِفَاتِهِ. وَقَالَ أَنَسٌ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَقُولُ جَهَنَّمُ: قَطْ قَطْ بِعِزَّتِكَ»[1]. وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «يَبْقَى رَجُلٌ بَيْنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، آخِرُ أَهْلِ النَّارِ دُخُولاً الجَنَّةَ، فَيَقُولُ: رَبِّ اصْرِفْ وَجْهِي عَنِ النَّارِ، لاَ وَعِزَّتِكَ لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهَا»[2].قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ تعالىَ: لَكَ ذَلِكَ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ»[3]. وَقَالَ أَيُّوبُ ﷺ: "وَعِزَّتِكَ لاَ غِنَى بِي عَنْ بَرَكَتِكَ"[4].

## ٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەو (خوایە) زاڵی کاربەجێیە)

(پەروەردگارت پاك و بێگەردە، پەروەردگاری باڵا دەست لەوەی بێباوەڕان دەیڵێن (دەربارەی)) (ڕێز و گەورەیی تەنها بۆخوا و بۆ پێغەمبەری خوایە[5])، وە باسی کەسێ سوێند بخوات بە گەورەیی خوا و سیفاتەکانی.

-ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دۆزەخ دەڵێت بەسە بەسە سوێند بەگەورەییت)).

---

(١) بڕوانە: ٤٨٤٨.

(٢) بڕوانە: ٦٥٧٣.

(٣) بڕوانە: ٦٥٧٣.

(٤) بڕوانە: ٢٧٩.

(٥) بۆ باوەڕدارانە.

**-ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((پیاوێك لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا دەمێنێتەوە کۆتا کەسی دۆزەخیە دەڕواتە بەهەشتەوە، ئینجا دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ڕووم لە دۆزەخ وەرچەرخێنە، نەخێر سوێند بەگەورەیی تۆ جگە لەوە هیچ داوایەکت لێ ناکەم)).**

**-ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: ئەوە بۆ تۆ و دە ئەوەندەی تری هاوشێوەی بۆ تۆ)).**

**-ئەیووب ﷺ فەرمووی: ((بە گەورەیی تۆ قەسەم من بێ نیازنیم لە فەزڵ و بەرەکەتی تۆ)).**

٧٣٨٣- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الْمُعَلِّمُ، حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ الذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، الذِي لاَ يَمُوتُ، وَالْجِنُّ وَالإِنْسُ يَمُوتُونَ»

**٧٣٨٣-ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((پەنا دەگرم بەگەورەیی تۆ کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە تۆ، ئەو زاتەی کە نامرێت، (بەڵام) جنۆکە و مرۆڤەکان هەموویان دەمرن)).**

٧٣٨٤- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا حَرَمِيٌّ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُلْقَى فِي النَّارِ». وَقَالَ لِي خَلِيفَةُ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ. وَعَنْ مُعْتَمِرٍ، سَمِعْتُ أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ،عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَزَالُ يُلْقَى فِيهَا وَتَقُولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ؟ حَتَّى يَضَعَ فِيهَا رَبُّ الْعَالَمِينَ قَدَمَهُ، فَيَنْزَوِي بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، ثُمَّ تَقُولُ: قَدْ قَدْ بِعِزَّتِكَ وَكَرَمِكَ. وَلاَ تَزَالُ الجَنَّةُ تَفْضُلُ حَتَّى يُنْشِئَ اللَّهُ لَهَا خَلْقًا، فَيُسْكِنَهُمْ فَضْلَ الجَنَّةِ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٤٨٤٨.

**٧٣٨٤-ئەنەس[١] ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( (خەڵك) فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ) خەلیفە پێی وتم: یەزیدی کوڕی زورەیع بۆی گێڕاینەوە وتی: سەعید بۆی گێڕاینەوە لە قەتادەوە لە ئەنەسەوە ﷺ.**

**موعتەمیر دەڵێ: لە باوکم بیست ئەویش لە قتادەوە لە ئەنەسەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بەردەوام (خەڵك) فڕێ دەدرێنە ناویەوە (دۆزەخ)، ئەویش (دۆزەخ) دەڵێ: ئایا هی تر ماوە، هەتا پەروەردگاری جیهانیان پێی خۆی پێدا دەنێت، ئەوسا هەندێکی دەچێت بەناو هەندێکیدا کۆدەبێتەوە، پاشان (دۆزەخ) دەڵێ: بەسمە بەسمە سوێند بەگەورەیی بەخشندەیت، وە بەردەوام بەهەشت جێگای زیادی دەبێت، هەتا خوای گەورە خەڵکانێکی بۆ دروست دەکات و لە جێگا زیادەکانی بەهەشت نیشتەجێیان دەکات)).**

## ٨- بابُ قَوْلِه تَعالَى: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴾ (٧٣) الأنعام

٧٣٨٥- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُو مِنَ اللَّيْلِ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، قَوْلُكَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِي لاَ إِلَهَ لِي غَيْرُكَ».حَدَّثَنَا ثَابِتُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بِهَذَا وَقَالَ: "أَنْتَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ الحَقُّ".

---

(١) ئیمامی بوخاری ئەم فەرموودەیە بەسێ ڕشتە و سەنەد دەهێنێ.

## ٨- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە هەر ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە بەهەق و ڕاستی)

٧٣٨٥- تاووس لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﵄ دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ لە شەودا بەم دوعایە دەپاڕایەوە: ((خوایە هەموو سوپاس هەر بۆ تۆیە تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویت، هەموو سوپاس هەر بۆ تۆیە تۆ (خاوەنی) ڕووناکی ئاسمانەکان و زەویت، فەرمایشتی تۆ هەق و ڕاستە، بەڵێنت ڕاست و دروستە، گەشتن بەحزورت (لە قیامەتدا) ڕاستە، بەهەشت هەق و ڕاستە، دۆزەخ هەق و ڕاستە، وە قیامەت ڕاستە، خوایە گەردن کەچی تۆم باوەڕم بەتۆ هێناوە و پشتم تەنها بەتۆ بەستووە، هەر بۆ لای تۆش دەگەڕێمەوە، وە بە پشتیوانی تۆ دەچم بەگژ دوژمناندا، بڕیار و حوکم هەر لە تۆوە وەردەگرم، دەی ئەوەی پێشم خستوە و ئەوە پاشم خستووە ئەوەی پەنهانم کردوە ئەوەی ئاشکرام کردوە لە تاوان لێم خۆش بە، تۆ پەرستراوی منی هیچ پەرستراوێکی ترم نییە جگەلە تۆ)).

(ئیمامی بوخاری دەڵێ) سابیتی کوڕی مەحەممەد ﷺ بۆی گێڕاینەوە وتی: سوفیان ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە بەم جۆرە: ((تۆ هەق و ڕاستی و وتەکانت هەق و ڕاستن)).

## ٩- بابٌ ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ١٣٤﴾ النساء

وَقَالَ الأَعْمَشُ: عَنْ تَمِيمٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتِ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الذِي وَسِعَ سَمْعُهُ الأَصْوَاتَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى عَلَى النَّبِيِّ ﷺ ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا ١﴾ المجادلة

## ٩- باسێک: (وەخوا بیسەری بینایە)

-ئەعمەش لە تەمیمەوە گێڕاویەتیەوە ئەویش لە عورووەوە لە عائیشەوە رضي الله عنها دەڵێ: سوپاس بۆ ئەو خوایەی بیستنی ئەو هەموو دەنگەکانی گرتۆتەوە[1]، جا خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند بۆ پێغەمبەر ﷺ: (بەڕاستی خوا وتەی ئەو ژنەی بیست لە بارەی مێردەکەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ ئەکردی[2]).

٧٣٨٦- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَكُنَّا إِذَا عَلَوْنَا كَبَّرْنَا، فَقَالَ: «ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا، تَدْعُونَ سَمِيعًا بَصِيرًا قَرِيبًا». ثُمَّ أَتَى عَلَيَّ وَأَنَا أَقُولُ فِي نَفْسِي: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. فَقَالَ لِي: «يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ، قُلْ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. فَإِنَّهَا كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الجَنَّةِ». أَوْ قَالَ: "أَلاَ أَدُلُّكَ؟ " بِهِ[3].

٧٣٨٦- ئەبو مووسا رضي الله عنه وتی: ئێمە لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین، جا ئێمە ئەگەر سەرکەوتینایە بۆ بەرزاییەك ئەڵلاهو ئەکبەرمان دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە، بەزەیتان بەخۆتاندا بێتەوە (و زۆر دەنگ بەرز مەکەنەوە)، چونکە بێگومان ئێوە هاوار لە زاتێکی کەڕ یان نادیار و دوور ناکەن، بەڵکو ئێوە هاوار لە زاتێکی بیسەری بینەری نزیك دەکەن))، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتە لام، منیش لە دڵی خۆمدا دەمووت (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ) پێغەمبەریش فەرمووی: ((ئەی عەبدوڵلای کوڕ قەیس بڵێ: (لاَ حَوْلَ وَلاَقُوَّةَ إِلاَّبِاللَّهِ)، چونکە بێگومان ئەوە گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی

---

(١) واتە:گوێی لە هەموو دەنگەکانە و دەنگ نیە نەیبیستێ.

(٢) عائیشە رضي الله عنها دەڵێت ئەو ژنە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە سوچێکی ژوورەکەدا قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەکرد، من گوێم لێ نەبوو بەهۆیەوە خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند.

(٣) بڕوانە: ٢٩٩٢.

**بەهەشت))، یان فەرمووی: ((ئایا وشەیەکت نیشاندەم؟ جا فەرموودەکە هەمووی دێنێت.**

٧٣٨٧- ٧٣٨٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلاَتِي. قَالَ: «قُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مِنْ عِنْدِكَ مَغْفِرَةً، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ»[1].

**٧٣٨٧- ٧٣٨٨- عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەبو بەکری صیدیق ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا دوعایەکم فێر بکە لە نوێژەکانمدا دوعای پێ بکەم، ئەویش فەرمووی: ((بڵێ خوایە گیان من ستەمێکی گەورەم لە خۆم کردوە جگەلە تۆش خوایە کەس لە تاوانەکان خۆش نابێت، دەی کەواتە بە لێخۆشبوونی تایبەتی خۆت لێم خۆشبە، بەڕاستی هەر تۆ لێخۆشبووی میهرەبانی)).**

٧٣٨٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ حَدَّثَتْهُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ جِبْرِيلَ ﷺ نَادَانِي قَالَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ»[2].

**٧٣٨٩- ئیبنو شیهاب دەڵێ: عوروە بۆی گێڕامەوە کە عائیشە ﷺ بۆی گێڕایەوە و وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان جیبریل ﷺ بانگی کردم و فەرمووی: بەڕاستی خوای گەورە گوێی لە قسەی گەلەکەت بوو و ئەو وەڵامەش وەڵامیان دایتەوە)).**

---

(١) بڕوانە: ٨٣٤.

(٢) بڕوانە: ٣٢٣١.

## ١٠- بابُ قَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى: ﴿ قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ ﴿٦٥﴾ ﴾ الأنعام

٧٣٩٠- حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ، حَدَّثَنَا مَعْنُ بْنُ عِيسَى، حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي المَوَالِي قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ المُنْكَدِرِ يُحَدِّثُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الحَسَنِ يَقُولُ: أَخْبَرَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ السَّلَمِيُّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُعَلِّمُ أَصْحَابَهُ الاسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ كُلِّهَا، كَمَا يُعَلِّمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ يَقُولُ: «إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ هَذَا الأَمْرَ -ثُمَّ تُسَمِّيهِ بِعَيْنِهِ- خَيْرًا لِي فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ -قَالَ: أَوْ فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي- فَاقْدُرْهُ لِي، وَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، اللَّهُمَّ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّهُ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي -أَوْ قَالَ: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ- فَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ رَضِّنِي بِهِ»[1].

## ١٠- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بڵێ هەر ئەو خوایەیە بەتوانا و دەسەڵاتدارە)

**٧٣٩٠- جابیری کوڕی عەبدوڵڵای سەلەمی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی فێری ئیستیخارە[2] دەکرد لە هەموو ئیش و کارێکدا، وەك چۆن سورەتێ لە قورئانی فێر دەکردن و دەیفەرموو: ((ئەگەر کەسێکتان نیازی کارێکی هەبوو ئەوە با دوو ڕکاتی نوێژی سوننەت بکات، پاشان بڵێت: خوایە داوات لێ دەکەم بە زانیاری خۆت و دەسەڵاتی خۆت چاکە و خێرم نیشان بدە، وە داوای چاکەت لێ دەکەم لە بەهرەی گەورەت، چونکە بەڕاستی تۆ بەتوانایت و**

(١) بڕوانە: ١١٦٢.
(٢) ئیستیخارە: واتە: شتێکە دوو باری هەیە، داوا بکەیت خێر و چاکە لە کامیان دایە خوا ئەوەیانت بۆ بکات.

من هیچ توانام نییە، وە تۆ هەموو شت دەزانی و من نازانم، وە تۆ زانایت بە هەموو شتە پەنهانەكان. خودایە ئەگەر دەزانی ئەم كارە - پاشان كارەكەی ناو ببات وەك خۆی- چاكە بۆ ژیانی دونیام و دواڕۆژم، یان بڵێ: بۆ ئایین و ژیانم و پاشە ڕۆژم، ئەوە لە چارەمی بنووسە و بۆم ئاسان بكە، پاشان فەڕ و بەرەكەتی تێبخە بۆم، خوایە ئەگەر دەزانی ئەم كارە خراپە بۆ ئایین و ژیانم و پاشە ڕۆژم - یا بڵێ بۆ دونیا و دواڕۆژم -ئەوە لایدە لێم و دوورم خەرەوە لێی، وە خەیر و چاكە لە چارەم بنووسە لە هەر كوێیە، پاشان ڕازیم بكە پێی)).

## ١١- بابُ مُقَلِّبِ الْقُلُوبِ

وَقَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ ﴿١١٠﴾ ﴾ الأنعام

٧٣٩١- حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: أَكْثَرُ مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَحْلِفُ: «لاَ وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ»[1].

## ١١- باسی (خوای) وەرگێڕەری دڵەكان

وە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (وە (كاتی هاتنی موعجیزەكان) دڵ و چاویان وەردەگێڕین و لادەدەین لە (باوەڕهێنان)).

٧٣٩١- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: زۆرتر كە پێغەمبەر ﷺ سوێندی دەخوارد: دەیفەرموو: ((نا (ئەو كارە ناكەم یا واز لەو شتە ناهێنم)، سوێند بە هەڵسوڕێنەری دڵان)).

(١) بڕوانە: ٦٦١٧.

## ١٢- بَابٌ: إِنَّ لِلَّهِ مِائَةَ اسْمٍ إِلاَّ وَاحِدًا

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿ذُو ٱلْجَلَٰلِ ۝٢٧﴾ الرحمن: الْعَظَمَةِ، ﴿ٱلْبَرُّ ۝٢٨﴾ الطور: اللَّطِيفُ.

٧٣٩٢- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مِائَةً إِلاَّ وَاحِدًا، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ»[1]. ﴿أَحْصَيْنَٰهُ ۝١٢﴾ يس: حَفِظْنَاهُ.

## ١٢- باسێک: بێگومان خودا سەد ناوی هەیە ناوێکی کەمە[2]

**ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ:** ﴿ذُو ٱلْجَلَٰلِ ۝٢٧﴾ الرحمن: **خاوەنی گەورەیی بەشکۆ.** ﴿ٱلْبَرُّ ۝٢٨﴾ الطور، **بەبەزەی و چاکەکار.**

**٧٣٩٢- ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا نەوەد و نۆ ناوی هەیە سەدە جگە یەك (ناو)، هەر کەس بیانژمێرێ[3] دەچێتە بەهەشتەوە)). (ئیمامی بوخاری دەڵێ:)** {أَحْصَيْنَٰهُ ۝١٢} يس: **لەبەرمان کرد، پاراستمان.**

## ١٣- بَابُ السُّؤَالِ بِأَسْمَاءِ اللَّهِ تَعَالَى وَالاِسْتِعَاذَةِ بِهَا

٧٣٩٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ فِرَاشَهُ فَلْيَنْفُضْهُ بِصَنِفَةِ ثَوْبِهِ ثَلاَثَ

---

(١) بروانە: ٢٧٣٦.

(٢) واتە: نەوەد و نۆ ناوی هەیە.

(٣) واتە: زانیاری دەربارەیان هەبێ و باوەڕی بتەوی پێیان هەبێت و کار بە ماناکانیان بکات. بروانە: إرشاد الساري: ٣٥٨/١٥.

مَرَّاتٍ، وَلْيَقُلْ: بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ». تَابَعَهُ يَحْيَى وَبِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَزَادَ زُهَيْرٌ وَأَبُو ضَمْرَةَ وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ زَكَرِيَّاءَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَرَوَاهُ ابْنُ عَجْلَانَ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ تابعَهُ مُحَمدُ بْنُ عَبد الرَّحمْنِ، والدَّروَارْدِيُّ، وَأُسَامَةُ بْنُ حَفْصٍ[1].

## ١٣- باسی داواکردن و پاڕانەوە بەناوەکانی خوای بەرز و بڵند و پەناگرتنیش پێیان[2]

**٧٣٩٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان چوویە ناو پێخەفی نوستنەکەی با پێخەفەکە بە دامێنی پۆشاکەکەی[3] بیتەکێنێت، وە با بڵێت: ئەی پەروەردگارم بەناوی تۆوە ڕاکشاوم و بەناوی تۆوە هەڵدەستم و بەرز دەبمەوە، ئەگەر گیانی منت ڕاگرت و مردم ئەوە بەزەیت پێدا بێتەوە، وە ئەگەر بەرەڵات کرد ئەوە بیپارێزە، بەوەی کە بەندە چاکەکانتی پێ دەپارێزی)).**

**-یەحیا و بیشری کوڕی موفەززەل لە عوبەیدوڵڵاوە گێڕاویانەتەوە لە سەعیدەوە لە ئەبی هورەیرەوە ﷺ، ئەویش ئەم فەرموودەی پێشووی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبدولعەزیزی ئەویسی لە مالیکەوە دەکات.**

**-ئەبو زەمرە و ئیسماعیل کوڕی زەکەریا لە عوبەیدوڵڵاوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی زوهەیری کوڕ موعاویە دەکەن.**

(١) بڕوانە: ٦٣٢٠.

(٢) پەناگرتن بە هەموو ناوەکانی خوای گەورە لە هەموو زیان و خراپەکانی.

(٣) واتە: پۆشاکەکە بگرێ بە دەستیەوە بە قراغ و دامێنی پۆشاکەکەی پێخەفەکەی بتەکێنێ، پێش ئەوەی بخەوێ بەو پێخەفەوە.

**-وە هەریەك لە زوهەیر و ئەبو زەمرە و ئیسماعیلی کوڕی زەکەریا لە عوبەیدوڵلاوە دەیگێڕنەوە لە سەعیدەوە لە باوکیەوە لە ئەبی هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە. کەسێك زیاد دەکەن لە ڕشتەکە کە باوکی سەعیدە.**

**-هەروەها ئیبنو عەجلان لە سەعیدەوە گێڕاویەتیەوە ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

**-وە موحەمەدی کوڕی عەبدورەحمان و دەراوەردیی و ئوسامەی کوڕی حەفص ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئیبنو عەجلان دەکەن[1].**

**٧٣٩٤-** حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ المَلِكِ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: «اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَحْيَا وَأَمُوتُ». وَإِذَا أَصْبَحَ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»[2].

**٧٣٩٤-حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەچوومیە ناو پێخەفی نوستنەکەیەوە دەیفەرموو: ((**اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَحْيَا وَأَمُوتُ**)) واتە: خوایە بەناوی تۆ دەژیم و دەمرم، وە کاتێ ڕۆژی لێ دەبوویەوە (لە خەو هەڵدەسا) دەیفەرموو: ((**الْحَمْدُ لِلَّهِ الذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ**)) واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینەوە پاش ئەوەی مراندینی، زیندوو کردنەوەش هەر لای ئەو دەبێت.**

---

(١) مەبەست لەم هەموو ڕشتە و ڕێگەیانە کە موعەلەقن، ڕوون کردنەوەی ئەو جیاوازیانەیە لەسەر سەعیدی مەقبوری هەیە ئایا ئەم فەرموودەی کە گێڕاویەتیەوە لە ئەبو هورەیرەوە، بەبوونی کەسێک لە نێوان ئەو و ئەبو هورەیرەدا کە باوکیەتی، یان نەبوونی هیچ کەسێک لە نێوانیاندا. بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٥٩/١٥.

(٢) بڕوانە: ٦٣١٢.

٧٣٩٥- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ خَرَشَةَ بْنِ الْحُرِّ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: "بِاسْمِكَ نَمُوتُ وَنَحْيَا" فَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: "الْحَمْدُ لِلَّهِ الذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ"[(١)].

**٧٣٩٥- ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێ لە شەودا دەچووە ناو پێخەفی نوستنەكەیەوە دەیفەرموو: ((**بِاسْمِكَ نَمُوتُ وَنَحْيَا**)) واتە: خوایە بەناوی تۆ ئەمرین و ئەژین، كاتێكیش لە خەو هەستایە دەیفەرموو: ((**الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ**)) واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە زیندووی كردینەوە پاش ئەوەی مراندینی، زیندوو كردنەوەش هەر لای ئەو دەبێت.**

٧٣٩٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ فَقَالَ بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا. فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ لَمْ يَضُرُّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا»[(٢)].

**٧٣٩٦-ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر كەسێكیان كاتێ ویستی لەگەڵ هاوسەریدا دروست بێت بڵێ: بەناوی خواوە، خوایە شەیتانمان لێ دوور خەرەوە، هەروەها شەیتان لەو (منداڵ)ـەی پێمان دەبەخشی دوور بخەرەوە، جا بێگومان ئەگەر لەو جووتبوونەی نێوانیاندا منداڵێك بڕیار درابێ، هەرگیزی شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت.**

٧٣٩٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا فُضَيْلٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ قُلْتُ: أُرْسِلُ كِلَابِي الْمُعَلَّمَةَ؟ قَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كِلَابَكَ الْمُعَلَّمَةَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ فَأَمْسَكْنَ فَكُلْ، وَإِذَا رَمَيْتَ بِالْمِعْرَاضِ فَخَزَقَ فَكُلْ»[(٣)].

---

(١) بڕوانە: ٦٣٢٥.

(٢) بڕوانە: ١٤١.

(٣) بڕوانە: ١٧٥.

**٧٣٩٧- عەدیی كوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كرد و وتم: سەگانی فێرە ڕاو بەردەدەمە نێچیر؟ فەرمووی: ((ئەگەر سەگە فێرەڕاوەكانت بەردایە نێچیرەكە و ناوی خوات هێنا، جا هەر نێچیرێكیان گرت ئەوە بیخۆ، وە ئەگەر نێزەكەت هاوێشت (بۆنێچیرەكە) و كونی كرد ئەوە بیخۆ)).**

٧٣٩٨- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ قَالَ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ عُرْوَةَ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هُنَا أَقْوَامًا حَدِيثًا عَهْدُهُمْ بِشِرْكٍ، يَأْتُونَا بِلُحْمَانٍ لاَ نَدْرِي يَذْكُرُونَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا أَمْ لاَ. قَالَ: «اذْكُرُوا أَنْتُمُ اسْمَ اللَّهِ وَكُلُوا». تَابَعَهُ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَالدَّرَاوَرْدِيُّ وَأُسَامَةُ بْنُ حَفْصٍ[١].

**٧٣٩٨- عائیشە ﷺ دەڵێت وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا لێرە كەسانێك ماوەیەكی كەمە لە بتپەرستی بڕاون و مسوڵمان بوون گۆشتمان بۆ دێنن، نازانین ناوی خوایان لێ هێناوە (لە كاتی سەربڕیندا) یان نەیانهێناوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خۆتان ناوی خوای لەسەر بێنن و بیخۆن)).**
**-موحەممەدی كوڕی عەبدوڕەحمان و دەراوەردی و ئوسامەی كوڕی حەفص ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی ئەبو خالید ئەحمەریان كردوە.**

٧٣٩٩- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: ضَحَّى النَّبِيُّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ، يُسَمِّي وَيُكَبِّرُ[٢].

**٧٣٩٩- ئەنەس ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ قوربانی كرد بە دوو بەران ناوی خوای هێنا و ئەڵلاهو ئەكبەری كرد (و هەردووكیانی سەربڕی).**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٥٧.
(٢) بڕوانە: ٥٥٥٣.

٧٤٠٠- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ جُنْدَبٍ أَنَّهُ شَهِدَ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ صَلَّى ثُمَّ خَطَبَ فَقَالَ: «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيَذْبَحْ مَكَانَهَا أُخْرَى، وَمَنْ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ بِاسْمِ اللَّهِ»[1].

**٧٤٠٠- ئەسوەدی كوڕی قەیس لە جوندەبەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە ئەو پێغەمبەری ﷺ بینی لە ڕۆژی جەژنی قورباندا نوێژی (جەژنی) كرد، پاشان وتاریدا و فەرمووی: ((هەر كەس قوربانی سەربڕیوە پێش ئەوەی نوێژ بكات، ئەوە باقوربانیەكی تر لە جێگادا سەربڕێ، هەر كەسیش قوربانی سەرنەبڕیوە، ئەوە با بەناوی خواوە سەری ببڕێت)).**

٧٤٠١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا وَرْقَاءُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «لاَ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، وَمَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ».

**٧٤٠١-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەباوكتان [2] سوێند مەخۆن، هەر كەس سوێندی خوارد، ئەوە با بە خوا سوێند بخوات)).**

## ١٤- بابُ مَا يُذْكَرُ فِي الذَّاتِ وَالنُّعُوتِ وَأَسَامِي اللَّهِ ﷻ

وَقَالَ خُبَيْبٌ ﷺ: وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الإِلَهِ. فَذَكَرَ الذَّاتَ بِاسْمِهِ.

٧٤٠٢- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ أَبِي سُفْيَانَ بْنِ أَسِيدِ بْنِ جَارِيَةَ الثَّقَفِيُّ - حَلِيفٌ لِبَنِي زُهْرَةَ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ أَبِي هُرَيْرَةَ - أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَشَرَةً مِنْهُمْ خُبَيْبٌ الأَنْصَارِيُّ، فَأَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عِيَاضٍ أَنَّ ابْنَةَ الحَارِثِ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهُمْ حِينَ اجْتَمَعُوا اسْتَعَارَ مِنْهَا مُوسَى يَسْتَحِدُّ بِهَا، فَلَمَّا خَرَجُوا مِنَ الحَرَمِ لِيَقْتُلُوهُ قَالَ خُبَيْبٌ الأَنْصَارِيُّ:

---

(١) بڕوانە: ٩٨٥.

(٢) یان بە سەری باوكتان سوێند مەخۆن، چونكە سوێند خواردن بەم جۆرە شتانە حەرامە و درووست نییە

وَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِمًا... عَلَى أَيِّ شِقٍّ كَانَ لِلَّهِ مَصْرَعِي

وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الإِلَهِ وَإِنْ يَشَأْ... يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ

فَقَتَلَهُ ابْنُ الحَارِثِ، فَأَخْبَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَصْحَابَهُ خَبَرَهُمْ يَوْمَ أُصِيبُوا[1].

## ١٤- باسی ئەوەی باسی دەکرێت و دەوترێت دەربارەی خودی خوا و سیفەتەکانی و ناوەکانی خوا ﷻ

**-وە خوبەیب ﷺ وتی: ئەمە لە بێناوی خودی پەرستراودا، زاتی بەناوی خوای بەرز و بڵند داناوە.**

**٧٤٠٢- ئیبنو شیهاب دەڵێ: عەمری کوڕی ئەبو سوفیانی کوڕی ئەسیدی کوڕی جارێی سەقەفی - هاوپەیمانی بەنی زوهرە بوو، وە لە هاوڕێیانی ئەبو هوڕەیرە بوو- بۆی گێڕامەوە و وتی: ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دە کەسی نارد خوبەیبی ئەنصاری یەکێك بوو لەو دە کەسە، (ئیبنو شیهاب دەڵێ:) وە عوبەیدوڵلای کوڕی عییاز بۆی گێڕامەوە کە (زینەبی) کچی حاریس بۆی گێڕایەوە کاتێ (کەس و کاری حاریس) کۆ بووبوونەوە (بۆ کوشتنی خوبەیب)، خوبەیب موسێکی لە کچی حاریس خواستبوو بەری پێ لابات، جا کاتێ لە سنووری حەرەم چوونە دەرەوە بۆ ئەوەی خوبەیب بکوژن خوبەیبی ئەنصاری وتی: گرنگ نییە بەلامەوە کاتێ بەمسوڵمانی دەکوژرێم بەهەر لایەکمدا بکەومە زەوی مردنەکەم بۆ خوایە، ئەو کوشتنەش لەبەر خوایە (و پاداشتی لای ئەوە)، ئەگەر بیەوێ فەڕ و بەرەکەت دەخاتە ئەندامە پارچە پارچەکراوەکانەوە، ئینجا (عوقبەی) کوڕی حاریس کوشتی، وە پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژەدا کوژرابوون هەواڵەکەیانی گەیاندبوو بە هاوەڵانی.**

---

(١) بڕوانە: ٣٠٤٥.

## ١٥- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تعالى: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ۝٢٨﴾ آل عمران

وَقَوْلِهِ: ﴿تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ ۝١١٦﴾ المائدة

٧٤٠٣- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ حَرَّمَ الفَوَاحِشَ، وَمَا أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ المَدْحُ مِنَ اللَّهِ»[١].

## ١٥- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە خوا لە (سزای) خۆی دەتان ترسێنێت)

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ((خوایە) تۆ ئەوەی لە دڵم دایە دەیزانی، بەڵام من نازانم و بێئاگام لەو نهێنیانەی کە لای تۆیە).**

**٧٤٠٣- شەقیق لە عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوودەوە) ﷺ گێڕایەوە، عەبدوڵڵاش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە و فەرمووی: ((هیچ کەس غیرەی[٢] لە خوا زیاتر نییە، هەر لەبەر ئەوەشە گوناهە بەدوو ناشرینەکانی حەرام کردوە، کەسیش وەسفی جوانی مەدحی لە خوا پێ خۆشتر نییە)).**

٧٤٠٤- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ -هُوَ يَكْتُبُ عَلَى نَفْسِهِ، وَهُوَ وَضْعٌ عِنْدَهُ عَلَى الْعَرْشِ- إِنَّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي»[٣].

---

(١) بڕوانە: ٤٦٣٤.

(٢) غیرە: واتە پێناخۆش بوونی گوناهو تاوان ڕقبوونەوە لێی، غیرەی خواش واتە: ڕێگری کردن لەتاوان و ڕقبونەوە لێی.

(٣) بڕوانە: ٣١٩٤.

**٧٤٠٤- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((کاتێ خوا لە دروستکردنی بوونەوەر بوویەوە، لە نووسراوێکی خۆیدا نووسیویەتی- کە خوا دەینوسێت (پێویستی دەکات) لەسەر خۆی کە لای خۆیەتی لەسەر عەرش دانراوە- بێگومان بەزەیی و میهرەبانی من زاڵ بووە بەسەر تورەی و خەشممدا)).**

٧٤٠٥- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، سَمِعْتُ أَبَا صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي،وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلأٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلأٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ بِشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً»[١].

**٧٤٠٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: من لەگەڵ گومان بردنی بەندەی خۆمدام بەو جۆرەی گومانم پێ دەبات، وە من لەگەڵی دام کاتێ یادم دەکات، جا ئەگەر لە ناخ و نەفسی خۆیدا یادی کردم، ئەوە منیش لە نەفسی خۆمدا یادی دەکەم، وە ئەگەر لە کۆڕ و کۆمەڵێکدا باسی کردم، ئەوا منیش لە ناو کۆڕ و کۆمەڵێکدا لەوەی خۆی چاکتر باسی دەکەم، وە ئەگەر یەك بست لە من نزیك بێتەوە، ئەوا من گەزێك لێی نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر گەزێك لە من نزیك بێتەوە، ئەوا من دوو باڵ لێی نزیك دەبمەوە، خۆ ئەگەر بەئاسایی بێت بۆ لام، ئەوە من بەپەلە دەچم بۆ لای[٢])).**

---

(١) بڕوانە: ٧٥٠٥، ٧٥٣٧.

(٢) ئەمانە هەمووی کینایەیە لەسەر بەزەیی و میهرەبانی خوای گەورە بەرانبەر بە بەندەکانی (إرشاد الساري:١٥/٣٧٠).

## ١٦- بابُ قَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ ۝٨٨﴾ القصص

٧٤٠٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ﴿قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ ۝٦٥﴾ الأنعام. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَعُوذُ بِوَجْهِكَ». فَقَالَ: ﴿أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ ۝٦٥﴾ الأنعام. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَعُوذُ بِوَجْهِكَ». قَالَ: ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا ۝٦٥﴾ الأنعام. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَذَا أَيْسَرُ»[١].

## ١٦- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (هەموو شتێک لە ناو دەچێت جگەلە زاتی خوا)

٧٤٠٦- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (بڵێ: هەر ئەو خوایە بەتوانا و دەسەڵاتدارە کە سزایەکتان بۆ بنێرێت لە سەرووتانەوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((پەنا دەگرم بە زاتی تۆ (ئەی خودا) )) فەرمووی: (یان لەژێر پێتانەوە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پەنا دەگرم بە زاتی تۆ (ئەی خودا) ))، فەرمووی: (یان سەرتان لێ بشێوێنێ و بتان کات بە چەند دەستە و تاقمێکەوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەمەیان ئاسانترە)).

## ١٧- باب قَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى: ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ۝٣٩﴾ طه: تُغَذَّى. وَقَوْلِهِ -جَلَّ ذِكْرُهُ-: ﴿تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا ۝١٤﴾ القمر

٧٤٠٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: ذُكِرَ الدَّجَّالُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّ اللهَ لاَ يَخْفَى عَلَيْكُمْ، إِنَّ اللهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ -وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى عَيْنِهِ- وَإِنَّ المَسِيحَ الدَّجَّالَ أَعْوَرُ الْعَيْنِ اليُمْنَى، كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ»[٢].

---

(١) بڕوانە: ٤٦٢٨.

(٢) بڕوانە: ٣٠٥٧.

# ١٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە بۆ ئەوەی پەروەردە بکرێیت[1] لە پێش چاوی خۆم بەچاودێری و پارێزگاری خۆم)

**خواردنت پێ بدرێ، وە باسی ئەم فەرمایشتە خوای بەگەورە ناوهێنرا: (بەچاودێری ئێمە دەڕۆشت[2]).**

**٧٤٠٧- نافیع لە عەبدوڵلاوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ باسی دەججال کرا، ئەویش فەرمووی: ((بێگومان خوا شاراوە نابێت لاتان، بەدڵنیاییەوە خوا کوێر نییە- بەدەستی ئاماژەی بۆ چاوی خۆی کرد- بەڵام بەڕاستی دەججال چاوی ڕاستی کوێرە، دەڵێی دەنکە ترێیەکی بەرز و دەرپۆقیوە)).**

٧٤٠٨- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنَا قَتَادَةُ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا بَعَثَ اللَّهُ مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ أَنْذَرَ قَوْمَهُ الأَعْوَرَ الكَذَّابَ، إِنَّهُ أَعْوَرُ، وَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ، مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ»[3].

**٧٤٠٨- قەتادە دەڵێ:لە ئەنەسم ﷺ بیست لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((خوا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت گەلەکەی لە کوێرە درۆزنەکە (دەججال) ئاگادار کردۆتەوە، بێگومان ئەوە (دەججالی) کوێرە، وە بەدڵنیاییەوە پەروەردگاری ئێوە کوێر نییە، (دەججال) لە نێوان هەردوو چاوی نوسراوە کافر)).**

---

(١) (ولتصنع) بەچەند جۆر مانا کراوە: دەتبەمە ماڵ پادشا و لە ناو ناز و نیعمەتدا بژیت، پەروەردە ببیت لەسەر خۆشەویستی من و ویست و ئیرادە من، ئیبنو حەجەر ئەم ڕایەی لا ڕاسترە.

(٢) مەبەست کەشتیەکەی نوحە ﷺ.

(٣) بڕوانە: ٧١٣١.

## ١٨- بابُ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُ ﴾ الحشر

٧٤٠٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاق، حَدَّثَنَا عَفَّانُ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا مُوسَى -هُوَ ابْنُ عُقْبَةَ- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ فِي غَزْوَةِ بَنِي الْمُصْطَلِقِ أَنَّهُمْ أَصَابُوا سَبَايَا، فَأَرَادُوا أَنْ يَسْتَمْتِعُوا بِهِنَّ وَلاَ يَحْمِلْنَ، فَسَأَلُوا النَّبِيَّ ﷺ عَنِ العَزْلِ، فَقَالَ: «مَا عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُوا، فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ كَتَبَ مَنْ هُوَ خَالِقٌ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ». وَقَالَ مُجَاهِدٌ: عَنْ قَزَعَةَ، سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ فَقَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْسَتْ نَفْسٌ مَخْلُوقَةٌ إِلاَّ اللَّهُ خَالِقُهَا»[١].

## ١٨- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (هەر ئەو خوا و بەدیهێنەر و داهێنەر و وێنەكێشە)

**٧٤٠٩- ئیبنو موحەیریز لە ئەبی سەعیدی خودریەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە دەربارەی غەزای بەنی لموصتەلیق كە ئەوان كۆمەڵێ ئافرەتیان بەدیل گرتبوو، ئینجا دەیانویست لەگەڵیان دروست ببن و سكیان پڕ نەبێ[٢]، بۆیە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ كرد دەربارەی عەزل[٣]، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هیچ زەرەرێكتان لەسەر نییە لە نەكردنی عەزلدا (یان عەزل نەكردن واجب نییە لەسەرتان)، چونكە دڵنیابن بێگومان خوا نووسیویەتی تا ڕۆژی قیامەت كێ دروست دەبێت)).**

**موجاهید لە قەزەعەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە ئەبی سەعیدم ﷺ بیست وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێك (بڕیاردرابێ) دروست ببێ خوا دروستی دەكات)).**

(١) بڕوانە: ٢٢٢٩.

(٢) ئافرەتان دووگیان و حامیلە نەبن.

(٣) عەزل: واتە: پیاو كە لەگەڵ ژندا دروست دەبێ، نەهێڵێ ئاوەكەی بڕواتە منداڵدانی ژنەكەوە و لە دەرەوە منداڵدانی بیرژێنێت. بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٧٥/١٥.

## ١٩- بابُ قَوْلِ اللهِ تعالى: ﴿لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴿٧٥﴾﴾ ص

٧٤١٠- حَدَّثَنِي مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «يَجْمَعُ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ، فَيَقُولُونَ: لَوِ اسْتَشْفَعْنَا إِلَى رَبِّنَا حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا هَذَا. فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ: يَا آدَمُ أَمَا تَرَى النَّاسَ؟ خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَأَسْجَدَ لَكَ مَلاَئِكَتَهُ وَعَلَّمَكَ أَسْمَاءَ كُلِّ شَيْءٍ، شَفِّعْ لَنَا إِلَى رَبِّنَا حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا هَذَا. فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكَ -وَيَذْكُرُ لَهُمْ خَطِيئَتَهُ الَّتِي أَصَابَ- وَلَكِنِ ائْتُوا نُوحًا، فَإِنَّهُ أَوَّلُ رَسُولٍ بَعَثَهُ اللَّهُ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ. فَيَأْتُونَ نُوحًا فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ -وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ الَّتِي أَصَابَ- وَلَكِنِ ائْتُوا إِبْرَاهِيمَ خَلِيلَ الرَّحْمَنِ. فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ -وَيَذْكُرُ لَهُمْ خَطَايَاهُ الَّتِي أَصَابَهَا- وَلَكِنِ ائْتُوا مُوسَى عَبْدًا أَتَاهُ اللَّهُ التَّوْرَاةَ وَكَلَّمَهُ تَكْلِيمًا. فَيَأْتُونَ مُوسَى فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ -وَيَذْكُرُ لَهُمْ خَطِيئَتَهُ الَّتِي أَصَابَ- وَلَكِنِ ائْتُوا عِيسَى عَبْدَ اللَّهِ وَرَسُولَهُ وَكَلِمَتَهُ وَرُوحَهُ. فَيَأْتُونَ عِيسَى فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ، وَلَكِنِ ائْتُوا مُحَمَّدًا ﷺ عَبْدًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ. فَيَأْتُونِي، فَأَنْطَلِقُ فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي، فَيُؤْذَنُ لِي عَلَيْهِ، فَإِذَا رَأَيْتُ رَبِّي وَقَعْتُ لَهُ سَاجِدًا، فَيَدَعُنِى مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدَعَنِي، ثُمَّ يُقَالُ لِي: ارْفَعْ مُحَمَّدُ، وَقُلْ يُسْمَعْ، وَسَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَحْمَدُ رَبِّي بِمَحَامِدَ عَلَّمَنِيهَا، ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا فَأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ، ثُمَّ أَرْجِعُ فَإِذَا رَأَيْتُ رَبِّي وَقَعْتُ سَاجِدًا، فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدَعَنِي، ثُمَّ يُقَالُ: ارْفَعْ مُحَمَّدُ، وَقُلْ يُسْمَعْ، وَسَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَحْمَدُ رَبِّي بِمَحَامِدَ عَلَّمَنِيهَا رَبِّي، ثُمَّ أَشْفَعُ، فَيَحُدُّ لِي حَدًّا فَأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ، ثُمَّ أَرْجِعُ فَإِذَا رَأَيْتُ رَبِّي وَقَعْتُ سَاجِدًا، فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدَعَنِي، ثُمَّ يُقَالُ:

ارْفَعْ مُحَمَّدُ، قُلْ يُسْمَعْ، وَسَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَحْمَدُ رَبِّي بِمَحَامِدَ عَلَّمَنِيهَا، ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا فَأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ، ثُمَّ أَرْجِعُ فَأَقُولُ: يَا رَبِّ، مَا بَقِيَ فِي النَّارِ إِلاَّ مَنْ حَبَسَهُ الْقُرْآنُ وَوَجَبَ عَلَيْهِ الْخُلُودُ». قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِنَ الْخَيْرِ مَا يَزِنُ شَعِيرَةً، ثُمَّ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ.

وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِنَ الخَيْرِ مَا يَزِنُ بُرَّةً، ثُمَّ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مَا يَزِنُ مِنَ الخَيْرِ ذَرَّةً»[١].

## ١٩- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بۆ کەسێک کە من بەدەستەکانی خۆم دروستم کردوە)

**٧٤١٠- قەتادە لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لەپیغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوا لە ڕۆژی دواییدا هەموو باوەڕداران کۆ دەکاتەوە هەر وەك کۆ کردنەوەیان لە دونیادا، ئینجا دەڵێن: خۆزگە (بەهۆی کەسێکەوە) تکامان لە پەروەردگارمان بکردایە تا ڕزگارمان بکات لە ئەم جێگایەمان، بۆیە دێن بۆ لای ئادەم ﷺ و دەڵێن: ئەی ئادەم ئایا ئەم خەڵکە نابینی؟ خوا بەدەستی خۆی دروستی کردووی و سوژدەی بە فریشتەکان برد بۆت و ناوی هەموو شتێکی فێر کردووی، دەی لای پەروەردگارمان تکامان بۆ بکە تا ڕزگارمان بکات لەم شوێنەمان (کە تێداین و زۆر ناڕەحەتین)، ئادەمیش دەڵێ: من ئەو پلەیەم نییە- وە باسی تاوانەکەی خۆی دەکات کە کردوویەتی تووشی بووە - بەڵام بڕۆن بۆ لای نووح ﷺ چونکە بێگومان ئەو یەکەم پێغەمبەرە خوا ناردویەتی بۆ خەڵکی سەر زەوی، ئەنجا دەڕۆن بۆ لای نووح ئەویش دەڵێ: من ئەو پلەیەم نییە - وە باسی تاوانەکەی خۆی دەکات کە کردویەتی تووشی بووە[٢] -بەڵام بڕۆن بۆ لای ئیبراهیمی خۆشەویستی خوای بەبەزەیی ﷺ، ئەوانیش دەڕۆن بۆ لای ئیبراهیم ئەویش دەڵێ: من ئەو پلەیەم نییە- وە باسی تاوانەکانی دەکات کە کردونی و تووشی بووە-بەڵام بڕۆن بۆ لای مووسا ﷺ کە بەندەیەکە خوا تەوراتی پێ بەخشیووە و ڕاستەوخۆ قسەی**

(١) بڕوانە: ٤٤.

(٢) کە پرسیارەی لە پەروەردگاری کرد دەربارەی ڕزگار کردنی کوڕەکەی و دواتر خوای کەورە گلەیی لێ کرد لەو پرسیارە.

لەگەڵ کردوە، ئینجا دێن بۆلای مووسا ﷺ ئەویش دەڵێ: من ئەو پلەیەم نییە - وە باسی تاوانەکانی دەکات کە کردونی وتووشی بووە -بەڵام بڕۆن بۆ لای عیسا ﷺ کە بەندە و پێغەمبەری خوایە، وە وشەی خوا و گیانی ئەوە ئەوانیش دەڕۆن بۆلای عیسا ﷺ، ئەویش دەڵێ: من ئەو پلەیەم نییە، بەڵام بڕۆن بۆ لای موحەممەد ﷺ کە بەندەیەك خوا لە گوناهی ڕابوردوو و داهاتووی خۆش بووە، جا دێن بۆ لای من، منیش دەڕۆم و داوای مۆڵەت دەکەم بۆ چوونە خزمەت پەروەردگارم، جا مۆڵەت دەدرێم بۆ چوونە خزمەتی، ئینجا کە پەروەردگارم بینی سوژدەی بۆ دەبەم، ئەنجا ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێ وازم لێ دێنێ، لە پاشان پێم دەوترێت: موحەممەد سەرت بەرز بکەرەوە، قسە بکە گوێت بۆ دەگیرێ و، داوا بکە پێت دەدرێت و، تکا بکە تکاکەت وەردەگیرێ، (منیش سەرم بەرز دەکەمەوە و) سوپاسی پەروەردگارم دەکەم بە چەند سوپاسێك کە فێری کردوم (و پێم دەڵێ:) لە پاشان تکا دەکەم جا سنوورێکم بۆ دیاری دەکات و دەیان خەمە بەهەشتەوە، لە پاشان دەگەڕێمەوە کە پەروەردگارم دی سوژدەی بۆ دەبەم، ئەنجا ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێ وازم لێ دێنێ، لە پاشان پێم دەوترێت: موحەممەد سەرت بەرز بکەرەوە، قسە بکە گوێت بۆ دەگیرێ و داوا بکە پێت دەدرێت و تکا بکە تکاکەت وەردەگیرێ، (منیش سەرم بەرز دەکەمەوە و) سوپاسی پەروەردگارم دەکەم بەچەند سوپاسێك کە فێری کردوم (و پێم دەڵێ)، لە پاشان تکا دەکەم جا سنوورێکم بۆ دیاری دەکات و دەیان خەمە بەهەشتەوە، لە پاشان دەگەڕێمەوە کە پەروەردگارم دی سوژدەی بۆ دەبەم، ئەنجا ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێ وازم لێ دێنێ، لە پاشان پێم دەوترێت: موحەممەد سەرت بەرز بکەرەوە، قسە بکە گوێت بۆ دەگیرێ و، داوا بکە پێت دەدرێت و، تکا بکە تکاکەت وەردەگیرێ، (منیش سەرم بەرز دەکەمەوە و) سوپاسی پەروەردگارم دەکەم بە چەند سوپاسێك کە فێری کردووم (و پێم

**دەڵێ)، لە پاشان تکا دەکەم، جا سنوورێکم بۆ دیاری دەکات و دەیان خەمە بەهەشتەوە، پاشان دەگەڕێمەوە و دەڵێم: ئەی پەروەردگارم کەس لە دۆزەخدا نەماوە جگە لەوانەی کە قورئان (بڕیاری) مانەوەی داون و بۆ هەمیشەیی پێویستە لە دۆزەخدا بن))، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) و کێشی دەنکە جۆیەك خێر لە دڵیدا بێ، لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە، پاشان ئەو کەسەش بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) و کێشی دەنکە گەنمێك خێر لە دڵیدا بێ، لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە، پاشان ئەو کەسەش بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) و کێشی وردیلەیەك خێر لە دڵیدا هەبێ، لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە (بەهەتا هەتایی لە دۆزەخدا نابێت) )).**

**٧٤١١-** حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: "يَدُ اللَّهِ مَلأَى لاَ يَغِيضُهَا نَفَقَةٌ، سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ". وَقَالَ: "أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ؟ فَإِنَّهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِي يَدِهِ" وَقَالَ: عَرْشُهُ عَلَى المَاءِ، وَبِيَدِهِ الأُخْرَى المِيزَانُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ»[1].

**٧٤١١-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((دەستی خوا هەمیشە پڕە، بەخشین لێی کەم ناکاتەوە، بەشەو و بەڕۆژ بە لێزمە دەبارێ و دەبەخشێ))، وە فەرمووی: ((پێم بڵێن لەو کاتەوەی ئاسمان و زەوی دروست کردوە چەندی بەخشیوە؟ چونکە بەڕاستی ئەوە لە دەستی دایە هیچ کەمی نەکردۆتەوە))، وە فەرمووی: ((عەرشی ئەو (خوا) لەسەر ئاوە، کێشانە و پێوەر بەدەستەکەی تری خوایە (هەر کەسی ویست) نزمی دەکات و (هەر کەسیشی ویست) بەرزی دەکات.**

---

(١) بڕوانە: ٤٦٨٤.

٧٤١٢- حَدَّثَنَا مُقَدَّمُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمِّي القَاسِمُ بْنُ يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يَقْبِضُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الأَرْضَ، وَتَكُونُ السَّمَوَاتُ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا المَلِكُ». رَوَاهُ سَعِيدٌ عَنْ مَالِكٍ[1].

**٧٤١٢- ئیبنو عومەر ﵄ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان خوا لە ڕۆژی قیامەتدا زەوی دەخاتە چنگێوە، ئاسمانەکانیش بەدەستی ڕاستیەوەن، لە پاشان دەفەرموێ: منم پادشا و دەسەڵاتدار)). سەعیدیش ئەم فەرودەی لە مالیکەوە گێڕاوەتەوە.**

٧٤١٣ - وَقَالَ عُمَرُ بْنُ حَمْزَةَ: سَمِعْتُ سَالِمًا، سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَذَا. وَقَالَ أَبُو اليَمَانِ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَقْبِضُ اللَّهُ الأَرْضَ»[2].

**٧٤١٣- عومەری کوڕی حەمزە وتی: لە ئیبنو عومەرم ﵄ بیست ئەویش ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕایەوە.**
**وە ئەبو لیەمان وتی: شوعەیب بۆی گێڕاینەوە لە زوهریەوە وتی: ئەبو سەلەمە بۆی گێڕامەوە کە ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا زەوی دەخاتە چنگێوە)).**

٧٤١٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، سَمِعَ يَحْيَى بْنَ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنِي مَنْصُورٌ وَسُلَيْمَانُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ يَهُودِيًّا جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَوَاتِ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْجِبَالَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالشَّجَرَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْخَلاَئِقَ عَلَى إِصْبَعٍ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ. فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى بَدَتْ

---

(١) بروانە: ٣١٩٤.
(٢) بروانە: ٤٨١٢.

نَوَاجِذُهُ ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ ﴾ الزمر. قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: وَزَادَ فِيهِ فُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ: فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَعَجُّبًا وَتَصْدِيقًا لَهُ[1].

**٧٤١٤- عەبیدە لە عەبدوڵڵاوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: جولەکەیەك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی موحەممەد بێگومان خوا ئاسمانەکانی لەسەر پەنجەیەکی ڕادەگرێ (دادەنێ)، زەویەکانیش لەسەر پەنجەیەکی و شاخەکانیش لەسەر پەنجەیەکی و درەختەکانیش لەسەر پەنجەیەکی و هەموو دروستکراوەکانی تریش لەسەر پەنجەیەکی دادەنێ (ڕادەگرێت)، پاشان خوا دەفەرموێ: منم پادشا، پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی هەتا ددانەکانی پێشەوەی دەرکەوتن، لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وە کافران خوایان نەناسیوە بەم جۆرەی شیاوی ئەو بێ).**

**یەحیای کوڕی سەعید دەڵێ: فوزەیلی کوڕی عیاز گێڕایەوە لە مەنصورەوە ئەویش لە ئیبراهیمەوە لەعەبیدەوە لە عەبدوڵڵاوە ئەمەی لێ زیاد کردوە: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی، وەك پێ سەرسام بوون و بەڕاست دانانی وتەکەی ئەو.**

٧٤١٥- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، سمِعْتُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: سَمِعْتُ عَلْقَمَةَ يَقُولُ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ فَقَالَ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَوَاتِ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالشَّجَرَ وَالثَّرَى عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْخَلاَئِقَ عَلَى إِصْبَعٍ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَنَا الْمَلِكُ. فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ ﴾ الزمر[2].

---

(١) بڕوانە: ٤٨١١.

(٢) بڕوانە: ٤٨١١.

**٧٤١٥- ئەعمەش دەڵێ: لە ئیبراهیمم بیست وتی: لە عەلقەمەم بیست دەیوت: عەبدوڵڵا ﷺ وتی: پیاوێك لە نامەدارەكان (جولەكەیەك) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی ئەبو لقاسیم بێگومان خوا ئاسمانەكانی لەسەر پەنجەیەكی ڕادەگرێ (دادەنێ)، زەویەكانیش لەسەر پەنجەیەكی و درەختەكانیش لەسەر پەنجەیەكی، خۆڵیش لەسەر پەنجەیەكی و هەموو دروستكراوەكانی تریش لەسەر پەنجەیەكی دادەنێ (ڕادەگرێت)، پاشان خوا دەفەرموێ: منم پادشا منم پادشا، ئینجا پێغەمبەرم ﷺ بینی پێكەنی، هەتا ددانەكانی پێشەوەی دەركەوتن، لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وە كافران خوایان نەناسیوە بەم جۆرەی شیاوی ئەو بێ).**

## ٢٠- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لا أحد أغْيَرُ مِنَ اللَّهِ»

وَقَالَ عُبَيْدُ الله بْنُ عَمْرٍو، عَنْ عَبْدِ المَلِكِ: "لَا شَخْصَ أَغْيَرُ مَنِ اللَّهِ"

٧٤١٦- حَدَّثَنَا مُوسَى، بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ المَلِكِ، عَنْ وَرَّادٍ كَاتِبِ المُغِيرَةِ، عَنِ المُغِيرَةِ، قَالَ: قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: لَوْ رَأَيْتُ رَجُلاً مَعَ امْرَأَتِي لَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ غَيْرَ مُصْفَحٍ. فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «تَعْجَبُونَ مِنْ غَيْرَةِ سَعْدٍ، وَاللَّهِ لأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ، وَاللَّهُ أَغْيَرُ مِنِّي، وَمِنْ أَجْلِ غَيْرَةِ اللَّهِ حَرَّمَ الفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ، وَلاَ أَحَدَ أَحَبُّ إِلَيْهِ العُذْرُ مِنَ اللَّهِ، وَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ بَعَثَ المُبَشِّرِينَ وَالْمُنْذِرِينَ، وَلاَ أَحَدَ أَحَبُّ إِلَيْهِ المِدْحَةُ مِنَ اللَّهِ، وَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ وَعَدَ اللَّهُ الجَنَّةَ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٦٨٤٦.

## ٢٠- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((هیچ کەسێک غیرەی[1] لە خوا زیاتر نییە))

عوبەیدوڵای کوڕی عەمر لە عەبدولمەلیکەوە دەگێڕێتەوە کە وتی:((هیچ مرۆڤێ لە خوا غیرەی زیاتر نییە)).

٧٤١٦- موغیرە دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ وتی: ئەگەر پیاوێك ببینم لەگەڵ ژنەکەمدا بێگومان بەشمشێر بەباری تیژیدا لێی دەدەم، ئەم وتەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((سەرتان سوڕدەمێنێ لە غیرەی[2] سەعد؟ سوێند بە خوا بێگومان من غیرەم لە سەعد زیاترە، خواش غیرەی[3] لە من زیاترە)).

وە لەبەر غیرەی (ڕێگری کردنی) خوایە کە گوناهە ناشرینەکانی حەرام کردوە، ئەوانەی ئاشکران و ئەوانەی شاراوەن لەو گوناهانە، وە کەس نییە بەقەدەر خوا عوزر و بەهانە نەهێشتنی پێ خۆش نییە، لەبەر ئەوەشە مژدەدەران و ترسێنەرانی[4] ناردووە، وە کەس بەقەدەر خوا پیاهەڵدانی پێ خۆش نییە، لەبەر ئەوەشە خوا بەڵێنی بەهەشتیدا (بەو باوەڕدارانەی گوێڕایەڵی دەکەن)) ).

## ٢١- بابٌ: قولُ الله: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً ﴿١٩﴾﴾ الأنعام. وَسَمَّى اللَّهُ نَفْسَهُ شَيْئًا ﴿قُلِ اللَّهُ ﴿١٩﴾﴾ الأنعام. وَسَمَّى النَّبِيُّ ﷺ القُرْآنَ شَيْئًا، وَهُوَ صِفَةٌ مِنْ صِفَاتِ اللَّه. وَقَالَ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ ﴿٨٨﴾﴾ القصص

٧٤١٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِرَجُلٍ: «أَمَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ؟». قَالَ: نَعَمْ، سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا. لِسُوَرٍ سَمَّاهَا[5].

---

(١) غیرە: واتە پێناخۆش بوونی گوناە و تاوان ڕقبوونەوە لێی، غیرەی خواش واتە: ڕێگری کردن لە تاوان و ڕقبوونەوە لێی.

(٢) غیرە: واتە پێناخۆش بوونی گوناە و تاوان و ڕقبوونەوە لێی.

(٣) غیرەی خوا: واتە ڕێگری کردنی لە تاوان ڕقبوونەوەی لێی.

(٤) واتە: پێغەمبەران ﷺ کە ئەو دوو سیفەتەیان هەیە

(٥) بڕوانە: ٢٣١٠.

## ٢١- باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوا: ((ئەی موحەممەدﷺ) بڵێ گرنگترین و گەورەترین شایەتیدان کامەیە)

خوای بەرز و بڵند ناوی خۆی بەشت بردووە (بڵێ خوا)، وە پێغەمبەریش ﷺ قورئانی بەشت ناو بردووە، لە کاتێکدا قورئان سیفەتێکە لە سیفەتەکانی خودا، وە خوا دەفەرمووی: (وە هەموو شتێك لە ناو دەچێ جگەلە زاتی خوا).

٧٤١٧- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە پیاوێك: ((ئایا هیچێك قورئانت لەبەرە؟)) وتی: بەڵێ، ئەو سوڕەتە و ئەو سوڕەتە، چەند سوڕەتێکی ناو هێنا.

## ٢٢- بابُ قوله تعالى: ﴿وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴿٧﴾﴾ هود

﴿وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾﴾ التوبة. قَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ ﴿ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٩﴾﴾ البقرة. ارْتَفَعَ، ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ ﴿٢٩﴾﴾ البقرة: خَلَقَهُنَّ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ ﴿ٱسْتَوَىٰ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف. عَلاَ ﴿عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄: ﴿ٱلْمَجِيدُ ﴿١٥﴾﴾ البروج: الكَرِيمُ، وَ﴿ٱلْوَدُودُ ﴿١٤﴾﴾ البروج. الحَبِيبُ. يُقَالُ: حَمِيدٌ مَجِيدٌ، كَأَنَّهُ فَعِيلٌ مِنْ مَاجِدٍ، مَحْمُودٌ مِنْ حَمِيدٍ

## ٢٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە عەرشی (خوا) لەسەر ئاو بوو)

(وە ئە (خوا) پەروەردگاری عەرشی گەورەیە). ئەبو لعالییە دەڵێ: ﴿ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٩﴾﴾ البقرة: بەرز بوویەوە، ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ ﴿٢٩﴾﴾ البقرة: دروستی کردن. موجاهید دەڵێ: ﴿ٱسْتَوَىٰ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف: چوویە ﴿عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف: سەر عەرش

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ:** ﴿ ٱلْمَجِيدُ ﴿١٥﴾ ﴾ البروج: **بەرز و پایەدار و بەڕێز.**

﴿ ٱلْوَدُودُ ﴿١٤﴾ ﴾ البروج: **زۆر خۆشەویست (لای بەندەکانی).**

**دەوترێ:** (حَمِيدٌ مَجِيدٌ) **وەك ئەوە وایە لەسەر کێش** (فَعِيلٌ) **بێت لە** (مَاجِدٍ) **وەرگیرابێت**[1]، (حَمِيدٌ)**یش وەك ئەوە وایە لەسەر کێشی** (مَحْمُودٌ) **بێت لە** (حَمِيدٌ)**ـەوە وەرگیرابێت**[2].

٧٤١٨- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ جَامِعِ بْنِ شَدَّادٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: إِنِّي عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ جَاءَهُ قَوْمٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ، فَقَالَ: «اقْبَلُوا البُشْرَى يَا بَنِي تَمِيمٍ». قَالُوا: بَشَّرْتَنَا فَأَعْطِنَا. فَدَخَلَ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ اليَمَنِ فَقَالَ: «اقْبَلُوا البُشْرَى يَا أَهْلَ اليَمَنِ إِذْ لَمْ يَقْبَلْهَا بَنُو تَمِيمٍ». قَالُوا: قَبِلْنَا، جِئْنَاكَ لِنَتَفَقَّهَ فِي الدِّينِ، وَلِنَسْأَلَكَ عَنْ أَوَّلِ هَذَا الأَمْرِ مَا كَانَ؟. قَالَ: «كَانَ اللَّهُ وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ قَبْلَهُ، وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ، ثُمَّ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ، وَكَتَبَ فِي الذِّكْرِ كُلَّ شَيْءٍ». ثُمَّ أَتَانِي رَجُلٌ فَقَالَ: يَا عِمْرَانُ أَدْرِكْ نَاقَتَكَ فَقَدْ ذَهَبَتْ: فَانْطَلَقْتُ أَطْلُبُهَا، فَإِذَا السَّرَابُ يَنْقَطِعُ دُونَهَا، وَايْمُ اللَّهِ لَوَدِدْتُ أَنَّهَا قَدْ ذَهَبَتْ وَلَمْ أَقُمْ[3].

**٧٤١٨- عیمران کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووم کاتێ چەند کەسێك لە بەنی تەمیم هاتنە خزمەتی، جا فەرمووی: ((مژدەم لێ وەرگرن ئەی بەنو تەمیم))، وتیان: مژدەت پێداین دەی ماڵ و سامانیشمان پێ ببەخشە، ئینجا چەند کەسێك خەڵکی یەمەن هاتنە خزمەتی فەرمووی: ((ئەی خەڵکی یەمەن ئەو موژدەی بەنو تەمیم وەریان نەگرت ئێوە وەری گرن))،**

---

(١) واته: (مجيد) بەمانای بەرز و پایەدار و بەخشندە لە خودی خۆیدا واته: ئیسمی فاعیله.
(٢) (حميد) بەمانای سوپاس کراو، واته: ئیسمی مەفعوله.
(٣) بڕوانه: ٣١٩٠.

**وتيان: وەرمان گرت، ئێمە هاتووين بۆ ئەوى شارەزا ببين لە ئايينى ئيسلام، وە بۆ ئەوەى پرسيارت لێ بكەين سەرەتاى ئەم بوونەوەرە چۆن بووە؟. فەرمووى: ((لە سەرتاوە خوا هەبووە هيچ شتێكى تر پێش خوا نەبووە، وە عەرشى خوا لەسەر ئاو بوو، پاشان خوا ئاسمانەكان و زەوى دروست كرد، وە لە** (لوح المحفوظ)**دا هەموو شتێكى (ديارى كردوو) نووسيوە))، پاشان پياوێك هات بۆ لام و وتى: ئەى عيمران بگە بە وشترەكەت بەڕاستى (بەرەڵابوو) ڕۆشت، منيش بەپەلە ڕۆشتم بەدوايدا سەير ئەكەم تراويلكەى كەوتۆتە نێوانمانەوە ڕێگرە لەوەى وشترەكە ببينم، جا سوێند بە خوا بەڕاستى زۆر پێم خۆش بوو ووشتەكەم بڕۆشتايە و هەڵنەساميە، (وە گوێم لە وتەكانى پێغەمبەر ﷺ بوايە).**

**٧٤١٩-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ يَمِينَ اللَّهِ مَلأَى لاَ يَغِيضُهَا نَفَقَةٌ، سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ، أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ؟ فَإِنَّهُ لَمْ يَنْقُصْ مَا فِي يَمِينِهِ، وَعَرْشُهُ عَلَى المَاءِ، وَبِيَدِهِ الأُخْرَى الفَيْضُ -أَوِ الْقَبْضُ- يَرْفَعُ وَيَخْفِضُ»[1].

**٧٤١٩- ئەبو هورەيرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ كە فەرموويەتى: ((بێگومان دەستى ڕاستى خوا هەميشە پڕە، بەخشين لێى كەم ناكاتەوە، بەشەو و بەرۆژ بەردەوام دەبەخشێ، پێم بڵێن لەو كاتەوەى ئاسمان و زەوى دروست كردوە چەندى بەخشيوە؟ چونكە بەڕاستى هيچى كەم نەكردۆتەوە لەوەى لە دەستى ڕاستى دايە، وە عەرشى ئەو (خوا) لەسەر ئاوە، بەخشين يان مردن لە دەستەكەى ترى دايە، (هەر كەسى ويست) بەرزى دەكات و (هەر كەسيشى ويست) نزمى دەكات.**

---

(١) بڕوانە: ٤٦٤٨.

٧٤٢٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ المُقَدَّمِيُّ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: جَاءَ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ يَشْكُو، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «اتَّقِ اللَّهَ، وَأَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ». قَالَتْ عَائِشَةُ: لَوْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَاتِمًا شَيْئًا لَكَتَمَ هَذِهِ. قَالَ: فَكَانَتْ زَيْنَبُ تَفْخَرُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: زَوَّجَكُنَّ أَهَالِيكُنَّ، وَزَوَّجَنِي اللَّهُ تَعَالَى مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَوَاتٍ.

**٧٤٢٠- ئەنەس ﷺ دەڵێ: زەیدی کوڕی حاریسە ﷺ سکاڵای کرد [١]، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو پێی: ((لە خودا بترسە خێزانت (زەینەب) لای خۆت ڕاگرە))، عائیشەش[٢] ﷺ وتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی بشاردایەتەوە ئەم ئایەتەی دەشاردەوە، (ئەنەس) وتی: ئینجا زەینەب خۆی هەڵدەکێشا بەسەر هاوسەرەکانی تری پێغەمبەردا و ﷺ دەیوت: ئێوە کەسوکارتان مارەی کردوون و بەشوی داون، بەڵام من خوای بەرز و بڵند لەسەروو حەوت ئاسمانەوە بەشووی داوم و مارەی کردووم (بۆ پێغەمبەر ﷺ).**

٧٤٢٠م- وَعَنْ ثَابِتٍ: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ ﴿٣٧﴾﴾ الأحزاب، نَزَلَتْ فِي شَأْنِ زَيْنَبَ وَزَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ[٣].

**٧٤٢٠م- (بە ڕشتەکەی پێشوو حەممای کوڕی زەید دەگێڕێتەوە) لە سابیتەوە ﷺ دەڵێ: ئەم ئایەتە (وە لە دڵی خۆتدا شتێك دەشاریتەوە کە خوا ئاشکرا دەکات، وە لە (قسەی) خەڵك دەترسیت)، دەربارەی حاڵی زەینەب و زەیدی کوڕی حاریسە دابەزی.**

(١) لەدەست زەینەبی خێزانی ﷺ.
(٢) لە گێڕانەوەیەکی تردا بەم جۆرەیە: ئەنەس وتی:
(٣) بڕوانە: ٤٧٨٧.

٧٤٢١- حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ طَهْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: نَزَلَتْ آيَةُ الحِجَابِ فِي زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَأَطْعَمَ عَلَيْهَا يَوْمَئِذٍ خُبْزًا وَلَحْمًا، وَكَانَتْ تَفْخَرُ عَلَى نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ وَكَانَتْ تقُولُ: إِنَّ اللَّهَ أَنْكَحَنِي فِي السَّمَاءِ[1].

**٧٤٢١- ئەنەس ﵁ دەڵێ: ئایەتی حیجاب[2] دەربارەی زەینەبی کچی جەحش[3] ﵂ دابەزی، لەو ڕۆژەدا بەهۆی شایی ئەو (زەینەب)ـەوە (پێغەمبەر ﷺ) نان و گۆشتی دەرخواردی خەڵکیدا، وە زەینەبیش شانازی دەکرد بەسەر خێزانەکانی تری پێغەمبەردا ﷺ دەیوت: بێگومان خوای گەورە لە ئاسمان منی مارە کردوە (بۆ پێغەمبەر ﷺ)**

٧٤٢٢- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَمَّا قَضَى الْخَلْقَ كَتَبَ عِنْدَهُ فَوْقَ عَرْشِهِ: إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي».

**٧٤٢٢-ئەبو هورەیرە ﵁ گێڕایەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی: ((بێگومان کاتێ خوا لە دروستکردنی بوونەوەر بوویەوە، لای خۆی لەسەر عەرش نوسیوویەتی: بێگومان بەزەیی و میهرەبانی من زاڵ بووە بەسەر توڕەی و خەشممدا)).**

٧٤٢٣- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ، حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ فُلَيْحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، حَدَّثَنِي هِلاَلٌ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَأَقَامَ الصَّلاَةَ، وَصَامَ رَمَضَانَ، كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، هَاجَر فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ

(١) بڕوانە: ٤٧٩١.
(٢) حیجاب:واتە: خۆداپۆشین و خۆدەرنەخستن بۆ پیاوانی بێگانە، نە لە ماڵەوە و نە لە دەرەوەی ماڵ.
(٣) لەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ زەینەبی گوێزایەوە بە بووکی، ئایەتی حیجاب دابەزی.

جَلَسَ فِي أَرْضِهِ الَّتِي وُلِدَ فِيهَا». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلاَ نُنَبِّئُ النَّاسَ بِذَلِكَ؟. قَالَ: «إِنَّ فِي الجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ، كُلُّ دَرَجَتَيْنِ مَا بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَسَلُوهُ الفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الجَنَّةِ وَأَعْلَى الجَنَّةِ، وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الجَنَّةِ»[١].

**٧٤٢٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەرکەس باوەڕی هەبێت بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی و نوێژ بکات و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت، ئەوە پێویستە لەسەر خوا بیخاتە بەهەشتەوە، کۆچی کردبێت لە ڕێی خوادا، یان هەر لەو وولاتەی تێیدا لە دایك بووە دانیشتبێت[٢]))، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەم هەواڵە بدەین بەخەڵکی؟ فەرمووی: ((بێگومان لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە خوا بۆ خەباتگێڕانی ڕێی خۆی ئامادە کردوە، نێوان هەر دوو پلەیەکیان بە ئەندازەی نێوان ئاسمان و زەویە، جا ئەگەر داواتان لە خوا کرد داوای فیردەوس بکەن، چونکە بێگومان فیردەوس ناوەڕاستی بەهەشتە، بەرزترین جێگای بەهەشتە، وە لە سەرووی فیردەوسەوە عەرشی خوای بەبەزەییە، وە لە وێشەوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن)).**

**٧٤٢٤-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ -هُوَ التَّيْمِيُّ- عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ، فَلَمَّا غَرَبَتِ الشَّمْسُ قَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ، هَلْ تَدْرِي أَيْنَ تَذْهَبُ هَذِهِ؟». قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «فَإِنَّهَا تَذْهَبُ تَسْتَأْذِنُ فِي السُّجُودِ فَيُؤْذَنُ لَهَا، وَكَأَنَّهَا قَدْ قِيلَ لَهَا: ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ. فَتَطْلُعُ مِنْ مَغْرِبِهَا». ثُمَّ قَرَأَ: (ذَلِكَ مُسْتَقَرٌّ لَهَا) فِي قِرَاءَةِ عَبْدِ اللَّهِ[٣].

---

(١) بڕوانە: ٢٧٩٠.
(٢) خەبات و تێکۆشان نەکات.
(٣) بڕوانە: ٣١٩٩.

**٧٤٢٤- ئیبراهیم - ئیبراهیمی تەیمی یە- لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە لە ئەبو زەڕەوە ﷺ دەڵێ: ڕۆشتمە ژوورەوە بۆ مزگەوت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، كاتێ خۆرئاوا بوو فەرمووی: ((ئەی ئەبو زەڕ دەزانی ئەم (خۆرە) بۆ كوێ دەڕوات))، دەڵێ: وتم خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ دەزانن، فەرمووی: ((بێگومان خۆر دەڕوات و مۆڵەت دەخوازێت بۆ سوژدە بردن، جا مۆڵەتی پێ دەدرێت، وەك ئەوە وایە پێی وترابێت: بگەڕێرەوە بۆ ئەو شوێنەی كە لێوەی هاتووی، ئەنجا لە خۆرئاوا بوونیەوە هەڵدێت))، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (ئەوە بنكە و جێگای وەستانیەتی)، لە خوێندنەوەی[1] عەبدوڵڵای كوڕی مەسعووددا وایە.**

٧٤٢٥- حَدَّثَنَا مُوسَى، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ السَّبَّاقِ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ ابْنِ السَّبَّاقِ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ حَدَّثَهُ قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ، فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ حَتَّى وَجَدْتُ آخِرَ سُورَةِ التَّوْبَةِ مَعَ أَبِي خُزَيْمَةَ الأَنْصَارِيِّ، لَمْ أَجِدْهَا مَعَ أَحَدٍ غَيْرِهِ ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴿١٢٨﴾﴾ التوبة، حَتَّى خَاتِمَةِ بَرَاءَةٌ[2].

حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ بِهَذَا، وَقَالَ: مَعَ أَبِي خُزَيْمَةَ الأَنْصَارِيِّ.

**٧٤٢٥- ئیبنو شیهاب لە ئیبنو سەبباقەوە گێڕایەوە وتی: بێگومان زەیدی كوڕی سابیت ﷺ بۆی گێڕایەوە و وتی: ئەبو بەكر ﷺ ناردی بەشوێنمدا (وتی: ئایەتەكان قورئان كۆبكەرەوە و بینووسەرەوە)، منیش گەڕام بە دوای ئایەتەكانی قورئاندا (و كۆم كردنەوە و نووسیمەوە)، تا كۆتایی سورەتی تەوبەم**

---

(١) ئەمە ڕاڤە و تەفسیرە نەک خوێندنەوە، ئەوەی کە مەشهورە لە عەبدوڵڵاوە بەم جۆرەیە: (لا مستقر لها) وەک لە کتێبی (المحتسب :٢١٢/٢ دا هاتووە.

(٢) بڕوانە: ٢٨٠٧.

**لای خوزەیمەی ئەنصاری دۆزیەوە ،کە ئەو کۆتاییەم لای کەسی تر نەدۆزییەوە جگەلە ئەو: (سوێند بەخوا بەڕاستی لە خۆتان پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە)، تا کۆتایی سورەتەکە.**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) یەحیای کوڕی بوکەیر بۆی گێڕاینەوە وتی: لەیس بۆی گێڕاینەوە لە یونسەوە ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە، وە وتی: لەگەڵ ئەبو خوزەیمەی ئەنصاریدا بوو[1].**

**٧٤٢٦-** حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُول عِنْدَ الكَرْبِ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَلِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ العَرْشِ الْعَظِيمِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الأَرْضِ رَبُّ العَرْشِ الكَرِيمِ»[2].

**٧٤٢٦- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە کاتی دڵتەنگی و ناڕەحەتیدا ئەم دووعایەی دەکرد: ((هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خوای زانای لەسەرخۆ، هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە پەروەردگاری عەرشی گەورە، هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خوای پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی و پەروەردگاری عەرشی بەڕێز)).**

**٧٤٢٧-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «النَّاسُ يَصْعَقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَإِذَا أَنَا بِمُوسَى آخِذٌ بِقَائِمَةٍ مِنْ قَوَائِمِ العَرْشِ»[3].

---

(١) واتە: ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی تەوبە.

(٢) بڕوانە: ٦٣٤٥.

(٣) بڕوانە: ٢٤١٢.

**٧٤٢٧- ئەبو سەعید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لە ڕۆژی دواییدا هەموو کەس لە هۆش خۆیان دەچن، جا من موسا ﷺ دەبینم باوەشی کردوە بە قاچێك لە قاچەکانی عەرشدا)).**

٧٤٢٨ - وَقَالَ المَاجِشُونُ: عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الفَضْلِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ بُعِثَ فَإِذَا مُوسَى آخِذٌ بِالْعَرْشِ»[1].

**٧٤٢٨- ئەبو هورەیرە: ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((جا من یەکەم کەسم زیندوو دەکرێمەوە (هۆش دەکەمەوە)، جا موسا ﷺ دەبینم دەستێکی گرتووە بە (قاچێکی) عەرشەوە )).**

## ٢٣- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ تَعْرُجُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ ﴿٤﴾ ﴾ المعارج

وَقَوْلِهِ تعالى: ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ﴿١٠﴾ ﴾ فاطر

وَقَالَ أَبُو جَمْرَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: بَلَغَ أَبَا ذَرٍّ مَبْعَثُ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ لأَخِيهِ: اعْلَمْ لِي عِلْمَ هَذَا الرَّجُلِ الذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ يَأْتِيهِ الْخَبَرُ مِنَ السَّمَاءِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: العَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُ الكَلِمَ الطَّيِّبَ. يُقَالُ: ﴿ ذِى ٱلْمَعَارِجِ ﴿٣﴾ ﴾ المعارج. المَلاَئِكَةُ تَعْرُجُ إِليه.

## ٢٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (فریشتەکان و جیبریل ﷺ سەردەکەون بۆ لای خوا)

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند (وتەی پاك و چاك تەنها بۆلای ئەو (خوا) سەردەکەوێ).**

(١) بڕوانە: ٢٤١١.

-ئەبو جەمرە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەبو زەڕ ﷺ كاتێ هەواڵی ناردنی پێغەمبەری ﷺ پێ گەشت، بە (ئونەیسی) برای وت: هەواڵی ئەو پیاوەم بۆ بپرسە كە دەڵێ: ئەو هەواڵی لە ئاسمانەوە بۆ دێت.

وە موجاهید دەڵێ: كردەوە چاكەكان و وتە پاك و چاكەكان بەرز دەكاتەوە. دەوترێت: ﴿ ذِى ٱلْمَعَارِجِ ۝٣ ﴾ المعارج، واتە: فریشتەكان سەردەكەون و بەرز دەبنەوە بۆ لای خودا.

٧٤٢٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ العَصْرِ وَصَلاَةِ الفَجْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ فَيَسْأَلُهُمْ -وَهْوَ أَعْلَمُ بِكُمْ- فَيَقُولُ: كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي؟ فَيَقُولُونَ: تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ»[1].

٧٤٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((چەند فریشتەیەك بەشەو چەند فریشتەیەك بەڕۆژ بەشوێن یەكتریدا بەنۆرە لەگەڵتانن، وە لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسردا بەیەك دەگەن، پاشان ئەوانەی شەو لەگەڵتان بوون بەرز دەبنەوە (بۆ خزمەتی خوای گەورە)، ئەویش پرسیاریان لێ دەكات (دەربارەی بەندەكان) -لە كاتێكدا خۆی شارەزاترە بە ئێوە- دەفەرمووی: چۆن بەندەكانی منتان بەجێ هێشت؟ فریشتەكانیش دەڵێن: كە بەجێمان هێشتن نوێژیان دەكرد، كاتێكیش ڕۆشتین بۆ لایان نوێژیان دەكرد)).

٧٤٣٠ - وَقَالَ خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ، وَلاَ

(١) بڕوانە: ٥٥٥.

يَصْعَدُ إِلَى اللهِ إِلاَّ الطَّيِّبُ فَإِنَّ اللهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يُرَبِّيهَا لِصَاحِبِهِ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الجَبَلِ». وَرَوَاهُ وَرْقَاءُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «وَلاَ يَصْعَدُ إِلَى اللهِ إِلاَّ الطَّيِّبُ»[١].

**٧٤٣٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس بەئەندازەی یەك دەنکە خورما کە بەحەڵاڵ پەیداکراو ببەخشێت، وە ماڵی حەڵاڵ نەبێ بەرز نابێتەوە بۆ لای خودا و گیرا نابێت، جا بێگومان خوای گەورە بەدەستی ڕاستی وەری دەگرێ، پاشان خوا گەشەی پێدەدات بۆخاوەنەکەی، وەك ئەوەی کەسێکتان جوانوەکەی بەخێو دەکات، هەتا بەقەدەر کێوێکی لێ دێت))، (ئەوەندە پاداشتی بەخشینەکە گەورەی دەکات بۆ خاوەنەکەی). وە وەرقا گێڕاویەتیەوە لە عەبدوڵلای کوڕی دینارەوە لە سەعیدی کوڕی یەسارەوە ئەویش لە ئەبو ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((وە (بەخشینێك) چاك و پاك نەبێت سەرناکەوێ بۆ لای خوا)).**

**٧٤٣١**- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي العَالِيَةِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو بِهِنَّ عِنْدَ الكَرْبِ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ العَظِيمُ الحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ العَرْشِ العَظِيمِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ»[٢].

**٧٤٣١- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە لە کاتی دڵتەنگی و نارەحەتیدا بەم وتانە دووعای دەکرد: ((هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خوای گەورەی لەسەرخۆ، هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە**

(١) بڕوانە: ١٤١٠.
(٢) بڕوانە: ٦٣٤٥.

**پەروەردگاری عەرشی گەورە، هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خوای پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی و پەروەردگاری عەرشی بەڕێز)).**

٧٤٣٢- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ أَبِي نُعْمٍ -أَوْ أَبِي نُعْمٍ، شَكَّ قَبِيصَةُ- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: بُعِثَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِذُهَيْبَةٍ، فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةٍ.
وَحَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ أَبِي نُعْمٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: بَعَثَ عَلِيٌّ -وَهْوَ بِالْيَمَنِ- إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِذُهَيْبَةٍ فِي تُرْبَتِهَا، فَقَسَمَهَا بَيْنَ الأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ الحَنْظَلِيِّ ثُمَّ أَحَدِ بَنِي مُجَاشِعٍ، وَبَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ بَدْرٍ الْفَزَارِيِّ، وَبَيْنَ عَلْقَمَةَ بْنِ عُلاَثَةَ الْعَامِرِيِّ ثُمَّ أَحَدِ بَنِي كِلاَبٍ، وَبَيْنَ زَيْدِ الخَيْلِ الطَّائِيِّ ثُمَّ أَحَدِ بَنِي نَبْهَانَ، فَتَغَضَّبَتْ قُرَيْشٌ وَالأَنْصَارُ فَقَالُوا: يُعْطِيهِ صَنَادِيدَ أَهْلِ نَجْدٍ وَيَدَعُنَا قَالَ: «إِنَّمَا أَتَأَلَّفُهُمْ». فَأَقْبَلَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ، نَاتِئُ الْجَبِينِ، كَثُّ اللِّحْيَةِ، مُشْرِفُ الوَجْنَتَيْنِ، مَحْلُوقُ الرَّأْسِ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، اتَّقِ اللَّهَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَمَنْ يُطِيعُ اللَّهَ إِذَا عَصَيْتُهُ، فَيَأْمَنِّي عَلَى أَهْلِ الأَرْضِ، وَلاَ تَأْمَنُونِي». فَسَأَلَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ قَتْلَهُ -أُرَاهُ خَالِدَ بْنَ الوَلِيدِ- فَمَنَعَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا وَلَّى قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمًا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ، يَقْتُلُونَ أَهْلَ الإِسْلاَمِ، وَيَدَعُونَ أَهْلَ الأَوْثَانِ، لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ عَادٍ»[1].

**٧٤٣٢- قەبیصە بۆی گێڕاینەوە وتی: سوفیان بۆی گێڕاینەوە لە باوکیەوە لە کوڕی ئەبی نوعمەوە - یان لە ئەبی نوعمەوە، قەبیصە گومانی بردووە- لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ دەڵێ :پارچە ئاڵتوونێك نێردرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش دابەشی کرد لە نێوان چوار کەسدا.**

---

(١) بڕوانە: ٣٣٤٤.

وه ئیسحاقی کوڕی نەصر بۆی گێڕامەوە وتی: عەبدوڕەزاق بۆی گێڕاینەوە وتی: سوفیان بۆی گێڕاینەوە لە باوکیەوە لە کوڕی ئەبی نوعمەوە ئەویش لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێڕایەوە دەڵێ: عەلی ﷺ - کاتێ لە یەمەن بوو- پارچە ئاڵتوونێکی کە هی خۆڵ بوو[1] نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش دابەشی کرد لە نێوان ئەقرەعی کوڕی حابیسی حەنزەلی، پاشان یەکێك لە کوڕانی موجاشیع، وە لە نێوان عویەینەی کوڕی بەدری فەزاری وعەلقەمەی کوڕی عولاسەی عامیری پاشان کەسێکی بەنی کیلاب، وە لە نێوان زەیدی خەیلی تائی و پاشان کەسێکی بەنی نەبهان، بۆیە قورەیشی و ئەنصارییەکان تورە بوون و وتیان: بەشی سەرۆکەکانی خەڵکی نەجد دەدات و واز لە ئێمە دێنی (و بەشمان نادات)، پێغەمبەریش فەرمووی: ((بێگومان من دڵیان دا ئەهێنم)) [2]، ئەنجا پیاوێك کە هەردوو چاوی چووبوو بەقوڵا و ناوچاوانی قۆقز بوو[3]، ڕیشێکی پڕی هەبوو کوڵمەکانی ئەستوور بوون، سەری تاشرابوو، هات وتی: ئەی موحەممەد لە خوا بترسە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((جا ئەگەر من سەرپێچی خوا بکەم کێ گوێڕایەڵی خوا دەکات؟ خوا منی بەئەمین داناوە بۆ سەر خەڵکی زەوی، دەی ئێوە بەئەمینم دانانێن؟)) بۆیە پیاوێك لە خەڵکەکە - وابزانم خالید کوڕی وەلید بوو - داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد ئەو پیاوە بکوژێت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەدا، جا کاتێ پیاوەکە پشتی هەڵکرد و ڕۆشت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لە وەچە و نەوەی ئەم پیاوە کەسانێك پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن لە گەروویان ناچێتە خوارەوە، لە ئاینی (ئیسلام) دەردەچن وەك چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێت، خەڵکی مسوڵمان دەکوژن و، واز لە خەڵکی بتپەرست دێنن، جا سوێند بە خوا ئەگەر پێیان بگەم دڵنیابن وەك گەلی عاد دەیانکوژم (قڕیان دەکەم) )).

---

(١) کەنەکرابوو بەخشڵ.

(٢) بۆ خۆشویستنی ئیسلام.

(٣) بۆ پێشەوە دەرچوو بوو.

٧٤٣٣- حَدَّثَنَا عَيَّاشُ بْنُ الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ قَوْلِهِ: ﴿ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ﴿٣٨﴾ ﴾ يس، قَالَ: «مُسْتَقَرُّهَا تَحْتَ العَرْشِ»[1].

**٧٤٣٣- ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (خۆریش بەرەو بنکەی خۆی (لە گەڕان دایە و دەڕوات)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بنکەی وەستانی لە ژێر عەرش دایە)).**

## ٢٤- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تعالى: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ القيامة

٧٤٣٤- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ وَهُشَيْمٌ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ نَظَرَ إِلَى القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ قَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ، لاَ تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَصَلاَةٍ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ، فَافْعَلُوا»[2].

## ٢٤- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (زۆر ڕووخسار لەو ڕۆژەدا گەشاوەن، تەماشای پەروەردگاریان دەکەن)

**٧٤٣٤-جەریری (کوڕی عەبدوڵڵا) ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین کاتێ سەیری مانگی کرد لە شەوی چواردەدا، فەرمووی: ((بێگومان لە داهاتوودا (قیامەت) پەروەردگارتان دەبینن چۆن ئێستا ئەم مانگی چواردە دەبینن بەبێ قەرەباڵغی و پاڵپاڵێن بۆ بینینی، جا ئەگەر توانیتان نوێژێکی**

---

(١) بڕوانە: ٣١٩٩.

(٢) بڕوانە: ٥٥٤.

**پێش خۆرهەڵاتن و نوێژێکی پێش ئاوابوونی خۆرتان لە دەست دەرنەچێ، (با لەدەستتان دەرنەچێ) ئەوە بیان کەن)).**

٧٤٣٥- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ يُوسُفَ اليَرْبُوعِيُّ، حَدَّثَنَا أَبُو شِهَابٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ عِيَانًا»[1].

**٧٤٣٥-جەریری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئێوە پەروەردگارتان بەچاوی خۆتان دەبینن)).**

٧٤٣٦- حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الجُعْفِيُّ، عَنْ زَائِدَةَ، حَدَّثَنَا بَيَانُ بْنُ بِشْرٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيْلَةَ البَدْرِ فَقَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا، لاَ تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ»[2].

**٧٤٣٦- جەریری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوی مانگی چواردە هاتە ناومان و فەرمووی: ((بێگومان ئێوە لە داهاتوودا لە قیامەتدا پەروەردگارتان دەبینن، وەك چۆن ئەم (مانگ)ـە دەبینن قەڵەباڵغی و پاڵپاڵێن ناکەن بۆ بینینی)).**

٧٤٣٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّاسَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «هَلْ تُضَارُّونَ فِي القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ؟». قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: «فَهَلْ تُضَارُّونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ؟». قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: «فَإِنَّكُمْ

(١) بڕوانە: ٥٥٤.

(٢) بڕوانە: ٥٥٤.

تَرَوْنَهُ كَذَلِكَ، يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُ: مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتَّبِعْهُ. فَيَتْبَعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ الشَّمْسَ، وَيَتْبَعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ القَمَرَ القَمَرَ، وَيَتْبَعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ الطَّوَاغِيتَ، وَتَبْقَى هَذِهِ الأُمَّةُ فِيهَا شَافِعُوهَا -أَوْ مُنَافِقُوهَا، شَكَّ إِبْرَاهِيمُ- فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ: هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا، فَإِذَا جَاءَنَا رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فِي صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا. فَيَتْبَعُونَهُ، وَيُضْرَبُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَيْ جَهَنَّمَ، فَأَكُونُ أَنَا وَأُمَّتِي أَوَّلَ مَنْ يُجِيزُهَا، وَلاَ يَتَكَلَّمُ يَوْمَئِذٍ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، هَلْ رَأَيْتُمُ السَّعْدَانَ؟». قَالُوا نَعَمْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ.

قَالَ: «فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ مَا قَدْرُ عِظَمِهَا إِلاَّ اللَّهُ، تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ، فَمِنْهُمُ الْمُوبَقُ بَقِيَ بِعَمَلِهِ -أَوِ الْمُوثَقُ بِعَمَلِهِ- وَمِنْهُمُ الْمُخَرْدَلُ أَوِ الْمُجَازَى -أَوْ نَحْوُهُ- ثُمَّ يَتَجَلَّى، حَتَّى إِذَا فَرَغَ اللَّهُ مِنَ القَضَاءِ بَيْنَ العِبَادِ وَأَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ بِرَحْمَتِهِ مَنْ أَرَادَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، أَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوا مِنَ النَّارِ مَنْ كَانَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا، مِمَّنْ أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَرْحَمَهُ مِمَّنْ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَيَعْرِفُونَهُمْ فِي النَّارِ بِأَثَرِ السُّجُودِ، تَأْكُلُ النَّارُ ابْنَ آدَمَ إِلاَّ أَثَرَ السُّجُودِ، حَرَّمَ اللَّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُودِ، فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ قَدِ امْتُحِشُوا، فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ، مَاءُ الحَيَاةِ فَيَنْبُتُونَ تَحْتَهُ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ، ثُمَّ يَفْرُغُ اللَّهُ مِنَ القَضَاءِ بَيْنَ العِبَادِ، وَيَبْقَى رَجُلٌ مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ عَلَى النَّارِ هُوَ آخِرُ أَهْلِ النَّارِ دُخُولاً الجَنَّةَ فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ، اصْرِفْ وَجْهِي عَنِ النَّارِ، فَإِنَّهُ قَدْ قَشَبَنِي رِيحُهَا وَأَحْرَقَنِي ذَكَاؤُهَا. فَيَدْعُو اللَّهَ بِمَا شَاءَ أَنْ يَدْعُوَهُ، ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ هَلْ عَسَيْتَ إِنْ أُعْطِيتَ ذَلِكَ أَنْ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ؟. فَيَقُولُ: لاَ وَعِزَّتِكَ، لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ، وَيُعْطِي رَبَّهُ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ مَا شَاءَ، فَيَصْرِفُ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ، فَإِذَا أَقْبَلَ على الجَنَّةِ وَرَآهَا سَكَتَ، مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَسْكُتَ ثُمَّ يَقُولُ: أَيْ رَبِّ، قَدِّمْنِي إِلَى بَابِ الجَنَّةِ. فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: أَلَسْتَ قَدْ أَعْطَيْتَ عُهُودَكَ وَمَوَاثِيقَكَ أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَ الذِي أُعْطِيتَ أَبَدًا؟، وَيْلَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ!. فَيَقُولُ أَيْ رَبِّ. وَيَدْعُو اللَّهَ، حَتَّى يَقُولَ: هَلْ عَسَيْتَ إِنْ أُعْطِيتَ ذَلِكَ أَنْ تَسْأَلَ غَيْرَهُ؟. فَيَقُولُ لاَ وَعِزَّتِكَ، لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ. وَيُعْطِي مَا شَاءَ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ، فَيُقَدِّمُهُ إِلَى بَابِ

الجَنَّةِ، فَإِذَا قَامَ إِلَى بَابِ الجَنَّةِ انْفَهَقَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، فَرَأَى مَا فِيهَا مِنَ الحَبْرَةِ وَالسُّرُورِ، فَيَسْكُتُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَسْكُتَ، ثُمَّ يَقُولُ أَيْ رَبِّ، أَدْخِلْنِي الجَنَّةَ. فَيَقُولُ اللهُ: أَلَسْتَ قَدْ أَعْطَيْتَ عُهُودَكَ وَمَوَاثِيقَكَ أَنْ لاَ تَسْأَلَ غَيْرَ مَا أُعْطِيتَ؟ -فَيَقُولُ:- وَيْلَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ! فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ، لاَ أَكُونَنَّ أَشْقَى خَلْقِكَ فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو حَتَّى يَضْحَكَ اللَّهُ مِنْهُ، فَإِذَا ضَحِكَ مِنْهُ قَالَ لَهُ: ادْخُلِ الجَنَّةَ. فَإِذَا دَخَلَهَا قَالَ اللَّهُ لَهُ: تَمَنَّهْ. فَسَأَلَ رَبَّهُ وَتَمَنَّى حَتَّى إِنَّ اللَّهَ لَيُذَكِّرُهُ يَقُولُ: كَذَا وَكَذَا، حَتَّى انْقَطَعَتْ بِهِ الأَمَانِيُّ، قَالَ اللَّهُ: ذَلِكَ لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ»[1].

**٧٤٣٧- عەتای کوڕی یەزیدی لەیسی لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: کە خەڵکی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە ڕۆژی دواییدا پەروەردگارمان دەبینین؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئایا ڕاجیا دەبن[2] لە بینینی مانگی چواردەدا؟)) وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ((دەی بێگومان ئێوە هەر بەو جۆرە پەروەردگارتان دەبینن، لە ڕۆژی دواییدا خوا خەڵکی کۆدەکاتەوە و دەفەرمووێ: هەر کەس هەرچی پەرستووە با شوێنی کەوێت، جا ئەوەی خۆری پەرستووە شوێن خۆر دەکەوێ، وە ئەوەی مانگی پەرستووە شوێن مانگ دەکەوێ، وە ئەوەی گومڕاکەر و سەرلێشێوێنی پەرستووە شوێن گومڕاکەر و سەرلێشێوێن دەکەوێ، ئەنجا ئەم ئوممەتی ئیسلامە دەمێنێتەوە و تکا کارەکانیانی-یان دووڕووە کانیانی تێدایە، ئیبراهیم گومانی بردووە- جا خوای گەورە دێ بۆ لایان (بەشێوەیەك نەیناسن) و دەفەرمووی: من پەروەردگارتانم، ئەوانیش دەڵێن: ئەمە شوێنمانە هەتا پەروەردگارمان دێت بۆ لامان، جا کە پەروەردگارمان هات بۆ لامان دەیناسینەوە، ئینجا خوای گەورە لەو شێوەی خۆیدا دەیناسنەوە دێت بۆ لایان و دەفەرمووێ: من پەروەردگاری ئێوەم،**

---

(١) بڕوانە: ٨٠٦.

(٢) (تُضَارُونَ) بەمانای لە نێوان خۆتاندا جیاواز نابن، یان دەمەقاڵێ و مشتومڕ ناکەن،یان ئەزێتی یەکتری دەدەن پاڵپاڵێن دەکەن بۆ بینینی. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٥/ ٤٠٢.

ئەوانیش دەڵێن: ڕاستە تۆ پەروەردگاری ئێمەی، جا شوێنی دەکەون، وە پردی (صراط) بەسەر دۆزەخدا دادەنرێ، ئینجا من و ئوممەتەکەم یەکەم کەس دەبین لەو پردە دەپەڕینەوە، وە لەو ڕۆژەدا جگەلە پێغەمبەران کەس قسە ناکات، وە داوا و تکای پێغەمبەرانیش ﷺ لەو ڕۆژەدا ئەوەیە دەڵێن: خوایە بێوەی خوایە بێوەی، وە لە دۆزەخدا قولاپ هەیە وەك دڕکی سەعدان[1]، ئایا دڕکی سەعدانتان بینیوە؟)) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((جا بەڕاستی (قولاپەکانی دۆزەخ) وەك دڕکی سەعدان وایە، بەڵام ئەوەندە هەیە خوا نەبێ کەس نازانێ چەند گەورەن، بەئەندازەی کردەوە (ی خراپ)، یان خەڵکی دەفڕێنن (فڕێ دەدەنە دۆزەخەوە)، جا هەیانە بەهۆی کردەوە (ی خراپ)یەوە تیادەچێ[2] -یان بەهۆی کردەوە (ی خراپ)یەوە بەسراوەتەوە و ڕاگیراوە-هەشیانە (قولاپەکان) ئەنجن ئەنجنی[3] دەکەن- یان تۆڵەی لێ سەنراوە- یان وتەك لەو شێوەیە- پاشان تەواو دەبێت و ڕزگاری دەبێ. هەتا کاتێ خوا لە دادگایی و بڕیاردانی نێوان بەندەکانی تەواو دەبێت، وە ئەوەی خۆی بیەوێ لە دۆزەخیان بە بەزەیی خۆی دەریبهێنێ لە دۆزەخ، فەرمان دەکات بە فریشتەکانی: کە ئەوەی هیچ شتێکی نەکردۆتە هاوبەشی خوا لە دۆزەخ دەری بێنن، لەوانەی خوا ویستی ڕەحمی پێ بکات لەو کەسانەی کە شایەتی داوە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا، فریشتەکانیش بەشوێنەواری سوژدە بردندا دەیانناسنەوە لە دۆزەخدا، (لەبەر ئەوەی) ئاگری دۆزەخ هەموو

---

(١) ڕووەکێکی دڕکاوییە. .

(٢) لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاریدا بەم جۆرەیە: (المؤمن يقي بعمله) واتە: هەیانە باوەڕدارە بەکردەوەی خۆی ڕزگاری دەبێت.

(٣) (الْمُخَرْدَلُ) بە چەند جۆری تر مانا کراوە: دابڕێنراون و جیاکراونەتەوە لە گەشتن بەوانەی ڕزگاربوون، لە هۆشخۆ چوون، ئیبنو تین دەڵێ: ئەو مانایە گونجاوە بۆی لە فەرموودەکەدا.

شوێنێکی مرۆڤ دەسوتێنێ جگە لە شوێنەواری سوژدە، چونکە خوای گەورە قەدەغەی کردوە و ڕێگە نادا ئاگری دۆزەخ شوێنەواری سوژدە بسوتێنێ، جا لە دۆزەخ دێنە دەرەوە بە سووتاوی و ڕەش بوونەتەوە، ئەوسا ئاوی ژیانەوە دەکرێ بەسەریاندا، ئەوسا لاشەیان لە ژێریەوە گۆشت دێنێتەوە هەر چۆنێك دانەوێڵەی قەراغی لافاو خێرا سەوز دەبێت، پاشان خوای گەورە لە دادگای نێوان بەندەکانی دەبێتەوە، پیاوێك دەمێنێتەوە ڕووخساری ڕوو بە دۆزەخ، کە کۆتاهەمین کەسە لە دۆزەخیان کە دەچێتە بەهەشتەوە، وە دەڵێ: ئەی پەروەردگار ڕووم لە دۆزەخ وەرچەرخێنە، چونکە بەڕاستی بۆنی ناخۆشی فەوتاندومی و گڕ و گەرمیەکەشی سووتاندومی، ئینجا بەو دوعایانەی دەیەوێ بپاڕێتەوە دەپاڕێتەوە لە خوا، پاشان خوای گەورەش دەفەرمووی: لەوانەیە ئەگەر ئەوەت پێ بدرێت داوای شتی ترم لێ بکەیت؟ ئەویش دەڵێ: نا بەگەورەییت سوێند بێ داوای شتی ترت لێ ناکەم، جا ئەوەی بیەوێ لە پەیمان و بەڵێن دەیدا بەپەروەردگاری، ئەنجا خوا ڕووخساری وەردەچەرخێنێ لە دۆزەخ، جا کە ڕووی دەکاتە بەهەشت دەبینێ ئەوەندەی خوا حەز بکات و بیەوێ بێدەنگ دەبێ، پاشان دەڵێ: ئەی پەروەردگارم نزیکم کەرەوە لە دەرگای بەهەشت، خوای گەورەش پێی دەڵێ: ئایا بەراستی تۆ بەڵێن و پەیمانت نەدا کە جگە لەوەی پێت درا جارێکی تر داوام لێ نەکەیت؟ هاوار بۆ تۆ ئەی ئادەمی پەیمان شکێنی! ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم و لە خوا دەپاڕێتەوە، هەتا خوا دەفەرمووێ: لەوانە ئەگەر ئەوەت پێ بدرێت داوای شتی ترم لێ بکەیت؟ ئەویش دەڵێ: نا بەگەورەییت سوێند بێ داوای شتی ترت لێ ناکەم، جا ئەوەی بیەوێ لە پەیمان و بەڵێن دەیدا بە خوا، ئینجا نزیکی دەکاتەوە لە دەرگای بەهەشت، جا کە هەستا و ڕۆشت بۆ لای دەرگای بەهەشت دەکرێتەوە والا

**دەبێت، ئەوسا ئەوەی لە بەهەشتایە لە ناسکی و جوانی و خۆشی دەبینێ، جا ئەوەندەی خوا بیەوێ بێدەنگ دەبێ، پاشان دەڵێ: ئەی پەروەردگار بمبەرە بەهەشتەوە، خوای گەورەش دەفەرمووی: ئایا تۆ پەیمان و بەڵێنت نەدا کە جگە لەوەی پێت درا داوای هیچی تر نەکەیت؟ ئینجا خوا دەفەرمووی: داماوی بۆ تۆ ئەی ئادەمیزاد چەند بێ پەیمانیت، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم با خراپترینی دروستکراوەکان نەبم، جا بەبەردەوامی دەپاڕێتەوە تا خوای گەورەش پێدەکەنێ پێی، جا کە پێکەنی پێی پێی دەفەرمووی: بڕۆ بەهەشتەوە، ئینجا کە ڕۆشتە بەهەشتەوە، خوا پێی دەفەرمووی: ئاوات بخوازە، ئەویش داوا لە پەروەردگاری دەکات و ئاوات دەخوازێ، هەتا خوای گەورە بیری دەخاتەوە و دەفەرمووی: ئەوە و ئەوەش بڵێ هەتا ئاوات خواستنەکانی کۆتاییان دێت، خوا دەفەرمووی: ((ئەوەی (ئاواتت خواست) بۆ تۆ و ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت)).**

٧٤٣٨ - قَالَ عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ: وَأَبُو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ لاَ يَرُدُّ عَلَيْهِ مِنْ حَدِيثِهِ شَيْئًا، حَتَّى إِذَا حَدَّثَ أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَّ اللَّهَ ﷻ قَالَ: «ذَلِكَ لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ».
قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ: «وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ مَعَهُ». يَا أَبَا هُرَيْرَةَ. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: مَا حَفِظْتُ إِلاَّ قَوْلَهُ: «ذَلِكَ لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ».قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ: أَشْهَدُ أَنِّي حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَوْلَهُ: «ذَلِكَ لَكَ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَذَلِكَ الرَّجُلُ آخِرُ أَهْلِ الجَنَّةِ دُخُولاً الجَنَّةَ[1].

**٧٤٣٨- عەتای کوڕی یەزید دەڵێ: ئەبو سەعیدی خودری لەگەڵ ئەبو هوڕەیرەدا ﷺ بوو هیچی لە فەرموودە (گێڕانەوە)ـی ئەبو هوڕەیرەی بەرپەرچ نەدەدایەوە، هەتا ئەبو هوڕەیرە ئەم فەرموودەی گێڕایەوەکە خوا ﷻ فەرمووی: ((ئەوە بۆ تۆ و ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت))، ئەبو سەعیدی خودری وتی: ((ئەوە بۆ**

(١) بڕوانە: ٢٢.

**تۆ و دە ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت)) ئەی ئەبو هورەیرە، ئەبو هورەیرەش وتی: من تەنها ئەم فەرمایشتەیم لەبەر کردوە ((ئەوە بۆ تۆ و ئەوەندەی تر وەك ئەوەی لەگەڵدا بێت))، ئەبو سەعیدی خودری وتی: شایەتی دەدەم کە من لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەم فەرمایشتەیم لەبەر کردوە((ئەوە بۆ تۆ، وە دە ئەوەندەی تری وەك ئەوەش))، ئەبو هورەیرە وتی: جا ئەو پیاوە کۆتاهەمین بەهەشتیە دەچێتە بەهەشتەوە.**

٧٤٣٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ خَالِدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ، عَنْ زَيْدٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: «هَلْ تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ إِذَا كَانَتْ صَحْوًا؟». قُلْنَا: لاَ. قَالَ: «فَإِنَّكُمْ لاَ تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ يَوْمَئِذٍ إِلاَّ كَمَا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَتِهِمَا -ثُمَّ قَالَ:- يُنَادِي مُنَادٍ لِيَذْهَبْ كُلُّ قَوْمٍ إِلَى مَا كَانُوا يَعْبُدُونَ. فَيَذْهَبُ أَصْحَابُ الصَّلِيبِ مَعَ صَلِيبِهِمْ، وَأَصْحَابُ الأَوْثَانِ مَعَ أَوْثَانِهِمْ، وَأَصْحَابُ كُلِّ آلِهَةٍ مَعَ آلِهَتِهِمْ، حَتَّى يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ أَوْ فَاجِرٍ، وَغُبَّرَاتٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، ثُمَّ يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ تُعْرَضُ كَأَنَّهَا سَرَابٌ، فَيُقَالُ لِلْيَهُودِ: مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ قَالُوا: كُنَّا نَعْبُدُ عُزَيْرَ ابْنَ اللَّهِ. فَيُقَالُ: كَذَبْتُمْ لَمْ يَكُنْ لِلَّهِ صَاحِبَةٌ وَلاَ وَلَدٌ، فَمَا تُرِيدُونَ؟ قَالُوا: نُرِيدُ أَنْ تَسْقِيَنَا، فَيُقَالُ: اشْرَبُوا فَيَتَسَاقَطُونَ فِي جَهَنَّمَ ثُمَّ يُقَالُ لِلنَّصَارَى: مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ فَيَقُولُونَ: كُنَّا نَعْبُدُ الْمَسِيحَ ابْنَ اللَّهِ. فَيُقَالُ: كَذَبْتُمْ، لَمْ يَكُنْ لِلَّهِ صَاحِبَةٌ وَلاَ وَلَدٌ، فَمَا تُرِيدُونَ؟ فَيَقُولُونَ: نُرِيدُ أَنْ تَسْقِيَنَا. فَيُقَالُ: اشْرَبُوا. فَيَتَسَاقَطُونَ حَتَّى يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ أَوْ فَاجِرٍ، فَيُقَالُ لَهُمْ: مَا يَحْبِسُكُمْ وَقَدْ ذَهَبَ النَّاسُ؟ فَيَقُولُونَ: فَارَقْنَاهُمْ وَنَحْنُ أَحْوَجُ مِنَّا إِلَيْهِ الْيَوْمَ وَإِنَّا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي: لِيَلْحَقْ كُلُّ قَوْمٍ بِمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ، وَإِنَّمَا نَنْتَظِرُ رَبَّنَا -قَالَ:- فَيَأْتِيهِمُ الْجَبَّارُ. فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا. فَلاَ يُكَلِّمُهُ إِلاَّ الأَنْبِيَاءُ، فَيَقُولُ: هَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ آيَةٌ تَعْرِفُونَهُ؟ فَيَقُولُونَ: السَّاقُ. فَيَكْشِفُ عَنْ سَاقِهِ، فَيَسْجُدُ لَهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ، وَيَبْقَى مَنْ كَانَ

يَسْجُدُ لِلَّهِ رِيَاءً وَسُمْعَةً، فَيَذْهَبُ كَيْمَا يَسْجُدَ، فَيَعُودُ ظَهْرُهُ طَبَقًا وَاحِدًا، ثُمَّ يُؤْتَى بِالْجَسْرِ فَيُجْعَلُ بَيْنَ ظَهْرَيْ جَهَنَّمَ». قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا الجَسْرُ؟ قَالَ: «مَدْحَضَةٌ مَزِلَّةٌ، عَلَيْهِ خَطَاطِيفُ وَكَلاَلِيبُ وَحَسَكَةٌ مُفَلْطَحَةٌ، لَهَا شَوْكَةٌ عُقَيْفَاءُ، تَكُونُ بِنَجْدٍ، يُقَالُ لَهَا: السَّعْدَانُ، الْمُؤْمِنُ عَلَيْهَا كَالطَّرْفِ وَكَالْبَرْقِ وَكَالرِّيحِ وَكَأَجَاوِيدِ الخَيْلِ وَالرِّكَابِ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ، وَنَاجٍ مَخْدُوشٌ، وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، حَتَّى يَمُرَّ آخِرُهُمْ يُسْحَبُ سَحْبًا، فَمَا أَنْتُمْ بِأَشَدَّ لِي مُنَاشَدَةً فِي الحَقِّ، قَدْ تَبَيَّنَ لَكُمْ مِنَ المُؤْمِنِ يَوْمَئِذٍ لِلْجَبَّارِ، وَإِذَا رَأَوْا أَنَّهُمْ قَدْ نَجَوْا فِي إِخْوَانِهِمْ يَقُولُونَ: رَبَّنَا، إِخْوَانُنَا كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَنَا وَيَصُومُونَ مَعَنَا وَيَعْمَلُونَ مَعَنَا. فَيَقُولُ اللهُ تَعَالَى: اذْهَبُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ دِينَارٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجُوهُ. وَيُحَرِّمُ اللهُ صُوَرَهُمْ عَلَى النَّارِ، فَيَأْتُونَهُمْ وَبَعْضُهُمْ قَدْ غَابَ فِي النَّارِ إِلَى قَدَمِهِ وَإِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ، فَيُخْرِجُونَ مَنْ عَرَفُوا، ثُمَّ يَعُودُونَ فَيَقُولُ اذْهَبُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ نِصْفِ دِينَارٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ مَنْ عَرَفُوا، ثُمَّ يَعُودُونَ، فَيَقُولُ: اذْهَبُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ مَنْ عَرَفُوا». قَالَ أَبُو سَعِيدٍ فَإِنْ لَمْ تُصَدِّقُونِي فَاقْرَءُوا: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا ﴿٤٠﴾ ﴾ النساء، «فَيَشْفَعُ النَّبِيُّونَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَالْمُؤْمِنُونَ فَيَقُولُ الْجَبَّارُ بَقِيَتْ شَفَاعَتِي. فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ، فَيُخْرِجُ أَقْوَامًا قَدِ امْتُحِشُوا، فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرٍ بِأَفْوَاهِ الجَنَّةِ يُقَالُ لَهُ: مَاءُ الحَيَاةِ، فَيَنْبُتُونَ فِي حَافَتَيْهِ كَمَا تَنْبُتُ الحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ، قَدْ رَأَيْتُمُوهَا إِلَى جَانِبِ الصَّخْرَةِ إِلَى جَانِبِ الشَّجَرَةِ، فَمَا كَانَ إِلَى الشَّمْسِ مِنْهَا كَانَ أَخْضَرَ، وَمَا كَانَ مِنْهَا إِلَى الظِّلِّ كَانَ أَبْيَضَ، فَيَخْرُجُونَ كَأَنَّهُمُ اللُّؤْلُؤُ، فَيُجْعَلُ فِي رِقَابِهِمُ الخَوَاتِيمُ، فَيَدْخُلُونَ الجَنَّةَ، فَيَقُولُ أَهْلُ الجَنَّةِ: هَؤُلاَءِ عُتَقَاءُ الرَّحْمَنِ أَدْخَلَهُمُ الجَنَّةَ بِغَيْرِ عَمَلٍ عَمِلُوهُ وَلاَ خَيْرٍ قَدَّمُوهُ. فَيُقَالُ لَهُمْ لَكُمْ مَا رَأَيْتُمْ وَمِثْلُهُ مَعَهُ»[1].

---

(١) بروانه: ٢٢.

٧٤٣٩- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگارمان دەبینین؟ فەرمووی: ((ئایا ئەزیەتی یەكتری دەدەن بۆ بینینی خۆر و مانگ كە ئاسمان سامالْ بێت؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: ((دەی بێگومان ئێوە ئەزیەتی یەكتری نادەن بۆ بینینی پەروەردگارتان لەو ڕۆژەدا، هەرچۆنێك ئەزیەتی یەكتری نادەن بۆ بینینی هەردووكیان[1])) لە پاشان فەرمووی: ((جاڕ دەرێك جاڕ دەدات، با هەر تاقمێك بڕۆن بۆ لای ئەوانەی پەرستونیان، ئینجا ئەوانەی خاچیان پەرستووە دەڕۆن بۆ لای خاچەكەیان، وە ئەوانەی بتیان پەرستووە دەڕۆن بۆ لای بتەكانیان، وە خاوەنی پەرستراوان دەڕۆن بۆ لای پەرستراوەكانیان، هەتا ئەوانە دەمێننەوە كە خوایان پەرستووە لە چاك یان خراپ، وە پاشماوەی نامە دارەكان، پاشان دۆزەخ دەهێنرێت و پیشان دەدرێت ئەڵێی تراویلكەیە، جا بەجووەكان دەوترێت ئێوە چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: ئێمە عوزەیری كوڕی خوامان دەپەرست، پێیان دەوترێت: درۆتان كرد، خوا نەهاوسەر و نەمنداڵی نەبووە، كەواتە چیتان دەوێ؟ دەڵێن: دەمانەوێ ئاوی خواردنەوەمان پێ بدرێ، جا پێیان دەوترێت: ئاو بخۆنەوە، ئیتر دەكەونە ناو دۆزەخەوە، لە پاشان بەگاورەكان دەوترێت: ئێوە چیتان دەپەرست؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە مەسیحی كوڕی خودامان دەپەرست، پێیان دەوترێت: درۆتان كرد خودا نەهاوسەر و نەمنداڵی نەبووە، دەی چیتان دەوێ؟ دەڵێن: دەمانەوێ ئاومان پێ بدەن (بیخۆینەوە)، پێیان دەوترێت: ئاو بخۆنەوە، ئەوسا دەكەونە ناو دۆزەخەوە، هەتا ئەوانە دەمێننەوە كە خوایان دەپەرست لە چاك یان خراپ، جا پێیان دەوترێت چ شتێك ئێوەی هێشتۆتەوە لە كاتێكدا خەڵكی ڕۆشتوون؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە جیا بووینەوە لێیان[2] لە

(١) مانگ وخۆر.

(٢) وازمان لە خزم و كەسوكار هێنا كە بێ باوەڕ بوون.

کاتێکدا زیاتر پێویستمان پێیان بوو[١] لە پێویستی ئەمڕۆمان، وە گوێمان لە جاڕدەرێك بوو جاڕی دەدا (دەیوت): با هەر کۆمەڵێ بڕوا بۆ لای ئەوانەی لە دونیادا پەرستونیان، وە بێگومان ئێمە چاوەڕوانی پەروەردگارمان دەکەین، دەڵێ: ئینجا خوای خاوەن دەسەڵات دێت بۆ لایان و دەڵێ: من پەروەردگارتانم، ئەوانیش دەڵێن: تۆ پەروەردگارمانی، جا تەنها پێغەمبەران ﷺ قسەی لەگەڵ دەکەن، ئینجا دەڵێ:[٢] ئایا لە نێوان ئێوە و ئەو (پەروەردگارتان)دا نیشانەیەك هەیە بیناسنەوە پێیدا؟ ئەوانیش دەڵێن: (دەرخستنی) لاقە، ئەوسا خوا لاقی [٣] دەر دەخات، ئینجا هەموو باوەڕدارێك سوژدەی بۆ دەبات، ئەو کەسانەش دەمێننەوە کە بۆ ڕووپامایی و بەرچاوی سوژدەیان دەبرد، ئینجا دەیەوێت سوژدە بەرێت بەڵام پشتی دەبێتە یەك پارچە (نانوشتێتەوە)، پاشان پردەکە دەهێنرێ و لەسەر دۆزەخ دادەنرێت))، عەرزمان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پردەکە چییە؟ فەرمووی: لووس و خزگەیە، قاڵنگە [٤] و قولاپ و ئاسنێکی گەورەی قولاپاویە، وەك ئەو دڕکە قولاپاویە وایە لەنەجد هەیە پێی دەڵێن (دڕکی) سەعدان، باوەڕدار بەسەری ئەو پردەدا دەڕوا بەخێرای وەك بینینی چاو و تیشك و باو ئەسپ و وشتری خێرا، جا هەیانە ڕزگاری دەبێ و سەلامەتە و هەیانە ڕزگاری دەبێ و ڕووشاو بریندار بووە، هەشیانە کەوتۆتە ناو ئاگری دۆزەخەوە و هەتا کۆتاهەمینی ڕزگار بووان دەڕوات بەڕاکێشان ڕادەکێشرێ، جا داوا کردنی ئێوە دەربارەی هەقێك کە بۆتان ڕوون بۆتەوە (لە دونیادا)، بەهێزتر نییە لە داوا کردنی باوەڕدار لەو ڕۆژەدا لە خوای بەدەسەڵات بۆ ڕزگاربوونی

---

(١) بۆبەرژەوەندی دونیایی.

(٢) لە گێڕانەوەیەکدا جا دەوترێ.

(٣) بەو شێوەی شیاوی خوا بێت ئێمە شێوە و چۆنێتیەکەی نازانین.

(٤) قاڵنگە: ئاسنێکی سەر چەماوەیە لە شت دەگیرێنرێت و پێی ڕادەکێشرێت. چنگەشی پێ دەوترێت، بڕوانە: ئەلمونجید بەکوردی:٦٧٢/١.

براکانیان، کاتێ دەبینن کە خۆیان ڕزگاریان بووە، دەڵێن: پەروەردگارمان ئەو برایانەمان کە لە دونیادا لەگەڵماندا نوێژیان دەکرد و لەگەڵماندا ڕۆژویان دەگرت و لەگەڵمانداکردەوەی چاکیان دەکرد (ڕزگاریان کەیت)، خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ بڕۆن و هەر کەستان دی بەقورسایی دینارێك باوەڕ لە دڵی دایە دەری بێنن، وە خوا حەرامی دەکات لەسەر دۆزەخ ڕووخساریان بسوتێنێ، ئەوانیش دەڕۆن بۆ لایان هەندێکیان تا پێیەکانی وون بووە لە ئاگرەکەدا هەندێکیان تانیوەی لاقی، جا ئەوانەیان دەردێنن کە ناسیبوونیان، پاشان دەگەڕێنەوە، خواش دەفەرمووێ: بڕۆن هەر کەستان دی بەقورسایی نیو دینار باوەڕ لە دڵی دایە دەری بێنن، ئینجا ئەوانەی ناسیبوونیان دەریان دێنن، پاشان دەگەڕێنەوە، ئینجا خوا دەفەرمووێ: بڕۆن هەرکەستان دی قورسایی گەردیلەیەك باوەڕی هەیە دەری بێنن، ئەوانیش ئەوەی ناسیبوونیان دەری دێنن))، ئەبو سەعید ﵁ دەڵێ: جائەگەر باوەڕم پێ ناکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە (بێگومان خوا قورسای گەردیلەیەك ستەم ناکات، وە ئەگەر چاکەیەك هەبێت (خودا) چەندانی دەکاتەوە)، ((ئینجا پێغەمبەران ﷺ و فریشتەکان و باوەڕداران تکا و شەفاعەت دەکەن، ئەوسا خوای بەدەسەڵات دەفەرمووێ: تکا و شەفاعەتی منیش ماوە، جا مشتێك هەڵدەگرێت لە دۆزەخ و کەسانێك دەردێنێ هەموو لاشەیان سوتاوە، ئینجا فڕێدەدرێنە ڕووبارێکەوە لە بەردەم بەهەشتایە پێی دەوترێت ئاوی ژیانەوە، ئەوسا لاشەیان لەمبەرە و بەریەوە گۆشت دێنێتەوە، وەك چۆن دانەوێڵەیەك لافاو دەیهێنێ لە کەناری لافاوەکەدا سەوز دەبێت (لە ماوەیەکی کەمدا)، بێگومان ئەو دانەوێڵە سەوز بووەتان دیوە لە تەنیشت بەردێکی گەورەدا لە تەنیشت درەختێکدا (سەوز بووە)، هەرکامیان لە خۆرە تاوابێت سەوزترە، هەرکامیشیان لە سێبەردا بێت سپییە، ئینجا (سووتاوەکان) لە ڕووبارەکە دێنە دەرەوە دەڵێی مروارین، جا ملوانکەیەك

**دەکرێتە ملیان و دەڕۆنە بەهەشتەوە. بەهەشتیەکانیش پێیان دەڵێن: ئائەمانە ئازادکراوەکانی خودای بەبەزەیین لە ئاگر، دەیان خاتە بەهەشتەوە بەبێ ئەوەی هیچ کردەوەیەکیان کردبێ، وە چاکەیەکیان پێش خۆیان نەناردووە (بۆ قیامەت)، ئینجا پێیان دەوترێت: ئەوەندەی بینیتان بۆ ئێوەیە ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت)).**

٧٤٤٠- وَقَالَ حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ: حَدَّثَنَا هَمَّامُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «يُحْبَسُ الْمُؤْمِنُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُهِمُّوا بِذَلِكَ، فَيَقُولُونَ: لَوِ اسْتَشْفَعْنَا إِلَى رَبِّنَا فَيُرِيحُنَا مِنْ مَكَانِنَا. فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ: أَنْتَ آدَمُ أَبُو النَّاسِ، خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَأَسْكَنَكَ جَنَّتَهُ، وَأَسْجَدَ لَكَ مَلاَئِكَتَهُ، وَعَلَّمَكَ أَسْمَاءَ كُلِّ شَيْءٍ، لِتَشْفَعْ لَنَا عِنْدَ رَبِّكَ حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا هَذَا -قَالَ:- فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ- قَالَ: وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ الَّتِي أَصَابَ أَكْلَهُ مِنَ الشَّجَرَةِ وَقَدْ نُهِيَ عَنْهَا -وَلَكِنِ ائْتُوا نُوحًا أَوَّلَ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللَّهُ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ فَيَأْتُونَ نُوحًا فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ. وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ الَّتِي أَصَابَ سُؤَالَهُ رَبَّهُ بِغَيْرِ عِلْمٍ- وَلَكِنِ ائْتُوا إِبْرَاهِيمَ خَلِيلَ الرَّحْمَنِ- قَالَ:- فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ فَيَقُولُ: إِنِّي لَسْتُ هُنَاكُمْ- وَيَذْكُرُ ثَلاَثَ كَلِمَاتٍ كَذَبَهُنَّ- وَلَكِنِ ائْتُوا مُوسَى عَبْدًا آتَاهُ اللَّهُ التَّوْرَاةَ، وَكَلَّمَهُ وَقَرَّبَهُ نَجِيًّا- قَالَ: -فَيَأْتُونَ مُوسَى فَيَقُولُ: إِنِّي لَسْتُ هُنَاكُمْ- وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ الَّتِي أَصَابَ قَتْلَهُ النَّفْسَ- وَلَكِنِ ائْتُوا عِيسَى عَبْدَ اللَّهِ وَرَسُولَهُ وَرُوحَ اللَّهِ وَكَلِمَتَهُ- قَالَ:- فَيَأْتُونَ عِيسَى فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ، وَلَكِنِ ائْتُوا مُحَمَّدًا ﷺ عَبْدًا غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ. فَيَأْتُونِي، فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي فِي دَارِهِ، فَيُؤْذَنُ لِي عَلَيْهِ، فَإِذَا رَأَيْتُهُ وَقَعْتُ سَاجِدًا، فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدَعَنِي فَيَقُولُ: ارْفَعْ مُحَمَّدُ، وَقُلْ يُسْمَعْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، وَسَلْ تُعْطَ -قَالَ:- فَأَرْفَعُ رَأْسِي، فَأُثْنِي عَلَى رَبِّي بِثَنَاءٍ وَتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِيهِ، فَيَحُدُّ لِي حَدًّا، فَأَخْرُجُ فَأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ».

قَالَ قَتَادَةُ: وَسَمِعْتُهُ أَيْضًا يَقُولُ: «فَأَخْرُجُ فَأُخْرِجُهُمْ مِنَ النَّارِ وَأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ، ثُمَّ أَعُودُ فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي فِي دَارِهِ، فَيُؤْذَنُ لِي عَلَيْهِ، فَإِذَا رَأَيْتُهُ وَقَعْتُ سَاجِدًا، فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ

أَنْ يَدَعَنِي ثُمَّ يَقُولُ ارْفَعْ مُحَمَّدُ، وَقُلْ يُسْمَعْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، وَسَلْ تُعْطَ -قَالَ: - فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأُثْنِى عَلَى رَبِّي بِثَنَاءٍ وَتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِيهِ- قَالَ- ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا فَأَخْرُجُ فَأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ».

قَالَ قَتَادَةُ وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «فَأَخْرُجُ فَأُخْرِجُهُمْ مِنَ النَّارِ وَأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ، ثُمَّ أَعُودُ الثَّالِثَةَ فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي فِي دَارِهِ فَيُؤْذَنُ لِي عَلَيْهِ، فَإِذَا رَأَيْتُهُ وَقَعْتُ سَاجِدًا فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدَعَنِي ثُمَّ يَقُولُ ارْفَعْ مُحَمَّدُ، وَقُلْ يُسْمَعْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، وَسَلْ تُعْطَهْ -قَالَ- فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأُثْنِى عَلَى رَبِّي بِثَنَاءٍ وَتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِيهِ -قَالَ- ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا فَأَخْرُجُ فَأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ».

قَالَ قَتَادَةُ وَقَدْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «فَأَخْرُجُ فَأُخْرِجُهُمْ مِنَ النَّارِ وَأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ، حَتَّى مَا يَبْقَى فِي النَّارِ إِلاَّ مَنْ حَبَسَهُ الْقُرْآنُ أَيْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْخُلُودُ -قَالَ:- ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴿٧٩﴾ ﴾ الإسراء. قَالَ: وَهَذَا المَقَامُ المَحْمُودُ الذِي وُعِدَهُ نَبِيُّكُمْ ﷺ[1].

**٧٤٤٠-قەتادە دەگێڕێتەوە کەئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لە ڕۆژی قیامەتدا باوەڕداران ڕادەگیرێن هەتا خەمبار و دلگران دەبن بەو ڕاگرتنە، جا دەڵێن: خۆزگە داوامان لە کەسێك بکردایە لای پەروەردگارمان تکامان بۆ بکات و ڕزگارمان بکات لەم شوێنەی تیایداین، ئینجا دەڕۆن بۆلای ئادەم ﷺ و دەڵێن: تۆ باوکی مرۆڤەکانی، خودا بەدەستی خۆی دروستی کردووی، لە بەهەشتدا جێنشینی کردی، سوژدەی بەفریشتەکان برد بۆت، ناوی هەموو شتێکی فێر کردی، دەی تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت تا ڕزگارمان بکات لەم جێگەی تیایداین، دەڵێ: ئەویش دەڵێ:من لەوپلەیەدا نیم- دەڵێ: باسی**

(١) بڕوانە: ٤٤.

ئەو هەڵەیە دەکات کە تووشی بوو: کە خواردنی بەری ئەو درەختە بوو کە قەدەغەکرا بوو لێی، بەڵام بڕۆن بۆلای نووح ﷺ کە یەکەم پێغەمبەرە خوا ناردویەتی بۆ خەڵکی سەر زەوی، ئەوانیش دەڕۆن بۆ لای نووح ﷺ، ئەویش دەڵێ: من لەو پلەیەدا نیم-ئەویش باسی ئەو هەڵەیە دەکات کە تووشی بووە: کە داواکردنی بوو لە پەروەردگار بەبێ زانیاری-بەڵام بڕۆن بۆ لای ئیبراهیم ﷺ، کە خۆشەویستی خوای بەبەزەییە، دەڵێ: ئەوانیش دەڕۆن بۆ لای ئیبراهیم ﷺ، ئەویش دەڵێ: من لەو پلەیەدا نیم - وە باسی ئەو سێ قسە درۆیە دەکات کە کردوونی -بەڵام بڕۆن بۆ لای موسا ﷺ -کە بەندەیەکە خوا تەوراتی پێ بەخشیوە و (ڕاستەوخۆ) قسەی لەگەڵدا کردوە و نزیکی کردۆتەوە لە خۆی و قسەی لەگەڵدا کردوە، دەڵێ: ئەوان دەڕۆن بۆ لای موسا ﷺ ئەویش دەڵێ:من لەو پلەیەدا نیم- باسی ئەو تاوانە دەکات کە تووشی بووە کە کوشتنی کەسێك بوو- بەڵام بڕۆن بۆ لای عیسا ﷺ کەبەندە و پێغەمبەری خوایە کە ڕۆحی خوایە (دروست بوونی بە) ووتەی خوایە، دەڵێ: ئەوانیش دەڕۆن بۆلای عیسا ﷺ ئەویش دەڵێ: من لەو پلەیەدا نیم، بەڵام بڕۆن بۆ لای موحەممەد ﷺ بەندەیەکە خوا لەو گوناهانەی ڕابوردوو و لە وانەشی لە داهاتوودا دێن خۆش بووە، ئیتر دێن بۆ لای موحەممەد، منیش مۆڵەت دەخوازم بۆ چوونە خزمەتی پەروەردگارم لە کاتێکدا لە بەهەشتەکەیدام، خواش مۆڵەتم دەدات بۆ بینینی و بەخزمەت گەیشتنی، جا کە بینیم دەچمە شوژدەوە ئینجا ئەوەندەی خوا خۆی حەزکات و بیەوێ وازم لێ دێنێت و دەمێنمەوە (لە سوژدەدا)، ئینجا دەفەرمووێ: موحەممەد سەرت بەرزکەرەوە قسە بکە و دەبیسترێت و تکا بکە و تکات وەردەگیرێ و داوا بکە پێت دەدرێت، فەرمووی منیش سەرم بەرزدەکەمەوە

و سوپاس و ستایشی پەروەردگارم دەکەم، بەسوپاس و ستایشێك کە فێرم دەکات، پاشان تکا دەکەم، ئینجا ژمارەیەکم بۆ دیاری دەکات، لە بەهەشت دەریان دێنم و دەیانبەمە بەهەشتەوە))

-قەتادە دەڵێ[1]: هەروەها لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:) ((جا (لە بەهەشت) دەڕۆمە دەرەوە (کۆمەڵێکی تریان) لە دۆزەخ دەردەهێنم وە دەیانبەمە بەهەشتەوە، پاشان دەگەڕێمەوە مۆڵەت لە پەروەردگارم دەخوازم بۆچوونە خزمەتی لە کاتێکدا لە بەهەشتەکەیدام، خواش مۆڵەتم دەدات بۆ چوونە خزمەتی، جا کە بینیم دەچم بەسوژدەیا، ئینجا وازم لێ دێنێ ئەوەندەی خوا خۆی بیەوێ بمێنمەوە[2]، پاشان (خوا) دەفەرمووێ: موحەمەد سەربەرز کەرەوە، قسە بکە لێت دەبیسترێت، تکا بکە تکات وەردەگیرێت، داوا بکە پێت دەدرێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: منیش سەرم بەرز دەکەمەوە و سوپاس و ستایشی پەروەردگارم دەکەم، بەسوپاس و ستایشێك کە فێرم دەکات، پاشان تکا دەکەم، ئینجا ژمارەیەکم بۆ دیاری دەکات، لە بەهەشت دەریدێنم و دەیانبەمە بەهەشتەوە)).

-قەتادە دەڵێ لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی): ((جا (لە بەهەشت) دەڕۆمە دەرەوە، (کۆمەڵێکی تریان) لە دۆزەخ دەردەهێنم وە دەیانبەمە بەهەشتەوە، پاشان بۆ جاری سێیەم دەگەڕێمەوە مۆڵەت لە پەروەردگارم دەخوازم بۆ چوونە خزمەتی لە کاتێکدا لە بەهەشتەکەی دام، خواش مۆڵەتم دەدات بۆ چوونە خزمەتی، جا کە بینیم دەچم بەسوژدەیا، ئینجا وازم لێ دێنێ ئەوەندەی خوا خۆی بیەوێ بمێنمەوە، پاشان (خوا)

---

(١) بە هەمان ڕشتەی فەرموودەی پێشوو.
(٢) لە سوژدەدا.

**دەفەرمووێ: موحەممەد سەر بەرز بكەرەوە، قسە بكە لێت دەبیسترێت، تكا بكە تكات وەردەگیرێت، داوا بكە پێت دەدرێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منیش سەرم بەرزدەكەمەوە و سوپاس و ستایشی پەروەردگارم دەكەم، بەسوپاس و ستایشێك كە فێرم دەكات، وتی: پاشان تكا دەكەم، ئینجا ژمارەیەكم بۆ دیاری دەكات، لە دۆزەخ دەریدێنم و دەیانبەمە بەهەشتەوە))**

**-قەتادە دەڵێ: بێگومان لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی) ((ئینجا لە بەهەشت دێمە دەرەوە ئەوانە (دیاری كراون بۆ من) لە دۆزەخ دەریان دێنم و دەیانبەمە بەهەشتەوە، هەتا كەس نامێنێتەوە لە دۆزەخدا جگە لەوانەی قورئان هێشتونیەتیەوە))، واتە: پێویستە لەسەری هەمیشەی بێت لە دۆزەخدا، دەڵێ: پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ئومێدەواربە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلە و جێگایەكی پەسەند كراو)، دەڵێ: ئەو پلەیەش ئەو جێگا پەسەند كراوەیە كە خوا بەڵێنی داوە بە پێغەمبەرەكەتان ﷺ.**

٧٤٤١- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنِي عَمِّي، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَرْسَلَ إِلَى الأَنْصَارِ، فَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ وَقَالَ لَهُمْ: «اصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوُا اللَّهَ وَرَسُولَهُ، فَإِنِّي عَلَى الحَوْضِ»[١].

**٧٤٤١- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەشوێن ئەنصارییەكانداو لە ژێر چادرێكی وەك گومەزدا كۆی كردنەوە، فەرمووی پێیان: ((ئارام بگرن هەتا دەگەنە خزمەتی خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ (لە قیامەتدا)، چونكە بێگومان من لەسەر حەوزەكەمم[٢])).**

(١) بڕوانە: ٣١٤٦.

(٢) مەبەستی حەوزی كەوسەرە.

**٧٤٤٢-** حَدَّثَنِي ثَابِتُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ الأَحْوَلِ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا تَهَجَّدَ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الحَقُّ، وَقَوْلُكَ الحَقُّ، وَوَعْدُكَ الحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ الحَقُّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ خَاصَمْتُ، وَبِكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ».

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ قَيْسُ بْنُ سَعْدٍ وَأَبُو الزُّبَيْرِ، عَنْ طَاوُسٍ: "قَيَّامٌ". وَقَالَ مُجَاهِدٌ الْقَيُّومُ الْقَائِمُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ. وَقَرَأَ عُمَرُ الْقَيَّامُ، وَكِلاَهُمَا مَدْحٌ[١].

**٧٤٤٢- تاووس لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﵄ دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لە شەودا شەو نوێژی بکردایە دەیفەرموو: ((خوایە هەموو سوپاس هەر بۆ تۆیە، تۆی ڕاگری ئاسمانەکان و زەوی ئەوەی تێیان دایە، هەموو سوپاس هەر بۆ تۆیە، تۆی (خاوەنی) ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی تێیان دایە، تۆ ڕاستی و دروستی و فەرمایشتت ڕاستە و دروستە و بەڵێنت ڕاست و دروستە، گەشتن بەخزمەتت (لە قیامەتدا) ڕاستە و بەهەشت و دۆزەخ ڕاستە و قیامەت ڕاستە، خوایە گەردن کەچی تۆم باوەڕم بەتۆ هێناوە و پشتم تەنها بەتۆ بەستووە، وە بەپشتیوانی تۆ دەچم بەگژ دوژمناندا، وە بڕیار و حوکم هەر لە تۆ وەردەگرم، دەی خۆشبە لەو گوناهانەی کردوومە و ئەوەشی دەیکەم، ئەوەشی پەنهانم کردوە، ئەوەشی ئاشکرام کردوە، ئەوش تۆ زاناتری پێی لە من، هیچ پەرستراوێکی ڕاست نیە جگەلە تۆ)).**

---

(١) بڕوانە: ١١٢٠.

**-ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: قەیسی کوڕی سەعد و ئەبو زوبەیر لە قەتادەوە گێڕاوەتەوە فەرموویەتی: ((قَيَّامٌ))** [1].

**-موجاهید دەڵێ: ﴿الْقَيُّومُ﴾ واتە: سەرپەرشتیار و چاودێر بەسەر هەموو شتێکەوە.**

**-وە عومەر ﷺ بە ﴿الْقَيَّامُ﴾[2] خوێندویەتیەوە. هەردووکیان (الْقَيُّومُ) و (الْقَيَّامُ) بۆ پیاهەڵدانن.**

**٧٤٤٣-** حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنِي الأَعْمَشُ، عَنْ خَيْثَمَةَ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ وَلاَ حِجَابٌ يَحْجُبُهُ»[3].

**٧٤٤٣- عەدیی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کام لە ئێوە پەروەردگاری لە داهاتوودا (لە قیامەتدا) قسەی لەگەڵدا دەکات، لە نێوان ئەو و خوادا نە وەرگێڕ هەیە نە پەردەیەك کە بەربەست بێت (لە بەینی خوا)) ).**

**٧٤٤٤-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ الصَّمَدِ، عَنْ أَبِي عِمْرَانَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «جَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَجَنَّتَانِ مِنْ ذَهَبٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلاَّ رِدَاءُ الكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ»[4].

---

(١) لە شوێنی (قيم) کە لە گێڕانەوەکەی پێشوودا هاتووە، هەمان مانایە بەڵام ماناکەی بەهێزتر لە عەرەبیدا پێی دەڵێن (صيغة مبالغة).

(٢) لە ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة.

(٣) بڕوانە: ١٤١٣.

(٤) بڕوانە: ٤٨٧٨.

**٧٤٤٤- ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە کە فەرموویەتی: (( (باوەڕدار لە بەهەشتدا) دوو بەهەشتی هەیە، قاپ و قاچاغ و هەرچی شت لەو دوو بەهەشتەدایە زیون، وە دوو بەهەشتی تری هەیە، قاپ و پاچاغ و هەرچی شت لەو دوو بەهەشتە دایە زێڕ و ئاڵتوونن. وە لە نێوان ئەو خەڵکە (بەهەشتیانە) و نێوان ئەوەی کە سەیری پەروەردگاریان بکەن هیچ نییە، جگەلە پەردەی گەورەیی کە بەسەر زاتی خواوەیە لە بەهەشتی هەمیشەییدا)).**

٧٤٤٥- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكُ بْنُ أَعْيَنَ وَجَامِعُ بْنُ أَبِي رَاشِدٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَنِ اقْتَطَعَ مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينٍ كَاذِبَةٍ، لَقِيَ اللهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ». قَالَ عَبْدُ اللهِ: ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِصْدَاقَهُ مِنْ كِتَابِ اللهِ -جَلَّ ذِكْرُهُ-: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ ﴿٧٧﴾ ﴾ الآيَةَ. آل عمران[1].

**٧٤٤٥- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس بە سوێندێکی درۆ ماڵ و سامانی کەسێکی مسوڵمانی بپچڕێت (بۆ خۆی)، کە دەگات بە خوا (لە ڕۆژی دواییدا) خوا زۆر لێی تووڕەیە. عەبدوڵڵا ﷺ وتی: پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پشت ڕاستکردنەوەی ئەوە لە قورئانەکەی خوادایە - ناوی گەورە و بەرز بێت - خوێندەوە: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن، ئەوانە بێ بەشن (لە بەهرەی خوا) لە ڕۆژی دواییدا، وە خوا لە ڕۆژی دواییدا قسەیان لەگەڵ ناکات)، تا کۆتایی ئایەتەکە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٥٦، ٢٣٥٧.

٧٤٤٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ: رَجُلٌ حَلَفَ عَلَى سِلْعَةٍ لَقَدْ أَعْطَى بِهَا أَكْثَرَ مِمَّا أَعْطَى وَهْوَ كَاذِبٌ، وَرَجُلٌ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ كَاذِبَةٍ بَعْدَ العَصْرِ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، وَرَجُلٌ مَنَعَ فَضْلَ مَاءٍ فَيَقُولُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: اليَوْمَ أَمْنَعُكَ فَضْلِي كَمَا مَنَعْتَ فَضْلَ مَا لَمْ تَعْمَلْ يَدَاكَ»[1].

**٧٤٤٦- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((سێ (جۆر کەس) هەن لە ڕۆژی قیامەتدا خوا قسەیان لەگەڵ ناکات و سەیریان ناکات: پیاوێك لەسەر کاڵایەك سوێند بخوات، بێگومان زیاتر لەوەی پێی داوە کە داوێتی (بەفرۆشیارەکە) و ئەو درۆیە بکات [2]، وە پیاوێك پاش عەسر سوێند بخوات بە سوێند خواردنێکی درۆ بۆ ئەوەی بەو سوێندە درۆیە ماڵی مسوڵمانێك بۆ خۆی ببچڕێت، وە پیاوێك بەرگری بکات لە زیادەی ئاوێك [3]، ئینجا خواش لە ڕۆژی قیامەتدا (پێی دەفەرمووێ): منیش ئەمڕۆ تۆ بێبەش ئەکەم لە فەزڵی خۆم، وەك چۆن تۆ ڕێگری شتێکت کرد کە بەدەستی خۆت دروستت نەکردبوو)).**

٧٤٤٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الزَّمَانُ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ، السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا، مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلاَثٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو القَعْدَةِ، وَذُو الحَجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبُ مُضَرَ الذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ، أَيُّ شَهْرٍ هَذَا؟». قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ يُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ قَالَ: «أَلَيْسَ ذَا الحَجَّةِ؟». قُلْنَا:

---

(١) بڕوانە: ٢٣٥٨.

(٢) لەوەی کە دەیڵەیت.

(٣) نەیدات بە خەڵک و دراوسێکانی.

بَلَى. قَالَ: «أَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟». قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ قَالَ: "أَلَيْسَ البَلْدَةَ؟ " قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: «فَأَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟». قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ قَالَ: «أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ؟». قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ- قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَأَعْرَاضَكُمْ- عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، وَسَتَلْقَوْنَ رَبَّكُمْ فَيَسْأَلُكُمْ عَنْ أَعْمَالِكُمْ، أَلاَ فَلاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي ضُلاَّلاً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، أَلاَ لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَلَعَلَّ بَعْضَ مَنْ يَبْلُغُهُ أَنْ يَكُونَ أَوْعَى مِنْ بَعْضِ مَنْ سَمِعَهُ». فَكَانَ مُحَمَّدٌ إِذَا ذَكَرَهُ قَالَ صَدَقَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ قَالَ: «أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ، أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ»[1].

**٧٤٤٧- ئەبو بەكرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كەفەرمووی: ((بێگومان چەرخ و زەمانە سوڕاوەتەوە سەر شێوەی خۆی لەو ڕۆژدا كە خوا ئاسمانەكان و زەوی دروست دەكرد، ساڵ دوانزە مانگە، چوار مانگیان حەرامن[2] سیانیان بەشوێن یەكتردا دێن (كە ئەمانەن:) زولقەعدە و زولحیججە و موحەڕەم و ڕەجەبی موزەڕ، كە لە نێوان جومادی دووەم شەعبان دایە، ئەم مانگە چ مانگێكە؟)) وتمان: خوا و پێغەمبەرەكەی زاناترن، جا بێدەنگ بوو هەتا گومانمان برد بەناوێكی تر جگە لە ناوەكەی خۆی ناوی دەبات، فەرمووی: ((ئایا ئەمە زولحیججە نییە؟)) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((ئەی ئەمە چ شارێكە؟)) وتمان خوا و پێغەمبەرە كەی زاناترن، ئەنجا بێدەنگ بوو هەتا گومانمان برد بە ناوێكی تر جگە لە ناوەكەی خۆی ناوی دەبات، فەرمووی: ((ئایا شارەكە (ی مەككە) نییە؟)) وتمان: بەڵێ، فەرمووی: ((ئەم ڕوژە چ ڕۆژێكە؟)) وتمان خوا و پێغەمبەرەكەی زاناترن، جا بێدەنگ بوو هەتا گومانمان برد بەناوێكی تر جگە**

(١) بڕوانە: ٦٧.
(٢) ڕێزگیراون و حەرامە نابێ جەنگیان تیا بكرێت.

له ناوەكەی خۆی ناوی دەبات، فەرمووی: ((ئەمرۆ جەژنی قوربان نییە؟)) وتمان: بەڵێ، فەرمووی: ((جا بێگومان خوێنتان و ماڵ و سامانتان- موحەممەد وتی: وابزانم فەرمووی: ناموستان- له یەكتر حەرامە وەك حەرامێتی ئەم ڕۆژەتان لەم شارەتاندا وە لەم مانگەتاندا، بێگومان (له قیامەتدا) دەگەنەوە بە پەروەردگارتان، وە بەڕاستی پرسیاری كردەوەكانتان لێدەكات، ئەوسا بێداربن پاش (مردنی) من گومڕا مەبنەوە هەندێكتان بدەن له گەردنی هەندێكتان، بێداربن ئەوەی ئامادەیە بیگەیەنێ بەوەی ئامادە نییە، چونكە لەوانەیە هەندێك لەوانەی پێی دەگەیەنرێت باشتر هەڵی بگرێی و لێی تێ بگات له هەندێ لەوانەی كە بیستویەتی))، جا موحەممەد (ی كوڕی سیرین) كە ئەم فەرموودەی باس بكردایە دەیوت: پێغەمبەر ﷺ ڕاستی فەرمووە، له پاشان (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((ئایا پێم ڕاگەیاندن؟ ئایا پێم ڕاگەیاندن؟)).

## ٢٥- بابُ مَا جَاءَ فِي قَوْلِ الله تعالى: ﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾﴾ الأعراف

٧٤٤٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أُسَامَةَ قَالَ: كَانَ ابْنٌ لِبَعْضِ بَنَاتِ النَّبِيِّ ﷺ يَقْضِي، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ أَنْ يَأْتِيَهَا، فَأَرْسَلَ: «إِنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلٌّ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ». فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ، فَأَقْسَمَتْ عَلَيْهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقُمْتُ مَعَهُ، وَمُعَاذُ ابْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَعُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، فَلَمَّا دَخَلْنَا نَاوَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ الصَّبِيَّ وَنَفْسُهُ تَقَلْقَلُ فِي صَدْرِهِ -

حَسِبْتُهُ قَالَ: كَأَنَّهَا شَنَّةٌ- فَبَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: أَتَبْكِي؟ فَقَالَ: «إِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ»[1].

## ٢٥- باسی ئەوەی لەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵندا هاتووە: (بەڕاستی میهرەبانی خوا لە چاکە کارانەوە نزیکە)

**٧٤٤٨- ئوسامە ﷺ دەڵێ: کوڕی کچێکی پێغەمبەر ﷺ لە سەرە مەرگدا بوو، بۆیە کەسێکی نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بڕوات بۆماڵیان، پێغەمبەریش ﷺ کەسێکی نارد کە بڵێ: ((بێگومان ئەوەی دەیباتەوە و ئەوەی دەیدات هەر هی خوایە، وە هەموو شتێکیش بۆ ماوەیەکی دیاری کراوە، کەواتە با ئارام بگرێ و چاوەڕوانی پاداشتی خوا بێت))، ئینجا کچەکەی ناردی بۆ لای پێغەمبەر و ﷺ سوێندی لێ خوارد (کە دەبێ بڕوات بۆ ماڵیان)، پێغەمبەری خواش ﷺ هەستا و ڕۆشت و من وموعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و عوبادەی کوڕی صامیت لەگەڵیدا هەستاین و ڕۆشتین، ئینجا کە ڕۆشتینە ژوورەوە منداڵەکەیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی لە سنگیدا دەجولا - وابزانم وتی: وەك مەشکە بیژەنی وابوو- بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ گریا، سەعدی کوڕی عوبادەش وتی: ئەوە دەگرییت؟ ئەویش فەرمووی: ((بێگومان خوای گەورە لە ناو بەندەکانیدا ڕەحم بە بەزەییدارەکانیان دەکات)).**

٧٤٤٩- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اخْتَصَمَتِ الجَنَّةُ وَالنَّارُ إِلَى رَبِّهِمَا، فَقَالَتِ الجَنَّةُ: يَا رَبِّ، مَا لَهَا لاَ يَدْخُلُهَا إِلاَّ ضُعَفَاءُ النَّاسِ وَسَقَطُهُمْ.وَقَالَتِ النَّارُ - يَعْنِي:- أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ. فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى لِلْجَنَّةِ أَنْتِ رَحْمَتِي، وَقَالَ لِلنَّارِ: أَنْتِ عَذَابِي،

---

(١) بڕوانە: ١٢٨٤.

أُصِيبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْكُمَا مِلْؤُهَا -قَالَ:- فَأَمَّا الجَنَّةُ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا، وَإِنَّهُ يُنْشِئُ لِلنَّارِ مَنْ يَشَاءُ، فَيُلْقَوْنَ فِيهَا، فَتَقُولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ؟ ثَلاَثًا، حَتَّى يَضَعَ فِيهَا قَدَمَهُ فَتَمْتَلِئُ، وَيُرَدُّ بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ وَتَقُولُ: قَطْ قَطْ قَطْ»[1].

**٧٤٤٩-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمووی: ((بەهەشت و دۆزەخ سكاڵایان لە دژی یەكتری بردە خزمەت پەروەردگاریان[2]، جا بەهەشت وتی: ئەو چیەتی هەر خەڵكانی لاواز و بێ نرخ هیچ و پوچ دێنە ناویەوە؟ دۆزەخیش وتی:-واتە- تایبەتكراوم بەخۆ بەزلزانانەوە، خوای بەرز و بڵندیش فەرمووی: بەبەهەشت تۆ بەزەیی خۆمی، وە بەدۆزەخی فەرموو: تۆش سزای منی هەر كەسم بوێ بەتۆ سزای دەدەم، وە بۆ هەر كامتان لە سەریەتی پڕكردنی- فەرمووی-جا سەبارەت بە (چوونە) بەهەشت، ئەوە بێگومان ستەم لە هیچ كام لە بەندەكانی ناكات، وە بەڕاستی هەر كەسی بوێ بۆ (چوونە) دۆزەخ دروستی دەكات، جا فرێ دەدرێنە ناویەوە، دۆزەخیش سێ جار دەڵێ: ئایا كەسی تر هەیە (دۆزەخ پڕ نابێت)، هەتا پەروەردگار پێی پیا ئەنێت، ئیتر پڕ دەبێت بەشەكانی دەچنە پاڵ یەكتری (دەچن بەناو یەكتریدا) دۆزەخیش دەڵێ: بەسمە بەسمە بەسمە)).**

٧٤٥٠- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيُصِيبَنَّ أَقْوَامًا سَفْعٌ مِنَ النَّارِ بِذُنُوبٍ أَصَابُوهَا عُقُوبَةً، ثُمَّ يُدْخِلُهُمُ اللَّهُ الجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ يُقَالُ لَهُمُ الْجَهَنَّمِيُّونَ». وَقَالَ هَمَّامٌ حَدَّثَنَا قَتَادَةُ حَدَّثَنَا أَنَسٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[3].

---

(١) بڕوانە: ٤٨٤٩.

(٢) دەگونجێ بەم جۆرەش مانا بكرێ: بەهەشت و دۆزەخ لە خزمەت پەروەردگاریان بوو بە دەمەقاڵەیان.

(٣) بڕوانە: ٦٥٥٩.

**٧٤٥٠-ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((بێگومان خەڵکانێك گڕی ئاگر (ی دۆزەخ) لێیان دەدات ڕەش هەڵیان دەگەڕێنێت، وەك تۆڵەیەك بەهۆی گوناهەکانیانەوە کە کردوویانە، لە پاشان خوا بەفەزڵ و بەزەیی خۆی دەیان خاتە بەهەشتەوە، پێیان دەوترێت: جەهەنمیەکان)).**

**-وەهەممام دەڵێ: قەتادە بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەنەس ﷺ ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ گێڕاینەوە.**

## ٢٦- بابُ قَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ﴿٤١﴾ ﴾ فاطر

٧٤٥١- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ قَالَ: جَاءَ حَبْرٌ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّ اللّٰهَ يَضَعُ السَّمَاءَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالأَرْضَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْجِبَالَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالشَّجَرَ وَالأَنْهَارَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَسَائِرَ الخَلْقِ عَلَى إِصْبَعٍ، ثُمَّ يَقُولُ بِيَدِهِ: أَنَا المَلِكُ. فَضَحِكَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ وَقَالَ: ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ﴿٩١﴾ ﴾ الأنعام[1].

## ٢٦- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بەڕاستی خوا ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیر دەکات بۆ ئەوەی لە ڕێڕەوی خۆیان لانەدەن)

**٧٤٥١ -عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: زانایەکی (ی جولەکە) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی موحەممەد بێگومان خوا ئاسمان لەسەر پەنجەیەکی ڕادەگرێ (دادەنێ)، زەوییش لەسەر پەنجەیەکی و درەخت و ڕووبارەکانیش لەسەر پەنجەیەکی ڕادەگرێ (دادەنێ)، وە هەموو دروستکراوەکانی تریش لەسەر**

---

(١) بڕوانە: ٤٨١١.

پەنجەیەکی دادەنێ (ڕادەگرێت)، پاشان خوا بە ئاماژەی دەستی دەفەرمووێ: منم پادشا، پێغەمبەری خواش ﷺ پێکەنی و فەرمووی: (وە کافران خوایان نەناسیوە بەو جۆرەی شیاوی ئەو بێ).

## ٢٧- بابُ مَا جَاءَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَغَيْرِهَا مِنَ الخَلَائِقِ

وَهْوَ فِعْلُ الرَّب وَأَمْرُهُ، فَالرَّبُّ بِصِفَاتِهِ وَفِعْلِهِ وَأَمْرِهِ، وَهْوَ الخَالِقُ غَيْرُ مَخْلُوقٍ، وَمَا كَانَ بِفِعْلِهِ وَأَمْرِهِ وَتَخْلِيقِهِ وَتَكْوِينِهِ، فَهْوَ مَفْعُولٌ مَخْلُوقٌ مُكَوَّنٌ.

٧٤٥٢- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، أَخْبَرَنِي شَرِيكُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ فِي بَيْتِ مَيْمُونَةَ لَيْلَةً وَالنَّبِيُّ ﷺ عِنْدَهَا؛ لأَنْظُرَ كَيْفَ صَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ، فَتَحَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَعَ أَهْلِهِ سَاعَةً ثُمَّ رَقَدَ، فَلَمَّا كَانَ ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ أَوْ بَعْضُهُ قَعَدَ فَنَظَرَ إِلَى السَّمَاءِ فَقَرَأَ: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأَيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران " ثُمَّ قَامَ فَتَوَضَّأَ وَاسْتَنَّ، ثُمَّ صَلَّى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ أَذَّنَ بِلاَلٌ بِالصَّلاَةِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى لِلنَّاسِ الصُّبْحَ[١].

## ٢٧- باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جگە لەوان لە دروست کراوەکانی تر

(دروستکردن) کار و فەرمانی پەروەردگاری بەرز و بڵندە، چونکە پەروەردگار بە سیفەتەکانی و کار و دروست کردن و فەرمانییەوە[٢]، وەهەر ئەو (خوایە) بەدیهێنەرەوەهەر ئەو دروستکەرە کە دروست نەکراوە.

(١) بڕوانە: ١١٧.

(٢) بەوانەوە خوا و پەروەردگارە.

وه ئەوەی بەکار و دروستکردن و بەدیهێنانی ئەو پەیدا بووبێت، ئەو شتە کردارو دروست کراو بەدیهێنراوی ئەوە.

٧٤٥٢- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: شەوێك لە ماڵی مەیمونە[1] مامەوە، پێغەمبەریش ﷺ لای ئەو بوو، بۆ ئەوەی ببینم شەو نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە؟ ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خێزانیدا ماوەیەك قسەی کرد، پاشان ڕاکشا و خەوت، ئەنجا کاتێ سێیەکی کۆتایی شەو بوو یان بەشێکی بوو، (پێغەمبەر) دانیشت و سەیری ئاسمانی کرد جا ئەم ئایەتەی خوێند: (بەڕاستی لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە جیاوازی و گۆڕانی شەو و ڕۆژدا چەندەها بەڵگە هەیە بۆ خاوەن ژیرییەکان)، پاشان هەستا و دەستنوێژی گرت و سیواکی کرد، جا یازدە ڕکات (شەو) نوێژی کرد، پاشان بیلال بانگی بەیانیدا، ئەوسا (پێغەمبەر ﷺ) دوو ڕکات نوێژی کرد لە پاشان ڕۆشت (بۆ مزگەوت) و پێشنوێژی بەیانی کرد بۆ خەڵکەکە.

## ٢٨- بابُ ﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ ﴾ الصافات

٧٤٥٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَمَّا قَضَى اللَّهُ الخَلْقَ كَتَبَ عِنْدَهُ فَوْقَ عَرْشِهِ إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي»[2].

## ٢٨- باسی (ئەم ئایەتە) (سوێند بەخوا بێگومان پێشتر بڕیارمان داوە بۆ بەندە نێردراوەکانمان)

٧٤٥٣-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کە خوا لە دروستکردنی بوونەوەر بوویەوە لای خۆی لەسەر عەرشەکەی

---

(١) کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ و پوری ئیبنو عەبباس بوو.

(٢) بڕوانە: ٣١٩٤.

**نووسیویەتی: بێگومان بەزەیی و میهرەبانی من زاڵ بووە بەسەر توڕەی و خەشمم دا)).**

٧٤٥٤- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ وَهْبٍ، سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ: «إِنَّ خَلْقَ أَحَدِكُمْ يُجْمَعُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا وَأَرْبَعِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَهُ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَهُ، ثُمَّ يُبْعَثُ إِلَيْهِ الْمَلَكُ فَيُؤْذَنُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ فَيَكْتُبُ: رِزْقَهُ وَأَجَلَهُ، وَعَمَلَهُ، وَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ، ثُمَّ يَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ، حَتَّى لاَ يَكُونُ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ إِلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُ النَّارَ، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ إِلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الكِتَابُ، فَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا»[1].

**٧٤٥٤- عەبدوڵلای (کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە ڕاستگۆی باوەڕپێکراوە بۆی گێڕاینەوە و فەرمووی: ((بێگومان دروست کردنی هەر یەك لە ئێوە چل ڕۆژ و چل شەو لە سکی دایکیدا کۆ دەکرێتەوە، پاشان بە ئەوەندەی تر (چل ڕۆژ) دەبێتە خوێنێکی بەستوو، پاشان بەئەوەندەی تر دەبێتە پارچە گۆشتێك (بەئەندازەی پارووییەك)، پاشان خوا فریشتەکی (تایبەت) دەنێردرێت بۆ لای و مۆڵەتی پێدەدرێت بە چوار وشە و دەنوسرێت: ڕسق و ڕۆزی و تەمەنی و کردەوەی و بەدبەختە یان بەختەوەرە، پاشان گیان دەکات بە بەریدا، جا بەڕاستی کەسێك لە ئێوە کار دەکات بەکاری بەهەشتیانە، هەتا لە نێوان ئەو و بەهەشتدا تەنها گەزێك دەمێنێت، جا نووسراوەکەی [2] پێش دەکەوێت لێی، ئیتر کاری دۆزەخیانە دەکات وئەوسا دەچێتە دۆزەخەوە، وە بێگومان کەسی واشتان**

---

(١) بروانە: ٣٢٠٨.

(٢) کە فریشتەکە لە سکی دایکیدا بۆی نووسیوە.

**هەیە کارو کردەوەی دۆزەخیانە دەکات هەتا لە نێوان ئەو دۆزەخدا تەنها گەزێك دەمێنێت، جا نووسراوەکەی پێش دەکەوێت لێی، ئیتر کاری بەهەشتیانە دەکات ئەوسا دەچێتە بەهەشتەوە)).**

٧٤٥٥- حَدَّثَنَا خَلَّادُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ ذَرٍّ، سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ عَنْ سَعِيدِ ابْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «يَا جِبْرِيلُ، مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا؟». فَنَزَلَتْ: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا ﴿٦٤﴾ ﴾ مريم. إِلَى آخِرِ الآيَةِ. قَالَ: هَذَا كَانَ الجَوَابَ لِمُحَمَّدٍ ﷺ[1].

**٧٤٥٥- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی جیبریل چ شتێك ڕێگریت دەکات لەوەی کە زیاتر لەو ئەندازەی سەردانیمان دەکەیت سەردانیمان بکەیت؟)) بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (ئێمە (فریشتەکان) لە ئاسمانەوە دانابەزین بە فەرمانی پەروەردگارت نەبێ، تەنها بۆ خوایە (و خۆی دەزانێ) هەموو کاروباری ئێستا و داهاتوو ڕابردوومان) وتی: ئەمە[2] وەلامی موحەممەد بوو ﷺ.**

٧٤٥٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي حَرْثٍ بِالْمَدِينَةِ وَهْوَ مُتَّكِئٌ عَلَى عَسِيبٍ، فَمَرَّ بِقَوْمٍ مِنَ اليَهُودِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ تَسْأَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ. فَسَأَلُوهُ، فَقَامَ مُتَوَكِّئًا عَلَى العَسِيبِ وَأَنَا خَلْفَهُ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ فَقَالَ:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء. فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: قَدْ قُلْنَا لَكُمْ لاَ تَسْأَلُوهُ[3].

(١) بڕوانە: ٣٢١٨.

(٢) واتە: دابەزینی ئایەتەکە وەلامی پێغەمبەر بوو ﷺ.

(٣) بڕوانە: ١٢٥.

**٧٤٥٦-عەلقەمە لە عەبدوڵڵاوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە مەدینەدا بەناو کێڵگەیەکدا دەڕۆشتم، خۆی دابوو بەسەر پەلێکی دار خورمایەکدا (لە ڕۆشتنیدا)، ئینجا ڕۆشت بەلای کۆمەڵێ جوولەکەدا، هەندێکیان بەهەندێکیان وت: پرسیاری لێ بکەن دەربارەی ڕۆح، هەندێکی تر وتیان: پرسیاری لێ مەکەن دەربارەی ڕۆح، بەڵام پرسیاریان لێ کرد، جا (پێغەمبەریش ﷺ) وەستا و خۆی دابوو بەسەر پەلی دار خورماکەدا، منیش لە پشتیەوە بووم، گومانم برد نیگای بۆ دێت، جا فەرمووی: (وە (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح (کە چییە؟) بڵێ: ڕۆح لە کار و فەرمانی تایبەت بە پەروەردگارمە، وە ئێوە تەنها کەمێك زانیاریتان پێ بەخشراوە)، ئەوسا هەندێکیان بەهەندێکیان وت: بێگومان پێمان وتن: پرسیاری لێ مەکەن.**

٧٤٥٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تَكَفَّلَ اللَّهُ لِمَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيلِهِ -لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ الجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ وَتَصْدِيقُ كَلِمَاتِهِ- بِأَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، أَوْ يَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الذِي خَرَجَ مِنْهُ مَعَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ»[1].

**٧٤٥٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((خوا دەستەبەری کردوە بۆکەسێك لە ڕێی خوادا تێکۆشابێ- کە هۆکار دەرچوونی تەنها خەبات کردن لە ڕێی خوا و باوەڕی تەواو بەبەڵێنەکانی بێت-بەوەی کە بیخاتە بەهەشتەوە یان بیگەڕێنێتەوە بۆ جێگاکەی کە لێوەی دەرچووە، لەگەڵ ئەوەی دەستی کەوتووە لە پاداشت یان دەستکەوت)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٦.

٧٤٥٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: الرَّجُلُ يُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، فَأَيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ العُلْيَا فَهْوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»(١).

**٧٤٥٨-ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: پیاو جەنگ دەكات بۆ مەردایەتی و غیرەت، وە جەنگ دەكات بۆ ئازایەتی، وە جەنگ دەكات بۆ ڕووپامایی، جا كام لەمانە لە ڕێی خوادایە؟ فەرمووی: ((هەر كەس جەنگ بكات تا وشەی خوا بەرزتر بێت هەر ئەوە لە ڕێی خوادایە)).**

**٢٩- بابُ قوْلِ اللَّهِ تعالى: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾﴾ النحل**

٧٤٥٩- حَدَّثَنَا شِهَابُ بْنُ عَبَّادٍ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ، عَنِ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَزَالُ مِنْ أُمَّتِي قَوْمٌ ظَاهِرِينَ عَلَى النَّاسِ، حَتَّى يَأْتِيَهُمْ أَمْرُ اللَّهِ»(٢).

## ٢٩- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێگومان وتەی ئێمە بۆ هەر کارێک کاتێ بمانەوێ (ئەمەیە)، پێی دەڵێین ببە یەکسەر دەبێت)

**٧٤٥٩-موغیرەی كوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بەردەوام كۆمەڵێ لە ئوممەتم زاڵ و سەركەوتوون بەسەر خەڵكیدا، هەتا فەرمانی خوا دێت (بەهاتنی قیامەت)) ).**

(١) بڕوانە: ١٢٣.

(٢) بڕوانە: ٣٦٤٠.

٧٤٦٠- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ جَابِرٍ، حَدَّثَنِي عُمَيْرُ بْنُ هَانِئٍ أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَزَالُ مِنْ أُمَّتِي أُمَّةٌ قَائِمَةٌ بِأَمْرِ اللَّهِ، مَا يَضُرُّهُمْ مَنْ كَذَّبَهُمْ، وَلاَ مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ».فَقَالَ مَالِكُ بْنُ يُخَامِرَ: سَمِعْتُ مُعَاذًا يَقُولُ: "وَهُمْ بِالشَّأْمِ". فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: هَذَا مَالِكٌ يَزْعُمُ أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاذًا يَقُولُ: "وَهُمْ بِالشَّأْمِ"[١].

**٧٤٦٠- عومەیری کوڕی هانی دەگێڕێتەوە کە لە موعاویەی بیست وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بەردەوام لە ئوممەتمدا کۆمەڵێك هەن بە فەرمانی خوا هەڵدەستن و، ئەوەی باوەڕیان پێ نەکات یان دژایەتیان بکات هیچ زیانێکیان پێ ناگەیەنێ، هەتا فەرمانی خوا دێت ئەوان لەسەر ئەو حاڵەی خۆیانن))، جا مالیکی کوڕی یوخامیر وتی: لە موعازم بیست دەیوت: ئەو کەسانە لە شامن، موعاویەش ﷺ وتی: ئەوە مالیکە بەقسەی خۆی دەڵێ: بێگومان ئەو لە موعازی ﷺ بیستووە وتویەتی: ئەو کەسانە لە شامن.**

٧٤٦١- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ، حَدَّثَنَا نَافِعُ بْنُ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: وَقَفَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى مُسَيْلِمَةَ فِي أَصْحَابِهِ فَقَالَ: «لَوْ سَأَلْتَنِي هَذِهِ القِطْعَةَ مَا أَعْطَيْتُكَهَا، وَلَنْ تَعْدُوَ أَمْرَ اللَّهِ فِيكَ، وَلَئِنْ أَدْبَرْتَ لَيَعْقِرَنَّكَ اللَّهُ»[٢].

**٧٤٦١-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: موسەیلەمە لەناو هاوڕێکانی دابوو پێغەمبەر ﷺ لە لایدا وەستا، جا فەرمووی پێی: ((ئەگەر داوای ئەم پەلە دار خورمایەم لێ بکەیت ناتدەمێ، وە ناتوانی لەو فەرمانەی خوای گەورە دەربارەت داوێتی دەربچیت، وە ئەگەر پشت هەڵکەیت (و گوێڕایەڵم نەبیت) بەدڵنیاییەوە خوا دەتکوژێت[٣])).**

---

(١) بڕوانە: ٧١.

(٢) بڕوانە: ٣٦٢٠.

(٣) هەرواش بوو لە جەنگی یەمامەدا بە دەستی مسوڵمانان کوژرا.

٧٤٦٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ عَبْدِ الْوَاحِدِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَعْضِ حَرْثِ الْمَدِينَةِ وَهْوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى عَسِيبٍ مَعَهُ، فَمَرَرْنَا عَلَى نَفَرٍ مِنَ الْيَهُودِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ. فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ تَسْأَلُوهُ أَنْ يَجِيءَ فِيهِ بِشَيْءٍ تَكْرَهُونَهُ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَنَسْأَلَنَّهُ. فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَقَالَ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ مَا الرُّوحُ؟ فَسَكَتَ عَنْهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ، فَقَالَ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْـرِ رَبِّى وَمَآ أُوتُوا[1] مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيـلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء. قَالَ الأَعْمَشُ هَكَذَا فِي قِرَاءَتِنَا[2].

**٧٤٦٢- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بە شوێنێکی کێڵگەیەکی مەدینەدا دەڕۆشتم، پێغەمبەر ﷺ خۆی دەدا بەسەر پەلی دار خورمایەکدا کە پێی بوو، جا ڕۆشتین بەلای چەند کەسێکی جولەکەدا لە ناو خۆیاندا بە یەکتریان وت: پرسیاری لێ بکەن دەربارەی ڕۆح؟ کەسێکیان وتی: پرسیاری لێ مەکەن نەوەك نیگای بۆ بێت بە شتێك کە پێتان ناخۆشە، کەسێکی تریان وتی: سوێندبێ پرسیاری لێ دەکەین، جا پیاوێکیان هەستا و وتی: ئەی ئەبو لقاسم ڕۆح چییە؟ پێغەمبەریش ﷺ لێی بێدەنگ بوو، ئیتر زانیم کە نیگای بۆ دێت، ئینجا فەرمووی: (وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح، تۆش بڵێ: ڕۆح لە کار و باری تایبەت بە پەروەردگارمە، وە ئێوە لە زانست و زانیاری پێتان نەبەخشراوە کەمێك نەبێ)، ئەعمەش دەڵێ: شێوەی خوێندنەوەی ئایەتەکە لای ئێمە ئاوایە: ﴿ أُوتُوا ﴾**[3].

---

(١) بەڵام لە ڕیوایەتی کوشمیهەنیی دا بە: ﴿ أُوتِيتُم ﴾ گێڕاویەتیەوە کە خوێندنەوەی زۆربەی قورئان خوێنەکانە و مەشهورە. إرشاد الساري:١٥/٤٣٥.

(٢) بڕوانە: ١٢٥.

(٣) واتە: ئەو وشە لە ئایەتەکەدا لە خوێندنەوەی ئەعمەشدا بە: ﴿ أُوتُوا ﴾ خوێنراوەتەوە، بەڵام ئەوانی تر بە: ﴿ أُوتِيتُم ﴾ خوێندویانەتەوە.

## ٣٠- بابُ قَوْلِ اللّٰهِ تعالى:

﴿ قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ ﴾ **الكهف، وقوله**: ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ﴿٢٧﴾ ﴾ ، **وقوله**: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾.

## ٣٠- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند:

**(بڵێ: ئەگەر (ئاوی) دەریاکان ببوایە بە مرەکەب بۆ (نووسینی) زانیاری پەروەردگارم، بێگومان (ئاوی) دەریاکان تەواو دەبوون پێش ئەوەی زانیاری و عیلمی پەروەردگارم تەواو ببێت، ئەگەر چەند ئەوەندەی دەریاکانیش بێنین (بیکەین بە مرەکەب عیلمی خوا تەواو نابێت).**

**وە ئەم فەرمایشتەی (بێگومان ئەگەر هەرچی درەخت هەیە لە زەوی دایە قەڵەم و پێنووس بێت، هەموو دەریای زەوی ببێتە مرەکەب حەوت دەریای تر دوای ئەو (ـەی باسکرا) ببێت بە مرەکەب، ئەوە زانیاریەکانی خوا کۆتایی نایەت و تەواو نابن)**

**وە ئەم فەرمایشتەی (بەڕاستی پەروەردگارتان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردوە، پاشان (خوا) چووە سەر عەرش[1]، بە**

(١) باوەڕمان پێیەتی بەڵام شێوەکەی نازانین.

**(تاریكایی) شەو (ڕۆشنایی) ڕۆژ دادەپۆشێ[1] (ڕۆژ بەشوێن شەوەوەیە بەخێرایی و) شەو بەشوێن ڕۆژەوەیە بەخێرای، خۆر و مانگ و ئەستێرەكانیش ژێر بار كراون بەفەرمانی خۆی بێداربن كە بەدی هێنان و فەرمان دان هەر بۆ خوایە پاك و بێگەردە (لە هەموو ناتەواویەك)، خوا پەروەردگاری جیهانیانە).**

٧٤٦٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تَكَفَّلَ اللَّهُ لِمَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيلِهِ -لاَ يُخْرِجُهُ مِنْ بَيْتِهِ إِلاَّ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ، وَتَصْدِيقُ كَلِمَتِهِ- أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، أَوْ يَرُدَّهُ إِلَى مَسْكَنِهِ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ»[2].

**٧٤٦٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا دەستەبەری كردوە بۆ كەسێك لە ڕێی خوادا تێكۆشابی- كە هۆكار دەرچوونی لە ماڵ تەنها خەبات كردن لە ڕێی خوا و باوەڕی تەواو بە بەڵێنەكانی بێت- بەوەی كە بیخاتە بەهەشتەوە، یان بیگەڕێنێتەوە بۆ جێگاكەی خۆی، لەگەڵ ئەوەی دەستی كەوتووە لە پاداشت یان دەستكەوت)).**

## ٣١- بابٌ: فِي المشيئةِ والإرادةِ

وَقَوْلِه تعالى: ﴿ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ ﴿٢٦﴾ ﴾ آل عمران. وقوله: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴿٢٩﴾ ﴾ التكوير، وقوله: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴿٢٤﴾ ﴾ الكهف. ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴿٥٦﴾ ﴾

(١) بەپێچەوانەشەوە.
(٢) بڕوانە: ٣٦.

القصص. قَالَ سَعِيدُ بْنُ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ: نَزَلَتْ فِي أَبِي طَالِبٍ. ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴿١٨٥﴾﴾ البقرة.

## ٣١- باسێک :دەربارەی خواست[1] و ویست

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دەسەڵات دەدەیت بە هەر کەسێك کە بتەوێت). وە ئەم فەرمایشتەش: (ئێوە حەزناکەن (لە گرتنی ئەو ڕێیە) مەگەر کاتێ کە خوا بیەوێ (وە بەزۆر ناچارتان بکات). وە ئەم فەرمایشتەش: (بۆ (کردنی) هیچ شتێك مەڵێ من سبەینێ ئەو شتە دەکەم، مەگەر (لەگەڵیدا بڵێ) ئەگەر خوا بیەوێ)**

**(بەڕاستی تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) ناتوانی ئەو کەسەی خۆشت بوێ ڕێنموونی بکەیت، بەڵام خوا هەر کەسی بوێ ڕێنموونی دەکات)، سەعیدی کوڕی موسەییەب لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ:ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبی تاڵیب دابەزی: (خوا ئاسانی ئەوێ بۆ ئێوە، وە گرانی ناوێ بۆتان).**

٧٤٦٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَعَوْتُمُ اللَّهَ فَاعْزِمُوا فِي الدُّعَاءِ، وَلاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: إِنْ شِئْتَ فَأَعْطِنِي، فَإِنَّ اللَّهَ لاَ مُسْتَكْرِهَ لَهُ»[2].

**٧٤٦٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر داواتان لە خوا کرد بەسوور خواستی داوا بکەن، وە کەستان نەڵێت: خودایە ئەگەر ویست داواکەم پێ بدەیت، چونکە بەڕاستی هیچ ناچار کەرێك نییە بۆ خوا)).**

٧٤٦٥- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ.

---

(١) (المشيئة): لە ئەسڵدا بەمانای بەدی هێنان و پێکانە، جا بۆ خوا بۆ بەدی هێنانە، وە بۆ مرۆڤ پێکانە.

(٢) بڕوانە: ٦٣٣٨.

وَحَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي أَخِي عَبْدُ الحَمِيدِ عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَتِيقٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، أَنَّ حُسَيْنَ بْنَ عَلِيٍّ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَرَقَهُ وَفَاطِمَةَ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةً فَقَالَ لَهُمْ «أَلاَ تُصَلُّونَ؟». قَالَ عَلِيٌّ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللَّهِ، فَإِذَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَنَا بَعَثَنَا، فَانْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ قُلْتُ ذَلِكَ، وَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئًا، ثُمَّ سَمِعْتُهُ وَهْوَ مُدْبِرٌ يَضْرِبُ فَخِذَهُ وَيَقُولُ: ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ ﴾ الكهف[1].

**٧٤٦٥- حوسەینی كوڕی عەلی ﷺ دەڵێ: عەلی كوڕی ئەبو تالیب ﷺ بۆی گێڕایەوە: كە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێ هات بۆ لای ئەو و فاتیمەی كچی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی پێیان: ((ئەوە شەونوێژ ناكەن؟!)) عەلی دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا، گیانمان بەدەستی خوایە، جا ئەگەر ویستی خەبەرمان كاتەوە ئەوە خەبەرمان دەكاتەوە (و هەڵدەسین)، ئیتر كە ئەوەم وت پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە هیچ وەڵامێكی نەدامەوە، پاشان كە پشتی هەڵكرد و ڕۆشت، گوێم لێ بوو دەیدا بەڕانیدا و دەیفەرموو: ((بەڕاستی ئادەمیزاد لە هەموو شتێ زیاتر موجادەلە و دەمەدەمێ دەكات)).**

٧٤٦٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، حَدَّثَنَا هِلاَلُ بْنُ عَلِيٍّ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ خَامَةِ الزَّرْعِ، يَفِيءُ وَرَقُهُ مِنْ حَيْثُ أَتَتْهَا الرِّيحُ تُكَفِّئُهَا، فَإِذَا سَكَنَتِ اعْتَدَلَتْ، وَكَذَلِكَ الْمُؤْمِنُ يُكَفَّأُ بِالْبَلاَءِ، وَمَثَلُ الكَافِرِ كَمَثَلِ الأَرْزَةِ صَمَّاءَ مُعْتَدِلَةً حَتَّى يَقْصِمَهَا اللَّهُ إِذَا شَاءَ»[2].

---

(١) بروانە: ١١٢٧.

(٢) بروانە: ٥٦٤٤.

**٧٤٦٦-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نموونەی باوەڕدار وەك ڕووەکێکی تەڕی تازە ڕوواو وایە، با لە هەر لایەکەوە بێت گەڵاکانی دەجوڵێنێ و ڕووەکەکەش بەملا و لادا لاری دەکاتەوە، ئینجا کە بایەکەش وەستا ڕووەکەکەش ڕێك و ڕاست دەبێتەوە، باوەڕداریش هەر وەهایە لەگەڵ بەڵا و ناڕەحەتیدا، وە نموونەی کافریش وەك داری سنەوبەر وایە، پتەوە و ناوی بۆش نییە و ڕاستە، هەتا کەی خوا ویستی دەیشکێنێ)).**

٧٤٦٧- حَدَّثَنَا الحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ قَائِمٌ عَلَى المِنْبَرِ: «إِنَّمَا بَقَاؤُكُمْ فِيمَا سَلَفَ قَبْلَكُمْ مِنَ الأُمَمِ كَمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْعَصْرِ إِلَى غُرُوبِ الشَّمْسِ، أُعْطِيَ أَهْلُ التَّوْرَاةِ التَّوْرَاةَ، فَعَمِلُوا بِهَا حَتَّى انْتَصَفَ النَّهَارُ، ثُمَّ عَجَزُوا، فَأُعْطُوا قِيرَاطًا قِيرَاطًا، ثُمَّ أُعْطِيَ أَهْلُ الإِنْجِيلِ الإِنْجِيلَ، فَعَمِلُوا بِهِ حَتَّى صَلاَةِ العَصْرِ، ثُمَّ عَجَزُوا، فَأُعْطُوا قِيرَاطًا قِيرَاطًا، ثُمَّ أُعْطِيتُمُ الْقُرْآنَ فَعَمِلْتُمْ بِهِ حَتَّى غُرُوبِ الشَّمْسِ، فَأُعْطِيتُمْ قِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ، قَالَ أَهْلُ التَّوْرَاةِ رَبَّنَا هَؤُلاَءِ أَقَلُّ عَمَلاً وَأَكْثَرُ أَجْرًا. قَالَ: هَلْ ظَلَمْتُكُمْ مِنْ أَجْرِكُمْ مِنْ شَيْءٍ؟ قَالُوا: لاَ. فَقَالَ: فَذَلِكَ فَضْلِي أُوتِيهِ مَنْ أَشَاءُ»[1].

**٧٤٦٧- سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست کە ئەو لەسەر دوانگە بوو دەیفەرموو: ((بێگومان مانەوەی ئێوە لەچاو مانەوەی ئەو گەلانەی لە پێش ئێوەدا بوون و تێپەڕین، وەك نێوان نوێژی عەسر تا خۆرئاوا بوونە، (جولەکەکانی) خاوەن تەورات تەوراتیان پێ درا و تا ڕۆژ نیوە بوو کاریان پێ کرد، ئیتر نەیانتوانی**

(١) بڕوانە: ٥٥٧.

پەکیان کەوت بۆیە سەر و قیراتیان پێدرا، پاشان (گاورەکانی) خاوەن ئینجیل ئینجیلیان پێدرا، ئەوانیش تا نوێژی عەسر کاریان پێکرد، پاشان نەیانتوانی پەکیان کەوت، ئەوانیش هەر کەس و سەر و قیراتیان پێدرا، پاشان ئێوە قورئانتان پێدرا و تا خۆرئاوابوون کارتان پێکرد، هەریەکەتان دوو قیرات دوو قیراتی پێدرا، جا (جولەکەکانی) خاوەن تەورات وتیان: ئەی پەروەردگارمان ئائەوانە کاریان کەمتر کردوە و پاداشتی زۆرتریان پێدراوە، پەروەردگار فەرمووی: ئایا لەپاداشتەکەی خۆتان هیچ ستەمێکم لێ کردوون؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: دەی ئەوە فەزڵ و بەهرەی خۆمە بەکێم بوێ دەیدەم)).

٧٤٦٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ الْمُسْنَدِيُّ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ، فَقَالَ: «أُبَايِعُكُمْ عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ، وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ وَلاَ تَعْصُونِي فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَأُخِذَ بِهِ فِي الدُّنْيَا فَهْوَ لَهُ كَفَّارَةٌ وَطَهُورٌ، وَمَنْ سَتَرَهُ اللَّهُ فَذَلِكَ إِلَى اللَّهِ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ»[1].

٧٤٦٨- عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: بەیعەتم بە پێغەمبەری خوادا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێ هاوەڵدا، جا فەرمووی: ((پەیمانتان لێ وەردەگرم لەسەر ئەوەی کە هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی خوا، وە دزی نەکەن و، داوێن پیسی نەکەن و، منداڵەکانتان نەکوژن، وە بوهتان نەکەن (بۆ خەڵکی) لە نێوان دەست پێ کانتاندا، سەرپێچیم نەکەن لە چاکەدا، جا هەر کەسێکتان پەیمانەکەی بردە

(١) بڕوانە: ١٨.

**سەر ئەوە پاداشتی لای خوایە، وە هەر کەسێکتان پێچەوانەی شتانێکی پەیمانەکەی کرد، ئەگەر لە دونیادا سزادرا ئەوە گوناهەکەی سڕاوەتەوە و پاك بۆتەوە، هەر کەسێکیش خوا بۆی پۆشی ئەوە حەواڵەی لای خوا دەکرێ، ئەگەر ویستی سزای دەدات، وە ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ)).**

٧٤٦٩- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا، وُهَيْبٌ عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: "أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ سُلَيْمَانَ ﷺ كَانَ لَهُ سِتُّونَ امْرَأَةً فَقَالَ: لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى نِسَائِي، فَلْتَحْمِلْنَ كُلُّ امْرَأَةٍ وَلْتَلِدْنَ فَارِسًا يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَطَافَ عَلَى نِسَائِهِ، فَمَا وَلَدَتْ مِنْهُنَّ إِلاَّ امْرَأَةٌ وَلَدَتْ شِقَّ غُلاَمٍ". قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كَانَ سُلَيْمَانُ اسْتَثْنَى لَحَمَلَتْ كُلُّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ، فَوَلَدَتْ فَارِسًا يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[1].

**٧٤٦٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا سولەیمان ﷺ شەست ژنی هەبوو، وتی سوێند بێ ئەم شەو بەسەر هەموو ژنەکانمدا دەسوڕێمەوە (سەرجێییان لەگەڵ دەکەم) و دەبێ هەموو ژنێکیان دووگیان ببێت و کوڕێکی سوارچاکیان ببێت بجەنگێ لە ڕێی خوادا، ئینجا (شەو) سوڕایەوە بەسەر ژنەکانیدا، بەڵام هیچیان منداڵی نەبوو جگەلە ژنێکیان لەتە کوڕێکی بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر سولەیمان** (إن شاء الله)**ی بکردایە، هەموو ژنەکانی دووگیان و حامیلە دەبوون، جا (هەریەکەیان) کوڕێکی سوار چاکی دەبوو لە ڕێی خوادا بجەنگێت)).**

٧٤٧٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ الْحَذَّاءُ، عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَى أَعْرَابِيٍّ يَعُودُهُ فَقَالَ: «لاَ بَأْسَ، عَلَيْكَ طَهُورٌ، إِنْ

---

(١) بڕوانە: ٢٨١٩.

شَاءَ اللَّهُ».قَالَ: قَالَ الأَعْرَابِيُّ: طَهُورٌ بَلْ هِيَ حُمَّى تَفُورُ عَلَى شَيْخٍ كَبِيرٍ، تُزِيرُهُ الْقُبُورَ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَنَعَمْ إِذًا»[1].

**٧٤٧٠- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت بۆلای پیاوێكی عەرەبی دەشتەكی (نەخۆش بوو) سەردانی كرد و فەرمووی: ((ترسی نییە بەویستی خوا پاكەرەوەی گوناهەكانتە))، دەڵێ: پیاوەكە وتی: (بە پێغەمبەر ﷺ) پاكەرەوەیە؟ نەخێر پاكەرەوە نییە بەڵكو لەرز و تایەكە پیرێكی بەتەمەن هەڵدەچۆقێنێ و سەردانی گۆڕستانی پێ دەكات[2]، پێغەمبەریش فەرمووی: ((كەواتە بەڵێ وا دەبێ خۆت دەڵێی)).**

٧٤٧١- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ حِينَ نَامُوا، عَنِ الصَّلاَةِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ قَبَضَ أَرْوَاحَكُمْ حِينَ شَاءَ وَرَدَّهَا حِينَ شَاءَ».فَقَضَوْا حَوَائِجَهُمْ وَتَوَضَّئُوا إِلَى أَنْ طَلَعَتِ الشَّمْسُ وَابْيَضَّتْ، فَقَامَ فَصَلَّى[3].

**٧٤٧١-عەبدوڵڵای كوڕی قەتادە لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە:كاتێ خەوتن و نوێژەكەیان ڕۆشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا كاتێ ویستی گیانتانی بردەوە، وەكاتێ ویستی گێڕایەوە (بۆتان) ))، ئینجا دەستیان بەئاو گەیاند و دەست نوێژیان گرت تا خۆرهەڵهات و دونیا ڕوون بوویەوە[4]، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەستا و نوێژی كرد (بۆیان بەكۆمەڵ).**

---

(١) بڕوانە: ٣٦١٦.
(٢) واتە: لەكۆڵی نابێتەوە تا نەیباتە ناو گۆڕەوە.
(٣) بڕوانە: ٥٩٥.
(٤) بەتەواوی دونیای ڕووناك كردەوە لە كاتی كەراهەت و ناپەسەندی دەرچوو.

٧٤٧٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَالأَعْرَجِ. وَحَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي أَخِي عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَتِيقٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَسَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلٌ مِنَ المُسْلِمِينَ وَرَجُلٌ مِنَ اليَهُودِ، فَقَالَ الْمُسْلِمُ: وَالَّذِي اصْطَفَى مُحَمَّدًا عَلَى الْعَالَمِينَ. فِي قَسَمٍ يُقْسِمُ بِهِ، فَقَالَ اليَهُودِيُّ: وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى عَلَى الْعَالَمِينَ. فَرَفَعَ المُسْلِمُ يَدَهُ عِنْدَ ذَلِكَ فَلَطَمَ اليَهُودِيَّ، فَذَهَبَ اليَهُودِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ،فَأَخْبَرَهُ بِالَّذِى كَانَ مِنْ أَمْرِهِ وَأَمْرِ المُسْلِمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تُخَيِّرُونِي عَلَى مُوسَى، فَإِنَّ النَّاسَ يَصْعَقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يُفِيقُ، فَإِذَا مُوسَى بَاطِشٌ بِجَانِبِ العَرْشِ، فَلاَ أَدْرِي أَكَانَ فِيمَنْ صَعِقَ فَأَفَاقَ قَبْلِي أَوْ كَانَ مِمَّنِ اسْتَثْنَى اللَّهُ».

**٧٤٧٢- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێکی مسوڵمان و پیاوێکی جولەکە جنێویان بەیەکتریدا، مسوڵمانەکەیان وتی: سوێند بەو زاتەی موحەممەدی ﷺ بەسەر جیهانیاندا هەڵبژاردووە، لەو سوێندانە بوو سوێند پێ دەخوارد، جوولەکەکەش وتی: سوێند بەو زاتەی موسای بەسەر جیهانیاندا هەڵبژاردووە، جا مسوڵمانەکە دەستی بەرزکردەوە و زللەیەکیدا لە ڕووخساری جوولەکەکە، جوولەکەکەش ڕۆشت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەی بوو بوو لە نێوان خۆی و مسوڵمانەکەدا بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((من هەڵمەبژێرن بەسەر موسادا ﷺ، چونکە بەڕاستی خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا بێ هۆش دەکەون، ئەنجا من یەکەم کەس دەبم هۆش دەکەمەوە، جا موسا ﷺ دەبینم توند دەستی گرتووە بەسوچێکی عەرشەوە، جا نازانم ئاخۆ لەو کەسانە بووە بێ هۆش کەوتووە و پێش من بەهۆش هاتۆتەوە، یاخود لەو کەسانە بووە خوا جیای کردوەتەوە (بێ هۆش نەکەوتووە).**

٧٤٧٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ أَبِي عِيسَى، أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «المَدِينَةُ يَأْتِيهَا الدَّجَّالُ فَيَجِدُ المَلاَئِكَةَ يَحْرُسُونَهَا، فَلاَ يَقْرَبُهَا الدَّجَّالُ وَلاَ الطَّاعُونُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ»[(١)].

**٧٤٧٣- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دەججال دێت بۆ مەدینە، جا دەبینێ فریشتەکان پاسەوانی دەکەن و دەیپارێزن، بۆیە نە دەججال نە چاوەقوڵە نزیکی ناکەوێتەوە ئەگەر خوا ویستی)).**

٧٤٧٤- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ، فَأُرِيدُ -إِنْ شَاءَ اللَّهُ- أَنْ أَخْتَبِيَ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لِأُمَّتِي يَوْمَ القِيَامَةِ»[(٢)].

**٧٤٧٤- ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەموو پێغەمبەرێك نزایەکی هەیە، بەڵام من دەمەوێ- ئەگەر خوا ویستی-ئەو نزا و پاڕانەوەم دوای بخەم بۆ تکاکردن بۆ ئوممەتەکەم لە دوا ڕۆژدا)).**

٧٤٧٥- حَدَّثَنَا يَسَرَةُ بْنُ صَفْوَانَ بْنِ جَمِيلٍ اللَّخْمِيُّ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي عَلَى قَلِيبٍ فَنَزَعْتُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ أَنْزِعَ، ثُمَّ أَخَذَهَا ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ فَنَزَعَ ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ وَفِي نَزْعِهِ ضَعْفٌ، وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَهُ، ثُمَّ أَخَذَهَا عُمَرُ فَاسْتَحَالَتْ غَرْبًا، فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا مِنَ النَّاسِ يَفْرِي فَرِيَّهُ، حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ حَوْلَهُ بِعَطَنٍ»[(٣)].

---

(١) بڕوانە: ٦٣٠٤.

(٢) بڕوانە: ٦٣٠٤.

(٣) بڕوانە: ٣٦٦٤.

**٧٤٧٥- ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا من خەوتبووم لە خەومدا خۆم دی ئەوەتام لەسەر بیرێك، ئەنجا ئەوەندەی خوا ویستی (بەو دوڵچە) ئاو هەڵگۆزم ئاوم هەڵگۆزی و دەرهێنا، پاشان کوڕی ئەبی قوحافە[1] ﷺ دۆڵچەکەی وەرگرت و دوڵچەیەك یان دووان ئاوی هەڵگۆزی، وە لە هەڵگۆزینەکەشیدا لاوازییەکی تیابوو خوا لێی خۆش بێت، پاشان عومەر دوڵچەکەی وەری گرت و گۆڕا بۆ دوڵچەیەکی گەورە، جا هیچ ئازا و لێزانێکم لە ئادەمیزاد نەدیوە بەوێنەی عومەر ئاوهەڵگۆزێ، هەتا ئەوەندەی هەڵگۆزی خەڵك وشترەکانیان پاراو کرد و بردنیان بۆ شوێنی حەوانەوەیان)).**

٧٤٧٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَتَاهُ السَّائِلُ -وَرُبَّمَا قَالَ: جَاءَهُ السَّائِلُ- أَوْ صَاحِبُ الحَاجَةِ قَالَ: «اشْفَعُوا فَلْتُؤْجَرُوا، وَيَقْضِي اللَّهُ عَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ مَا شَاءَ»[2].

**٧٤٧٦- ئەبو مووسا ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر کەسێك بهاتایە داوای هاوکاری بکردایە- وە هەندێ جار دەیوت: داواکارێك بهاتایەتە خزمەتی- یان خاوەن پێویستیەك بهاتایەتە خزمەتی دەیفەرموو: ((تکا بکەن تا پاداشت بدرێنەوە، خواش هەر بڕیارێکی بوێ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی دەیدات)).**

---

(١) واتە: ئەبو بەکر ﷺ.
(٢) بڕوانە: ١٤٣٢.

٧٤٧٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ، ارْحَمْنِي إِنْ شِئْتَ، ارْزُقْنِي إِنْ شِئْتَ، وَلْيَعْزِمْ مَسْأَلَتَهُ، إِنَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ، لاَ مُكْرِهَ لَهُ»(١).

**٧٤٧٧- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((کەستان نەڵێن: خوایە لێم خۆش بە ئەگەر ویستت، ڕەحمم پێ بکە ئەگەر ویستت، ڕۆزیم بدە ئەگەر ویستت، با بەسوور خواستی داوا بکات، بێگومان خوا چی بوێ دەیکات هیچ ناچار کەرێك نییە بۆ خوا)).**

٧٤٧٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ عَمْرٌو، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ تَمَارَى هُوَ وَالْحُرُّ بْنُ قَيْسِ بْنِ حِصْنٍ الفَزَارِيُّ فِي صَاحِبِ مُوسَى أَهُوَ خَضِرٌ، فَمَرَّ بِهِمَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ الأَنْصَارِيُّ، فَدَعَاهُ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّي تَمَارَيْتُ أَنَا وَصَاحِبِي هَذَا فِي صَاحِبِ مُوسَى الذِي سَأَلَ السَّبِيلَ إِلَى لُقِيِّهِ، هَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُ شَأْنَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «بَيْنَا مُوسَى فِي مَلإٍ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: هَلْ تَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنْكَ؟ فَقَالَ مُوسَى: لاَ. فَأُوحِيَ إِلَى مُوسَى: بَلَى عَبْدُنَا خَضِرٌ. فَسَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَى لُقِيِّهِ، فَجَعَلَ اللَّهُ لَهُ الحُوتَ آيَةً وَقِيلَ لَهُ: إِذَا فَقَدْتَ الحُوتَ فَارْجِعْ، فَإِنَّكَ سَتَلْقَاهُ. فَكَانَ مُوسَى يَتْبَعُ أَثَرَ الحُوتِ فِي البَحْرِ، فَقَالَ فَتَى مُوسَى لِمُوسَى: أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ، فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهِ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ، قَالَ مُوسَى: ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِي، فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا، فَوَجَدَا خَضِرًا، وَكَانَ مِنْ شَأْنِهِمَا مَا قَصَّ اللَّهُ»(٢).

(١) بڕوانە: ٦٣٣٩.

(٢) بڕوانە: ٧٤.

**٧٤٧٨- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئەو لەگەڵ حوڕی کوڕی قەیسی کوڕی حیصنی فەزاری دەربارەی هاوەڵەکەی موسا ﷺ دەمەقاڵێ و مشت و مڕیان بوو، ئایا ئەو خزرە، جا ئوبەی کوڕی کەعبی ئەنصاری بەلایاندا تێپەڕی، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش بانگی کرد و وتی: لە ڕاستیدا من و ئەم هاوڕێیەم دەربارەی هاوەڵەکەی موسا ﷺ مشت و مڕمانە، ئەو کەسەی کە موسا ﷺ پرسیاری لە خوا کرد چۆن بەخزمەتی بگات، ئایا لە پێغەمبەری خوات ﷺ بیستووە باسی لێوە کردبێت؟ وتی: بەڵێ: بێگومان لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە کاتێکدا موسا ﷺ لە کۆڕێکی جوولەکەکاندا بوو پیاوێك هات بۆ لای وتی: ئایا کەسێك دەناسیت لە تۆ زاناتر بێت؟ موساش ﷺ فەرمووی: نەخێر، ئەنجا خوا نیگای کرد بۆ موسا ﷺ کە بەڵێ بەندەمان خزر (لە تۆ زاناترە)، جا مووسا ﷺ پرسیاری کرد ڕێگەی گەشتن پێی کامەیە و چۆنە؟ خوای گەورەش ماسییەکی کردە نیشانە (بۆگەیشتن بە خزر)، وە پێی وترا لەهەر شوێنێکدا ماسیەکەت لێ وون بوو بگەڕێرەوە و دڵنیابە پێی دەگەیت، بۆیە موسا ﷺ بەوردی سەرنجی ئاسەواری ماسیەکەی دەدا لە دەریادا، ئینجا گەنجەکە لەگەڵ موسادابوو بە مووسای ﷺ وت: ( ئایا دەزانی کاتێ ڕۆشتینە پەنا گابەردەکە (پشوومانداا)، جا بێگومان من ماسییەکەم لەبیر چوو (بیهێنم)، وە هەر شەیتان لەبیری بردمەوە، کە باسی بکەم بۆت)، (موساش وتی: ئەوە ئەو (نیشانەیە) کە ئێمە دەمانویست، ئەوسا بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە)، ئیتر خزریان دۆزییەوە، جا دەنگ و باسیان ئەوەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا گێڕاویەتیەوە)).**

٧٤٧٩- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ: حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ

رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «نَنْزِلُ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ، حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الكُفْرِ». يُرِيدُ المُحَصَّبَ[1].

**٧٤٧٩- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((بەویستی خوا سبەینێ لەخەیفی تیرەی کینانە دادەبەزین و دادەنیشین، ئەو جێگایەی تێیدا سوێندیان بۆ یەکتری خوارد لەسەر کافرێتی (و دژایەتی مسوڵمانان)) ). مەبەستی بە (خەیفی تیرەی کینانە) موحەصصەبە.**

٧٤٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ عَنْ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي العَبَّاسِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ حَاصَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَهْلَ الطَّائِفِ فَلَمْ يَفْتَحْهَا فَقَالَ: «إِنَّا قَافِلُونَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ».فَقَالَ المُسْلِمُونَ: نَقْفُلُ وَلَمْ نَفْتَحْ! قَالَ: «فَاغْدُوا عَلَى القِتَالِ». فَغَدَوْا فَأَصَابَتْهُمْ جِرَاحَاتٌ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّا قَافِلُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ». فَكَأَنَّ ذَلِكَ أَعْجَبَهُمْ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[2].

**٧٤٨٠- عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتوانی تائیفی گەمارۆدا و بەڵام بۆی نەگیرا و ئازادی نەکرد و فەرمووی: ((بەویستی خوا ئێمە دەگەڕێنەوە))، مسوڵمانان وتیان: چۆن بگەڕێنەوە کە ئازادمان نەکردوە؟ فەرمووی: ((دەی سبەینێ بڕۆن بۆ جەنگ کردن)) جاسبەی ڕۆشتن و (لە قەڵاکەیانەوە تیربارانیان کردن) زۆریان بریندار بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەویستی خوا ئێمە دەگەڕێنەوە)) ئینجا وادیار بوو ئەویان پێخۆشتر بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد.**

---

(١) بڕوانە: ١٥٨٩.

(٢) بڕوانە: ١٥٨٩.

## ٣٢- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تعالى:

﴿ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ﴾ سبأ. وَلَمْ يَقُلْ: مَاذَا خَلَقَ رَبُّكُمْ وَقَالَ -جَلَّ ذِكْرُهُ-: ﴿ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة. قَالَ مَسْرُوقٌ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ إِذَا تَكَلَّمَ اللَّهُ بِالْوَحْيِ سَمِعَ أَهْلُ السَّمَوَاتِ شَيْئًا، فَإِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ وَسَكَنَ الصَّوْتُ عَرَفُوا أَنَّهُ الحَقُّ مِن رَبِّكُم وَنَادَوْا: ﴿ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ ﴿٢٣﴾ ﴾ سبأ. يُذْكَرُ عَنْ جَابِرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يَحْشُرُ اللَّهُ العِبَادَ، فَيُنَادِيهِمْ بِصَوْتٍ يَسْمَعُهُ مَنْ بَعُدَ كَمَا يَسْمَعُهُ مَنْ قَرُبَ: أَنَا المَلِكُ، أَنَا الدَّيَّانُ».

## ٣٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند:

**(وە تکا کردن لای خوا سوودی نییە مەگەر بۆ کەسێ ئەو (خودا) ڕێگە بدات، هەتا کاتێ ترس و بیم لە دڵی (تکاکاران) لادەبرێ[١]، (بەیەکتر) دەڵێن: پەروەردگارتان چی بڕیارێکی فەرموو؟ دەڵێن: وتە ڕاستەکەی فەرموو[٢]، وە تەنها (خودا) بەرز و بڵند و گەورەیە). نەیفەرمووە: پەروەردگارتان چی دروست کردوە؟ هەروەها خوا بەگەورە ناو هێنرا و فەرموویەتی: ((کێیە لەو ڕۆژەدا بتوانێ تکای لە لا بکات مەگەر بەرێ پێدانی خۆی)).**

**مەسروق لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کاتێ خوا نیگا دەفەرمووێ ئەوانەی لە ئاسمانەکاندان شتێك دەبیستن (دەترسن)، جا کاتێ**

---

(١) بەهۆی ڕێگە پێدانی شەفاعەت و تکاوە.

(٢) کە ڕێگە نەدانە بەتکا کردن.

**ترسەكە لە دڵیان لادەبرێت و دەنگەكە نامێنێت، دەزانن ئەوە وتە و ڕاستەكە بوو لە پەروەردگارتانەوە، بەیەكتری دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرموو؟ دەڵێن: وتە ڕاستەكەی فەرموو.**

**وە لە جابیرەوە ﷺ دەگێڕدرێتەوە ئەویش لە عەبدوڵڵای كوڕی ئونەیسەوە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((خەڵك (لە ڕۆژی قیامەتدا) كۆدەكرێنەوە بەدەنگێك بانگ دەكرێن، ئەو كەسەی دووره دەیبیستێ وەك چۆن ئەوەی نزیكە دەیبیستێ (دەفەرمووێ): منم خاوەن دەسەڵات و پادشایەتی، هەر من پاداشت دەرەوە و دەسەڵات دارم.**

٧٤٨١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَضَى اللَّهُ الأَمْرَ فِي السَّمَاءِ ضَرَبَتِ المَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ، كَأَنَّهُ سِلْسِلَةٌ عَلَى صَفْوَانٍ -قَالَ عَلِيٌّ: وَقَالَ غَيْرُهُ: صَفَوَانٍ- يَنْفُذُهُمْ ذَلِكَ، فَإِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا: الحَقَّ، وَهُوَ العَلِيُّ الكَبِيرُ».

قَالَ عَلِيٌّ: وَحَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَمْرٌو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ بِهَذَا.

قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ عَمْرٌو: سَمِعْتُ عِكْرِمَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ.

قَالَ عَلِيٌّ: قُلْتُ لِسُفْيَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ عِكْرِمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ؟، قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ لِسُفْيَانَ: إِنَّ إِنْسَانًا رَوَى عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ يَرْفَعُهُ أَنَّهُ قَرَأَ: (فُرِّغَ). قَالَ سُفْيَانُ هَكَذَا قَرَأَ عَمْرٌو فَلاَ أَدْرِي سَمِعَهُ هَكَذَا أَمْ لاَ، قَالَ سُفْيَانُ وَهِيَ قِرَاءَتُنَا[1].

**٧٤٨١- ئەبو هورەیرە ﷺ فەرموودەكە دەباتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ كە فەرمووی: ((كاتێ خوا لە ئاسمان بڕیاری كارێكی دا فریشتەكان باڵەكانیان دەدەن بەیەكدا بەمل كەچی بۆ فەرمایشتەكەی خودا (دەنگی ئەو فەرمایشتەی خوا)، وەك دەنگ و زرەی**

(١) بروانە: ٤٧٠١.

**زنجیرێك وایە بدرێت بەسەر تاوێرە بەردێكی سافدا- عەلی (كوڕی مەدینی) دەڵێ: جگە لەو (سوفیان) وتی: تاوێرە بەردێكی ساف[1] -ئەو دەنگەیان دەگاتێ كە ترسی دڵیان لادەبرێ. (فریشتەكان) دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووە؟ دەڵێن: خوا وتەی هەقی فەرمووە ئەو (خوایە) بەرز و بڵند و گەورەیە)).**

**عەلی وتی: سوفیان بۆی گێڕاینەوە وتی: عەمر بۆی گێڕاینەوە لە عیكریمەوە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ ئەم فەرموودەی بەم شێوە گێڕایەوە[2].**

**سوفیان وتی: عەمر وتی: لە عیكریمەم بیست وتی: ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕاینەوە.**

**عەلی دەڵێ: وتم بە سوفیان (ئایا تۆ لە عەمرت بیستووە؟) وتی: لە عیكریمەم بیستووە وتی: لە ئەبو هورەیرەم ﷺ بیستووە، (سوفیان) وتی: بەڵێ، بەسوفیانم وت: بێگومان كەسێك گێڕاویەتیەوە لە عەمرەوە لە عیكریمەوە لە ئەبو هورەیرەوە دەیباتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، كە ئەو (پێغەمبەر ﷺ بە** (فُرِّغَ)[3] **خوێندیەوە، سوفیان وتی: عەمر ئاوەها خوێندیەوە جا نازانم ئابەو جۆرە بیستویەتی یان نا، سوفیان دەڵێ: هەر ئەوش خوێندنەوەی ئێمەیە** (فُرِّغَ).

٧٤٨٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِلنَّبِيِّ ﷺ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ». وَقَالَ صَاحِبٌ لَهُ: يُرِيدُ أَنْ يَجْهَرَ بِهِ[4].

---

(١) سوفیان لە گێڕانەوەكەیدا دەڵێ: (صَفْوَانٍ) لە جێگای (صَفْوَانٍ).

(٢) بەم ڕشتە و بەم شێوەیە واتە سوفیان ئەم فەرموودەی لە عەمرەوە گێڕاوەتەوە بە (حَدَّثَنَا عَمْرٌو) واتە ڕاستەوخۆ لێی بیستووە، چونكە ڕشتەی یەكەم كە سوفیان لە عەمری گێڕاوەتەوە بە (عَنْ عَمْرٍو) لێی گێڕاوەتەوە كە لێبیستنی ڕاستەوخۆ ناگەیەنێت.

(٣) (فُرِّغَ) بەڵام خوێندنەوەی زۆربەی قورئان خوێنان (فُزِّعَ)ـەیە.

(٤) بڕوانە: ٥٠٢٣.

**٧٤٨٢- ئەبو سەلەمی كوڕی عەبدوڕەحمان لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە ئەو دەڵێ: پێغەمەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوا بۆ هیچ شتێك گوێی نەگرتووە ئەوەندەی گوێی بۆ پێغەمبەرێك گرتووە قورئان بەدەنگی بەرز و خۆش بخوێنێ (یان بە قورئان بێنیازبێت لەشتی تر)) )، هاوڕێیەكی ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: مەبەستی بە (يَتَغَنَّى) ئەوەیە بەدەنگی بەرز و ئاشكرا بیخوێنێ.**

٧٤٨٣- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَقُولُ اللَّهُ: يَا آدَمُ. فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ. فَيُنَادَى بِصَوْتٍ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تُخْرِجَ مِنْ ذُرِّيَّتِكَ بَعْثًا إِلَى النَّارِ»[1].

**٧٤٨٣- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوای بەرز و بڵند لە ڕۆژی دواییدا دەفەرموێ: ئەی ئادەم. ئادەمیش دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم فەرمان بەردارتم خۆشنودی تۆ بەدەست دێنم، ئینجا بەدەنگێكی بەرز بانگی لێ دەكرێت، بێگومان خوا فەرمانت پێ دەكات لە نەوەكانت كۆمەڵێك دەربێنی كە دەنێردرێن بۆ دۆزەخ)).**

٧٤٨٤- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: مَا غِرْتُ عَلَى امْرَأَةٍ مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ، وَلَقَدْ أَمَرَهُ رَبُّهُ أَنْ يُبَشِّرَهَا بِبَيْتٍ فِي الجَنَّةِ[2].

**٧٤٨٤- عائیشە ﷺ دەڵێ: غیرەم لە هیچ كام لە هاوسەرەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەكرد، ئەوەندەی غیرەم لە خەدیجە دەكرد، وە بێگومان پەروەردگاری فەرمانی پێ كردبوو كە موژدەی پێ بدات بە كۆشكێك لە بەهەشتدا.**

---

(١) بروانە: ٣٣٤٨.

(٢) بروانە: ٣٨١٦.

## ٣٣- بابُ كَلَامِ الرَّبِّ ﷻ مَعَ جِبْرِيلَ وَنِدَاءِ اللهِ المَلَائِكَةَ

وَقَالَ مَعْمَرٌ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ ﴿٦﴾ ﴾ النمل، أَيْ: يُلْقَى عَلَيْكَ. وَتَلَقَّاهُ أَنْتَ أَيْ: تَأْخُذُهُ عَنْهُمْ، وَمِثْلُهُ: ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ ﴿٣٧﴾ ﴾ البقرة.

٧٤٨٥- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ -هُوَ ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ- عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي جِبْرِيلُ فِي السَّمَاءِ إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ. فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، وَيُوضَعُ لَهُ القَبُولُ فِي أَهْلِ الأَرْضِ»[١].

## ٣٣- باسی قسه کردنی پەروەردگار ﷻ لەگەڵ جیبریل ﷺ و بانگکردنی خوا لە فریشتەکان

**مەعمەر دەڵێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ ﴿٦﴾ ﴾ النمل، واتە: پێت دەدرێ و دەخوێنرێ بەسەرتدا و تۆش پێشوازی لێ دەکەیت و وەری دەگرێ لێیان[٢]، هاوشێوەی ئەوە ئەم ئایەتەیە (ئینجا ئادەم ﷺ چەند وتەیەکی (پاڕانەوەی) لە پەروەردگاریەوە وەرگرت).**

**٧٤٨٥- ئەبو هوڕەیرە[٣] ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا ﷻ ئەگەر بەندەیەکی خۆش ویست جیبریل ﷺ بانگ دەکات و (پێی دەفەرموێ:) بێگومان خوا فلان کەسی خۆش دەوێ، تۆش خۆشت بوێ، ئیتر جیبریلیش ﷺ خۆشی دەوێ، پاشان جیبریل ﷺ بە ناو خەڵکی ئاسماندا جاڕ**

(١) بڕوانە: ٣٢٠٩.

(٢) یان وەردەگیرێ لێی.

(٣) ئەم فەرموودە دوو ڕێگە و سەنەدی هەیە پێی گێڕدراوەتەوە لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ.

**دەدات، بەڕاستی خوا فلان کەسی خۆش دەوێ، کەواتە ئێوەش خۆشتان بوێ، ئەوسا خەڵکی ئاسمانیش خۆشیان دەوێ، پاشان لە ناو خەڵکی سەر زەویدا قبوڵ و پەسەند دەکرێت (خۆشەویست دەبێت) )).**

٧٤٨٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ العَصْرِ وَصَلاَةِ الْفَجْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ، فَيَسْأَلُهُمْ - وَهْوَ أَعْلَمُ-: كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي؟ فَيَقُولُونَ: تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ»[1].

**٧٤٨٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((چەند فریشتەیەك بەشەو چەند فریشتەیەك بەرۆژ بەشوێن یەکتریدا بەنۆرە لەگەڵتانن، وە لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسردا بەیەك دەگەن، پاشان ئەوانەی شەو لەگەڵتان بوون بەرز دەبنەوە (بۆ خزمەتی خوای گەورە)، ئەویش پرسیاریان لێ دەکات (دەربارەی بەندەکان) -لە کاتێکدا خۆی شارەزاترە- چۆن بەندەکانی منتان بەجێ هێشت؟ ئەوانیش دەڵێن: کە بەجێمان هێشتن نوێژیان دەکرد، کاتێکیش ڕۆشتین بۆ لایان نوێژیان دەکرد)).**

٧٤٨٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ وَاصِلٍ، عَنِ المَعْرُورِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَتَانِي جِبْرِيلُ فَبَشَّرَنِي أَنَّهُ مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الجَنَّةَ».قُلْتُ وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى؟! قَالَ: «وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى»[2].

**٧٤٨٧- ئەبو زەڕ ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((جیبریل ﷺ هات بۆ لام موژدەی پێدام بێگومان هەر کەس بمرێت و هاوبەشی**

(١) بڕوانە: ٥٥٥.

(٢) بڕوانە: ١٢٣٧.

**بۆخوا دانەنابێت دەچێتە بەهەشتەوە))، (ئەبو زەڕ دەڵێ) وتم: ئەگەر زینای کردبێ و ئەگەر دزی کردبێ؟ فەرمووی: ((ئەگەر زینای کردبێ و ئەگەر دزی کردبێ)).**

## ٣٤- بابُ قَوْلِ اللّٰهِ تعالى: ﴿أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ ﴿١٦٦﴾﴾ النساء

قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ ﴿١٢﴾﴾ الطلاق، بَيْنَ السَّمَاءِ السَّابِعَةِ وَالأَرْضِ السَّابِعَةِ.

٧٤٨٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ الْهَمْدَانِيُّ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا فُلاَنُ، إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَقُلِ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الذِي أَرْسَلْتَ. فَإِنَّكَ إِنْ مُتَّ فِي لَيْلَتِكَ مُتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ، وَإِنْ أَصْبَحْتَ أَصَبْتَ أَجْرًا»[1].

## ٣٤- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: ((خوا) بەزانینی خۆی ناردویەتیە خوارەوە فریشتەکانیش شایەتی دەدەن)

**موجاهید دەڵێ: ﴿يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ ﴿١٢﴾﴾ الطلاق، لە نێوان ئاسمانی حەوتەم و زەوی حەوتەمدا.**

**٧٤٨٨- بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((ئەی فلانە کەس کاتێ چویت بۆ ناو جێگای نوستنەکەت ئەوە بڵێ: خوایە خۆم دایە دەستی تۆ، وە کاروباری خۆم بە تۆ سپارد، ڕووم کردە تۆ، تەنها پشتم بە تۆ**

(١) بڕوانە: ٢٤٧.

**بەستووە، ئومێدم هەر بەتۆیە، ترسیشم هەر لە تۆیە، هیچ پەناگا و پارێزەرێك نییە لە بەرانبەر تۆدا مەگەر لای خۆت، خوایە باوەڕم هەیە بەو پەڕاوەی داتبەزاندووە، وە بەو پێغەمبەرەی ناردووتە، جا ئەگەر لەو شەوەتدا مردیت، ئەوە لەسەر ئیمانداری دەمریت، وە ئەگەر ڕۆژت لێ بوویەوە (نەمردیت)، پاداشێکت دەست کەوتوە)).**

٧٤٨٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الأَحْزَابِ: «اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ سَرِيعَ الْحِسَابِ، اهْزِمِ الأَحْزَابَ وَزَلْزِلْ بِهِمْ»[1].

زَادَ الحُمَيْدِيُّ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي خَالِدٍ، سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ.

**٧٤٨٩-عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەنگی ئەحزابدا فەرمووی: ((ئەی خوایە دابەزێنەری قورئان، خێرا لە پرسینەوە و موحاسەبەدا، خوایە ئەم تاقم و کۆمەڵانە تێکشکێنە و ترس و بیم بخەرە ناویانەوە[2])).**

**-حومەیدی دەڵێ: سوفیان بۆی گێڕاینەوە وتی: ئیبنو ئەبی خالید بۆی گێڕاینەوە وتی: لە عەبدوڵڵام ﷺ بیست وتی ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە.**

٧٤٩٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ هُشَيْمٍ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ، بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء، قَالَ: أُنْزِلَتْ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَوَارٍ بِمَكَّةَ،

---

(١) بڕوانە: ٢٨١٨.

(٢) بیبانهێنە لەرزە لە ترسانا پێیەکانیان خۆی نەگرێت لە زەویدا.

فَكَانَ إِذَا رَفَعَ صَوْتَهُ سَمِعَ الْمُشْرِكُونَ فَسَبُّوا الْقُرْآنَ وَمَنْ أَنْزَلَهُ وَمَنْ جَاءَ بِهِ. وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾ ﴾ الإسراء، لاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ حَتَّى يَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ، وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا عَنْ أَصْحَابِكَ فَلاَ تُسْمِعُهُمْ. ﴿ وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ ﴾ الإسراء، أَسْمِعْهُمْ وَلاَ تَجْهَرْ حَتَّى يَأْخُذُوا عَنْكَ الْقُرْآنَ[١].

**٧٤٩٠- ئیبنو عەبباس ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە (لە نوێژكردنتدا دەنگ بەرز مەكەرەوە و بە نهێنیش مەیكە)، دەڵێ: كاتێ دابەزێنرا كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەككەدا خۆی شاردبوویەوە[٢] جا كە دەنگی بەرز دەكردەوە (بەقورئان خوێندن لە نوێژدا)، بتەپەرستان گوێیان لێی دەبوو جنێویان دەدا بەقورئان و ئەوەی دایبەزاندووە و ئەوەش هێناویەتی، بۆیە خوای بەرز و بڵندیش فەرمووی: (لە نوێژكردنتدا دەنگ بەرز مەكەرەوە بە نهێنیش مەیكە)، دەنگ بەرز مەكەرەوە لە نوێژكردنتدا كە بتپەرستان گوێیان لێی بێت، ئەوەندەش نزمی مەكەرەوە كە هاوەڵەكانت لێت نەبیستن (لەو نێوانەدا ڕێگایەك هەڵبژێرە).**

## ٣٥- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ ﴿١٥﴾ ﴾ الفتح. ﴿ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الطارق: حَقٌّ ﴿ وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ ﴿١٤﴾ ﴾ الطارق، بِاللَّعِبِ.

٧٤٩١- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ، يَسُبُّ الدَّهْرَ، وَأَنَا الدَّهْرُ، بِيَدِي الأَمْرُ، أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ»[٣].

---

(١) بڕوانە: ٤٧٢٢.

(٢) لەسەرەتای ئیسلامدا.

(٣) بڕوانە: ٤٨٢٦.

# ٣٥- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دەیانەوێ وتەی خوا[1] بگۆڕن). ﴿لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾﴾ الطارق ، هەقە ﴿وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ ﴿١٤﴾﴾ الطارق ، گاڵتە نی یە

**٧٤٩١- ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوای بەرز و بڵند فەرمووی: ئادەمی ئازارم دەدات، جنێو بە ڕۆژگار دەدات، (هەڵسوڕێنەری) ڕۆژگار منم، كاروبار هەموو بەدەستی منە، شەو و ڕۆژ ئاڵوگۆڕی پێ دەكەم)).**

٧٤٩٢- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَقُولُ اللَّهُ ﷻ: الصَّوْمُ لِي وَأَنَا أَجْزِى بِهِ، يَدَعُ شَهْوَتَهُ وَأَكْلَهُ وَشُرْبَهُ مِنْ أَجْلِي. وَالصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: فَرْحَةٌ حِينَ يُفْطِرُ، وَفَرْحَةٌ حِينَ يَلْقَى رَبَّهُ، وَلَخَلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ المِسْكِ»[2].

**٧٤٩٢- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((خوا ﷻ دەفەرموێ: ڕۆژوو بۆ منە و هەر منیش پاداشتی دەدەمەوە، واز لەئارەزوو خواردن و خواردنەوەی خۆی دێنێ لەبەر من، وە ڕۆژوو قەڵغانە، ڕۆژووەوان دوو خۆشی بۆ هەیە: خۆشیەكیان كاتێ ڕۆژوو دەشكێنێ، خۆشیەكی تریان كاتێ دەگات بە خزمەتی پەروەردگاری، وە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە)).**

---

(١) كە دەستكەوتەكانی خەیبەرە بۆ بەشداربووانی حودەیبیە، چونكە خوای گەورە بەڵێنی دابوو بە بەشداربووانی حودەیبیە كە دەسكەوتەكانی خەیبەر تەنها بۆ ئەوان بێت، كەس لە عەرەبە دەشتەكیانە لەگەڵیاندا بەشداری دەستكەوتەكانی خەیبەر نەبن، كە لە غەزا بەجێمان لە پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان، موجاهید و قەتادە و دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ ﴿١٥﴾﴾ الفتح. دەڵێن: ئەو بەڵێنە بوو كە خوا دای بە بەشداربووانی حودەیبیە كە دەستكەوتەكانی خەیبەر تەنها بۆ ئەوان بێت، ئیبن جەریر ئەم تەفسیرەی هەڵبژاردوە كە باسمان كرد (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، إعداد جماعة من العلماء بإشراف الشيخ صفي الرحمن المباركفوري: ص ١٢٨٩).

(٢) بڕوانە: ١٨٩٤.

٧٤٩٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بَيْنَمَا أَيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَانًا خَرَّ عَلَيْهِ رِجْلُ جَرَادٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَجَعَلَ يَحْثِي فِي ثَوْبِهِ، فَنَادَى رَبُّهُ يَا أَيُّوبُ، أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَمَّا تَرَى؟ قَالَ: بَلَى يَا رَبِّ، وَلَكِنْ لاَ غِنَى بِي عَنْ بَرَكَتِكَ»[1].

**٧٤٩٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((لە کاتێکدا ئەیووب ﷺ بەڕووتی خۆی دەشۆری پۆلێ کوللەی ئاڵتونی بەسەریدا باری، ئەیووبیش ﷺ بەمشت دەیکردە ناو پۆشاکەکەیەوە، پەروەردگاریشی بانگی کرد (فەرمووی:) ئەی ئەیووب ئایا بێ نیازم نەکردووی لەوەی کە دەیبینیت؟ وتی: بەڵێ (بێ نیازت کردووم) ئەی پەروەردگار، بەڵام بی نیاز نیم لە فەڕ و بەرەکەتت )).**

٧٤٩٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ الأَغَرِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَتَنَزَّلُ رَبُّنَا ﷻ كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ فَيَقُولُ مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ»[2].

**٧٤٩٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەموو شەوێك پەروەردگار ﷻ دێتە خوارەوە بۆئاسمانی دونیا کاتێ سێ یەکی کۆتایی شەو ماوە و دەفەرمووی: کێ لێم دەپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە؟ کێ داوام لێ دەکات تا پێی ببەخشم؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات تا لێی خۆش بم)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٧٩.

(٢) بڕوانە: ١١٤٥.

٧٤٩٥- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، أَنَّ الأَعْرَجَ، حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ القِيَامَةِ»[١].

**٧٤٩٥- ئەعرەج لە ئەبو هورەیرەی ﷺ بیستووە گێڕاویەتیەوە کە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((ئێمەین کۆتاهەمینی پێشکەوتووان لە ڕۆژی دواییدا)).**

٧٤٩٦- وَبِهَذَا الإِسْنَادِ: «قَالَ اللَّهُ: أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ»[٢].

**٧٤٩٦- وە هەر بەم ڕشتەیەی پێشوو((خوا فەرموویەتی: تۆ ببەخشە منیش پێت دەبەخشم)).**

٧٤٩٧- حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ فَقَالَ: «هَذِهِ خَدِيجَةُ أَتَتْكَ بِإِنَاءٍ فِيهِ طَعَامٌ -أَوْ إِنَاءٍ فِيهِ شَرَابٌ- فَأَقْرِئْهَا مِنْ رَبِّهَا السَّلاَمَ، وَبَشِّرْهَا بِبَيْتٍ مِنْ قَصَبٍ لاَ صَخَبَ فِيهِ وَلاَ نَصَبَ»[٣].

**٧٤٩٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: (جیبریل ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ[٤] ((ئەوە خەدیجەیە هات دەفرێکی بۆ هێناوی خواردنی تێدایە -یان دەفرێکی بۆ هێناوی خواردنەوەی تێدایە - جا سڵاوی پەروەردگاری پێ ڕاگەیەنە، وە موژدەی پێبدە بەکۆشکێکی دوڕ لە بەهەشتدا، نەدەنگە دەنگی تیایە نەماندوو بوون)).**

٧٤٩٨- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ أَسَدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "قَالَ اللَّهُ: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ»[٥].

---

(١) بڕوانە: ٢٣٨.
(٢) بڕوانە: ٤٦٨٤.
(٣) بڕوانە: ٣٨٢٠.
(٤) ئەم زیادەیە لە صەحیحی بوخاری دا بەژمارە: ٣٨٢٠ هاتووە.
(٥) بڕوانە: ٣٢٤٤.

**٧٤٩٨- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((خوا دەفەرموێ: (لە بەهەشتدا) ئامادەم کردوە بۆ بەندە چاکەکانم ئەوەی چاو نەیبینیوە، وە گوێ نەیبیستووە، وە بە دڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە)).**

٧٤٩٩- حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنِي سُلَيْمَانُ الأَحْوَلُ، أَنَّ طَاوُسًا أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا تَهَجَّدَ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ «اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الحَقُّ، وَوَعْدُكَ الحَقُّ وَقَوْلُكَ الحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ الحَقُّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ»[1].

**٧٤٩٩- ئیبنو جورەیج وتی: سولەیمانی ئەحوەل بۆی گێڕاینەوە کە تاووس بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەو لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی ﷺ بیستووە دەیوت: هەمیشە پێغەمبەر ﷺ کە لە شەودا هەڵسا شەونوێژ بکات دەیفەرموو: ((خوایە هەموو سوپاس هەر بۆ تۆیە، تۆی (خاوەنی) ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوی، سوپاس هەر بۆ تۆیە تۆی ڕاگری ئاسمانەکان و زەویت، هەموو سوپاس هەر بۆ تۆیە تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی تێیاندایە، تۆ ڕاست و دروستی و بەڵێنت ڕاست و دروستە و فەرمایشتت ڕاستە و دروستە و گەشتن بە حوزورت (لە قیامەتدا) ڕاستە و بەهەشت ڕاستە و دۆزەخ ڕاستە و پێغەمبەران ڕاستن، قیامەت ڕاستە، خوایە گەردن کەچی تۆم، باوەڕم بەتۆ هێناوە و پشتم تەنها بە تۆ بەستووە، وە بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە، وە بەپشتیوانی تۆ دەچم بەگژ**

(١) بڕوانە: ١١٢٠.

**دوژمناندا، وە بڕیار و حوكم هەر لە تۆ وەردەگرم، دەی خۆشبە لەو گوناهانەی كردوومە و ئەوەشی دەیكەم، ئەوەشی پەنهانم كردوە و ئەوەشی ئاشكرام كردوە، تۆ پەرستراوی منی هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگەلە تۆ)).**

٧٥٠٠- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ النُّمَيْرِيُّ، حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ الأَيْلِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ قَالَ: سَمِعْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ وَسَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَعَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ، وَعُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا، فَبَرَّأَهَا اللَّهُ مِمَّا قَالُوا، وَكُلٌّ حَدَّثَنِي طَائِفَةً مِنَ الحَدِيثِ الذِي حَدَّثَنِي- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: وَلَكِنْ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَنَّ اللَّهَ يُنْزِلُ فِي بَرَاءَتِي وَحْيًا يُتْلَى، وَلَشَأْنِي فِي نَفْسِي كَانَ أَحْقَرَ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى، وَلَكِنِّي كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللَّهُ بِهَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ ﴿١١﴾﴾ النور. العَشْرَ الآيَاتِ[1].

**٧٥٠٠-زوهری دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە هەریەك لە عوروەی كوڕی زوبەیر و سەعیدی كوڕی موسەییەب و عەلقەمەی كوڕی وەققاص و عوبەیدوڵلای كوڕی عەبدوڵلام بیست، دەربارەی عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ كاتێ بوهتان چییەكان ئەوەی وتیان پێی وتیان، خواش بەریبوونی ئەوی سەلماند لەوەی كە وتیان، هەریەك لەو كەسانە بەشێك لەو فەرموودەی بۆ گێڕامەوە لە عائیشەوە ﵂ كە وتی، بەڵام سوێند بەخوا من گومانم نەدەبرد كە خوای گەورە دەربارەی بەریبوونی من نیگا دابەزێنێت و بخوێنرێتەوە، كار و حاڵی من بەلای خۆمەوە بچووكترە لەوەی خوا دەربارەم ئایەتێ بفەرمووێ و بخوێنرێتەوە، بەڵكو من ئومێدم وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا خەوێك ببینێ كە خوا بەو خەوە**

(١) بڕوانە: ٢٥٩٣.

**پاكێتی من دەربخات، ئەوسا خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند: (بێگومان كەسانێك كە ئەو بوهتانەیان (بۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ) هەڵبەست)، دە ئایەتی تەواو (دابەزی).**

٧٥٠١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا المُغِيرَةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَقُولُ اللَّهُ: إِذَا أَرَادَ عَبْدِي أَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً فَلاَ تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ حَتَّى يَعْمَلَهَا، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا بِمِثْلِهَا، وَإِنْ تَرَكَهَا مِنْ أَجْلِي فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْمَلَ حَسَنَةً فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةٍ».

**٧٥٠١-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر بەندەكەم ویستی خراپەیەك بكات، ئەوا مەینوسن لەسەری هەتا دەیكات، جائەگەر كردی ئەوا وەك خۆی (بەیەك خراپە) بینووسن، خۆ ئەگەر لەبەر من نەیكرد ئەوا بەچاكەیەك بۆی بنووسن، وە ئەگەر ویستی چاكەیەك بكات، بەڵام نەیكرد، ئەوا بە چاكەیەك بۆی بنووسن، خۆئەگەر كردی ئەوا بە دە چاكەی وەك خۆی تا حەوت سەد (چاكە) بۆی بنووسن)).**

٧٥٠٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي مُزَرِّدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خَلَقَ اللَّهُ الخَلْقَ فَلَمَّا فَرَغَ مِنْهُ قَامَتِ الرَّحِمُ فَقَالَ: مَهْ. قَالَتْ: هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ. فَقَالَ: أَلاَ تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ بَلَى يَا رَبِّ. قَالَ: فَذَلِكِ لَكِ».ثُمَّ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ محمد[1].

---

(١) بڕوانە: ٤٨٣.

**٧٥٠٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوا دروستكراوەكانی دروست كرد، ئەنجا كاتێ لە دروست كردنیان بوویەوە خزمایەتی (ڕەحم) هەستا، جا (خوا) فەرمووی: وازبێنێ، (ڕەحم) وتی: ئەمە شوێنی پەناگرە بەتۆ لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، بۆیە (خوا) فەرمووی: ئایا ڕازی نابیت ئەوەی تۆ بگەیەنێت منیش پەیوەندی لەگەڵ ببەستم، وە ئەوەی تۆی پچڕاند منیش پەیوەندی لەگەڵ بپچڕێنم؟ وتی: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، (خوا) فەرمووی دەی ئەوە بۆ تۆ بێت))، پاشان ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: (ئەم ئایەتە بخوێنن): (جا ئایا ئێوە بەتەمان (ئەی ناپاكان) ئەگەر پشت هەڵكەن (لە ئیسلام و جیهاد)، لە زەویدا ئاژاوە و خراپە بەرپابكەن، وە هەرچی پەیوەندی خزمایەتی یە بیپچڕێنن).**

٧٥٠٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ صَالِحٍ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ قَالَ: مُطِرَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «قَالَ اللَّهُ أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِي»[1].

**٧٥٠٣- زەیدی كوڕی خالید ﷺ وتی: (بەهۆی دوعای پێغەمبەرەوە ﷺ) باران بۆ پێغەمبەر ﷺ بارێنرا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوا فەرمووی ئەم بەیانیە هەندێ لە بەندەكانم بێ باوەڕ بوون بەمن و هەندێكیان باوەڕدار بوون بەمن)).**

٧٥٠٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ: إِذَا أَحَبَّ عَبْدِي لِقَائِي أَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ، وَإِذَا كَرِهَ لِقَائِي كَرِهْتُ لِقَاءَهُ»

**٧٥٠٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا دەفەرمووێ: ئەگەر بەندەكەم گەشتن بەمنی پێ خۆش بێت، منیش گەشتن**

(١) بڕوانە: ٨٤٦.

**بەوم پێ خۆشە، وە ئەگەر گەشتن بەمنی پێ ناخۆش بێت، منیش گەشتن بەوم پێ ناخۆشە)).**

٧٥٠٥- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي»(١).

**٧٥٠٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوای گەورە دەفەرموێ: من لەگەڵ گومان بردنی بەندەكەمدام پێم)).**

٧٥٠٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ، فَإِذَا مَاتَ فَحَرِّقُوهُ، وَاذْرُوا نِصْفَهُ فِي البَرِّ وَنِصْفَهُ فِي البَحْرِ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ لَيُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا لاَ يُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ العَالَمِينَ، فَأَمَرَ اللَّهُ البَحْرَ فَجَمَعَ مَا فِيهِ، وَأَمَرَ البَرَّ فَجَمَعَ مَا فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: لِمَ فَعَلْتَ؟ قَالَ: مِنْ خَشْيَتِكَ، وَأَنْتَ أَعْلَمُ، فَغَفَرَ لَهُ»(٢).

**٧٥٠٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((پیاوێك كە هەرگیز چاكەی نەكردبوو وتی: ئەگەر مرد بیسوتێنن نیوەی خۆڵەمێشەكەی لە وشكانی (زەوی)دا برژ و بڵاوبكەنەوە(٣) نیوەكەی تریشی بەدەریادا (برژ و بڵاو بكەنەوە)، سا سوێند بەخوا ئەگەر خوا دەسڵاتی بەسەریدا هەبێت(٤) (و زیندووی بكاتەوە)، بەدڵنیاییەوە سزایەكی ئەوەندە سەختی دەدات كە سزای كەسی لە جیهانیاندا (بەو جۆرە) نەدابێت، ئینجا خوا**

(١) بڕوانە: ٧٤٠٥.

(٢) بڕوانە: ٣٤٨١.

(٣) بیدەن بەدەم باوە تا پرژوبڵاوی بكات.

(٤) ئەوە قسە و وتەی كابرا تاوانبارە پێی وابووە ئەگەر بە جۆرە لە لاشەكەی بكەن خوا ناتوانێ كۆیكاتەوە و زیندووی كاتەوە.

**فەرمانی بەدەریا كرد چی تیا بوو[1] كۆی كردەوە، وە فەرمانی بە وشكانی كرد چی تیابوو كۆی كردەوە، پاشان (خوا) فەرمووی: بۆ وات كرد؟ وتی: لەترسی تۆ (خوایە) خۆشت زاناتری، خواش لێی خۆش بوو)).**

٧٥٠٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِسْحَاقَ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي عَمْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ عَبْدًا أَصَابَ ذَنْبًا -وَرُبَّمَا قَالَ: أَذْنَبَ ذَنْبًا- فَقَالَ: رَبِّ أَذْنَبْتُ -وَرُبَّمَا قَالَ: أَصَبْتُ- فَاغْفِرْ لِي فَقَالَ رَبُّهُ: أَعَلِمَ عَبْدِي أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِهِ؟ غَفَرْتُ لِعَبْدِي. ثُمَّ مَكَثَ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أَصَابَ ذَنْبًا -أَوْ أَذْنَبَ ذَنْبًا- فَقَالَ: رَبِّ أَذْنَبْتُ -أَوْ أَصَبْتُ- آخَرَ، فَاغْفِرْهُ. فَقَالَ: أَعَلِمَ عَبْدِي أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِهِ؟ غَفَرْتُ لِعَبْدِي، ثُمَّ مَكَثَ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أَذْنَبَ ذَنْبًا -وَرُبَّمَا قَالَ:- أَصَابَ ذَنْبًا -قَالَ:- قَالَ: رَبِّ أَصَبْتُ -أَوْ أَذْنَبْتُ - آخَرَ فَاغْفِرْهُ لِي. فَقَالَ: أَعَلِمَ عَبْدِي أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِهِ؟ غَفَرْتُ لِعَبْدِي -ثَلاَثًا- فَلْيَعْمَلْ مَا شَاءَ».

**٧٥٠٧-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((بێگومان بەندەیەك تاوانێكی تووش بوو- هەندێ جار فەرموویەتی تاوانێكی ئەنجامدا- ئەوسا وتی: پەروەردگارم تاوانم كرد- هەندێ جار وتوویەتی: تووشی تاوانێك بووم- دەی لێم خۆش بە، پەروەردگاریشی فەرمووی: ئایا بەندەكەم زانی پەروەردگارێكی هەیە لە تاوان خۆش دەبێت و سزاش دەدات لەسەری؟ لە بەندەكەم خۆش بووم، پاشان ئەوەندەی خوا حەز بكات مایەوە، لە پاشان تاوانێكی توش بوو- وە هەندێ جار وتویەتی تاوانێكی كرد- وتی: ئەی ئەروەردگارم تاوانێكی ترم كرد- یان تاوانێكی ترم تووش بوو- دەی لێم خۆش**

---

(١) لە ئەندامەكانی ئەو كەسە.

**به؟ خواش فەرمووی: ئایا بەندەکەم زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە تاوان خۆش دەبێت و سزاش دەدات لەسەری؟ لە بەندەکەم خۆش بووم، پاشان ئەوەندەی پەروەردگارم حەز بکات مایەوە، لە پاشان تاوانێکی کرد- هەندێ جار ووتویەتی- تاوانێکی تووش بوو- وتی:- دەڵێ: پەروەردگارم تاوانێکی ترم تووش -یان تاوانێکی ترم کرد، دەی لێم خۆش بە، خواش دەفەرمووێ: ئایا بەندەکەم زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە تاوان خۆش دەبێت و سزاش لەسەر دەدات؟ لە بەندەکەم خۆش بووم- لە هەرسێ جار تاوان کردنەکەی- با چی دەوێت بیکات)).**

٧٥٠٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، سَمِعْتُ أَبِي، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَبْدِ الغَافِرِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «أَنَّهُ ذَكَرَ رَجُلاً فِيمَنْ سَلَفَ -أَوْ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، قَالَ كَلِمَةً يَعْنِي-: "أَعْطَاهُ اللَّهُ مَالاً وَوَلَدًا - فَلَمَّا حَضَرَتِ الْوَفَاةُ قَالَ لِبَنِيهِ أَيَّ أَبٍ كُنْتُ لَكُمْ قَالُوا خَيْرَ أَبٍ. قَالَ: فَإِنَّهُ لَمْ يَبْتَئِرْ -أَوْ: لَمْ يَبْتَئِزْ- عِنْدَ اللَّهِ خَيْرًا، وَإِنْ يَقْدِرِ اللَّهُ عَلَيْهِ يُعَذِّبْهُ، فَانْظُرُوا إِذَا مُتُّ فَأَحْرِقُونِي، حَتَّى إِذَا صِرْتُ فَحْمًا فَاسْحَقُونِي -أَوْ قَالَ: فَاسْحَكُونِي- فَإِذَا كَانَ يَوْمُ رِيحٍ عَاصِفٍ فَأَذْرُونِي فِيهَا». فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «فَأَخَذَ مَوَاثِيقَهُمْ عَلَى ذَلِكَ وَرَبِّي، فَفَعَلُوا ثُمَّ أَذْرَوْهُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ، فَقَالَ اللَّهُ ﷻ: كُنْ. فَإِذَا هُوَ رَجُلٌ قَائِمٌ. قَالَ اللَّهُ: أَيْ عَبْدِي، مَا حَمَلَكَ عَلَى أَنْ فَعَلْتَ مَا فَعَلْتَ؟ قَالَ: مَخَافَتُكَ" أَوْ: "فَرَقٌ مِنْكَ" قَالَ: "فَمَا تَلاَفَاهُ أَنْ رَحِمَهُ عِنْدَهَا". وَقَالَ مَرَّةً أُخْرَى: فَمَا تَلاَفَاهُ غَيْرُهَا". فَحَدَّثْتُ بِهِ أَبَا عُثْمَانَ فَقَالَ: سَمِعْتُ هَذَا مِنْ سَلْمَانَ غَيْرَ أَنَّهُ زَادَ فِيهِ" أَذْرُونِي فِي الْبَحْرِ".أَوْ كَمَا حَدَّثَ[1].

حَدَّثَنا موسى: حَدَّثَنا معتَمرٌ وقال: ((لم يَبْتَئر))

-وقال خليفة: حَدَّثَنا معتَمرٌ وقال: ((لم يَبْتَئز)) فسَّرَهُ قتادةُ: لم يَدَّخِر.

---

(١) بڕوانە: ٣٤٧٨.

**٧٥٠٨- ئەبو سەعید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە((كە پێغەمبەر ﷺ باسی پیاوێكی كرد لە گەلانی ڕابردوو بوو- یان لە گەلانی پێش ئێوەدابوو- وتەیەكی فەرموو ماناكەی ئەمە بوو- خودا سامان و منداڵی پێ بەخشی بوو- جا كاتێ لەسەر مەرگدابوو بە كوڕەكانی وت: من چۆن باوكێك بووم بۆتان؟ وتیان: چاكترین باوك بوویت، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بەڵام هیچ چاكەیەكی پێش خۆی نەخستبوو[١] بۆ لای خوا، وە ئەگەر خوا دەسەڵاتی بەسەریدا هەبێت [٢] (زیندووی بكاتەوە) بەتوندی سزای دەدات، بۆیە سەرنج بدەن كە گیانم كێشرا و مردم (لاشەكەم) بسوتێنن هەتا دەبمە خەڵوز، ئینجا چاك بمهاڕن-یان وتی باش بمهاڕن- جا ڕۆژێ كە بایەكی توند بوو بمدنە بەدەم باكەوە))، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئنجا لەسەر ئەوە بەڵێن و پەیمانی لە كوڕەكانی وەرگرت، (وتی بڵێن:) بە پەروەردگار (وادەكەین)، ئەوانیش وایان كرد و پاشان لە ڕۆژێكی ڕەشەبادا دایان بەدەم باوە، ئینجا خوا ﷻ فەرمووی: ببە، دەست بەجێ بۆیە پیاوێكی ڕاوەستاو، خوا فەرمووی: ئەی بەندەكەم، چی وای لێكردی كە ئەوە بكەی كە كردت؟ وتی: ترسی تۆ- یان ترسان لە (سزای) تۆ- خوا فەرمووی: لەوێدا بەڕەحمەتی خۆی فریای كەوت (و لێی خۆش بوو)) ). وە لە گێڕانەویەكی تردا فەرمووی: ((جا فریای نەكەوت بەبەزەیی نەبێت)).**

**(سولەیمانی تەیمی دەڵێ:) ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ ئەبو عوسمان ئەویش وتی: (ئەم فەرموودەیم) لە سەلمان بیست بەڵام ئەمەی لێ زیادە كردبوو: ((بەپرژو بڵاوی بمكەنە ناو دەریاوە))، یا وەكو ئەو گێڕایەوە.**

---

(١) قەتادە (لم يَبْتَئِرْ)ـی بە: پێش خۆی نەخستبوو مانای كردوە، وە (لم يَبْتَئِزْ) هەمان مانای هەیە.

(٢) ئەو تێگەشتنی كابرایە بۆ زیندوو بوونەوە ئەگەر وشەكە بە (يَقدِر) بخوێنرێتەوە ماناكەی بەو شێوەیە لەسەرەوە مانا كراوە، بەڵام ئەگەر بە (يُقَدِر) بخوێنرێتەوە ئەو بەمانای تەسک كردنەوە و لێ توند كردنە، واتە ئەگر خوا بیەوێ لەسەری توند كات و سزای بدات.

(ئیمامی بوخاری دەڵێ) موسا بۆی گێڕاینەوە وتی: موعتەمیر بۆی گێڕاینەوە فەرمووی: (لم يَبْتَئِر).

وە خەلیفە وتی: موعتەمیر بۆی گێڕاینەوە فەرمووی: (لم يَبْتَئِز). قەتادە ئاوای مانای کرد تووێشوی پێش خۆی نەناردبوو.

## ٣٦- بابُ كَلَامِ الرَّبِّ ﷻ يَوْمَ القِيَامَةِ مَعَ الأَنْبِيَاءِ وَغَيْرِهِمْ

٧٥٠٩- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ رَاشِدٍ، حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ القِيَامَةِ شُفِّعْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَبِّ، أَدْخِلِ الجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ خَرْدَلَةٌ. فَيَدْخُلُونَ، ثُمَّ أَقُولُ: أَدْخِلِ الجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ أَدْنَى شَيْءٍ». فَقَالَ أَنَسٌ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى أَصَابِعِ رَسُولِ اللهِ ﷺ[1].

## ٣٦- باسی قسە کردنی پەروەردگار ﷻ لەگەڵ پێغەمبەران ﷺ و کەسانی تریشدا لە ڕۆژی قیامەتدا

٧٥٠٩- حومید دەڵێ:لە ئەنەسم ﷺ بیست وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((کاتێ ڕۆژی قیامەت هات دەکرێمە تکاکار، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگار ئەوەی بەئەندازەی تۆ و خەرتەلەیەك باوەڕ لە دڵیدایە بیخەرە بەهەشتەوە، ئینجا ئەوانە دەڕۆنە بەهەشتەوە، لە پاشان دەڵێم: ئەو کەسەی کەمترین ئەندازە باوەڕ لە دڵی دایە بیخەرە بەهەشتەوە))، ئەنەس دەڵێ:دەڵێی پەنجەکانی پێغەمبەر ﷺ (بەپێش چاومەوەیە و) سەیریان دەکەم.

---

(١) بڕوانە: ٤٤.

٧٥١٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، حَدَّثَنَا مَعْبَدُ بْنُ هِلَالٍ العَنَزِيُّ قَالَ اجْتَمَعْنَا نَاسٌ مِنْ أَهْلِ البَصْرَةِ، فَذَهَبْنَا إِلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَذَهَبْنَا مَعَنَا بِثَابِتٍ إِلَيْهِ يَسْأَلُهُ لَنَا عَنْ حَدِيثِ الشَّفَاعَةِ، فَإِذَا هُوَ فِي قَصْرِهِ، فَوَافَقْنَاهُ يُصَلِّي الضُّحَى، فَاسْتَأْذَنَّا، فَأَذِنَ لَنَا وَهْوَ قَاعِدٌ عَلَى فِرَاشِهِ، فَقُلْنَا لِثَابِتٍ: لاَ تَسْأَلْهُ عَنْ شَيْءٍ أَوَّلَ مِنْ حَدِيثِ الشَّفَاعَةِ. فَقَالَ: يَا أَبَا حَمْزَةَ هَؤُلاَءِ إِخْوَانُكَ مِنْ أَهْلِ البَصْرَةِ جَاءُوكَ يَسْأَلُونَكَ عَنْ حَدِيثِ الشَّفَاعَةِ. فَقَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ مَاجَ النَّاسُ بَعْضُهُمْ فِي بَعْضٍ، فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ: اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ. فَيَقُولُ: لَسْتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِإِبْرَاهِيمَ فَإِنَّهُ خَلِيلُ الرَّحْمَنِ. فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فَيَقُولُ: لَسْتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُوسَى فَإِنَّهُ كَلِيمُ اللهِ. فَيَأْتُونَ مُوسَى، فَيَقُولُ: لَسْتُ لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِعِيسَى فَإِنَّهُ رُوحُ اللهِ وَكَلِمَتُهُ. فَيَأْتُونَ عِيسَى، فَيَقُولُ لَسْتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُحَمَّدٍ ﷺ فَيَأْتُونِي، فَأَقُولُ: أَنَا لَهَا، فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي، فَيُؤْذَنُ لِي، وَيُلْهِمُنِي مَحَامِدَ أَحْمَدُهُ بِهَا لاَ تَحْضُرُنِي الآنَ، فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ وَأَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا، فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وَسَلْ تُعْطَ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَقُولُ: يَا رَبِّ، أُمَّتِي أُمَّتِي. فَيُقَالُ: انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مِنْهَا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ شَعِيرَةٍ مِنْ إِيمَانٍ. فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ثُمَّ أَعُودُ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ، ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وَسَلْ تُعْطَ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَقُولُ يَا رَبِّ، أُمَّتِي أُمَّتِي. فَيُقَالُ: انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مِنْهَا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ -أَوْ: خَرْدَلَةٍ- مِنْ إِيمَانٍ. فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ثُمَّ أَعُودُ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ المَحَامِدِ، ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا، فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وَسَلْ تُعْطَ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَقُولُ: يَا رَبِّ، أُمَّتِي أُمَّتِي. فَيَقُولُ: انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ أَدْنَى أَدْنَى أَدْنَى مِثْقَالِ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَأَخْرِجْهُ مِنَ النَّارِ. فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ».

٧٥١٠/م - فَلَمَّا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِ أَنَسٍ قُلْتُ لِبَعْضِ أَصْحَابِنَا: لَوْ مَرَرْنَا بِالْحَسَنِ وَهْوَ مُتَوَارٍ فِي مَنْزِلِ أَبِي خَلِيفَةَ فَحَدَّثَنَا بِمَا حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، فَأَتَيْنَاهُ فَسَلَّمْنَا عَلَيْهِ، فَأَذِنَ لَنَا، فَقُلْنَا لَهُ: يَا أَبَا سَعِيدٍ، جِئْنَاكَ مِنْ عِنْدِ أَخِيكَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ فَلَمْ نَرَ مِثْلَ مَا حَدَّثَنَا فِي الشَّفَاعَةِ،

فَقَالَ: هِيهِ، فَحَدَّثْنَاهُ بِالْحَدِيثِ فَانْتَهَى إِلَى هَذَا الْمَوْضِعِ فَقَالَ: هِيهِ، فَقُلْنَا: لَمْ يَزِدْ لَنَا عَلَى هَذَا. فَقَالَ: لَقَدْ حَدَّثَنِي وَهْوَ جَمِيعٌ مُنْذُ عِشْرِينَ سَنَةً، فَلاَ أَدْرِي أَنَسِيَ أَمْ كَرِهَ أَنْ تَتَّكِلُوا. قُلْنَا: يَا أَبَا سَعِيدٍ فَحَدِّثْنَا. فَضَحِكَ وَقَالَ: خُلِقَ الإِنْسَانُ عَجُولاً، مَا ذَكَرْتُهُ إِلاَّ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُحَدِّثَكُمْ، حَدَّثَنِي كَمَا حَدَّثَكُمْ بِهِ قَالَ: «ثُمَّ أَعُودُ الرَّابِعَةَ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ، ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا، فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، وَقُلْ يُسْمَعْ، وَسَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَقُولُ: يَا رَبِّ، ائْذَنْ لِي فِيمَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَيَقُولُ: وَعِزَّتِي وَجَلاَلِي وَكِبْرِيَائِي وَعَظَمَتِي لأُخْرِجَنَّ مِنْهَا مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ»[1].

**٧٥١٠- مەعبەدی کوڕی هیلالی عەنەزی دەڵێ:چەند کەسێکی خەڵکی بەصرە کۆبوینەوە، جا ڕۆشتین بۆلای ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ سابیتیشمان لەگەڵ خۆمان برد بۆلای ئەنەس تاپرسیاری لێ بکات بۆمان دەربارەی فەرموودەی شەفاعەت، جادەبینین ئەنەس لەکۆشکەکەی خۆیدایە، وەلەو کاتەدا ئێمە ڕۆشتین وا ڕێك کەوت نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد، ئێمە مۆڵەتمان خواست بۆ چوونە ژوورەوە ئەویش مۆڵەتی داین وخۆی لەسەر ڕاخەرەکەی دانیشتبوو ئێمەش بەسابیتمان وت: پێش فەرموودەی شەفاعەت پرسیاری هیچ شتێکی تری لێ مەکە، سابیتیش وتی: ئەی ئەبو حەمزە ئائەم برایانەت لەخەڵکی بەصرە هاتوون بۆلات پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی شەفاعەت، ئەنەسیش ﷺ وتی: موحەممەد ﷺ بۆی گێڕاینەوەو فەرمووی: ((کاتێ ڕۆژی قیامەت هات خەڵکی هەندێکیان دەچن بەناو هەندێکیاندا[2]، ئینجا دەڕۆن بۆلای ئادەم ﷺ ودەڵێن: لای پەروەردگارت تکامان بۆبکە، ئادەمیش دەڵێ: من کەسی ئەو کارە نیم، بەڵام بڕۆن بۆلای ئیبراهیم ﷺ چونکە بێگومان ئەوخۆشەویستی خوای بەبەزەیی بوو ئینجا دەڕۆن بۆلای ئیبراهیم ﷺ ئەویش دەڵێ: بێگومان من**

(١) بڕوانە: ٤٤.

(٢) لەناڕەحەتی ئەو ڕۆژەدا خەڵکەکە سەریان لێ شێواوە هەر دێن بەناو یەکداو نازانن چی بکەن.

پیاوی ئەم کارە نیم، بەڵام بڕۆن بۆ لای مووسا ﷺ چونکە بێگومان ئەو خوا قسەی لەگەڵ کردوە، ئینجا دەڕۆن بۆ لای مووسا ﷺ ئەویش دەڵێ:بێگومان من پیاوی ئەم کارە نیم، بەڵام بڕۆن بۆلای عیسا ﷺ چونکە بێگومان ڕۆحی خودا و قسە لەگەڵ کراوی خودایە، ئینجا دەڕۆن بۆلای عیسا ﷺ ئەویش دەڵێ:بێگومان من پیاوی ئەم کارە نیم، بەڵام بڕۆن بۆلای موحەممەد ﷺ ئینجا دێن بۆلای من، منیش دەڵێم: من پیاوی ئەو کارەم، ئینجا مۆڵەت لەپەروەردگارم دەخوازم، ئەویش مۆڵەتم دەدات، جا خودا هەندێ دەربڕینی سوپاس کردن دەخاتە دڵمەوە فێرم دەکات کەسوپاسی ئەوی پێ بکەم ئێستا لەبەرم نییە وبۆم ناوترێ ئینجا بەو وشەودەربڕینانە سوپاسی خوا دەکەم، وەبۆی دەکەوم بە سوژدەدا خواش دەفەرمووێ: ئەی موحەممەد سەرت بەرزکەرەوە قسە بکە گوێت بۆ دەگیرێ، داوا بکە پێت دەبەخشرێ، تکا بکە تکات دەگیرێ، منیش دەڵێم ئەی پەروەردگارم: فریای ئوممەتەکەم کەوە فریای ئوممەتەکەم کەوە، جا پێم دەوترێت: بڕۆ ئەو کەسەی قورسایی دەنکە جۆیەك باوەڕی لەدڵ دایە لە دۆزەخ دەری بێنە، منیش ئەڕۆم (ئەوەی فەرمانم پێکراوە) ئەنجامی دەدەم، پاشان دەگەڕێمەوە، بەو سوپاس وستایشانە (فێرکرام) سوپاسی خوا دەکەم پاشان دەکەوم بەسوژدەدا بۆخوا، پێم دەوترێت: [1] ئەی موحەممەد: سەرت بەرزکەرەوە قسە بکە گوێت بۆ دەگیرێ، داوا بکە پێت دەبەخشرێ، تکا بکە تکات دەگیرێ، منیش دەڵێم ئەی پەروەردگارم: بمکە تکاکاری ئوممەتەکەم بمکە تکاکاری ئوممەتەکەم، جا پێم دەوترێت: بڕۆ ئەو کەسەی گەردیلەیەك یان تۆو خەرتەلەیەك باوەڕی لەدڵ دایە لە دۆزەخ دەری بێنە، منیش ئەڕۆم (ئەوەی فەرمانم پێکراوە) ئەنجامی دەدەم، پاشان دەگەڕێمەوە، بەو سوپاس و ستایشانە

---

(١) یان خوا دەفەرمویٚ پێم وەک لەهەندێ گێڕانەوەی بوخاری دا هاتووە

(فێرکرام) سوپاسی خوا دەکەم پاشان دەکەوم بە سوژدەدا بۆ خوا جا پێم دەوترێت: ئەی موحەمەد:سەرت بەرزکەرەوە قسە بکە گوێت بۆ دەگیرێ، داوا بکە پێت دەبەخشرێ، تکا بکە تکات دەگیرێ، منیش دەڵێم ئەی پەروەردگارم: بمکەتکاکاری ئوممەتەکەم بمکە تکاکاری ئوممەتەکەم، جا پێم دەوترێت: بڕۆ ئەو کەسەی کەمترین کەمترین کەمترینی قورسایی تۆو خەرتەلەیەك باوەڕی لەدڵ دایە لە دۆزەخ دەری بێنە، منیش ئەڕۆم (ئەوەی فەرمانم پێکراوە) ئەنجامی دەدەم)) ).

٧٥١٠- (مەعبەد دەڵێ) جا کاتێ لای ئەنەس ﷺ هاتینە دەرەوە، وتم بەیەکێ لە هاوڕێکانم: خۆزگە لای حەسەنەوە[1] بڕۆشتینایە-لەوکاتەدا لە ماڵی ئەبو خەلیفە خۆی شاردبویەوە- ئەوەی ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕاینەوە (بۆمان بگێڕایەتەوە)، ئینجا ڕۆشتین بۆلای (حەسەن) و سڵاومان لێ کرد، ئەویش مۆڵەتی داین، ئێمەش پێمان وت:ئەی ئەبو سەعید، لای ئەنەسی کوڕی مالیکی براتەوە هاتوین بۆلات، جا ئێمە هاوشێوەی ئەو فەرموودەی دەربارەی شەفاعەت بۆی گێڕاینەوە نەمانزانیوە، وتی لەوە زیاترم بۆ باسکەن و بگێڕنەوە ئێمەش فەرموودەکەمان بۆ گێڕایەوەمتا گەشتە ئەو شوێنە (ی ئەنەس بۆ گێڕاینەوە) وتی زیاترم بۆ باس کەن، ئێمەش وتمان: لەوە زیاتری بۆ باس نەکردین، (حەسەن) وتی: سوێند بەخوا دڵنیا بن ماوەی بیست ساڵ لەمەو پێش (ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاوەمەتەوە-لەکاتێکدا بیرو هۆی چاك بوو- جانازانم ئایا لەبیری چووەتەوە یان حەزی نەکردوە پشت بەشەفاعەت ببەستن، وتمان: ئەی ئەبو سەعید دەی تۆ (ئەو زیادەیەمان) بۆ بگێڕەڕەوە، (حەسەنیش) پێکەنی وتی: مرۆڤ بەلاساری دروست کراوە، تەنها لەبەر ئەوە ئەوەم وت بۆ ئەوەی فەرموودەکەتان بۆ

---

(١) حەسەنی بەصری ﷺ.

بگێڕمەوە، ئەنەس ﷺ بۆ منیشی گێڕایەوە وەك چۆن بۆ تۆشی گێڕایەوە وتی (فەرمووی): ((پاشان بۆ جاری چوارەم دەگەڕێمەوە بەو سوپاسانەی فێرکراوم سوپاسی خودای پێدەکەم، پاشان دەکەوم و دەڕۆم بەسوژدەدا (بۆخوا) جا پێم دەوترێت، ئەی موحەمەد سەرت بەرزکەرەوە و قسە بکە و گوێت بۆ دەگیرێ وداوا بکە پێت دەدرێ وتکا بکە تکات وەردەگیرێ، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگارم مۆڵەتم بدە دەربارەی هەرکەسێ وتبێتی: (لا اله الا الله) (دەری بێنم لە دۆزەخ) خوای گەورەش دەفەرمووێ: سوێند بە عیززەت و جەلال و گەورەیی و عەزەمەتی خۆم هەرکەس وتویەتی: (لا اله الا الله) دەری دێنم لە دۆزەخ)).

٧٥١١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ آخِرَ أَهْلِ الجَنَّةِ دُخُولاً الجَنَّةَ، وَآخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنَ النَّارِ رَجُلٌ يَخْرُجُ حَبْوًا، فَيَقُولُ لَهُ رَبُّهُ: ادْخُلِ الجَنَّةَ. فَيَقُولُ: رَبِّ، الجَنَّةُ مَلأَى. فَيَقُولُ لَهُ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَكُلُّ ذَلِكَ يُعِيدُ عَلَيْهِ: الجَنَّةُ مَلأَى. فَيَقُولُ: إِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنْيَا عَشْرَ مِرَارٍ»[1].

٧٥١١-عەبیدە لە عوبەیدوڵڵاوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان کۆتاهەمین کەسی بەهەشتی کە دەڕواتە بەهەشتەوە، وە کۆتاهەمین کەسی دۆزەخی کە دەردەچێ لە دۆزەخ، پیاوێکە بە گاگۆڵکێ دەردەچێ، جا پەروەردگاری پێی دەفەرمووێ: بڕۆرە بەهەشتەوە، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم بەهەشت پڕ بووە، خواش سێ جار ئەو وتەیەی پێ دەفەرمووێ: ئەویش لە هەموو جارەکاندا ئەم ووتە دووبارە دەکاتەوە: بەهەشت پڕ پڕە، ئەوسا خوای گەورە دەفەرمووێ: بەڕاستی دە جار بەئەندازەی دونیا بۆ تۆیە)).

---

(١) بڕوانە: ٦٥٧١.

٧٥١٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ خَيْثَمَةَ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْكُمْ أَحَدٌ إِلاَّ سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تَرْجُمَانٌ، فَيَنْظُرُ أَيْمَنَ مِنْهُ فَلاَ يَرَى إِلاَّ مَا قَدَّمَ مِنْ عَمَلِهِ، وَيَنْظُرُ أَشْأَمَ مِنْهُ فَلاَ يَرَى إِلاَّ مَا قَدَّمَ، وَيَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ النَّارَ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، فَاتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ». قَالَ الأَعْمَشُ: وَحَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، عَنْ خَيْثَمَةَ مِثْلَهُ، وَزَادَ فِيهِ: «وَلَوْ بِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»[(١)].

**٧٥١٢-عەدیی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ کەسێك لەئێوە نییە ئیللا بەدڵنیاییەوە پەروەردگاری قسەی لەگەڵ دەکات، لە نێوان ئەو پەروەردگاریدا وەرگێڕ نییە، ئینجا (ئەو کەسە) سەیری لای ڕاستی خۆی دەکات هیچ نابینێ جگە لەو کردەوانەی پێش خۆی خستووە، وە سەیری لای چەپی خۆی دەکات هیچ نابینێ جگە لەو کردەوانەی پێش خۆیی خستووە، وە سەیری بەردەمی خۆی دەکات جگە لە ئاگر هیچی تر نابینێ کە بەرامبەر دەم و چاو ڕووخساریەتی، دەی کەواتە خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن با بەلەتە خورمایەکیش بێت)).**

**ئەعمەش دەڵێ: عەمرەی کوڕی مورە بۆی گێڕامەوە لە خەیسەمەوە هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوە، ئەمەشی بۆ زیاد کرد: ((با بە وتەیەکی جوان و شیرینیش بێت)).**

٧٥١٣- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: جَاءَ حَبْرٌ مِنَ اليَهُودِ فَقَالَ: إِنَّهُ إِذَا كَانَ يَوْمَ القِيَامَةِ جَعَلَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْمَاءَ وَالثَّرَى عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْخَلاَئِقَ عَلَى إِصْبَعٍ، ثُمَّ يَهُزُّهُنَّ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَنَا الْمَلِكُ. فَلَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَضْحَكُ حَتَّى

(١) بروانە: ١٤١٣.

بَدَتْ نَوَاجِذُهُ تَعَجُّبًا وَتَصْدِيقًا لِقَوْلِهِ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ ﴿٦٧﴾﴾ إلى قوله: ﴿يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾ الزمر[1].

**٧٥١٣- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: زانایەکی جوولەکە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: بێگومان کاتێ قیامەت دەبێت، خوای گەورە ئاسمانەکان هەمووی دەخاتە سەر پەنجەیەك (ی خۆی)، زەویەکانیش دەخاتە سەر پەنجەیەك، وە ئاو و خاك و خۆڵیش دەخاتە سەر پەنجەیەك، هەموو دروست کراوەکانیش دەخاتە سەر پەنجەیەك، پاشان هەمووی دەلەرزێنێتەوە، لە پاشان دەفەرمووێ: من پادشام من دەسەڵاتدارم، (عەبدوڵلا دەڵێ) جا سوێند بەخوا پێغەمبەرم ﷺ بینی پێدەکەنی هەتا ددانەکانی پێشەوەی دەرکەوتن، وەك سەرسامی بەڕاست دانانی وتەی ئەو (زانا جووە) لە پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کافران خوایان نەناسیوە (بەگەورەیان نەزانیوە) بەو جۆرەی شیاویەتی))، تا گەشتە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە (دەیکەنە هاوبەشی (خوا) ).**

٧٥١٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ: كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي النَّجْوَى؟ قَالَ: «يَدْنُو أَحَدُكُمْ مِنْ رَبِّهِ حَتَّى يَضَعَ كَنَفَهُ عَلَيْهِ فَيَقُولُ: أَعَمِلْتَ كَذَا وَكَذَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ. وَيَقُولُ: عَمِلْتَ كَذَا وَكَذَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ. فَيُقَرِّرُهُ، ثُمَّ يَقُولُ: إِنِّي سَتَرْتُ عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا، وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ».

وَقَالَ آدَمُ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا صَفْوَانُ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ.

**٧٥١٤- صەفوانی کوڕی موحریز دەگێڕێتەوە کە پیاوێك پرسیاری لە ئیبنو عومەر ﷺ کرد وتی: چۆنت بیستووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی چپە**

(١) بڕوانە: ٤٨١١.

چی دەفەرمووی؟ (وتی) فەرمووی: ((کەسێکتان لە پەروەردگاری نزیك دەبێتەوە هەتا باڵی خۆی لەسەری دادەنێت، ئینجا دەفەرمووێ: ئایا ئەوە و ئەوەت کرد؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، وە دەفەرمووێ: ئەوە و ئەوەشت کرد؟ دەڵێ: بەڵێ، تا وای لێدەکات دان بنێت بەتاوانەکانیدا، پاشان دەفەرمووێ: بێگومان لە دونیادا بۆم پۆشیت، بۆیە ئەمڕۆش من لەو تاوانانەت خۆش دەبم)).

ئادەم دەڵێ: شەیبان بۆی گێڕاینەوە وتی: قەتادە بۆی گێڕاینەوە وتی: صەفوان بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ وتی: (ئەم فەرموودەم) لە پێغەمبەر ﷺ بیست[1].

## ٣٧- بابُ قَوْلِ اللهِ تعالى: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾﴾ النساء

٧٥١٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا عُقَيْلٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى، فَقَالَ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الذِي أَخْرَجْتَ ذُرِّيَّتَكَ مِنَ الجَنَّةِ. قَالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى الذِي اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالاَتِهِ وَكَلاَمِهِ، ثُمَّ تَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِّرَ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ. فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى»[2].

## ٣٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە خوا قسەی کرد لەگەڵ موسا ﷺ بەقسەکردن)

٧٥١٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئادەم و مووسا ﷺ بوویە مشت و مڕیان (بەڵگەیان بەرامبەر یەکتری هێنایەوە)، جا

(١) بۆیە ئەم ڕشتەی دووەمی هێناوە بۆ فەرموودەکە، تا بیسەلمێنێ کە قەتادە بە ڕوونی لە صەفوانی بیستووە کە دەڵێ: (حدثنا صفوان) بەپێچەوانەی ڕشتەی یەکەم کە دەڵێ: (عن صفوان).

(٢) بڕوانە: ٣٤٠٩.

**موسا فەرمووی: تۆ ئەو ئادەمەیت کە نەوەکانت لە بەهەشت دەرکرد، ئادەم فەرمووی: تۆ ئەو موسایەیت کە خوا هەڵیبژاردی بە پەیامەکانی و بەقسە کردنی (لەگەڵت)، پاشان سەرزەنشتی من دەکەیت لەسەر کارێك بۆم نوسرابوو پێش ئەوەی دروست بکرێم؟ بۆیە ئادەم بە بەڵگە زاڵ بوو بەسەر موسادا)).**

٧٥١٦- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُجْمَعُ الْمُؤْمِنُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُونَ: لَوِ اسْتَشْفَعْنَا إِلَى رَبِّنَا، فَيُرِيحُنَا مِنْ مَكَانِنَا هَذَا. فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ لَهُ: أَنْتَ آدَمُ أَبُو الْبَشَرِ، خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَأَسْجَدَ لَكَ الْمَلاَئِكَةَ وَعَلَّمَكَ أَسْمَاءَ كُلِّ شَيْءٍ، فَاشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّنَا حَتَّى يُرِيحَنَا. فَيَقُولُ لَهُمْ: لَسْتُ هُنَاكُمْ. فَيَذْكُرُ لَهُمْ خَطِيئَتَهُ التِي أَصَابَ»[1].

**٧٥١٦- قەتادە دەگێڕێتەوە کە ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە ڕۆژی قیامەتدا باوەڕداران کۆدەکرێنەوە جا دەڵێن: خۆزگە لای پەروەردگارمان تکامان بکردایە و ڕزگاری بکردینایە لەم شوێنە (ناخۆشە)مان، جا دەڕۆن بۆلای ئادەم ﷺ و پێی دەڵێن: تۆ باوکی مرۆڤەکانی، خودا بەدەستی خۆی دروستی کردووی، سوژدەی برد بەفریشتەکان بۆت، ناوی هەموو شتێکی فێر کردی، دەی تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارمان تارزگارمان بکات، ئەویش پێیان دەڵێ: من لەو پلەیەدا نیم ئێوە وام دەزانن، جا باسی ئەو هەڵەیەی خۆی دەکات کە توشی بوو کردی)).**

٧٥١٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ مَالِكٍ يَقُولُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ مَسْجِدِ الكَعْبَةِ أَنَّهُ جَاءَهُ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ

---

(١) بڕوانە: ٤٤.

قَبْلَ أَنْ يُوحَى إِلَيْهِ وَهْوَ نَائِمٌ فِي المَسْجِدِ الحَرَامِ، فَقَالَ أَوَّلُهُمْ: أَيُّهُمْ هُوَ؟ فَقَالَ أَوْسَطُهُمْ: هُوَ خَيْرُهُمْ. فَقَالَ آخِرُهُمْ: خُذُوا خَيْرَهُمْ. فَكَانَتْ تِلْكَ اللَّيْلَةَ، فَلَمْ يَرَهُمْ حَتَّى أَتَوْهُ لَيْلَةً أُخْرَى فِيمَا يَرَى قَلْبُهُ، وَتَنَامُ عَيْنُهُ وَلاَ يَنَامُ قَلْبُهُ، وَكَذَلِكَ الأَنْبِيَاءُ تَنَامُ أَعْيُنُهُمْ وَلاَ تَنَامُ قُلُوبُهُمْ، فَلَمْ يُكَلِّمُوهُ حَتَّى احْتَمَلُوهُ، فَوَضَعُوهُ عِنْدَ بِئْرِ زَمْزَمَ، فَتَوَلاَّهُ مِنْهُمْ جِبْرِيلُ فَشَقَّ جِبْرِيلُ مَا بَيْنَ نَحْرِهِ إِلَى لَبَّتِهِ حَتَّى فَرَغَ مِنْ صَدْرِهِ وَجَوْفِهِ، فَغَسَلَهُ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ بِيَدِهِ، حَتَّى أَنْقَى جَوْفَهُ، ثُمَّ أُتِيَ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ فِيهِ تَوْرٌ مِنْ ذَهَبٍ مَحْشُوًّا إِيمَانًا وَحِكْمَةً، فَحَشَا بِهِ صَدْرَهُ وَلَغَادِيدَهُ -يَعْنِي: عُرُوقَ حَلْقِهِ- ثُمَّ أَطْبَقَهُ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَضَرَبَ بَابًا مِنْ أَبْوَابِهَا فَنَادَاهُ أَهْلُ السَّمَاءِ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: جِبْرِيلُ. قَالُوا: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مَعِي مُحَمَّدٌ. قَالَ: وَقَدْ بُعِثَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالُوا: فَمَرْحَبًا بِهِ وَأَهْلاً. فَيَسْتَبْشِرُ بِهِ أَهْلُ السَّمَاءِ، لاَ يَعْلَمُ أَهْلُ السَّمَاءِ بِمَا يُرِيدُ اللَّهُ بِهِ فِي الأَرْضِ حَتَّى يُعْلِمَهُمْ، فَوَجَدَ فِي السَّمَاءِ الدُّنْيَا آدَمَ، فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ: هَذَا أَبُوكَ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ. فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، وَرَدَّ عَلَيْهِ آدَمُ وَقَالَ: مَرْحَبًا وَأَهْلاً بِابْنِي، نِعْمَ الابْنُ أَنْتَ. فَإِذَا هُوَ فِي السَّمَاءِ الدُّنْيَا بِنَهَرَيْنِ يَطَّرِدَانِ، فَقَالَ: "مَا هَذَانِ النَّهَرَانِ يَا جِبْرِيلُ؟ ". قَالَ: هَذَا النِّيلُ وَالْفُرَاتُ عُنْصُرُهُمَا. ثُمَّ مَضَى بِهِ فِي السَّمَاءِ فَإِذَا هُوَ بِنَهَرٍ آخَرَ عَلَيْهِ قَصْرٌ مِنْ لُؤْلُؤٍ وَزَبَرْجَدٍ، فَضَرَبَ يَدَهُ فَإِذَا هُوَ مِسْكٌ قَالَ: مَا هَذَا يَا جِبْرِيلُ؟ " قَالَ: هَذَا الكَوْثَرُ الذِي خَبَأَ لَكَ رَبُّكَ. ثُمَّ عَرَجَ إِلَى السَّمَاءِ الثَّانِيَةِ، فَقَالَتِ المَلاَئِكَةُ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَتْ لَهُ الأُولَى: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قَالُوا: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ ﷺ. قَالُوا: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالُوا: مَرْحَبًا بِهِ وَأَهْلاً. ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ وَقَالُوا لَهُ مِثْلَ مَا قَالَتِ الأُولَى وَالثَّانِيَةُ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى الرَّابِعَةِ، فَقَالُوا لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الخَامِسَةِ، فَقَالُوا مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ السَّادِسَةِ، فَقَالُوا لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ فَقَالُوا لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ. كُلُّ سَمَاءٍ فِيهَا أَنْبِيَاءُ قَدْ سَمَّاهُمْ، فَأَوْعَيْتُ مِنْهُمْ إِدْرِيسَ فِي الثَّانِيَةِ، وَهَارُونَ فِي الرَّابِعَةِ، وَآخَرَ فِي الخَامِسَةِ لَمْ أَحْفَظِ اسْمَهُ، وَإِبْرَاهِيمَ فِي السَّادِسَةِ، وَمُوسَى فِي السَّابِعَةِ بِتَفْضِيلِ كَلاَمِ اللَّهِ، فَقَالَ مُوسَى: رَبِّ لَمْ أَظُنَّ أَنْ يُرْفَعَ عَلَيَّ أَحَدٌ. ثُمَّ عَلاَ بِهِ فَوْقَ ذَلِكَ بِمَا لاَ يَعْلَمُهُ إِلاَّ اللَّهُ،

حَتَّى جَاءَ سِدْرَةَ الْمُنْتَهَى، وَدَنَا الجَبَّارُ رَبُّ العِزَّةِ فَتَدَلَّى حَتَّى كَانَ مِنْهُ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى، فَأَوْحَى اللَّهُ فِيمَا أَوْحَى إِلَيْهِ خَمْسِينَ صَلاَةً عَلَى أُمَّتِكَ كُلَّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ.

ثُمَّ هَبَطَ حَتَّى بَلَغَ مُوسَى، فَاحْتَبَسَهُ مُوسَى فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مَاذَا عَهِدَ إِلَيْكَ رَبُّكَ قَالَ: "عَهِدَ إِلَيَّ خَمْسِينَ صَلاَةً كُلَّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ. قَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ لاَ تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ فَارْجِعْ فَلْيُخَفِّفْ عَنْكَ رَبُّكَ وَعَنْهُمْ. فَالْتَفَتَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى جِبْرِيلَ كَأَنَّهُ يَسْتَشِيرُهُ فِي ذَلِكَ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ جِبْرِيلُ: أَنْ نَعَمْ إِنْ شِئْتَ. فَعَلاَ بِهِ إِلَى الجَبَّارِ فَقَالَ وَهْوَ مَكَانَهُ "يَا رَبِّ، خَفِّفْ عَنَّا، فَإِنَّ أُمَّتِي لاَ تَسْتَطِيعُ هَذَا". فَوَضَعَ عَنْهُ عَشْرَ صَلَوَاتٍ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مُوسَى فَاحْتَبَسَهُ، فَلَمْ يَزَلْ يُرَدِّدُهُ مُوسَى إِلَى رَبِّهِ حَتَّى صَارَتْ إِلَى خَمْسِ صَلَوَاتٍ، ثُمَّ احْتَبَسَهُ مُوسَى عِنْدَ الْخَمْسِ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ وَاللَّهِ لَقَدْ رَاوَدْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ قَوْمِي عَلَى أَدْنَى مِنْ هَذَا، فَضَعُفُوا فَتَرَكُوهُ، فَأُمَّتُكَ أَضْعَفُ أَجْسَادًا وَقُلُوبًا وَأَبْدَانًا وَأَبْصَارًا وَأَسْمَاعًا، فَارْجِعْ فَلْيُخَفِّفْ عَنْكَ رَبُّكَ كُلَّ ذَلِكَ يَلْتَفِتُ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى جِبْرِيلَ لِيُشِيرَ عَلَيْهِ وَلاَ يَكْرَهُ ذَلِكَ جِبْرِيلُ، فَرَفَعَهُ عِنْدَ الخَامِسَةِ فَقَالَ: "يَا رَبِّ إِنَّ أُمَّتِي ضُعَفَاءُ أَجْسَادُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ وَأَسْمَاعُهُمْ وَأَبْدَانُهُمْ فَخَفِّفْ عَنَّا".

فَقَالَ الجَبَّارُ: يَا مُحَمَّدُ. قَالَ: "لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ". قَالَ: إِنَّهُ لاَ يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَى، كَمَا فَرَضْتُ عَلَيْكَ فِي أُمِّ الْكِتَابِ -قَالَ- فَكُلُّ حَسَنَةٍ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، فَهْيَ خَمْسُونَ فِي أُمِّ الْكِتَابِ وَهْيَ خَمْسٌ عَلَيْكَ. فَرَجَعَ إِلَى مُوسَى فَقَالَ: كَيْفَ فَعَلْتَ؟ فَقَالَ: "خَفَّفَ عَنَّا أَعْطَانَا بِكُلِّ حَسَنَةٍ عَشْرَ أَمْثَالِهَا".

قَالَ مُوسَى: قَدْ وَاللَّهِ رَاوَدْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ فَتَرَكُوهُ، ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَلْيُخَفِّفْ عَنْكَ أَيْضًا. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "يَا مُوسَى، قَدْ وَاللَّهِ اسْتَحْيَيْتُ مِنْ رَبِّي مِمَّا اخْتَلَفْتُ إِلَيْهِ". قَالَ: فَاهْبِطْ بِاسْمِ اللَّهِ. قَالَ: وَاسْتَيْقَظَ وَهْوَ فِي مَسْجِدِ الحَرَامِ[1].

**٧٥١٧- شەریکی کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە (ئەنەسی) کوڕی مالیکم ﷺ بیست دەیوت: ئەو شەوەی کە شەو ڕەوی بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا لە مزگەوتی کەعبەوە، پێش ئەوەی سرووشی بۆ بێت سێ کەس هاتن بۆ لای، لە کاتێکدا لە مزگەوتی حەرامدا خەوتبوو، جا کەسی یەکەمیان وتی: کامەیان**

(١) بڕوانە: ٣٥٧٠.

ئەوە؟ ناوەنجیەکەیان وتی: ئەو باشترینیانە، کەسی سێیەم کۆتاییان وتی: باشترینەکەیان بێنن، جا ئەوە لەو شەوەدا بوو، ئیتر نەیبینین هەتا شەوێکی تر هاتنەوە بۆ لای، وەك ئەوەی دڵی بیبینێ[1] -پێغەمبەر ﷺ چاوی دەخەوێ بەڵام دڵی بەخەبەرە و ناخەوێ پێغەمبەرانیش ﷺ هەرئاوەهان چاویان دەخەوێ بەڵام دڵیان ناخەوێ- جا قسەیان لەگەڵی نەکرد و هەتا بردیان لای بیری زەمزەم دایان نا، ئینجا جیبریل ﷺ لێیانی وەرگرت و جیبریل ﷺ نێوان گەردن ودانەی پەراسوی تا سنگی هەموو ناوسکی لەت کردووهەڵدڕی وبەدەستی خۆی لەئاوی زەمزەم شۆردی، هەتا ناوسکی جوان جوان پاك کردەوە، پاشان تەشتێکی ئاڵتوون هێنرابۆ (پێغەمبەر ﷺ) وجامێکی ئاڵتونی تیا بوو[2]، کەپڕ کرابوو لەباوەڕودانایی، ئینجا ناوسنگ ودەمارەکانی ملی- لَغَادِيدَهُ واتە: دەمارەکانی ملی- پڕکرابوو لەباوەڕو دانایی، پاشان جیبریل ﷺ سنگی نوساندەوە بەیەکەوە، پاشان (سواری بوراقی کردو) بەرزی کردەوە بۆئاسمانی دونیا، ئینجا جیبریل ﷺ تەقەی دا لەدەرگایەك لەدەرگاکانی ئاسمان، جایەکێ لەوانەی ئاسمان بانگی کرد وتی: ئەوە کێیە؟ وتی: جیبریل، وتیان کێت لەگەڵە؟ وتی موحەممەدم لەگەڵە، وتی: نێردراوە بەشوێنیدا؟ وتی بەڵێ، وتیان: بەخێربێن وخۆشحاڵین بەهاتنی، ئیتر خەڵکی ئاسمان [3] بەهۆیەوە مژدە بەیەکتری دەدەن وخۆشحاڵن، خەڵکی ئاسمان نازانن چ مەبەستێکی بە پێغەمبەر ﷺ هەیە لەزەویدا هەتا خوا خۆی ئاگاداریان دەکات، جا لەئاسمانی دونیادا ئادەمی ﷺ بینی، جا جیبریل ﷺ پێی فەرموو: ئەوە باوکتە وسەلامی لێ بکە، پێغەمبەریش ﷺ سەلامی لێ کرد

(١) واتە وەک بەخەو بیان بینێ وابوو بەڵام بەخەبەریش بوو.

(٢) واتە: تەشتەکە دەفرێ یاجامێکی ئاڵتونی تیا بوو.

(٣) مەبەست پێی فریشتەکانە.

ئادەمیش ﷺ وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و فەرمووی: بەخێر بێیت و خۆشحاڵم بە هاتنی کوڕەکەم، تۆ چەند کوڕێکی باشیت، جا دەبینێ لە ئاسمانی دونیادا دوو ڕووبار دەڕۆن بۆیە فەرمووی: ((ئەی جیبریل ﷺ ئەم دوو ڕووبارە چین؟ فەرمووی: ئەوە ئەسڵی نیل و فوراتە، پاشان بە ئاسماندا بردی ئینجا ڕووبارێکی تری بینی کۆشکێکی لە مرواری و زمڕوت بەسەرەوەیە بەدەستی لە ئاوەکەی دا دەبینێ ئەو ڕووبارە میسکە[1] پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی جیبریل ئەمە چییە؟)) فەرمووی: ئەوە کەوسەرە کە پەروەردگارت بۆ تۆی هەڵگرتووە و شاردوێتیەوە، لە پاشان بەرز بویەوە بۆ ئاسمانی دووەم فریشتەکان هەر بەو جۆرەیان پێ وت کە لە ئاسمانی یەکەم پێیان وت، ئەوە کێیە؟ وتی: جیبریل، وتیان: کێت لەگەڵە؟ وتی موحەممەدم لەگەڵە، وتی: نێردراوە بەشوێنیدا؟ وتی بەڵێ، وتیان: بەخێربێن و خۆشحاڵین بەهاتنی، ئینجا (جیبریل) بەرزی کردەوە بۆ ئاسمانی سێیەم، لەوێش لەئاسمانی یەکەم ودووەم چییان پێ وت هەمان شتیان پێ وتەوە، لە پاشان بەرزی کردەوە بۆئاسمانی چوارەم جالەوێش هەمان شتیان پێ وتەوە، لە پاشان بەرزی کردەوە بۆ ئاسمانی پێنجەم لەوێش هەمان شتیان پێ وتەوە، لە پاشان بەرزی کردەوە بۆئاسمانی شەشەم جالەوێش هەمان شتیان پێ وتەوە، لە پاشان بەرزی کردەوە بۆئاسمانی حەوتەم جا لەوێش هەمان شتیان پێ وتەوە، هەموو ئاسمانێك پێغەمبەرانی تیا بوو بێگومان ناوی هێنان لەو ناوانە کە بیرم ماوە ئیدریس ﷺ لە ئاسمانی دووەم دا، هاروون ﷺ لە ئاسمانی چوارەم دا، یەکێکی ترلەئسمانی پێنجەمدا ناوەکەیم بیر نەماوە، ئیبراهیم ﷺ لەشەشەم دا بوو، مووسا ﷺ لە حەوتەم دا بوو بەهۆی فەزڵی قسە کردنی خودا لەگەڵی دا، جا مووسا ﷺ وتی: ئەی پەروەردکارم گومانم نەدەبرد

---

(١) هەرمیسک لەشێوەی ڕووباردا یان بۆنی میسکی لێ دێ.

كەس بەرز بكرێتەوە بەسەر مندا پاشان (جیبریل) پێغەمبەری ﷺ بەرز كردەوە بۆ سەرو ئەوەش [1] بۆجێگایەك جگە لەخوا كەس نازانێ (كوێیە) هەتا چووە لای سیدرەتەلمونتەها، وەپەروەردگاری بەهێزو بەدەسەڵات نزیك بوویەوە جاداوای كرد زیاتر نزیك بێتەوە جابەئەندازەی دوو كەوان یا كەمتربوو نزیك بوو لێی، ئینجا خوا سرووشی بۆ كرد دەربارەی ئەوەی كە پەنجا نوێژم پێویست كرد لەسەر ئوممەتەكەت لە هەموو شەو ڕۆژێكدا، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتە خوارەوە هەتا گەیشتە لای مووسا ﷺ جامووسا ڕایگرت وتی: ئەی موحەممەد پەروەردگارت چ فەرمان وئامۆژگاریەكی كردی؟ فەرمووی: ((فەرمانی پێكردم بەپەنجا نوێژ لە هەموو شەو ڕۆژێكدا)) مووسا وتی: بەڕاستی گەلەكەت ناتوانن ئەوە بكەن،كەواتە بگەڕێرەوە باپەروەردگارت سووكی بكات لەسەر خۆت وگەلەكەت، پێغەمبەریش ﷺ لایەكی كردەوە بەلای جیبریل دا وەك بڵەی ڕاوێژی پێ بكات لەو بارەیەوە، جیبریلیش ﷺ ئاماژەی بۆكرد، بەڵێ باشە ئەگەر حەز دەكەیت وپێت خۆشە، ئینجا جیبریل ﷺ پێغەمبەری ﷺ بەرز كردەوە بۆلای خوای بەدەسەڵات وبەهێز جالەشوێنەكەی پێشووی دا بوو فەرمووی: ((ئەی پەروەردگارم لەسەرمان سووك كەچونكە بەڕاستی ئوممەتەكەم ناتوانن ئەو ئەركە ئەنجام بدەن)) خوداش دە نوێژی لەسەر لابرد پاشان گەڕایەوە بۆلای مووسا ﷺ ورایگرت جا ئیتر مووسا بەردەوام دەیگەڕاندەوە بۆلای پەروەردگاری هەتا بوو بە پێنج نوێژ، ئینجا مووسا پێغەمبەری ﷺ ڕاگرت لە پێنج نوێژەكەش دا، وتی: ئەی موحەممەد سوێند بەخوا دڵنیابە من گەلەكەم كەبەنی ئیسرائیلە كەبەكەمتر لەوە هەوڵم لەگەڵیان دا بەڵام نەیان توانی وازیان لێ هێنا، جاگەلەكەی تۆلاشەودڵ وبەدەن وچاو گوێیان لاوازترە، لەبەر ئەوە

(١) سەروی ئاسمانی حەوتەم.

**بگەڕێرەوە باپەروەردگارت سوکی کات لەسەرت، لە هەموو ئەم کارانەدا پێغەمبەر ﷺ لای دەکردەوە بەلای جیبریل ﷺ دا تاڕای خۆی پێ بلێ، جیبریلیش ﷺ ئەوەی لا ناپەسەند نەبوو بۆیە لەجاری پێنجەم دا بەرزی کردەوەو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی پەروەردگارم گەلەکەی من لاوازن لەروی لاشەو دڵ و گوێچکە و بەدەنیانەوە بۆیە سوکی کە لەسەرمان)) خوای بەدەسەڵاتیش فەرمووی: ئەی موحەممەد. ئەویش فەرمووی: ئامادەی فەرمانتم وئاسودەیی تۆ دەخوازم)) خوا فەرمووی: لەلایەن منەوە وتەی من گۆڕینی بۆ نییە وەك چۆن لەتۆمارو نوسراودا[1] فەرز کراوە لەسەرت (وەك خۆیەتی) فەرموو: هەموو چاکەیەك بە دە ڤاتی خۆیەتی. بۆیە نوێژەکان لە (**لوح المحفوظ)**دا پەنجایە کەلەسەر تۆ پێنجە، ئیتر گەڕایەوە بۆلای مووسا ﷺ وفەرمووی: چیت کرد؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (( (خوا) سووکی کرد لەسەرمان، بە هەرچاکەیەك دە بەرامبەری خۆی پێ داین)) مووسا ﷺ فەرمووی بەدڵنیاییەوە سوێند بەخوا من هەوڵم لەگەڵ بەنی ئیسرائیل دا لەسەر کەمتر لەوە بەڵام وازیان لێ هێناو نەیان کرد، بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت جارێکی تر، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (ئەی مووسا سوێند بەخوا ئەوەندە هاتوچۆی لای پەروەردگارم کرد شەرم دەکەم لە پەروەردگارم (بڕۆمەوە بۆلای)) ئیتر جیبریل ﷺ فەرمووی: ئیتر بەناوی خوا دابەزەرەوە بۆسەر زەوی، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خەبەری بویەوە[2] لەوکاتەدا لە مزگەوتی حەرام بوو.**

---

(١) مەبەستی (لوح المحفوظ)ـە.

(٢) دەشگونجێ بڵێین گەڕایەوە سەر حاڵەتە ئاسایی مرۆڤیەکەی جارانی.

## ٣٨- بابُ كَلاَمِ الرَّبِّ مَعَ أَهْلِ الجَنَّةِ

٧٥١٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ لأَهْلِ الجَنَّةِ يَا أَهْلَ الجَنَّةِ: فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ. فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَمَا لَنَا لاَ نَرْضَى يَا رَبِّ وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ. فَيَقُولُ: أَلاَ أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُونَ يَا رَبِّ، وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي، فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا»[1].

## ٣٨- باسی قسە کردنی پەروەردگار لەگەڵ خەڵکی بەهەشتدا

**٧٥١٨- ئەبو سەعید خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوای گەورە بە بەهەشتیەکان دەفەرموێ: ئەی بەهەشتیەکان، ئەوانیش دەڵێن فەرمان بەردارین پەروەردگارمان خۆشنوودی تۆ دەخوازین و هەموو چاکەیەك لە دەستی تۆ دایە، جا دەفەرموێ: ئایا ڕازی بوون؟ ئەوانیش دەڵێن: بۆچی ڕازی نابین ئەی پەروەردگارمان، لە کاتێکدا ئەوەی بە ئێمەت داوە بە هیچ کەس لە دروستکراوەکانی خۆتت نەداوە؟ ئەویش دەفەرموێ: ئایا لەوە گەورەترتان پێ ببەخشم؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگار چ شتێك لەمە چاکتر و گەورەترە؟ ئەویش دەفەرموێ: ڕەزامەندی خۆم دەبارێنم بەسەرتاندا، ئیتر پاش ئەوە هەرگیز لێتان تورە نابم)).**

٧٥١٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، حَدَّثَنَا هِلاَلٌ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَوْمًا يُحَدِّثُ، وَعِنْدَهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ البَادِيَةِ «أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ

---

(١) بڕوانە: ٦٥٤٩.

الجَنَّةِ اسْتَأْذَنَ رَبَّهُ فِي الزَّرْعِ فَقَالَ لَهُ: أَوَ لَسْتَ فِيمَا شِئْتَ؟ قَالَ: بَلَى، وَلَكِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَزْرَعَ. فَأَسْرَعَ وَبَذَرَ، فَتَبَادَرَ الطَّرْفَ نَبَاتُهُ وَاسْتِوَاؤُهُ وَاسْتِحْصَادُهُ وَتَكْوِيرُهُ أَمْثَالَ الجِبَالِ، فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: دُونَكَ يَا ابْنَ آدَمَ، فَإِنَّهُ لاَ يُشْبِعُكَ شَيْءٌ».فَقَالَ الأَعْرَابِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لاَ تَجِدُ هَذَا إِلاَّ قُرَشِيًّا أَوْ أَنْصَارِيًّا فَإِنَّهُمْ أَصْحَابُ زَرْعٍ، فَأَمَّا نَحْنُ فَلَسْنَا بِأَصْحَابِ زَرْعٍ. فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[1].

**٧٥١٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکیان قسەی دەکرد پیاوێکی دەشتەکیش لە خزمەتی دابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان پیاوێکی بەهەشتی مۆڵەتی لە پەروەردگاری خواست کە کشتووکاڵ بکات، پەروەردگاریش فەرمووی پێی: مەگەر تۆ لە ناو ئەوخۆشیانەدا نیت حەزت لێیەتی؟ پیاوەکە وتی: بەڵێ لە ناویدام، بەڵام من بۆ خۆم حەز دەکەم کشتووکاڵ بکەم، (خواش مۆڵەتیدا) جا بەپەلە تۆی وەشاند لە خێراتر لە چاو تروکانێکدا سەوز بوو بەرز بوو، کاتی دروێنەکردنی هات دانەوێڵەکە بەقەدەر شاخێك دەبوو، ئەنجا خوای بەرز و بڵند فەرمووی پێی: بگرە ئەی نەوەی ئادەم چونکە بەڕاستی هیچ شتێك تێرت ناکات))، عەرەبە دەشتەکیەکەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا هەبێ و نەبێ ئەوە پیاوە بەهەشتییە هەر کەسێکی قورەیشی یا ئەنصاری بووە، چونکە بەڕاستی هەر ئەوان خاوەن کشتووکاڵن، بەڵام ئێمە خاوەنی زەوی و کشتووکاڵ نین، پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی.**

(١) بڕوانە: ٢٣٤٨.

## ٣٩- بَابُ ذِكْرِ اللَّهِ بِالأَمْرِ وَذِكْرِ العِبَادِ بِالدُّعَاءِ وَالتَّضَرُّعِ وَالرِّسَالَةِ وَالإِبْلاَغِ

لِقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ ﴿١٥٢﴾ ﴾ البقرة، ﴿ ۞ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكُم مَّقَامِي وَتَذْكِيرِي بِآيَاتِ اللَّهِ فَعَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْتُ فَأَجْمِعُوا أَمْرَكُمْ وَشُرَكَاءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً ثُمَّ اقْضُوا إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ﴿٧١﴾ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾ يونس، ﴿ غُمَّةً ﴿٧١﴾ ﴾ يونس: هَمٌّ وَضِيقٌ. قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ اقْضُوا إِلَيَّ ﴿٧١﴾ ﴾ يونس. مَا فِي أَنْفُسِكُمْ، يُقَالُ: افْرُقِ: اقْضِ وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ﴿٦﴾ ﴾ التوبة. إِنْسَانٌ يَأْتِيهِ فَيَسْتَمِعُ مَا يَقُولُ وَمَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَهْوَ آمِنٌ حَتَّى يَأْتِيَهُ فَيَسْمَعَ كَلاَمَ اللَّهِ، وَحَتَّى يَبْلُغَ مَأْمَنَهُ حَيْثُ جَاءَهُ. ﴿ النَّبَإِ الْعَظِيمِ ﴿٢﴾ ﴾ النبأ: القُرْآنُ ﴿ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ﴾ النبأ. حَقًّا فِي الدُّنْيَا وَعَمَلٌ بِهِ

## ٣٩- باسی یادو باسی خوا (بۆ بەندەکانی) بەفەرمان پێکردن (بەگوێڕایەڵی) وە یادی بەندەکانیش (بۆخوا) بەدوعا و پاڕانەوە، وە (پابەندی بە) بەپەیامەکە و گەیاندنی دەبێت

**بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (کەواتە یادم بکەن تامنیش لەبیرتان نەکەم) ((ئەی موحەممەد ﷺ دەنگ و باس و هەواڵی نووحیان ﷺ بۆ**

**بخوێنەرەوە كاتێ بەگەلەكەی فەرمووः ئەی گەلەكەم ئەگەر بەلاتانەوە قورس و گرانە مانەوەم لە ناوتاندا و ئامۆژگاری كردنم (بۆتان) بەئایەتەكانی خوا، ئەوا من پشتم بە خوا بەستووە ئێوەش كار و بڕیاری خۆتان كۆكەنەوە لەگەڵ هاوبەشەكانتاندا، ئینجا با كار و بڕیارەكانتان شاراوە نەبێ بەلاتانەوە[1]، پاشان پەلامارم بدەن و ماوەم مەدەن. جا ئەگەر سەرپێچیتان كردم[2]، ئەوە من هیچ پاداشتێكم داوا نەكردوە لێتان، پاداشتی من هەر لەسەر خوایە، وە فەرمانم پێ دراوە كە لە فەرمان بەر و مسوڵمانان بم ). (بوخاری دەڵێ:)** ﴿ غُمَّةً ﴿٧١﴾ ﴾ یونس: **داخ و خەفەت و دڵگرانی.**

**موجاهید دەڵێ:** ﴿ ٱقْضُوٓاْ إِلَيَّ ﴿٧١﴾ ﴾: **ئەوەی لە دڵ و ناختان دایە، دەوترێ:** افْرُق[3]: **بڕیار بدە.**

**وە موجاهید دەڵێ:** ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴿٦﴾ ﴾ التوبة: **واتە: كەسێك (لە هاوبەشدانەران) دێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوێ دەگرێ لە وتەی خوا و ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزێنراوە، ئەو كەسە پارێزراوە هەتا دێتە لای (پێغەمبەر ﷺ) گوێ لە وتەی خوا بگرێ، وە هەتا دەگاتەوە شوێنی پارێزراوی خۆی لە كوێوە هاتووە (بگەڕێتەوە بۆی)** ﴿ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢﴾ ﴾ النبأ: **واتە: قورئان** ﴿ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ﴾ النبأ: **ڕاستیە لە دونیا و كاركردنە پێی.**

---

(١) بەڵكو ئاشكرا بێت.

(٢) واتە: پشتم تێ دەكەن.

(٣) وەک لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿ فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾ المائدە.

## ٤٠- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا ﴿٢٢﴾﴾ البقرة.

وَقَوْلِهِ: ﴿وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾﴾ فصلت، وَقَوْلِهِ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴿٦٨﴾﴾ الفرقان. وقوله: ﴿وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾﴾ الزمر. وَقَالَ عِكْرِمَةُ: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾﴾ يوسف. ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ ﴿٨٧﴾﴾ الزخرف، وَ﴿مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴿٣٨﴾﴾ الزمر. فَذَلِكَ إِيمَانُهُمْ، وَهُمْ يَعْبُدُونَ غَيْرَهُ.وَمَا ذُكِرَ فِي خَلْقِ أَفْعَالِ العِبَادِ وَأَكْسَابِهِمْ، لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾﴾ الفرقان. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: مَا تَنَزَّلُ المَلاَئِكَةُ إلاَّ بِالْحَقِّ: بِالرِّسَالَةِ وَالْعَذَابِ ﴿لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ﴿٨﴾﴾ الأحزاب. الْمُبَلِّغِينَ الْمُؤَدِّينَ مِنَ الرُّسُلِ، ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾﴾ الحجر. عِنْدَنَا ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ ﴿٣٣﴾﴾ الزمر. القرآن ﴿وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ﴿٣٣﴾﴾ الزمر. الْمُؤْمِنُ، يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: هَذَا الذِي أَعْطَيْتَنِي، عَمِلْتُ بِمَا فِيهِ.

## ٤٠- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (کەواتە هاوبەش بۆ خوا بڕیار مەدەن)

وە ئەم فەرمایشتەی خوایە ناوهێنانی گەورەیە: (وە هاوبەشانی بۆ دادەنێن هەر ئەو پەروەردگاری جیهانیانە)، وەئەم فەرمایشتەی خوا کە ناوی بەرز و

**گەورەیە: (وە کەسانێکن کە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن)، وەئەم فەرمایشتە: (سوێند بەخوا نیگا کراوە بۆ تۆ و پێغەمبەرانی پێش تۆش، ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێیت بێگومان کردەوەت هەڵدەوەشێتەوە و بێگومان لە زەرەر مەندان دەبیت، (وا مەکە) بەڵکو تەنها خودا بپەرستە وە لە سوپاسکاران بە).**

**-عیکریمە دەڵێ: (جا زۆربەیان باوەڕ ناهێنن بەخوا مەگەر ئەوان لەو کاتەدا هاوبەش دانەرن بۆ خوا) و (وە ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت کێ دروستی کردوون) و (سوێند بەخوا ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە، بێگومان دەڵێن: خوا)، ئەمە باوەڕیانە (بەخوا) لە هەمان کاتدا جگە لە خوا دەپەرستن.**

**وە باسی ئەوەی باس کراوە دەربارەی دروستکەری کردەوە و کۆششی بەندەکان بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە (خوا) هەموو شتێکی دروست کردوە، وە ئەندازەی بۆ دیاری کردوە[1] بەچاکی)**

**- موجاهید دەڵێ:** ﴿ مَا تَنَزَّلُ[2] ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٨﴾ ﴾ الحجر **(فریشتەکان تەنها) بە پەیام و سزا دادەبەزن[3]** ﴿ لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ﴿٨﴾ ﴾ الأحزاب: **ئەوانەی گەیەنەر و جێبەجێ کەری پەیامی خودان لە پێغەمبەران ﷺ** ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ یوسف: **ئێمە لە لایەن خۆمانەوە**

---

(١) لە هەموو ڕوویەکەوە.

(٢)سوورەتی (الحجر: ٨) حفص حمزة وخلف وكيسائی بە ﴿ مانُنَزِلُ ﴾ خوێندویانەتەوە، شوعبە بە ﴿ مانُنَزَّلُ ﴾ ئەوانی کەشیان بە ﴿ ماتَنَزَّلُ ﴾ خوێندویانەتەوە.

(٣) بەڵام ئەگەر ﴿ ننزلُ ﴾ بێت واتە دایان دەبەزێنین.

(دەیپارێزین) ﴿ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدۡقِ ﴿٣٣﴾ ﴾ الزمر: **واتە: قورئان** ﴿ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ﴿٣٣﴾ ﴾ الزمر: **باوەڕدارە، لە ڕۆژی قیامەت دا دەڵێ: ئەم قورئانەی پێت داوم ئەوەی تێیدایە کارم کردوە.**

٧٥٢٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهْوَ خَلَقَكَ».قُلْتُ إِنَّ ذَلِكَ لَعَظِيمٌ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخَافُ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ». قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ»[1].

**٧٥٢٠- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد کام تاوانە لای خوا گەورەترە؟ فەرمووی: ((ئەوەی کە هاوشێوە بۆ خوا دانێیت کە ئەو تۆی دروست کردوە))، وتم: بێگومان ئەو کارە گەورەیە، لە پاشان چی تر گەورەترە؟ فەرمووی: ((ئەوەی کە منداڵەکەت بکوژی بترسیت لەگەڵتدا نان بخوات))، وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی: ((ئەوەی کە زینا بکەیت لەگەڵ هاوسەر و حەلاڵی دراوسێکەتدا)).**

## ٤١- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَتِرُونَ أَن يَشۡهَدَ عَلَيۡكُمۡ سَمۡعُكُمۡ وَلَآ أَبۡصَٰرُكُمۡ وَلَا جُلُودُكُمۡ وَلَٰكِن ظَنَنتُمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعۡلَمُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ فصلت.

٧٥٢١- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اجْتَمَعَ عِنْدَ الْبَيْتِ ثَقَفِيَّانِ وَقُرَشِيٌّ -أَوْ قُرَشِيَّانِ وَثَقَفِيٌّ- كَثِيرَةٌ شَحْمُ بُطُونِهِمْ، قَلِيلَةٌ فِقْهُ قُلُوبِهِمْ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَتَرَوْنَ أَنَّ اللَّهَ يَسْمَعُ مَا نَقُولُ؟ قَالَ الآخَرُ:

---

(١) بڕوانە: ٤٤٧٧.

يَسْمَعُ إِنْ جَهَرْنَا، وَلاَ يَسْمَعُ إِنْ أَخْفَيْنَا. وَقَالَ الآخَرُ إِنْ كَانَ يَسْمَعُ إِذَا جَهَرْنَا فَإِنَّهُ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَـٰرُكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ فصلت، الآيَةَ[1].

## ٤١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند:

**(وە ئێوە خۆتان نەدەشاردەوە[2] لە شایەتی دانی گوێ و چاو پێستی لەشتان لە دژتان، بەڵکو وا گومانتان دەبرد کە خوا بەزۆرێك لەو کارانەی کە دەیکەن نازانێ)**

**٧٥٢١- ئەبو مەعمەر لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕایەوە و وتی: لە پەنا کەعبەدا دوو پیاوی سەقیفی و پیاوێکی قوڕەیشی - یان دوو پیاوی قوڕەیشی و پیاوێکی سەقیفی- کۆبوونەوە (پێکەوە دانیشتن) چەوری ناوسکیان زۆر بوو، بەڵام تێگەیشتنی دڵیان کەم بوو، جا یەکێکیان وتی: ئایا بەڕاستی ئێوە ڕاتان وایە ئەوەی دەیڵێین خوا دەیبیستێ؟ یەکێکی تریان وتی: ئەگەر دەنگ بەرزکەینەوە دەیبیستێ، بەڵام ئەگەر دەنگ نزم کەینەوە نایبیستێ، یەکێکی کەیان وتی: ئەگەر دەنگمان بەرزکەینەوە بیبیستێ، ئەوە دڵنیابن ئەگەر دەنگیشمان نزم کەینەوە هەر دەیبیستێ، بەو هۆیەوە خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وە ئێوە خۆتان نەدەشاردەوە لە شایەتی دانی گوێ و چاو و پێستی لەشتان لە دژتان)، تا کۆتایی ئایەتەکە.**

(١) بڕوانە: ٤٨٦١.
(٢) خۆتان نەدەپاراست لە گوناه و تاوان.

٤٢- بَابُ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾﴾ الرحمن وَ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ ﴿٢﴾﴾ الأنبياء. وَقَوْلِهِ تعالى: ﴿لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾﴾ الطلاق. وَأَنَّ حَدَثَهُ لاَ يُشْبِهُ حَدَثَ الْمَخْلُوقِينَ لِقَوْلِهِ تعالى: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى. وَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «إِنَّ اللَّهَ يُحْدِثُ مِنْ أَمْرِهِ مَا يَشَاءُ، وَإِنَّ مِمَّا أَحْدَثَ أَنْ لاَ تَكَلَّمُوا فِي الصَّلاَةِ»

## ٤٢- باسی ئەم فەرمايشتەی خوای بەرز و بڵند:

**(هەموو ڕۆژێك خوا لەكردنی كاردايە) وە (هەر پەيامێكی تازەيان لە پەروەردگاريانەوە بۆ بێت (كە قورئانە))، وە ئەم فەرمايشتەی خوای بەرز و بڵند: (لەوانەيە خوا دوای ئەوە كارێكی تر پێش بێنێ). وە بێگومان پێش هێنانی خوا لە پێش هێنانی دروست كراوەكان ناچێت، بەبەڵگەی ئەم فەرمايشتەی خوای بەرز و بڵند: (هيچ شتێك وەك وێنەی خوا نييە، وە ئەو بيسەری بينايە)**

**ئيبنو مەسعوود ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموويەتی: ((بێگومان لە كاری خۆيدا ئەوەی بيەوێ پێشی دێنێ و دەيكات، وە بەڕاستی يەكێك لەوانەی تازەيە و پێشی هێناوە، (ئەوەيە) كە نابێ لە ناو نوێژدا قسە بكەن)).**

٧٥٢٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ وَرْدَانَ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَيْفَ تَسْأَلُونَ أَهْلَ الْكِتَابِ عَنْ كُتُبِهِمْ وَعِنْدَكُمْ كِتَابُ اللَّهِ أَقْرَبُ الْكُتُبِ عَهْدًا بِاللَّهِ تَقْرَءُونَهُ مَحْضًا لَمْ يُشَبْ؟[1]

(١) بڕوانە: ٢٦٨٥.

**٧٥٢٢- عيكرمە لە ئيبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە وتی: چۆن ئێوە پرسيار لە خاوەن كتێبە ئاسمانيەكان دەكەن دەربارەی كتێبەكانيان، لە كاتێكدا ئێوە كتێبی خواتان لايە (كە قورئانە)، تازەترين كتێبە لە لايەن خواوە هاتبێ، بەپوختی و ساغی دەيخوێننەوە كە هيچی تێكەڵ نەبووە)).**

٧٥٢٣- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ قَالَ: يَا مَعْشَرَ المُسْلِمِينَ، كَيْفَ تَسْأَلُونَ أَهْلَ الكِتَابِ عَنْ شَيْءٍ وَكِتَابُكُمُ الذِي أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّكُمْ ﷺ أَحْدَثُ الأَخْبَارِ بِاللَّهِ مَحْضًا لَمْ يُشَبْ، وَقَدْ حَدَّثَكُمُ اللَّهُ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ بَدَّلُوا مِنْ كُتُبِ اللَّهِ وَغَيَّرُوا فَكَتَبُوا بِأَيْدِيهِمْ، قَالُوا: هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ. لِيَشْتَرُوا بِذَلِكَ ثَمَنًا قَلِيلاً، أَوَ لاَ يَنْهَاكُمْ مَا جَاءَكُمْ مِنَ العِلْمِ عَنْ مَسْأَلَتِهِمْ؟ فَلاَ وَاللَّهِ مَا رَأَيْنَا رَجُلاً مِنْهُمْ يَسْأَلُكُمْ عَنِ الذِي أُنْزِلَ عَلَيْكُمْ[1].

**٧٥٢٣- عوبەيدوڵلای كوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە كە عەبدوڵلای كوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەی پێڕی مسوڵمانان چۆن ئێوە پرسياری هيچ شتێك لە خاوەن كتێبەكان دەكەن لە كاتێكدا ئەو كتێبەی دابەزێنراوە بۆ پێغەمبەرەكەتان ﷺ تازەترين فەرمايشتەكانی خوايە، كە پوخت بێ و هيچی تێكەڵ نەكرابێ، وە بێگومان خوای گەورە بۆتانی باس كردوە كە خاوەن كتێبەكان كتێبەكانی خوايان گۆڕيوەو بەدەستی خۆيان نووسيويانەوە، وتوويانە: ئەمە لە لايەن خواوە هاتووە، بۆ ئەوە بەنرخێكی كەم بيفرۆشن و بيگۆڕنەوە، دەی ئايا ئەو زانست و زانيارييەی كە بۆتان هاتووە ڕێگريتان لێ ناكات لە پرسياركردنتان لێيان؟ ناوەڵلاهی يەك پياومان لێ نەديوون هەرگيز پرسيار لە ئێوە بكات دەربارەی ئەو كتێبەی بۆ ئێوە دابەزێنراوە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٦٨٥.

## ٤٣- بابُ قَوْلِ اللّٰهِ تعالى: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ ﴿١٦﴾ ﴾ القيامة

وَفِعْلِ النَّبِيِّ ﷺ حَيْثُ يُنْزَلُ عَلَيْهِ الوَحْيُ.

وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «قَالَ اللَّهُ تعالى: أَنَا مَعَ عَبْدِي إذا ذَكَرَنِي وَتَحَرَّكَتْ بِي شَفَتَاهُ».

## ٤٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (زمانت مەجوڵێنە بەخوێندنەوەی نیگا)، وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەیکرد کاتێ نیگای بۆ دابەزیایە

**-وە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوای بەرز و بڵند فەرموویەتی: من لەگەڵ بەندەی خۆم دام، لە هەر شوێنێکدا یادی کردم و لێوەکانی بەناوی من جوڵاند)).**

٧٥٢٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ ﴿١٦﴾ ﴾ القيامة. قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً، وَكَانَ يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ -فَقَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ: أُحَرِّكُهُمَا لَكَ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحَرِّكُهُمَا. فَقَالَ سَعِيدٌ: أَنَا أُحَرِّكُهُمَا كَمَا كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يُحَرِّكُهُمَا. فَحَرَّكَ شَفَتَيْهِ- فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾ القيامة. قَالَ: جَمْعُهُ فِي صَدْرِكَ، ثُمَّ تَقْرَؤُهُ. ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة. قَالَ: فَاسْتَمِعْ لَهُ وَأَنْصِتْ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا أَنْ تَقْرَأَهُ. قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ ﵇ اسْتَمَعَ، فَإِذَا انْطَلَقَ جِبْرِيلُ قَرَأَهُ النَّبِيُّ ﷺ كَمَا أَقْرَأَهُ[1].

(١) بڕوانە: ٥.

٧٥٢٤- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (زمانت مەجووڵێنە بە خوێندنەوەی نیگا) دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ بە دابەزینی قوڕئان (و لەبەرکردنی) زۆر نارەحەت دەبوو، بۆیە لێوەکانی بەپەلە دەجوڵاند، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس پێی وتم: منیش دەیانجووڵێنم بۆ تۆ، هەرچۆنێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەیجووڵاندن، جا سەعید وتی: منیش دەیانجووڵێنم بۆ تۆ، هەرچۆنێك ئیبنو عەبباس دەیجووڵاندن، جا سەعید لێوەکانی جوڵاند، خوا ﷻ ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾ القيامة، عەبدوڵڵا وتی: واتە: کۆکردنەوەی لە سنگتدا، پاشان دەیخوێنیتەوە ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة، وتی: واتە: گوێی بۆبگرە و بێدەنگ بە، پاشان لەسەر ئێمەیەکە: (پێت لەبەر بکەین و بیخوێنیتەوە، دەڵێ: ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ (دوای ئەو بەڵێنە) ئەگەر جیبریل ﷺ بهاتایە بۆلای گوێی بۆ دەگرت، کە جیبریل ﷺ دەڕۆیشت پێغەمبەر ﷺ قورئانەکەی دەخوێندەوە، بەو شێوەیەی جیبریل ﷺ پێی خوێندووە)).

## ٤٤- بابُ قَوْلِ اللّٰهِ تعالى: ﴿ وَأَسِرُّوا۟ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُوا۟ بِهِۦٓ ۖ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾ الملك

﴿ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ طه. يَتَسَارُّونَ.

٧٥٢٥- حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ، عَنْ هُشَيْمٍ أَخْبَرَنَا أَبُو بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾ ﴾ الإسراء

قَالَ: نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُخْتَفٍ بِمَكَّةَ، فَكَانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرْآنِ، فَإِذَا سَمِعَهُ الْمُشْرِكُونَ سَبُّوا الْقُرْآنَ وَمَنْ أَنْزَلَهُ وَمَنْ جَاءَ بِهِ، فَقَالَ اللَّهُ لِنَبِيِّهِ ﷺ: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ﴿١١٠﴾ ﴾ الإسراء. أَيْ: بِقِرَاءَتِكَ، فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ، فَيَسُبُّوا الْقُرْآنَ: ﴿ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾ ﴾ الإسراء: عَنْ أَصْحَابِكَ فَلاَ تُسْمِعُهُمْ ﴿ وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ ﴾ الإسراء[1].

## ٤٤- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئێوە قسەکانتان بەپەنهان بکەن یان بەئاشکرا (بۆ خوا یەکسانە، چونکە) دڵنیا بن ئەو (خودا) ئاگادارە بەخودی[2] دڵان، ئایا ئەو خودایەی کە ئادەمیزادی دروست کردوە ئاگای لە نهێنیان نییە. لە کاتێکدا کە ئەو وردبین و ئاگادارە)

﴿ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ طه: بەچپە و سرتە لە نێوان خۆیاندا قسە دەکەن.

٧٥٢٥- ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (لە نوێژکردنتدا دەنگ بەرز مەکەرەوە بەنهێنیش مەیکە)، دەڵێ: کاتێ دابەزی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەدا خۆی دەشاردەوە[3] کە پێشنوێژی بۆ هاوەڵانی دەکرد بە قورئان خوێندنەکەی دەنگی بەرز دەکردەوە، جا کە بتەپەرستان گوێیان لێی دەبوو جنێویان دەدا بەقورئان و ئەوەی دایبەزاندووە و ئەوەش هێناویەتی، بۆیە خواش فەرمووی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ (لە نوێژکردنتدا دەنگ بەرز مەکەرەوە) ،واتە: بەقورئان خوێندنت، چونکە هاوبەش دانەران گوێبیستی

---

(١) بڕوانە: ٤٧٢٢.

(٢) نهێنی دڵان.

(٣) لە سەرەتای ئیسلامدا.

**دەبن و جنێو دەدەن بەقورئان، (وە پەنهانیشی مەکە) لە هاوەڵەکانت کە لێت نەبیستن، (لەو نێوانەدا بەدوای ڕێگایەکدا بگەڕێ و بدۆزەرەوە).**

٧٥٢٦- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء، فِي الدُّعَاءِ[1].

**٧٥٢٦- عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەو ئایەتە (لە نزاکانتدا دەنگ بەرز مەکەرەوە و بە نهێنیش مەیکە)، دەربارەی دوعا و نزا دابەزی.**

٧٥٢٧- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ». وَزَادَ غَيْرُهُ: «يَجْهَرُ بِهِ»

**٧٥٢٧- ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە ئێمە نییە[2] ئەو کەسەی دەنگ خۆش و جوان نەکات بەقورئان خوێندن))، وە غەیری ئەبو هورەیرە (لە گێڕانەوەکەیدا ) ئەم زیادەی هێناوە: ((بەدەنگی بەرز بیخوێنێ)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٧٢٣.

(٢) واتە: لەسەر ڕێباز و سوننەتی ئێمە نییە.

## ٤٥- بابُ قَوْلِ النَّبيِّ ﷺ: «رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهْوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَرَجُلٌ يَقُولُ: لَوْ أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ هَذَا فَعَلْتُ كَمَا يَفْعَلُ»

فَبَيَّنَ اللَّهُ أَنَّ قِيَامَهُ بِالْكِتَابِ هُوَ فِعْلُهُ. وَقَالَ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ الروم، وَقَالَ:جَلَّ ذكرهُ ﴿ وَٱفْعَلُوا۟ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ ﴾ الحج

## ٤٥- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((پیاوێک خوا (شارەزایی) قورئانی پێ بەخشیووە، ئەویش کاتەکانی شەو ڕۆژ دەیخوێنێ، پیاوێکیش دەڵێ: ئەگەر وێنەی ئەوەی بەو کەسە دراوە بەمن بدرێ، ئەوەی ئەو دەیکات منیش دەمکرد))

**کەواتە خوا ڕوونی کردەوە کە خوێندنی قورئان [١] کار و کردەوەی قورئان خوێنەکەیە [٢]**

**وە خوا فەرمووی: (وە لە نیشانەکانی (دەسەڵاتی) ئەوە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی زمانتان و ڕەنگتان)، وە خوای بەگەورە ناوهێنراو دەفەرمووێ: (وە کاری چاك بکەن بۆ ئەوەی ڕزگاربن).**

---

(١) (قِيامُهُ بالقران) مەبەست پێی خوێندنی قورئانە، وەک لە گێڕانەوەیەکی تری صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە کوشمەیهنیی گێڕاویەتیەوە. (فتح الباري: ٦١٤/١٦). وە ئیمامی بوخاری دەڵێ: قورئان مەخلوق نییە: (من نقل عني أني قلتُ لفظي بالقرآن مخلوق فقد كذب) واتە: هەر کەس لە منەوە بیگێڕێتەوە کە من وتوومە خوێندنەوەی من بۆ قورئان مەخلوقە، ئەوە درۆی کردوە بەدەم منەوە. (فتح الباري:٦١٥/١٦)

(٢) لە گێڕانەوەیەکی بوخاری دەڵێ: کەواتە پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردەوە کە خوێندنەوەی قورئان کار و کردەوەی قورئان خوێنەکەیە. (فتح الباري:٦١٤/١٦)

**٧٥٢٨-** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَحَاسُدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهْوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، فَهْوَ يَقُولُ: لَوْ أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ هَذَا، لَفَعَلْتُ كَمَا يَفْعَلُ. وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَهْوَ يُنْفِقُهُ فِي حَقِّهِ فَيَقُولُ: لَوْ أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ عَمِلْتُ فِيهِ مِثْلَ مَا يَعْمَلُ»[1].

**٧٥٢٨-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((حەسوودی مەبەن لە دوو شتدا نەبێ: پیاوێك خوا فێری قورئانی كردوە جا ئەو كەسە لە كاتەكانی شەو و كاتەكانی ڕۆژدا دەوری دەكاتەوە، ئەو كەسەش بڵێ: كاشكێ ئەوەی بەفلانە كەس بەخشراوە بەمنیش ببەخشرایە، ئەوەی ئەو دەیكات دەربارەی قورئان منیش دەمكرد، پیاوێكیش خوا ماڵ و سامانێكی زۆری پێ بەخشیوە جا ئەو كەسە لە ڕێگەی هەقی خۆیدا بیبەخشێت، پیاوەكەش بڵێ: كاشكێ ئەوەی بەفلانە كەس بەخشراوە بەمنیش ببەخشرایە، جا ئەوەی ئەو دەیكات دەربارەی سامانەكەی منیش دەمكرد)).**

**٧٥٢٩-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهْوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَهْوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ». سَمِعْتُ سُفْيَانَ مِرَارًا لَمْ أَسْمَعْهُ يَذْكُرُ الْخَبَرَ، وَهْوَ مِنْ صَحِيحِ حَدِيثِهِ[2].

**٧٥٢٩- سالیم لە باوكیەوە (كە عەبدوڵلای كوڕی عومەرە) ﷺ گێڕایەوە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((حەسوودی دووست نییە لە دووشت دا نەبێ: پیاوێك خوا (شارەزایی) قورئانی پێ بەخشی بێت جا ئەو كەسە لە كاتەكانی شەو و كاتەكانی ڕۆژدا بیخوێنێ (و كاری پێ بكات)،**

---

(١) بڕوانە: ٥٠٢٥.

(٢) بڕوانە: ٥٠٢٥.

پیاوێکیش خوا ماڵ و سامانی پێ بەخشی بێت ئەو کەسەش لە کاتەکانی شەو ڕۆژدا دەیبەخشێت)).

(عەلی مەدینی دەڵێ:) چەندین جار ئەم فەرموویەم لە سوفیان بیستووە، لێم نەبیستووە بڵێ بیستوومە (لە زوهریەوە بەڵکو دەیوت زوهری وتی)، لەگەڵ ئەوەشدا لە فەرموودە ڕاست و دروستەکانی سوفیانە.

## ٤٦- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ﴿٦٧﴾ ﴾ المائدة

وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: مِنَ اللَّهِ الرِّسَالَةُ، وَعَلَى رَسُولِهِ البَلاَغُ، وَعَلَيْنَا التَّسْلِيمُ. وَقَالَ: ﴿ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمْ ﴿٢٨﴾ ﴾ الجن. وَقَالَ: ﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى ﴿٦٢﴾ ﴾ الأعراف. وَقَالَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ حِينَ تَخَلَّفَ عَنِ رسول ﷺ: ﴿ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ ﴿٩٤﴾ ﴾ التوبة[1]. وَقَالَتْ عَائِشَةُ: إِذَا أَعْجَبَكَ حُسْنُ عَمَلِ امْرِئٍ فَقُلِ: ﴿ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ ﴿١٠٥﴾ ﴾ التوبة. وَلاَ يَسْتَخِفَّنَّكَ أَحَدٌ. وَقَالَ مَعْمَرٌ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة. هُوَ هَذَا الْقُرْآنُ ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة. بَيَانٌ وَدِلاَلَةٌ كَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ ﴿١٠﴾ ﴾ الممتحنة. هَذَا حُكْمُ اللَّهِ ﴿ لَا رَيْبَ ۛ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة. لاَ شَكَّ ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ﴿٢﴾ ﴾ لقمان. يَعْنِي: هَذِهِ أَعْلاَمُ القُرْآنِ، وَمِثْلُهُ ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم ﴿٢٢﴾ ﴾ يونس. يَعْنِي: بِكُمْ. وَقَالَ أَنَسٌ ﷺ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ خَالَهُ حَرَامًا إِلَى قَوْمِهِ، وَقَالَ أَتُؤْمِنُونِي أُبَلِّغُ رِسَالَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَجَعَلَ يُحَدِّثُهُمْ[2].

---

(١) بڕوانە: ٤٦٧٧.

(٢) بڕوانە: ٤٠٩١.

## ٤٦- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیەنە (بەخەڵک) ئەوەی لە لایەن پەروەردگارتەوە هێنراوەتە خوارەوە بۆت، وە ئەگەر وانەکەی ئەوە ڕاسپێریەکانی[1] خوات ڕانەگەیاندووە و بەجێت نەهێناوە)

-زوهری دەڵێ: لە خواوە پەیام و لەسەر پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاندن و لەسەر ئێمەش گەردن کەچی، وە (زوهری) دەڵێ: (خوا دەفەرمووێ) (تابزانێ کە سروشتی پەروەردگاری خۆیان گەیاندووە)، وە دەفەرمووێ: ((پەیامەکانی پەروەردگارم ڕادەگەیەنم پێتان)).

-کەعبی کوڕی مالیك ﷺ کاتێ بەجێما لە پێغەمبەر ﷺ لە غەزای تەبووکدا خوا فەرمووی: (وە لە داهاتوودا خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ کردەوەکانتان دەبینن).

- عائیشە ﷺ دەڵێ: ئەگەر جوانی کردەوەی کەسێك سەرسامی کردی ئەوە بڵێ: (کردەوە بکە جا بێگومان خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ و باوەڕداران کردەوەکانتان دەبینن) و با کەس (بەکردەوەکانی) نەتخەڵەتێنێ

-مەعمەر دەڵێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة: ئەوە ئەم قورئانەیە. ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة: ڕوون کردنەوە و بەڵگەیە وەك ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند وایە: ﴿ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ﴿١٠﴾ ﴾[2] الممتحنة: ئەمە حوکم و بڕیاری

(١) ﴿ رِسَالَاتِهِ ﴾ (بە کۆ هێناویەتی هەندێ لە قورئان خوێنەکان وایان خوێندووەتەوە ئەوانی تر بە: ﴿ رِسَالَتَهُ ﴾ خوێندویانەتەوە.

(٢) (ذَٰلِكَ،ذَٰلِكُمْ )(هەردووکیان بۆ ئاماژەی دوور بەکاردەهێنرێن، بەڵام لەو دوو ئایەتەدا بۆ ئاماژەی نزیک بەکارهاتوون بۆیە بە هەردووکیان بە (هذا) مانا کردوە کە بۆ ئاماژەی نزیکە. إرشاد الساري:١٥/٥٠٧.

**خوايه.** ﴿ لَا رَيۡبَۛ ﴾ البقرة، **گومانى تێدا نييه.** ﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ﴾ لقمان، **واته: ئەمانه نيشانەكانى (ڕانوماى) قورئانن، ئەم ئايەتەش وێنەى ئەوه:** ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم ﴾ يونس، **واته: بەئێوه**

**ـئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەرامى خاڵى (ئەنەسى) نارد بۆ لاى هۆزەكەى وتى پێيان: پارێزراو دەبم له لايەن ئێوەوه تا پەيامى پێغەمبەرى خوا ﷺ ڕاگەيەنم (ئەوانيش دڵنيايان كرد)، ئينجا دەستى كرد به قسه كردن بۆيان.**

٧٥٣٠- حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ يَعْقُوبَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ الرَّقِّيُّ، حَدَّثَنَا المُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ الثَّقَفِيُّ، حَدَّثَنَا بَكْرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيُّ وَزِيَادُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ حَيَّةَ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ حَيَّةَ، قَالَ المُغِيرَةُ: أَخْبَرَنَا نَبِيُّنَا ﷺ عَنْ رِسَالَةِ رَبِّنَا «أَنَّهُ مَنْ قُتِلَ مِنَّا صَارَ إِلَى الجَنَّةِ»[١].

**٧٥٣٠-جوبەيرى كوڕى حەييه وتى موغيره وتى:[٢] پێغەمبەرەكەمان ﷺ هەواڵى پێداوين له پەيامەكەى پەروەردگارمانەوه(( كه هەر كەسێكمان بكوژرێت دەڕوات بۆ بەهەشت)).**

٧٥٣١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: مَنْ حَدَّثَكَ أَنَّ مُحَمَّدًا ﷺ كَتَمَ شَيْئًا.

وَقَالَ مُحَمَّدٌ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَنْ حَدَّثَكَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَتَمَ شَيْئًا مِنَ الْوَحْيِ فَلاَ تُصَدِّقْهُ، إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ ﴾ المائدة[٣].

---

(١) بڕوانه: ٣١٥٩.

(٢) وتى بەنوێنەرەكەى كيسرا.

(٣) بڕوانه: ٣٢٣٤.

**٧٥٣١- مەسروق لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: هەرکەس پێی وتی: کە موحەممەد ﷺ شتێکی (نیگای) شاردۆتەوە.**

**شەعبی لە مەسروقەوە گێڕایەوە ئەویش لە عائیشەوە ﷺ گێڕایەوە کە وتی: هەر کەس پێی وتی: پێغەمبەر ﷺ شتێکی لە نیگا شاردۆتەوە ئەوە باوەڕی پێ مەکە، بێگومان خوای بەرز و بڵند دەفەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بۆت دابەزێنراوە لە پەروەردگارتەوە ڕایگەیەنە (بەخەڵکی)، وە ئەگەر وا نەکەیت ئەوە ڕاسپێریەکەی خوات ڕانەگەیاندووە و بە جێت نەهێناوە).**

٧٥٣٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيد، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَكْبَرُ عِنْدَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَنْ تَدْعُوَ لِلَّهِ نِدًّا، وَهْوَ خَلَقَكَ». قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ، أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ». قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ».فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَصْدِيقَهَا: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ ﴿٦٩﴾ ﴾ الفرقان[1].

**٧٥٣٢- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ: کام تاوانە لای خوا گەورەترە؟ فەرمووی: ((ئەوەیە کە هاوشێوە بۆ خوا دانێیت کە ئەو (خوا) تۆی دروست کردوە))، وتی: لە پاشان چی تر (گەورترە)؟ فەرمووی: ((پاشان ئەوە کە منداڵەکەت بکوژیت (لە ترسی ئەوەی) کە لە گەڵتدا خواردن بخوات))، وتی: لە پاشان چی تر (گەورترە)؟ فەرمووی: ((ئەوەیە کە زینا بکەیت لەگەڵ هاوسەر و حەلاڵی دراوسێکەتدا)).**

(١) بڕوانە: ٤٤٧٧.

**ئیتر خوا پشت ڕاست کردنەوە بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزاند: (وە کەسانێکن کە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن، وە هیچ کەس ناکوژن کە خوا کوشتنی ئەوەی حەرام کردوە بەهەق و ڕەوا نەبێ، وە زینا ناکەن، وە هەر کەس ئەو تاوانانە بکات (کە باسکران) تووشی تۆڵە دێت سزای بۆ چەند بارە دەکرێتەوە).**

## ٤٧- بابُ ﴿ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾ آل عمران

وَقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «أُعْطِيَ أَهْلُ التَّوْرَاةِ التَّوْرَاةَ فَعَمِلُوا بِهَا، وَأُعْطِيَ أَهْلُ الإِنْجِيلِ الإِنْجِيلَ فَعَمِلُوا بِهِ، وَأُعْطِيتُمُ القُرْآنَ فَعَمِلْتُمْ بِهِ»[1]. وَقَالَ أَبُو رَزِينٍ: ﴿ يَتْلُونَهُۥ ﴿١٢١﴾ ﴾ البقرة، يَتَّبِعُونَهُ وَيَعْمَلُونَ بِهِ حَقَّ عَمَلِهِ. يُقَالُ: ﴿ يُتْلَىٰ ﴿١٢٧﴾ ﴾ النساء، يُقْرَأُ، حَسَنُ التِّلاَوَةِ: حَسَنُ القِرَاءَةِ لِلْقُرْآنِ. ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ ﴿٧٩﴾ ﴾ الواقعة. لاَ يَجِدُ طَعْمَهُ وَنَفْعَهُ إِلاَّ مَنْ آمَنَ بِالْقُرْآنِ، وَلاَ يَحْمِلُهُ بِحَقِّهِ إِلاَّ المُوقِنُ لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥﴾ ﴾ الجمعة،

وَسَمَّى النَّبِيُّ ﷺ الإِسْلاَمَ وَالإِيمَانَ عَمَلاً. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِبِلاَلٍ: «أَخْبِرْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الإِسْلاَمِ». قَالَ: مَا عَمِلْتُ عَمَلاً أَرْجَى عِنْدِي أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ إِلاَّ صَلَّيْتُ. وَسُئِلَ: أَيُّ العَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ، ثُمَّ الجِهَادُ، ثُمَّ حَجٌّ مَبْرُورٌ».

---

(١) بڕوانە: ٥٥٧.

## ٤٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بڵێ دەی تەورات بهێنن بیخوێننەوە[1])

وە باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((خەڵكی (خاوەنی) تەورات تەوراتیان پێدرا و كاریان پێ كرد، وە خەڵكی (خاوەنی) ئینجیل ئینجیلیان پێدرا و كاریان پێ كرد، ئێوەش قورئانتان پێ دراوە و كارتان پێ كرد)).

-ئەبو ڕەزین دەڵێ: ﴿ يَتْلُونَهُ ﴾: شوێنی دەكەون و كاری پێ دەكەن بەو شێوەی شیاوی كارپێ كردنیەتی، وە دەوترێ ﴿ يُتْلَىٰ ﴾ دەخوێنرێنەوە (حَسَنُ التِّلَاوَةِ) جوان خوێندنەوەی قورئان ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ ﴾ لەزەت و چێژ و سوودی قورئان هەست پێ ناكات، مەگەر كەسێك باوەڕی بە قورئان هێنابێت، وەكەس بەو شێوەی هەقیەتی هەڵی ناگرێ جگە لە باوەڕدارێكی دامەزراو، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (نموونەی بەسەرهاتی ئەوانەی كە تەوراتیان درا بەسەردا، لە پاشان هەڵیان نەگرت (ڕەفتاریان پێ نەكرد)، وەك گوێدرێژێكە كە كتێبێكی زۆر هەڵگرتبێ، ئای چەند خراپە نموونەی ئەو گەلەی كە نیشانەكانی خوایان بەدرۆزانی، وە خوا ڕێنموونی گەلی ستەمكاران ناكات).

-وە پێغەمبەر ﷺ ئیسلام و ئیمانی بەكردەوە ناو بردووە و ناوی ناوە.

-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە بیلالی ﷺ فەرموو: ((پێم بڵێ چ كردەوەیەكت كردوە لە ئیسلامدا زیاتر ئومێدت پێ ی بوو بێت؟)) (بیلال) وتی: هیچ كردەوەیەكم نەكردوە لە ئیسلامدا زۆر ئومێدم پێی بوو بێت لەوەی دەست نوێژم نەگرتووە، ئیللا بەو دەستنوێژەوە نوێژم كردوە.

---

(١) ئەگەر ڕاست دەكەن.

**وه پرسیارکرا (له پێغەمبەر ﷺ) کام کردەوەیە گەورەترە فەرمووی: ((باوەڕ بوون بەخوا و بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، پاشان خەبات و تێکۆشان، لە پاشان حەجێکی چاکی وەرگیراو[1])).**

٧٥٣٣- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي سَالِمٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا بَقَاؤُكُمْ فِيمَنْ سَلَفَ مِنَ الأُمَمِ كَمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْعَصْرِ إِلَى غُرُوبِ الشَّمْسِ، أُوتِيَ أَهْلُ التَّوْرَاةِ التَّوْرَاةَ فَعَمِلُوا بِهَا حَتَّى انْتَصَفَ النَّهَارُ، ثُمَّ عَجَزُوا فَأُعْطُوا قِيرَاطًا قِيرَاطًا، ثُمَّ أُوتِيَ أَهْلُ الإِنْجِيلِ الإِنْجِيلَ فَعَمِلُوا بِهِ حَتَّى صُلِّيَتِ الْعَصْرُ. ثُمَّ عَجَزُوا فَأُعْطُوا قِيرَاطًا قِيرَاطًا، ثُمَّ أُوتِيتُمُ الْقُرْآنَ فَعَمِلْتُمْ بِهِ حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَأُعْطِيتُمْ قِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ، فَقَالَ أَهْلُ الْكِتَابِ: هَؤُلاَءِ أَقَلُّ مِنَّا عَمَلاً وَأَكْثَرُ أَجْرًا. قَالَ اللَّهُ: هَلْ ظَلَمْتُكُمْ مِنْ حَقِّكُمْ شَيْئًا؟ قَالُوا: لاَ. قَالَ: فَهْوَ فَضْلِي أُوتِيهِ مَنْ أَشَاءُ»[2].

**٧٥٣٣- سالیم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما گێڕایەوە وتی: کە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرمووی: ((بێگومان مانەوەی ئێوە لە چاو مانەوەی ئەو گەلانەی لە پێش ئێوەدا بوون و تێپەڕین، وەك نێوان نوێژی عەسر تا خۆرئاوا بوونە، (جولەکەکانی) خاوەن تەورات تەوراتیان پێدرا، تا ڕۆژ نیوە بوو کاریان پێ کرد، پاشان نەیانتوانی بۆیە سەر و قیراتیان پێدرا، پاشان (گاورەکانی) خاوەن ئینجیل ئینجیلیان پێدرا، ئەوانیش تا نوێژی عەسر کرا کاریان پێکرد، پاشان نەیانتوانی، ئەوانیش هەرکەس و سەر و قیراتیان پێدرا، پاشان ئێوە قورئانتان پێدرا، تا خۆرئاوابوون کارتان پێکرد، هەر یەکەتان دوو قیرات دوو قیراتان پێدرا، جا نامەدارەکان وتیان: ئائەوانە لە ئێمە کاریان کەمتر کردوە و پاداشتیان**

(١) تاوانی تێکەڵ نەبوو بێت.

(٢) بڕوانە: ٥٥٧.

زۆرترە، خوا فەرمووی: ئایا لە مافەکەی خۆتان هیچ ستەمێکم لێ کردوون؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: دەی ئەوە بەهەرەی خۆمە بەکێم بوێ دەیدەم)).

## ٤٨- بابٌ: وَسَمَّى النَّبِيُّ ﷺ الصَّلَاةَ عَمَلاً

## وَقَالَ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ»[١].

٧٥٣٤- حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الوَلِيدِ. وَحَدَّثَنِي عَبَّادُ بْنُ يَعْقُوبَ الأَسَدِيُّ، أَخْبَرَنَا عَبَّادُ بْنُ العَوَّامِ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ، عَنِ الوَلِيدِ بْنِ العَيْزَارِ، عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ: أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «الصَّلَاةُ لِوَقْتِهَا، وَبِرُّ الوَالِدَيْنِ، ثُمَّ الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[٢].

## ٤٨- باسێک: پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەکردەوە ناو بردووە و فەرموویەتی: ((هەر کەس سورەتی فاتیحە نەخوێنێ نوێژەکەی دروست نییە))

7534-ئەبی عەمری شەیبانی لە ئیبنو مەسعوودەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد (وتی:) کام کردەوانە گەورەترە؟ فەرمووی: ((نوێژ لە کاتی خۆیدا و چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا، پاشان خەبات و تێکۆشان لە ڕێی خوادا)).

---

(١) بڕوانە: ٧٥٦.

(٢) بڕوانە: ٥٢٧.

## ٤٩- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾﴾ المعارج. ﴿هَلُوعًا ﴿١٩﴾﴾: ضَجوراً

٧٥٣٥- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنِ الحَسَنِ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ مَالٌ، فَأَعْطَى قَوْمًا وَمَنَعَ آخَرِينَ، فَبَلَغَهُ أَنَّهُمْ عَتَبُوا، فَقَالَ: «إِنِّي أُعْطِي الرَّجُلَ وَأَدَعُ الرَّجُلَ، وَالَّذِي أَدَعُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الذِي أُعْطِي، أُعْطِي أَقْوَامًا لِمَا فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الجَزَعِ وَالْهَلَعِ، وَأَكِلُ أَقْوَامًا إِلَى مَا جَعَلَ اللَّهُ فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الغِنَى وَالْخَيْرِ، مِنْهُمْ عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ».فَقَالَ عَمْرٌو: مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِكَلِمَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حُمْرَ النَّعَمِ[1].

## ٤٩- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێگومان ئادەمیزاد بە چاوچنۆکی وتەنگە تیلکە دروست کراوە کەناخۆشیەکی تووش ببێ هاوارو ناڵە دەست پێ دەکات کەسامانیش ڕوی تێبکات ئەیگرێتەوە لە خەڵکی) ﴿هَلُوعًا ﴿١٩﴾﴾: چاوبرسێتی و تەنگەتیلکە.

**٧٥٣٥- عەمری کوڕی تەغلیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەندێ ماڵ و سامانیان بۆ هێنرا، جا بەشی کەسانێکی دا و کەسانێکی بێبەش کرد، وە پێی گەشتەوە ئەوانەی (کە بەشی نەدابوون) گلێیان کردبوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دڵنیابن من ماڵ و سامان دەدەم بەکەسێك، کەسێکیش بێ بەش دەکەم، ئەو کەسەیان لام خۆشەویسترە کە بەشی نادەم لەوەیان کە بەشی دەدەم، بەشی کەسانێك دەدەم کە دڵیان دانەمەزراوە و هەڵپە هەڵپێتی، وەکەسانێکیش دەسپێرم بەو بێنیازی و چاکەی کە خوا لە دڵیاندا دروستی کردوە، لەوانە**

(١) بڕوانە: ٩٢٣.

عەمری کوڕی تەغلیبە))، عەمر دەڵێ: سوێند بەخوا حەز ناکەم لە جیاتی ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ وشتری سوورم ببێت (و پێم بدرێ).

## ٥٠- بابُ ذِكْرِ النَّبِيِّ ﷺ وَرِوَايَتِهِ عَنْ رَبِّهِ

٧٥٣٦- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، حَدَّثَنَا أَبُو زَيْدٍ سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ الهَرَوِيُّ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ قَالَ: «إِذَا تَقَرَّبَ العَبْدُ إِلَيَّ شِبْرًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِذَا تَقَرَّبَ مِنِّي ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وَإِذَا أَتَانِي مَشْيًا أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً».

## ٥٠- باسی باسکردن و گێڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە پەروەردگاریەوە

**٧٥٣٦- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەویش لە پەروەردگاریەوە دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر بەندە بستێ لە من نزیك بێتەوە، من گەزێك لە ئەو نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر بەندە گەزێك لە من نزیك بێتەوە، من دوو باڵ لە ئەو نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر ئەو بەئاسای بێت بۆ لام، من نیمچە ڕاکردنێك دەچم بۆ لای)).**

٧٥٣٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: رُبَّمَا ذَكَرَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَقَرَّبَ الْعَبْدُ مِنِّي شِبْرًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ ذِرَاعًا وَإِذَا تَقَرَّبَ مِنِّي ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا" أَوْ: بُوعًا [1]»[2]. وَقَالَ مُعْتَمِرٌ: سَمِعْتُ أَبِي، سَمِعْتُ أَنَسًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ ﷻ.

---

(١) (بَاعًا) یا (بُوعًا) هەردووکیان بەیەک مانا دێت کە: باڵێکە.

(٢) بڕوانە: ٧٤٠٥.

**٧٥٣٧- ئەنەسی كوڕی مالیك لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: هەندێ جار باسی پێغەمبەری ﷺ دەكرد- فەرموویەتی: (خوا دەفەرمووی): ((ئەگەر بەندەكەم بستێ لە من نزیك بێتەوە، من گەزێك لە ئەو نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر بەندەكەم باڵێك لە من نزیك بێتەوە، من دوو باڵ لە ئەو نزیك دەبمەوە))**

**-موعتەمیر دەڵێ: لە باوكم بیست وتی: لە ئەنەسم ﷺ بیست ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە لە پەروەردگاریەوە ﷻ گێڕایەوە.**

٧٥٣٨- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّكُمْ قَالَ: «لِكُلِّ عَمَلٍ كَفَّارَةٌ، وَالصَّوْمُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَلَخَلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ المِسْكِ»[1].

**٧٥٣٨-ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پەروەردگاریەوە دەیگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((بۆ هەموو كردەوەیەك[2] كەفارەتێك هەیە، ڕۆژوو بۆ منە هەر منیش پاداشتەكەی دەدەمەوە، وە بەڕاستی بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە)).**

٧٥٣٩- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ. وَقَالَ لِي خَلِيفَةُ حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي العَالِيَةِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِيمَا يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ قَالَ: «لاَ يَنْبَغِي لِعَبْدٍ أَنْ يَقُولَ إِنَّهُ خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى».وَنَسَبَهُ إِلَى أَبِيهِ[3].

(١) بڕوانە: ١٨٩٤.
(٢) كەتاوان بێت.
(٣) بڕوانە: ٥٣.

**٧٥٣٩- ئەبو لعالیە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەویش لەو فەرمودانەیە لە پەروەردگاریەوە دەیگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((هیچ کەسێك بۆی نییە کە بڵێت: ئەو [1] لە یونسی کوڕی مەتتا چاکترە))، یونسی پاڵ دایە لای باوکی (کە مەتتایە).**

٧٥٤٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي سُرَيْجٍ، أَخْبَرَنَا شَبَابَةُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الفَتْحِ عَلَى نَاقَةٍ لَهُ يَقْرَأُ سُورَةَ الفَتْحِ، أَوْ مِنْ سُورَةِ الفَتْحِ قَالَ: -فَرَجَّعَ فِيهَا- قَالَ: ثُمَّ قَرَأَ مُعَاوِيَةُ يَحْكِي قِرَاءَةَ ابْنِ مُغَفَّلٍ وَقَالَ: «لَوْلاَ أَنْ يَجْتَمِعَ النَّاسُ عَلَيْكُمْ لَرَجَّعْتُ كَمَا رَجَّعَ ابْنُ مُغَفَّلٍ. يَحْكِي النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ لِمُعَاوِيَةَ: كَيْفَ كَانَ تَرْجِيعُهُ؟ قَالَ: "آآ آ" ثَلاَثَ مَرَّاتٍ[2].

**٧٥٤٠- شوعبە لە موعاویەی کوڕی قورەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عەبدوڵلای کوڕی موغەففەلی موزەنییەوە ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەری خوام ﷺ دی بەسواری وشترەکەیەوە سوڕەتی فەتحی -یان لە سوڕەتی فەتحی- دەخوێند، دەڵێ: لە خوێندنەکەیدا دەنگی بۆ دەلەراندەوە، (شوعبە) دەڵێ: پاشان موعاویە خوێندی و لاسایی خوێندنەوەکەی ئیبنو موغەففەلی دەکردەوە، وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە خەڵکتان لێ کۆدەبێتەوە، دەنگم دەلەراندەوە بەو شێوەی ئیبنوموغەففەل دەنگی پێ لەراندەوە کە لاسایی پێغەمبەری ﷺ دەکردەوە (لە لەراندنەوەکەی دا)، ئینجا (شوعبە دەڵێ) وتم بەموعاویە: لەرانەوەکەی چۆن بوو؟ سێ جار وتی: ئا ئا ئا.**

---

(١) قسەکەرەکە خۆی یان پێغەمبەرمان ﷺ.

(٢) بڕوانە: ٤٢٨١.

## ٥١- بابُ مَا يَجُوزُ مِنْ تَفْسِيرِ التَّوْرَاةِ وَغَيْرِهَا مِنْ كُتُبِ اللَّهِ بِالْعَرَبِيَّةِ وَغَيْرِهَا

لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾ آل عمران.

٧٥٤١- وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَخْبَرَنِي أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ أَنَّ هِرَقْلَ دَعَا تَرْجُمَانَهُ، ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَرَأَهُ: «بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى هِرَقْلَ، وَ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ﴿٦٤﴾ ﴾ الآيَةَ. آل عمران[1].

## ٥١- باسی ئەوەی کە دروستە لە ڕاڤەی تەورات و کتێبەکانی تری خودا بەعەرەبی و زمانەکانی تر بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دەی تەورات بهێنن و بیخوێننەوە ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن)

**٧٥٤١- ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب بۆی گێڕامەوە کە هیرەقل وەرگێڕەکەی بانگ کرد، پاشان داوای نامەکەی پێغەمبەری ﷺ کرد، ئەوەیش خوێندیەوە: (بەناوی خوای بەخشندەوەی میهرەبان لە موحەممەدی بەندە و پێغەمبەری ﷺ خواوە بۆ هیرەقل، وە (ئەی خاوەن نامەکان وەرن بۆلای وتەیەکی ڕاست و (یەکسان) لە نێوان من و ئێوەدا)، تاکۆتایی ئایەتەکەی.**

٧٥٤٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الكِتَابِ يَقْرَءُونَ التَّوْرَاةَ

(١) بڕوانە: ٧.

بِالْعِبْرَانِيَّةِ، وَيُفَسِّرُونَهَا بِالْعَرَبِيَّةِ لأَهْلِ الإِسْلاَمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "لاَ تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ، وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ وَقولوا: ﴿ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ ﴿١٣٦﴾ ﴾ البقرة[1].

**٧٥٤٢-ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێشتر نامەدارەکان (جووەکان) تەوراتیان بەعیبری[2] دەخوێندەوە و بەعەرەبی ڕاڤەیان دەکرد بۆمسوڵمانان، ئەنجا پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((باوەڕ بەنامەدارەکان مەکەن و بە درۆشیان مەخەنەوە[3] (بەڵکو) بڵێن: ((مسوڵمانان) بڕوامان هێناوە بە خوا و بەو قورئانەی کە نێردراوەتە خوارەوە)).**

٧٥٤٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِرَجُلٍ وَامْرَأَةٍ مِنَ اليَهُودِ قَدْ زَنَيَا، فَقَالَ لِلْيَهُودِ: «مَا تَصْنَعُونَ بِهِمَا؟». قَالُوا: نُسَخِّمُ وُجُوهَهُمَا وَنُخْزِيهِمَا. قَالَ: ﴿ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾ آل عمران. فَجَاءُوا فَقَالُوا لِرَجُلٍ مِمَّنْ يَرْضَوْنَ: يَا أَعْوَرُ اقْرَأْ. فَقَرَأَ حَتَّى انْتَهَى عَلَى مَوْضِعٍ مِنْهَا فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهِ، قَالَ: «ارْفَعْ يَدَكَ». فَرَفَعَ يَدَهُ، فَإِذَا فِيهِ آيَةُ الرَّجْمِ تَلُوحُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ عَلَيْهِمَا الرَّجْمَ. وَلَكِنَّا نُكَاتِمُهُ بَيْنَنَا. فَأَمَرَ بِهِمَا فَرُجِمَا، فَرَأَيْتُهُ يُجَانِئُ عَلَيْهَا الحِجَارَةَ[4].

**٧٥٤٣- نافیع لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاو و ژنێکی جوولەکە کە زینایان کردبوو[5] هێنران بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا فەرمووی بەجولەکەکان ((ئێوە هەردووکیان چی لێ دەکەن؟)) وتیان: دەم و چاویان ڕەش**

---

(١) بڕوانە: ٤٤٨٥.
(٢) کە زمانی جووەکانە.
(٣) بە ناڕاستیان مەزانن یا بە درۆزنیان دامەنێن.
(٤) بڕوانە: ١٣٢٩.
(٥) لەگەڵ یەکتر زینایان کردبوو.

دەكەین و ڕسوایان دەكەین[١]، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی پێیان: (دەی تەورات بهێنن و بیخوێننەوە ئەگەر ڕاست دەكەن)، ئینجا هێنایان وتیان بە پیاوێ[٢] لەو كەسانە بوو كە خۆیان ڕازی بوون پێی:ئەی ئەعور بخوێنە، ئەویش خوێندی هەتا گەیشتە جێگایەك تیایدا و دەستی خستە سەری[٣]، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((دەست بەرز كەرەوە و لایبە))، ئەویش دەستی بەرز كردەوە، دەبینن ئایەتی بەردباران كردنەكە دەركەوت، (جا كابرا) وتی: ئەی موحەممەد ﷺ بێگومان بەرد باران كردنیان لەسەرە، بەڵام ئێمە لە نێوان خۆماندا دەمان شاردەوە، ئینجا فەرمانیان كرد بەبەردباران كردنیان و بەردباران كران،جا پیاوە (زیناكەرە) كەم دی خۆی دەدا بەسەر ژنەكەدا لە بەردەكان دەیپاراست.

## ٥٢- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ الكِرَامِ البَرَرَةِ» وَزَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُم"

٧٥٤٤- حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ»[٤].

## ٥٢- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((ئەو كەسەی قورئانی لەبەرە و چاک دەیخوێنێتەوە، لەگەڵ

(١) سواری گوێدرێژێكیان دەكەین بەپێچەوانەوە (پشتیان لە یەكترەوە بێت) و بەبازاڕدا دەیان گێڕین.
(٢) كە ناوی عەبدوڵڵای كوڕی صوریای ئەعور بووە، كە جوولەكە بوو.
(٣) سەر ئایەتی بەردباران كردنەكە.
(٤) بڕوانە: ٥٠٢٣.

## فریشتە ڕێزگیراو چاکەکاران دایە[1]))، وە ((قورئان برازێننەوە بەدەنگ و ئاوازی خۆشتان))

**٧٥٤٤- ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو دەڵێ: لە پێغەمەری خوام ﷺ بیست فەرمووی: ((خوا بۆ هیچ شتێك گوێی نەگرتووە، ئەوەندەی گوێی بۆ پێغەمبەرێك گرتووە قورئان بەدەنگی بەرز و خۆش بخوێنێ)).**

٧٥٤٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدُ بْنُ المُسَيَّبِ، وَعَلْقَمَةُ بْنُ وَقَّاصٍ، وَعُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا- وَكُلٌّ حَدَّثَنِي طَائِفَةً مِنَ الحَدِيثِ، قَالَتْ: فَاضْطَجَعْتُ عَلَى فِرَاشِي، وَأَنَا حِينَئِذٍ أَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ يُبَرِّئُنِي، وَلَكِنْ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَنَّ اللَّهَ يُنْزِلُ فِي شَأْنِي وَحْيًا يُتْلَى، وَلَشَأْنِي فِي نَفْسِي كَانَ أَحْقَرَ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى، وَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ ﴿١١﴾﴾ النور. العَشْرَ الآيَاتِ كُلَّهَا[2].

**٧٥٤٥- ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە هەر یەك لە عوروەی کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی موسەییەب و عەلقەمەی کوڕی وەققاص و عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵام بیست، دەربارەی باسەکەی عائیشە ﵂ کاتێ بوهتان چییەکان ئەوەی پێیان وت وتیان، هەر یەك لەو کەسانە بەشێك لە فەرموودەکەی بۆ گێڕامەوە، عائیشە ﵂ وتی: منیش لەسەر پێخەفەکەم ڕاکشام، وە من لەو کاتەدا دەمزانی کە من بەریی و بێ تاوانم، وە دڵنیابووم خوا بەریبوون ڕوون کاتەوە، بەڵام وەڵڵاهی من گومانم نەدەبرد کە خوا دەربارەم نیگا دابەزێنێ بخوێنرێتەوە، وە**

(١) لە ڕۆژی دوایدا.
(٢) بڕوانە: ٢٥٩٣.

**من له ناخمدا خۆم لەوە بەکەمتر دەزانی کە خوای گەورە دەربارەم هیچ بڕیارێك بفەرمووی بخوێنرێتەوە، جا خوا ﷻ: (بێگومان کەسانێك کە ئەو بوهتانەیان (بۆ عائیشە) هەڵبەست)، دە ئایەتەکەی هەمووی دابەزاند.**

٧٥٤٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، أُرَاهُ عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْعِشَاءِ: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ ۝١﴾ التين. فَمَا سَمِعْتُ أَحَدًا أَحْسَنَ صَوْتًا أَوْ قِرَاءَةً مِنْهُ[1].

**٧٥٤٦- عەدی کوڕی سابیت وا گومان دەبەم لە بەڕائەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست لە نوێژی عیشادا: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ ۝١﴾ التين، ی دەخوێند، وە گوێم لە کەس نەبووە ئەوەندەی ئەو دەنگی خۆش بێت، یا قورئان خوێندنی خۆش بێت.**

٧٥٤٧- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ مُتَوَارِيًا بِمَكَّةَ، وَكَانَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ، فَإِذَا سَمِعَ الْمُشْرِكُونَ سَبُّوا الْقُرْآنَ وَمَنْ جَاءَ بِهِ، فَقَالَ اللَّهُ ﷻ لِنَبِيِّهِ ﷺ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ۝١١٠﴾ الإسراء[2].

**٧٥٤٧- ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مەککەدا خۆی شاردبۆوە[3] (کە پێشنوێژی بۆ هاوەڵانی دەکرد بەقورئان خوێندنەکەی) دەنگی بەرزدەکردەوە، جا کە بتەپەرستان گوێیان لێی دەبوو جنێویان دەدا بە قورئان و ئەوەش هێناویەتی، بۆیە خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی فەرموو: (لە نوێژکردنتدا دەنگ بەرز مەکەرەوە و بە نهێنیش مەیکە).**

---

(١) بڕوانە: ٧٦٧.

(٢) بڕوانە: ٤٧٢٢.

(٣) لەسەرەتای ئیسلام دا.

٧٥٤٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ ﷺ، قَالَ لَهُ: «إِنِّي أَرَاكَ تُحِبُّ الغَنَمَ وَالْبَادِيَةَ، فَإِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْ بَادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ لِلصَّلاَةِ فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ، فَإِنَّهُ لاَ يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ المُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلاَ إِنْسٌ وَلاَ شَيْءٌ، إِلاَّ شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[١].

**٧٥٤٨- عەبدوڵڵای كوڕی عەبدوڕەحمانی كوڕی صەعصەعەی لە باوكیەوە گێڕایەوە كە بۆی گێڕاوەتەوە كە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ پێی وتووە: ((بەڕاستی من دەتبینم حەزت لە مەڕ و ماڵات و دەشت و چۆڵەوانیە، جا كاتێ لە ناو مەڕ و ماڵاتەكەدا بوویت یا لە دەشت و چۆڵەوانیەكەتدا بوویت و بانگتدا بۆ نوێژ، ئەوە بەو بانگدانە دەنگت بەرزبكەرەوە، چونكە بێگومان هیچ جنۆكە و مرۆڤ و شتێك نییە كە گوێی لە دەنگی بانگبێژ بێت، ئیللا لە ڕۆژی دوایدا شایەتی بۆ دەدات))، ئەبو سەعید وتی: ئەمەم لە پێغەمبەری خواوە بیستوە ﷺ.**

٧٥٤٩- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَرَأْسُهُ فِي حَجْرِي وَأَنَا حَائِضٌ[٢].

**٧٥٤٩- - عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەری لە كۆشمدا بوو قورئانی دەخوێند لە كاتێكدا من لە حەیزدا بووم.**

## ٥٣- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿فَٱقْرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ٢٠﴾ المزمل

٧٥٥٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ المِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدٍ القَارِيَّ حَدَّثَاهُ أَنَّهُمَا سَمِعَا عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ

(١) بڕوانە: ٦٠٩.
(٢) بڕوانە: ٢٩٧.

يَقُولُ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمٍ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاسْتَمَعْتُ لِقِرَاءَتِهِ، فَإِذَا هُوَ يَقْرَأُ عَلَى حُرُوفٍ كَثِيرَةٍ لَمْ يُقْرِئْنِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكِدْتُ أُسَاوِرُهُ فِي الصَّلاَةِ، فَتَصَبَّرْتُ حَتَّى سَلَّمَ، فَلَبَبْتُهُ بِرِدَائِهِ، فَقُلْتُ: مَنْ أَقْرَأَكَ هَذِهِ السُّورَةَ الَتِي سَمِعْتُكَ تَقْرَأُ؟ قَالَ: أَقْرَأَنِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. فَقُلْتُ: كَذَبْتَ، أَقْرَأَنِيهَا عَلَى غَيْرِ مَا قَرَأْتَ. فَانْطَلَقْتُ بِهِ أَقُودُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى حُرُوفٍ لَمْ تُقْرِئْنِيهَا. فَقَالَ: «أَرْسِلْهُ، اقْرَأْ يَا هِشَامُ». فَقَرَأَ الْقِرَاءَةَ الَّتِي سَمِعْتُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَذَلِكَ أُنْزِلَتْ».، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَأْ يَا عُمَرُ». فَقَرَأْتُ الَّتِي أَقْرَأَنِي، فَقَالَ: «كَذَلِكَ أُنْزِلَتْ، إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ»[١].

## ٥٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئینجا ئەوەندە لە قورئان بخوێنن کە بۆتان ئاسانە)

**٧٥٥٠- ئیبنو شیهاب دەڵێ: عوروەو بۆی گێڕامەوە کە میسوەری کوڕی مەخرەمە و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدولقاری بۆیان گێڕایەوە، کە هەردووکیان لە عومەری کوڕی خەتتابیان ﷺ بیست دەیوت: لە هیشامی کوڕی حەکیمم بیست ﷺ لە ژیانی پێغەمبەری خوادا سوڕەتی فورقانی دەخوێند، منیش گوێم گرت بۆ قورئان خوێندنەکەی، جا دەبینم ئەو بە چەند شێوەیەك دەیخوێنێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوە بەمنی نەخوێندبوو، بۆیە خەریك بوو لە نوێژەکەدا پەلاماری بدەم[٢]، بەڵام زۆر لە خۆم کرد دانم بەخۆمدا گرت تا سەلامی دایەوە (لە نوێژەکە)، ئینجا یەخەی جلەکانیم گرت وتم: کێ ئەم سوڕەتەی پێ خوێندووی بەو شێوەی کە من گوێم لێ بوو دەتخوێند؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خوێندووم، وتم: درۆ دەکەیت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەمنی خوێندووە جیاواز لەوەی تۆ**

---

(١) بڕوانە: ٢٤١٩.

(٢) سەری بگرم.

خوێندت، ئینجا دامەبەر و بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا و ﷺ وتم: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) من گوێم لەم (پیاو)ە بوو سورەتی فورقانی دەخوێند بە شێوەیەك كە جەنابت بەو شێوازە بە منت نەخوێندووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەرەڵای كە، ئەی هیشام بیخوێنە))، هیشامیش بەو شێوەی كە من گوێ بیستی بووم خوێندی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئا بەو جۆرە دابەزێنراوە))، لە پاشان فەرمووی: ((ئەی عومەر بیخوێنە)) منیش بەو شێوەی كە خۆی پێی خوێندووم خوێندم، جا فەرمووی: ((ئا بەو جۆرە دابەزێنراوە، بێگومان ئەم قورئانە لەسەر حەوت شێوە (خوێندەوە) دابەزێنراوە، بۆیە بەكام لەو حەوتە ئاسانە (بۆتان) بیخوێنن)).

**٥٤- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾﴾ القمر**

وَقَالَ ﷺ «كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ». يُقَالُ: مُيَسَّرٌ مُهَيَّأٌ.وقال مجاهد: (يَسَّرْنا القرآنَ) بِلِسانكَ هَوَّنَّا قِراءَتَهُ عليك. وَقَالَ مَطَرٌ الوَرَّاقُ: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾﴾ القمر. قَالَ: هَلْ مِنْ طَالِبِ عِلْمٍ فَيُعَانَ عَلَيْهِ.

## ٥٤- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە قورئانمان ئاسان كردوە بۆ ئامۆژگاری لێ وەرگرتن جا ئایە پەند وەرگرێك هەیە؟)

-وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەموو (كەسێك) ئامادەكراوە بۆ ئەوەی بۆی دروست كراوە)) دەوترێت: (مُيَسَّرٌ): ئامادەكراو.

موجاهید دەڵێ: ﴿يَسَّرْنا القرآنَ﴾ خوێندنەوەی قورئانمان ئاسان كردوە بۆت.

- (مەتەڕو لوەڕراق) دەڵێ: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ القمر: ئایا قوتابییەکی زانست خواز هەیە بۆ ئەوەی یارمەتی بدرێت لەسەری.

٧٥٥١- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، قَالَ يَزِيدُ: حَدَّثَنِي مُطَرِّفُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ عِمْرَانَ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فِيمَا يَعْمَلُ العَامِلُونَ؟ قَالَ: «كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ»[1].

**٧٥٥١- موتەڕیفی کوڕی عەبدوڵلا لە عیمرانەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەواتە ئەوانەی کار دەکەن لەبەر چی کار بکەن؟ فەرمووی: ((هەر کەسێك ئامادە کراوە بۆ ئەوەی بۆی دروست کراوە)).**

٧٥٥٢- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مَنْصُورٍ وَالأَعْمَشِ سَمِعَا سَعْدَ بْنَ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ فِي جِنَازَةٍ فَأَخَذَ عُودًا، فَجَعَلَ يَنْكُتُ فِي الأَرْضِ فَقَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ أَوْ مِنَ الجَنَّةِ». قَالُوا: أَلاَ نَتَّكِلُ؟ قَالَ: «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ ﴾ الآيَةَ. الليل[2].

**٧٥٥٢- ئەبو عەبدوڕەحمان لە عەلییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە ئەو (پێغەمبەر ﷺ لە (سەر قەبرانی) مردوویەکدا بوو، چیلکەدارێکی گرت بەدەستیەوە زەوییەکەی پێ دەکۆڵی، ئەنجا فەرمووی: ((هەر کەس لە ئێوە شوێنەکەی لە دۆزەخدا یان لە بەهەشتدا نوسراوە))، هاوەڵانیش وتیان: دەی بۆچی پشت بەو (نووسینە) نەبەستین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەوڵبدەن و کار بکەن هەموو کەسێ ئامادە کراوە (بۆ ئەوەی بۆی دروست**

(١) بڕوانە: ٦٥٩٦.

(٢) بڕوانە: ١٣٦٢.

کراوە)، (جائەم ئایەتانەی خوێندەوە) (ئینجا ئەو کەسەی (ماڵ و سامان) ببەخشێ و لە خوا بترسێ و پارێزگار بێت)، تا کۆتایی ئایەتە.

## ٥٥- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ البروج

﴿ وَالطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَابٍ مَّسْطُورٍ ﴿٢﴾ ﴾ الطور. قَالَ قَتَادَةُ: ﴿ مَّسْطُورٍ ﴿٢﴾ ﴾ مَكْتُوبٌ، ﴿ يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ ﴾ القلم:

يخطون ﴿ فِي أُمِّ الْكِتَابِ ﴿٤﴾ ﴾ الزخرف، جُمْلَةِ الكِتَابِ وَأَصْلِهِ، ﴿ مَّا يَلْفِظُ ﴿١٨﴾ ﴾ ق. مَا يَتَكَلَّمُ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ كُتِبَ عَلَيْهِ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: يُكْتَبُ الْخَيْرُ وَالشَّرُّ. ﴿ يُحَرِّفُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾ النساء. يُزِيلُونَ، وَلَيْسَ أَحَدٌ يُزِيلُ لَفْظَ كِتَابٍ مِنْ كُتُبِ اللَّهِ، وَلَكِنَّهُمْ يُحَرِّفُونَهُ يَتَأَوَّلُونَهُ عَلَى غَيْرِ تَأْوِيلِهِ، دِرَاسَتُهُمْ: تِلاَوَتُهُمْ. ﴿ وَاعِيَةٌ ﴿١٢﴾ ﴾ الحاقة. حَافِظَةٌ، وَتَعِيَهَا: تَحْفَظُهَا. ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِ ﴿١٩﴾ ﴾ الأنعام. يَعْنِي: أَهْلَ مَكَّةَ ﴿ وَمَنْ بَلَغَ ﴿١٩﴾ ﴾ الأنعام: هَذَا الْقُرْآنُ فَهُوَ لَهُ نَذِيرٌ.

## ٥٥- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بەڵکو ئەوە (ی کەبەدرۆی دەزانن) قورئانێکی گەورە و بەڕێزە، لە لەوحێکی پارێزراو دایە)، (سوێند بەکێوی توور، وە بەکتێبی نووسراو)

قەتادە دەڵێ: ﴿ مَّسْطُورٍ ﴿٢﴾ ﴾ الطور: نووسراو ﴿ يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ ﴾ القلم: دەینووسن ﴿ فِي أُمِّ الْكِتَابِ ﴿٤﴾ ﴾ الزخرف: تێکڕای کتێبەکە و ئەسڵیەکەی ﴿ مَّا يَلْفِظُ ﴿١٨﴾ ﴾ ق: هەر قسەیەك بکات لەسەری دەنووسرێت.

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ مَّا يَلْفِظُ ﴿١٨﴾ ﴾ ق: چاكە و خراپە هەمووی دەنووسرێت ﴿ يُحَرِّفُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾ النساء: لای دەبەن، هیچ كەس نییە بتوانێت وشەیەك لە كتێبێك لە كتێبەكانی خوای گەورە و بەشكۆ لاببات، بەڵام تەحریفی دەكەن، مانایەكی بۆ دەكەن كە ماناكەی وانییە. (دِرَاسَتُهُمْ) خوێندنەوەیان. ﴿ وَاعِيَةٌ ﴿١٢﴾ ﴾ الحاقة: پارێزەر و هۆشمەند. (وَتَعِيَهَا): لەگوێی گرێ، لەبەری كات ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ ﴿١٩﴾ ﴾ الأنعام: مەبەستی خەڵكی مەككەیە. ﴿ وَمَنۢ بَلَغَ ﴿١٩﴾ ﴾ الأنعام. (هەركەس) ئەم قورئانەی پێ بگات ئەوە بۆی ئاگاداركەرەوەیە.

٧٥٥٣- وَقَالَ لِي خَلِيفَةُ بْنُ خَيَّاطٍ: حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، سَمِعْتُ أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَمَّا قَضَى اللَّهُ الخَلْقَ كَتَبَ كِتَابًا عِنْدَهُ: غَلَبَتْ -أَوْ قَالَ: سَبَقَتْ- رَحْمَتِي غَضَبِي. فَهْوَ عِنْدَهُ فَوْقَ العَرْشِ»[١].

٧٥٥٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((كە خوا لە دروستكردنی بوونەوەر بوویەوە لە نووسراوێكدا لای خۆیەتی نووسی: بەزەیی ومیهرەبانی من زاڵ بووە- یان پێشكەوتووە- بەسەر تووڕەی و خەشمدا، ئەو نووسراوە لای خۆیەتی لەسەر عەرشە)).

٧٥٥٤- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي غَالِبٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، أَنَّ أَبَا رَافِعٍ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ كِتَابًا قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ الخَلْقَ: إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي. فَهْوَ مَكْتُوبٌ عِنْدَهُ فَوْقَ العَرْشِ»[٢].

---

(١) بڕوانە: ٣١٩٤.
(٢) بڕوانە: ٣١٩٤.

٧٥٥٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست فەرمووی: ((بێگومان پێش ئەوەی خوا بوونەوەر دروست کات نووسراوێکی نووسیوە: بەڕاستی بەزەیی و میهرەبانی من پێشکەوتووە بەسەر توڕەی و خەشمدا، ئەوە لای خۆیەتی لەسەر عەرش نووسراوە )).

## ٥٦- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الصافات

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر. وَيُقَالُ لِلْمُصَوِّرِينَ: "أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ"[1].

﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف. قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ: بَيَّنَ اللهُ الْخَلْقَ مِنَ الأَمْرِ لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ﴿٥٤﴾ ﴾الأعراف. وَسَمَّى النَّبِيُّ ﷺ: الإِيمَانَ عَمَلاً[2]. وقَالَ أَبُو ذَرٍّ ﷺ وَأَبُو هُرَيْرَةَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ"[3]. وَقَالَ: ﴿ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة. وَقَالَ وَفْدُ عَبْدِ القَيْسِ لِلنَّبِيِّ ﷺ: مُرْنَا بِجُمَلٍ مِنَ الأَمْرِ إِنْ عَمِلْنَا بِهَا دَخَلْنَا الجَنَّةَ. فَأَمَرَهُمْ بِالإِيمَانِ، وَالشَّهَادَةِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، فَجَعَلَ ذَلِكَ كُلَّهُ عَمَلاً.

---

(١) بڕوانه: ٢١٠٥.
(٢) بڕوانه: ٢٦.
(٣) بڕوانه: ٢٥١٨.

## ٥٦- باسی ئەم فەرمايشتەی خوای بەرز و بڵند: (لە كاتێكدا خوا بەديهێنەری خۆتان و ئەو بتانەشە دروستان كردوون)، (بێگومان ئێمە هەمووشتێكمان بە ئەندازە دروست كردوە)، وە دەوترێت بە وێنە كێشان ((ئەوەی دروستان كردوە زيندووی كەنەوە))

(بەڕاستی پەروەردگارتان ئەو خوايەيە كە ئاسمانەكان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست كردوە، پاشان (خوا) چووە سەر عەرش[1] بە (تاريكايی) شەو (ڕۆشنايی) ڕۆژ دادەپۆشێ (بە پێچەوانەشەوە)، (ڕۆژبە شوێن شەوەوەيە بەخێرايی و) شەو بەشوێن ڕۆژەوەيە بەخێرايی، خۆر و مانگ و ئەستێرەكان ژێربار كراون بەفەرمانی خۆی، بێداربن كە بەديهێنان و فەرماندان هەر بۆ خوايە پاك و بێگەردە (لە هەموو كەم و كوڕييەك)، خوای پەروەردگاری جيهانيانە)

-ئيبنو عويەينە دەڵێ: خوا بەدی هێنانی (دروستكراوەكانی) لە فەرماندان[2] جيا كردووەتەوە، بە بەڵگەی ئەم فەرمايشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێداربن كە بەدی هێنان و فەرماندان هەر بۆخوايە).

-وە پێغەمبەر ﷺ ئيمانی بەكردەوە ناو بردووە. ئەبو زەڕ و ئەبو هوڕەيرە ﷺ دەڵێن: پرسيار لە پێغەمبەر ﷺ كرا كام كردەوانە گەورەترە؟ فەرمووی: ((باوەڕ بوون بەخواو تێكۆشان لە ڕێی خوادا)). وە فەرمووی: (ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بەهۆی ئەو كردەوانەی كە كردوويانە).

-وە نوێنەرانی عەبدولقەيس عەرزی پێغەمبەريان ﷺ كرد كۆمەڵێ فەرمانمان پێ بدە ئەگەر كارمان پێيان كرد بچينە بەهەشتەوە، ئينجا ئەويش فەرمانی پێ

---

(١) باوەڕمان پێيەتی بەڵام شێوەكەی نازانين.

(٢) واتە: وتە و قسەی خوا كە فەرمانی پێدەدات.

**كردن بە باوەڕهێنان و شایەتومان هێنان و نوێژكردن و زەكات دان، جا هەموو ئەوانەی بەكردەوە دانا.**

٧٥٥٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ وَالْقَاسِمِ التَّمِيمِيِّ، عَنْ زَهْدَمٍ قَالَ: كَانَ بَيْنَ هَذَا الحَيِّ مِنْ جُرْمٍ وَبَيْنَ الأَشْعَرِيِّينَ وُدٌّ وَإِخَاءٌ، فَكُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ الطَّعَامُ فِيهِ لَحْمُ دَجَاجٍ، وَعِنْدَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَيْمِ اللَّهِ كَأَنَّهُ مِنَ المَوَالِي، فَدَعَاهُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُهُ يَأْكُلُ شَيْئًا فَقَذِرْتُهُ، فَحَلَفْتُ لاَ آكُلُهُ. فَقَالَ: هَلُمَّ فَلأُحَدِّثْكَ عَنْ ذَاكَ، إِنِّي أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي نَفَرٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ نَسْتَحْمِلُهُ، قَالَ: «وَاللَّهِ لاَ أَحْمِلُكُمْ، وَمَا عِنْدِي مَا أَحْمِلُكُمْ». فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِنَهْبِ إِبِلٍ، فَسَأَلَ عَنَّا فَقَالَ: «أَيْنَ النَّفَرُ الأَشْعَرِيُّونَ؟».

فَأَمَرَ لَنَا بِخَمْسِ ذَوْدٍ غُرِّ الذُّرَى، ثُمَّ انْطَلَقْنَا، قُلْنَا: مَا صَنَعْنَا؟ حَلَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لاَ يَحْمِلُنَا، وَمَا عِنْدَهُ مَا يَحْمِلُنَا، ثُمَّ حَمَلَنَا، تَغَفَّلْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمِينَهُ، وَاللَّهِ لاَ نُفْلِحُ أَبَدًا، فَرَجَعْنَا إِلَيْهِ فَقُلْنَا لَهُ، فَقَالَ: «لَسْتُ أَنَا أَحْمِلُكُمْ، وَلَكِنَّ اللَّهَ حَمَلَكُمْ، إِنِّي وَاللَّهِ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ أَتَيْتُ الذِي هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ وَتَحَلَّلْتُهَا»[1].

**٧٥٥٥- زەهدەم دەڵێ: لە ڕابردوودا لە نێوان ئەم هۆزی جەرم و ئەشعەریەكاندا خۆشەویستی و برایەتی هەبوو، جا ئێمە لای ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ بووین، خواردنێكی لێ نزیك كرایەوە گۆشتی مریشكی تیابوو، پیاوێكی لە بەنی (تَيْمِ اللَّهِ)ی لابوو وەك ئەو وابوو لە غەیرە عەرەب بێت، (ئەبو موسا) بانگی كرد بۆسەر خواردنەكە، پیاوەكە وتی: من ئەو مریشكەم دیوە شتێكی دەخوارد، بۆیە قێزم لێی هاتەوە و سوێندم خواردوە كە نەیخۆم، ئەبو موسا وتی: وەرە با لەو بارەیەوە فەرموودەیەكت بۆ بگێڕمەوە، من لەگەڵ چەند كەسێكی ئەشعەریدا**

---

(١) بڕوانە: ٣١٣٣.

**ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوای وڵاغی سواریمان لێ كرد (بۆ غەزاكردن)، فەرمووی: ((سوێندی بەخوا سوار وڵاغتان ناكەم [1] (بۆ غەزاكردن)، هیچ وڵاغێكم لا نییە سوارتان كەم))، پاشان وشتری تاڵانی هێنرا خزمەتی جا پرسیاری ئێمەی كرد و فەرمووی: ((كەسە ئەشعەریەكان كوان؟)) ئەوسا فەرمانیدا بە پێدانی پێنج وشتری كۆپارە بەرز پێمان، (وشترەكانمان وەرگرت و) پاشان ڕۆشتین، لە ناو خۆماندا وتمان: چی (كارێكی خراپ)مان كرد؟ پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی خوارد سوار وڵاغمان نەكات (بۆغەزا)، وە وڵاغیشی لانەبوو سوارمان كات، پاشان سواری كردین (وڵاغی پێداین) سوێندەكەمان بیری پێغەمبەری خوا ﷺ نەخستەوە، وەڵڵاهی هەرگیز سەركەوتوو نابین، بۆیە گەڕاینەوە بۆ خزمەتی عەرزمان كرد: فەرمووی: ((دڵنیابن من ئێوەم سوار نەكردوە، بەڵكە خوا ئێوەی سوار كردوە، وەڵڵاهی من سوێند ناخۆم لەسەر هەرشتێك ئینجا غەیر سوێند لەسەر خوراوەكە چاكتربێ بەلامەوە، ئیللا ئەوەی چاكترە دەیكەم و كەفارەتی سوێندەكەم ئەدەم)).**

٧٥٥٦- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا قُرَّةُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو جَمْرَةَ الضُّبَعِيُّ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ القَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: إِنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ المُشْرِكِينَ مِنْ مُضَرَ، وَإِنَّا لاَ نَصِلُ إِلَيْكَ إِلاَّ فِي أَشْهُرٍ حُرُمٍ، فَمُرْنَا بِجُمَلٍ مِنَ الأَمْرِ، إِنْ عَمِلْنَا بِهِ دَخَلْنَا الجَنَّةَ، وَنَدْعُو إِلَيْهَا مَنْ وَرَاءَنَا. قَالَ: «آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: آمُرُكُمْ بِالإِيمَانِ بِاللَّهِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مَا الإِيمَانُ بِاللَّهِ؟ شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَإِقَامُ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَتُعْطُوا مِنَ المَغْنَمِ الخُمُسَ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: لاَ تَشْرَبُوا فِي الدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالظُّرُوفِ المُزَفَّتَةِ، وَالْحَنْتَمَةِ» [2].

---

(١) وڵاخی سواریتان نادەمێ.

(٢) بڕوانە: ٥٣.

**٧٥٥٦- قورەی کوڕی خالید وتی: ئەبو جەمرەی زوبەعی بۆی گێڕاینەوە دەڵێ: قسەم لەگەڵ ئیبنو عەبباسدا ﷺ کرد، ئیبنو عەبباسیش ﷺ وتی: شاندێکی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان: لە نێوان ئێمە و بەرێزتدا بتپەرستانی موزەڕ هەیە، وە بەڕاستی ئێمە ناگەینە خزمەتت لە مانگە ڕێزگیراوەکاندا [١] نەبێ، جا چەند فەرمانێکمان پێ بکە ئەگەر کاری پێبکەین بڕۆینە بەهەشتەوە، بەو کەسانەی لای خۆشمان بڵێین و فەرمانیان پێبکەین، فەرمووی: ((فەرمان تان پێ دەکەم بەچوار شت، چوار شتیشتان لێ قەدەغە دەکەم: فەرمانتان پێدەکەم بەباوەڕبوون بەخوا، ئایا دەزانن باوەڕ بوون بەخوا چییە؟ (ئەمەیە) شایەتیدانە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خوا، وە نوێژ کردن و زەکات دان، وە دەبێ لە دەسکەوت پێنج یەکی بدەن، وە چوار شتیشتان لێ قەدەغە دەکەم: (لەو خواردنەوانەی دروست دەکرێ) لە ناو کولەکە و بنی داری هەڵکۆڵراو[٢] و کوپەی سەوز و کوپەدا[٣] مەیخۆنەوە )).**

**٧٥٥٧-** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَيُقَالُ لَهُمْ أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ»[٤].

**٧٥٥٧- قاسیمی کوڕی موحەممەد لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خاوەنی ئەم وێنانە لە ڕۆژی دواییدا سزا دەدرێن و پێیان دەوترێت: ئەوەی دروستان کردوە زیندووی بکەنەوە)).**

---

(١) ئەو مانگانەن کە عەرەبەکان ڕێزیان لێ دەگرتن و جەنگیان تێیدا نەدەکرد، پێان دەوترێت (أَشْهُرِ حُرُمٍ).
(٢) کاسەیەکە کە قەدی درەختە و ناوەکەی هەڵکۆڵراوە.
(٣) کە لە قوڕ و موو دروست کراوە.
(٤) بڕوانە: ٢١٠٥.

٧٥٥٨- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَيُقَالُ لَهُمْ أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ»[١].

**٧٥٥٨- ٧٥٥٧-ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خاوەنی ئەم وێنانە لە ڕۆژی دواییدا سزا دەدرێن و پێیان دەوترێت: ئەوەی دروستان کردوە زیندووی کەنەوە)).**

٧٥٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «قَالَ اللَّهُ ﷻ: وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي، فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً، أَوْ لِيَخْلُقُوا حَبَّةً أَوْ شَعِيرَةً»[٢].

**٧٥٥٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((خوا ﷻ فەرمووی: کێ لەوە ستەمکارترە نیازی بێ دروست کراوی وەك دروست کراوی من دروست کات، دەی با دەنکە گەردیلەیەك دروست کەن، یان با دەنکە گەنمێك یان دەنکە جۆیەك دروست کەن)).**

## ٥٧- بابُ قِرَاءَةِ الفَاجِرِ وَالْمُنَافِقِ، وَأَصْوَاتُهُمْ وَتِلاَوَتُهُمْ لاَ تُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ

٧٥٦٠- حَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالأُتْرُجَّةِ، طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَرِيحُهَا طَيِّبٌ، وَالَّذِي لاَ يَقْرَأُ كَالتَّمْرَةِ، طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَلاَ رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الفَاجِرِ الذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ

---

(١) بڕوانە: ٥٩٥١.
(٢) بڕوانە: ٥٩٥٣.

كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الحَنْظَلَةِ، طَعْمُهَا مُرٌّ وَلاَ رِيحَ لَهَا»[1].

## ٥٧- باسی قورئان خوێندنی ناپاک و دووڕوو، دەنگیان و قورئان خوێندنەکەیان لەگەرویان تێپەڕ ناکات

**٧٥٦٠- ئەنەس لە ئەبو موساوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((نموونەی ئەو باوەڕدارەی قورئان دەخوێنێت (و کاری پێ دەکات) وەك ترنج[2] وایە، تامی خۆشە و بۆنیشی خۆشە، وە نموونەی ئەو (باوەڕدار)ەی قورئان ناخوێنێت وەك خورما وایە، تامی خۆشە و بۆنی نییە، وە نموونەی ئەو دووڕووەی قورئان دەخوێنێت وەك ڕیحانە وایە، بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، وە نموونەی ئەو ناپاکەی قورئان ناخوێنێت، وەك گوژاڵکە وایە تامی تاڵە و بۆنیشی نییە)).**

٧٥٦١- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ح. وَحَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا عَنْبَسَةُ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي يَحْيَى بْنُ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: سَأَلَ أُنَاسٌ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الكُهَّانِ، فَقَالَ: «إِنَّهُمْ لَيْسُوا بِشَيْءٍ». فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ بِالشَّيْءِ يَكُونُ حَقًّا. قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تِلْكَ الكَلِمَةُ مِنَ الحَقِّ يَخْطَفُهَا الجِنِّيُّ، فَيُقَرْقِرُهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ كَقَرْقَرَةِ الدَّجَاجَةِ، فَيَخْلِطُونَ فِيهِ أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ كَذْبَةٍ»[3].

**٧٥٦١- عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێ: عائیشە ﵂ وتی: کەسانێك پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی فاڵچیەکان، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی**

---

(١) بڕوانە: ٥٠٢٠.

(٢) الأَتْرُجَّة: درەختی ترنج، بەری ترنج (درەختێکە لە ڕەگەزی لیمۆیە) (ئەلمونجید بەکوری: ٣٣/١).

(٣) بڕوانە: ٣٢١٠.

**پێیان: ((بێگومان ئەوان (فاڵچیەکان) هیچ نیین))، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا هەندێ جار ئەوان (فاڵچیەکان) باسی شتێك (ی نهێنی) دەکەن ڕاست دەردەچێت و وادەبێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوە وشەیەکی ڕاستە جنۆکە دەیفڕێنێ و دەیدات بەگوێی دۆستە (فاڵچیە) کەیدا، وەك گارە گاری مریشك، ئەوانیش زیاد لە سەد درۆی لەگەڵ تێکەڵ دەکەن)).**

٧٥٦٢- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا مَهْدِيُّ بْنُ مَيْمُونٍ، سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ سِيرِينَ يُحَدِّثُ، عَنْ مَعْبَدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَخْرُجُ نَاسٌ مِنْ قِبَلِ المَشْرِقِ وَيَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، ثُمَّ لاَ يَعُودُونَ فِيهِ حَتَّى يَعُودَ السَّهْمُ إِلَى فُوقِهِ». قِيلَ: مَا سِيمَاهُمْ؟. قَالَ: «سِيمَاهُمُ التَّحْلِيقُ». أَوْ قَالَ: «التَّسْبِيدُ».

**٧٥٦٢-ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خەڵکانێك لە لای ڕۆژهەڵاتەوە پەیدا دەبن، قورئان دەخوێنن لەچەڵەمە (گەر و) یان تێپەڕناکات، لە ئاین (ی ئیسلام) دەردەچن، وەك چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێ، پاشان ناگەڕێنەوە بۆ ناو ئایین، هەتا تیرەکە نەگەڕێتەوە بۆشوێنی خۆی لە کەوانەکە))، وترا: نیشانەیان چییە؟فەرمووی: مووتاشین[1]، یان فەرمووی: ((هەڵکێشانی موو[2])).**

(١) مووقژی سەریان یان موو تاشین بەگشتی.

(٢) بەچەند مانای تریش هاتووە: تاشین، نەشۆردنی قژ، ڕۆن لێ نەدانی.

## ٥٨- بابُ قَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٤٧﴾﴾ الأنبياء وَأَنَّ أَعْمَالَ بَنِي آدَمَ وَقَوْلَهُمْ يُوزَنُ.

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: الْقُسْطَاسُ: العَدْلُ بِالرُّومِيَّةِ، وَيُقَالُ: القِسْطُ: مَصْدَرُ المُقْسِطِ، وَهْوَ العَادِلُ، وَأَمَّا القَاسِطُ فَهْوَ الجَائِرُ.

## ٥٨- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (وە ئێمە تەرازووەکانی دادپەروەری (کە کردەوەی پێ دەکێشرێ) دادەنێین).وە بێگومان کردار و گوفتاری ئادەمیزادەکان دەکێشرێن

**موجاهید دەڵێ: (الْقُسْطَاسُ): دادگەرییە بەزمانی خەڵکی ڕۆم. وە دەوترێت: (القِسْطُ): چاوگی (المُقْسِطِ)ـە کە دادپەروەرە، بەڵام (القَاسِطُ) ستەمکار و نادادپەروەرە.**

٧٥٦٣- حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ إِشْكَابٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ القَعْقَاعِ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ، خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ»[1].

**٧٥٦٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دوو وشەلای خوای بەبەزەیی خۆشەویستن، لەسەر زمان سوکن (بوترێن) لە تەرازوودا قورسن، (کە بریتین لە): (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ)).**

(١) بروانە: ٦٩٤.

سوپاس بۆ خوای گەورەو بەبەزەیی ئەمڕۆ سێ شەممە ٢٠٢٠/١١/٥. کاتژمێر ٣:٣٠ پاش نیوەڕۆ سلێمانی/گەڕەکی کازیوە. وەرگێڕانی صەحیحی بوخاریم تەواو کرد، خوا یارمەتیمان بدات بۆ تەواوکردنی کارەکانی تری تا بەزوویی چاپ بکرێت و بکەوێتە بەردەستی خوێنەرانی کورد زمان، داوا دەکەم لە هەر کەسێك کەئەم وەرگێڕاوەی خوێندەوە دووعای خێرمان بۆ بکات، وە هەر هەڵە و تێبینیەکی هەبوو ئاگادارمان بکات لێی بەم ژمارە تەلەفۆنانە:

٠٧٥٠١١٤٣٧٨٢ - ٠٧٧٠٢١٢٤٧٤٤

ئەمڕۆ یەك شەممە: ٢٠٢٠/٨/٢٣ لە پیاداچونەوە و هەڵە گیری وەرگێڕانی صەحیحی بوخاری بومەوە، کاتژمێر ٦:١٠ پاش نیوەڕۆ / سلێمانی/گەڕەکی کازیوە.

ئەمڕۆ پێنج شەممە: ٢٠٢١/٤/١٥ بۆ جاری دووهەم لە پیاداچونەوە و هەڵە گیری وەرگێڕانی صەحیحی بوخاری بوومەوە، کات ژمێر ٦:٠٥ پاش نیوەڕۆ / سلێمانی/گەڕەکی کازیوە.

ئەمڕۆ چوار شەممە: ٢٠٢٢/٥/٢٥ لە سەیرکردن و چاوپیاگێڕانی ئەو تێبینیانە بوومەوە کە بەڕێز دکتۆر حسین محمد نووسیبوی بۆم، لەسەر وەرگێڕاوی صەحیحی ئیمامی بوخاری، زۆر سوپاسی دەکەم بەڕاستی تێبینی و پێشیار و سەرنجی زۆر جوانی بۆ نووسیبوم، سوودی باشم لێ بینین خوای گەورە پاداشتی بداتەوە.

کاتژمێر ٣ پاش نیوەڕۆ / سلێمانی/گەڕەکی کازیوە.

سوپاس بۆ خوای گەورە

ئەمشەو ١٦ لەسەر ١٧/ ١٢/٢٠٢٢ كۆتایی پێداچونەوەی هەڵەكانی ئامادەكردنی صەحیحی ئیمامی بوخاری بۆ چاپكردن بومەوە كەشەوی شەمەیە كاژمێر ٨،٣٠ی شەو/ سلێمانی گەڕەكی كازیوە

مەلا محمد ملا صالح بامۆكی

# پێرستی بەرگی دەیەم



## ٨٧- پەڕاوی خوێنبایی ١٥

## ٨٨- پەڕاوی داوای تەوبەکردن لە هەڵـگەڕاوان و سەرکەشان و جەنگ کردن لە دژیان ٦٤

## ٨٩- پەڕاوی زۆرلێکردن ٨٧



## ٩٠- پەڕاوی فێڵەکان ١٠٢

## ٩١- پەڕاوی لێکدانەوەی خەو ١٢٩

## ٩٣- پەڕاوی بڕیارەکان ٢٥٢

## ٩٤- پەڕاوی ئاوات خواستن ٣٣٣

## ٩٥- پەڕاوی فەرموودە ئاحادەکان ٣٤٩

## ٩٦- پەڕاوی پابەندی بە قورئان و سوننەتەوە ٣٦٧

## ٩٧- پەڕاوی یەکتا پەرستی ٤٥٣